

ئینیاتسیو سیلۆنە

# نان و شەراب

رۆمان

وەرگێڕانی:

کەریمی حسامی

به یادی شاعیری پایه بەرز و خۆشەویستی گەل- هێمن

ئەوسـالانەی کە پێکەوە لە بەغدا دەژیاین، پاش ئەوەی کتێبی دایکی ماکسیم گۆرکی- م کرد بە کـوردی و کۆڕی زانیاری کوردی چاپی کرد، مامۆسـتا هێمن ڕەوانی شاد، هانی دەدام کە نان و شەراب بکەم بە کوردی. دەیگوت لە بەر توحفەی موزەفەریە پێراناگەم دەنا لێی ڕانەدەوەستام. چەند جار لێی دوو پاتە دەکردمەوە و دەیگوت: حـەیفـە نان و شـەراب نەکرێتە کوردی. دەستم بـە وەرگێڕانی کرد و لام وایە سی لاپەڕەم کرد بوو بە کوردی، لێک بڵاو بووین و گەڕاینەوە بۆ وڵات. لەوێ لە بەر کـاری زۆر و چوونە چیا و تەنگ و چەڵەمـەی خـەبات و ژیان نەمتـوانی درێژەی پێبدەم. کاتێ مـامـوسـتـا هێـمن لە ژێر تەوژمی ( دێمـوکراسی و نـەخـلاقێکی کە دوکتور قاسملو هێنا بوویە نێو حیزبی دێموکرات) لە شیلاناوێ دەست بە سەر کرا بوو، خـەریک بوو نان و شـەراب بکاتە کوردی. بەلام پاشـان زانیم بە داخـەوە بۆی نەکراوە. من ئەو سـی لاپەڕەم ئەو دەم نارد بۆوە بولغارسـتـان و لە نێو دەفتـەر و کاغەزاندا کەوتبۆوە. کە دیتمـەوە هاتمە سـەر ئەو بڕیارە کە وەرگێڕانەکەی درێژە پێبدەم. بەلام لە بەر نووسینی بیرەوەرییـەکانم و پێداچوونەوە و وەرگێڕانی( ئازادی یامەرگ) و وردە نووسینی دیکە، نان و شەراب خرا پشت گوێ. تانۆرەی گەیشتێ کە جارێکی دیکەش بیخوێنمەوە. پاش تەواو کردنی بریارم دا کە بە یادی هێمن بیکەمە کوردی و با لانی کەم ئەگەر چاپ بکرێ ئەم ئاواتەی شاعیری مـەزنی سەر دەم پاش نەمانی بکاتە جێ و شانازیشی بۆ من بمێنێتەوە و کتێبخانەی کوردیشی پێ برازێتەوە. کەریمی حسامی ٨/١٢/ ١٩٩٩

## پێشەکی وەرگێڕی فارسی

شاد روان محەممەدی قازی

**ئیگنازیۆ سیلوونە**( ناسراو بە سکۆندۆ ترانکویلی) لە نووسەرانی گەورەی هاو چەرخی ئیتالیایە کە ساڵی ۱۹۰۰ لە پشینا ئاکویلا سەر بە هەرێمی ئابروتزە، ناوچەی فوچینۆ هاتۆتە دنیاوە. خوێندنی سەرەتایی لە مەدرەسەی مەعقول و مەنقول و پاشان لە کالیجی ماسیمۆ لە ڕۆم تەواو کردوە. سەر دەمی منداڵی بە هەژاری و دەست تەنگی بردۆتە سەر و لە بومە لەرزەی ساڵی ۱۹۱۵ دایک و باب وپێنج برای لە کیس چوون. پاش تەواو کردنی خوێندن دەبێتە سۆسیالیست و یەکێ لە دامەزرێنەرانی حیزبی کۆمونیستی ئیتالیا. لە ماوەی ساڵەکانی ۱۹۲۱ تا ۱۹۳۱ یەکێ لە ڕێکخەرانی تێکۆشانەکانی نهێنی دژی فاشیستی بوە. ماوەیک لە مۆسکۆ بوە وپاش ئەوەی ساڵی ۱۹۳۰ لە حیزبی کۆمونیست دەر کراوە، لە سویس نیشتە جێ بوە. دەکرێ بڵێین پاش کشانەوە لە حیزبی کۆمونیست ڕەگەڵ ئاندرە ژید و ئارترکۆستلەر و سپندەر و ڕایت و لویی فیشر کەوتوە.

لە سویس تێکۆشانی دژی فاشیستی و خەباتی نهێنی خۆی دژی دەزگای دیکتاتۆری موسولینی درێژە پێدا و هەر لەوێشە کە نیزیکە تەواوی شوێنە وارەکانی خۆی هێناوەتە سەر کاغەز.

ساڵی ۱۹٤٥ پاش ڕوخانی حکوومەتی فاشیستی موسولینی دەگەڕێتەوە ئیتالیا و لە لایەن حیزبی سۆسیال دیموکرات بە نوێنەری مەجلیسی شوڕای میللی ئیتالیا هەڵدەبژێردرێت. ڕۆمانەکانی وی لە ڕاستیدا بیر خەرەوەی خەباتی دژی فاشیستی ئازادیخوازان و سۆسیالیستە تێکۆشەرەکانی ئیتالیا و ڕوونکەرەوەی ژیانی دژواری وەرزێڕانی فەقیری ناوچەی فوچینۆی شوێنی لە دایکبوونی خۆنی. لە ڕۆمانەکانی ویدا توانای نووسینێکی بەر چاو لە گەڵ ڕیئالیزمی ئازایانە بە شێوەیەکی کاریگەر تێکەڵ بوون و بابەتێکی تەکاندەریان پێکهێناوە. دەکرێ لە وانە ئەم کتێبانەی خوارەوە ناو بەرین: فۆنتامارا(۱۹۳۰)، نان و شەراب(۱۹۳۷)، دەنگی ژێر بەفر(۱۹٤۰)، مستێک تودرک(۱۹٥٤)، ڕاز لۆقا(۱۹٥٦)، کارەساتی

مەسیحییەکی فەقیر(١٩٥٨) و ڕێوی و گوڵەکانی کاملیا.)

لەم نووسراوانە ئەوەندی بزانم نان و شەراب و کارەساتی مەسیحییەکی فەقیر( کارەساتی پێشەوایەکی شەهید) لە لاین خۆم ، فۆنتامارا و مستێک تودرِک و ڕێوی وگوڵەکانی کاملیا لە لایەن وەرگێرانی دیکەوە کراون بە فارسی.

سیلونە تا ئەم ساڵانەی پێشوو دەژیا و لە مەزرایەکی شەخسی خۆی، لە نیزیک ڕۆم، سەر دەمی پیری خۆی دەبردە سەر.

نان و شەراب کە ئێستا حەفتەمین چاپی وی دەکەوێتە بەر چاوی خوێنەران، بابەتێکی مەشهورە وهەوەڵجار لە ڕێگای ئەم کتێبەوە سیلونە بە دنیای فارسی زمانان ناسێنرا. قارەمانانی سەرەکی ئەم ڕۆمانە، پێترۆ سپینا، لە ڕاستیدا تارمایی خودي نووسەرە و هەر بۆیە دەکرێ ئەم کتێبە بە بابەتێکي (ئۆتۆ بیۆ گرافیک) دابنرێت. کتێب داستانێکی تەکاندەرە لە ژیانی وەرزێرانی فەقیری ئیتالیا لە وێدا داب و نەریت و بیر و باوەری خەرافاتی و بار و دۆخی ژیانی داخداری ئەوان بە زمانێکی ساکار و شیرین و پڕ لە تەنز و تانە و لاتاو ڕوونکراوەتەوە. کتێبێکە پڕە لە وروژاندن وشانۆی زیندو و سەرنج ڕاکێشی ئینسانی کە لە هەموو شوێنی ویدا، ئینسان دۆستی و عاتیفەی ئینسانی و ویژدانی سیاسی و کۆمەلایەتي و ئەڤینی ژیانی ئازاد و بیر کردنەوەی ئازاد لە وێدا شەپۆل دەدات. تەنیا بە تەنگ خۆوە نە بوون و ئاسایش و نیعمەتی تێکەل بە کۆیلەتی بە زەلیل دانان و ژیانی سەبارەت بە کۆمەڵگا، دەرسێکە ئەو کتێبە جوان و بە نرخە فێرمان دەکات. لە ڕاستیدا قارەمانی ئەم کتێبە، کە بێگومان بە یەکێ لە شاکارەکانی مۆدێرنی ئەدەبیاتی کۆمەلایەتی و سیاسی سەدەی دوایی دەژمێردرێ، تەنیا خودی نووسەر نیە بەڵکوو تەواوی خەڵکی ئیتالیا لە ناشیرین ترین و پیسترین و نا ئینسانیترین سروشتەکانەوە بگرە تا سیمای پرشنگداری وەک( دۆن بنە دێتۆ) قەشەی گوندی ڕوکا و کریستینا کیژی نەجیبزادە و هەستیار و مەزهەبی بەلام ئینساندۆست و بە شەرەف و بیانکینا ژنی سوک و بە ناز و هەر لەو کاتەشدا شەریف و فیدا کار لە وێدا نەخشی گەورەیان لە ئەستۆیە.

ئەم کتێبە حەماسەیەکە لە فیداکاری خەڵکێک کە لە نێو چەرخی ماشێنی ئاڵو گۆڕی کۆمەلایەتی ئیتالیای فاشیست دا گیرساون و بۆ ڕزگاری خۆیان و پێکهێنانی ژیانی خۆشتر و دنیای باشتر تێدەکۆشن. لەم کتێبە دا نەخشی کلیسا لە هاو دەستی لە گەڵ حکوومەتي زوڵم و زۆرداری بە جوانی نیشان دراوە و ئەگەر

قـەشـەكـانی وەک دۆن بنـە دێتۆ ئـامـادە نەبوون مل بۆ كليـسـا و پاپ و حكوومـەتی دیكتاتۆری ڕا بكێشن، بە وەزعێكی هەرە خەراب سەریان تێدا دەچێ.

لە وانەیە شكلێكی كە سیلونە لەم شوێنەوارە و نووسینەكانی دیكەی خۆیدا لە بارەی بار و دۆخی ئیتالیای سەر دەمی تێكۆشانی خۆی نیشانددەدات، زۆر تاڵ و ناهومێدانە و هەستی بەد بینی بێت، بەڵام هەر چۆنێكی بێت لە هەموو شوێنێ بە چاوی بێلایانە و خالیسانە و دوور لە قین و دۆستی بێجێ و دەمار گرژی واقعیەت نیشان دەدا كە هاندەری ئەو لە پێكهێنانی ئەم شوێنە وارە جگە لە بڕوا بە ئازادی و ئەڤین بە ئینسانیەت شتێكی تر نە بوە. لایەنی شاز و تەنزاوی نووسینی سیلونە هاو دووله گەڵ ڕەوانی و ساكاری و یەكدەستی دەق و سەرنجدانی نوكتەكانی ئەخلاقی و كۆمەڵایەتی و ڕەوانناسی تا ڕادەیەک نووسینەكانی ئەناتۆل فرانس وە بیر دێنێتەوە.

بۆ وەر گێڕانی ئەم كتێبە لە دوو دەقی وەرگێڕاوەی فەرانسەیی و ئینگلیزی كەلک وەر گیراوە، سەبارەت بە تەواو بوونی زیاتر و پێڕەوی ورد تر لە شێوەی نووسینی نووسەر، دەقی فەرانسەییەكە كاری لە سەر كراوە و بۆ لە بەر یەک ڕاگرتن و هێنانی ئەو بەشانەی كە لە دەقی فەرانسییەكە دا نە بوون، لە دەقی ئینگلیزی كەلک وەر گیراوە.

هەر وەها لە سەر دەمی تاغوت دا كە ئەم كتێبە بە زەحمەتی زۆر ڕێگای درا بۆ چاپ، سانسۆر كرا و گۆڕین و دەسكاری تێدا كرا و ئێستا كە لە سایەی شۆڕشی ئیـســلامی لە ئازادی چاپەمـەنی زیاتر كـەلكمـان وەر گـرتوە، دەسكاری و گۆڕینەكانمان هێناوەتەوە سەر ڕێبازی سەرەكی خۆی و ئەوانەی وەلاشیان نا بوون سەر لە نوێ لە كتێبەكەمان زیاد كردوە..

محمد قاضی

١

دۆن بنە دیتو قەشـەی پیر لە سـەر دیواری باغچە لە ژێر سێبەری دارێکی سـەرو دانیشـتوە. ڕەشایی عەباکەی کە کلکەی سێبەری دارە، کەوتۆتە سەر دیوار و ئەوی نەدیو کردوە. لە پشت وی، خوشکی لە سەر دەزگای چنین کە لە نێو خەڵفە شمشاد و ( ئیکلیلی کێـوی)دایمەزراندوە، خـەریکی چنینـە. مـەکۆی دەزگـایەکـە لە سـەر هەودای سوور و سپی بە ڕاست و چەپدا لە هاتوو چۆ دایە. ئەم هاتوو چۆیە لە گەڵ هەوای پێ بزاوتنی مـاشـێن کـە هەودا جـیـا کـەرەوەکـان بەرز دەکـاتـەوە ولە گـەڵ هەڕەکـەتـی شـانـی کـە ڕایەڵەکـان دەکـوتێ، هـاو ئاهـەنگە. دوای نیـوەڕۆ ڕۆژێکە لە ڕۆژەکـانی ئاخـری مـانگـی ئەپریل و هەوایەکی سـازگـاری هەیە. فیکـریش بە دوای جولانەوەی هەوداکاندا، بە ڕاست و چەپدا دەخولێتەوە.

لە لای ڕاستەوە بۆ شار دەچن و لە لای چەپەش کوتو پڕ توشی چیا دەبن. هێڵی ڕێگای ئاسن و شـەقـامـە ڕێی مـیللی لە لای ڕاسـتـە و بە شـوێن قـەدیمە ڕێگای(ڤیا والریا)دا، بە نێوچیمـەن و مەزرای دەغڵ و دان و پـەتاتە و چەوەندەر ولۆبیا و گەنمە شامیدا بەرەو( ئاوەتزانۆ) تێدەپەڕێ و بۆ لای (کوللی دێ مۆنتە بۆڤا) سەر دەکەوێ و بە دیوی( تیولی)دا شـۆڕ دەبێتەوە و پاشان هەر وەکوو تەواوی شەقامە ڕێیـەکانی جیهان ئاخرەکەی دەگاتەوە ڕۆم.(١)

لە لای چەپە ڕێگای ئەیالەتی کەوتۆتە نێوان ڕەز و مەزرای نۆک و پیواز و هەرلە سـەرەتاوە بە چیـا دا سـەر دەگەوێ و لە ناوچە لێرەوارەکان کە ورچی هەیە، بە نێو دڵی زەویەکـانی ( ئابرۆتزە)دا شـۆڕ دەبێـتـەوە ودەگاتە گوندەکانی (پێسکا سرۆلی) و( مۆپی) و (ئاڵفێدنا).

ئێسـتـا خـوشکی قەشـە مـەکۆی لە گـەڵ دەزووی سـوور خسـتۆتە نێو هەودای دەزگـاکـەوە. لە جادەی ئـەیالەتییـەوە کە بـەسـتێنێکی وشکی پڕ لە ورتکە بەرد و خـواره پێـچـەیە، ژنێکی گەنجی دیهاتی منداڵێک بە ئامێزەوە، بە سـواری کـەرێکی چکۆڵە دێت. جـادەکـە سـپـیـە. لە قـەراخ ڕێگا، پیـاوێکی دێهـاتـی بە گـاسنێکی باسکێش دار کـە دوو کــەر دەیکێـشن، جــوتی دەکــا. لە دوورەوە لـە لای ڕاست، کامیۆنێکی پڕ لە سـەر باز بە شەقامە ڕێی میللیدا دەڕوا کە ئاسنە کۆنەکانی تەقە تەقیانە و کامیۆن لە تەپ و تۆز دا بزر بوە. ژیان لە ڕوانگەی باخی قەشەوە دیمەنی بیجبیجە خانمی منالانی هەیە.

ئیمڕۆ ڕاست ٧٥ ساڵ لە تەمەنی( دۆن بنە دیتو) تێدەپەڕێ. ئەو لە سەر دیواری باخەوە دەڕوانێتە دەشتێ. چاوەڕوانی پۆلێک شاگردی قەدیمیی خۆیەتی کە بە بۆنەی ڕۆژی لە دایکبوونی لێی گێراونەوە. لە بەر ئەوەی ژیانی دوای خوێندن لاوەکانی لێک بڵاو کردوە، یەک یەک لە ڕاست و چەپ، واتە لە شار و لە چیاوە دێن و دەگەنێ. لە خوارەوەی باخچەی دۆن بنەدێتو چەند خانووی گوندی(ڕۆکا) دیارن وە چۆلیی دەچن. لە نێوە ڕاستی ئەو خانوە چکۆلانەی پێکەوە نووساو، مەیدانێکی تەنگ و بچکۆلە هەیە کە سەنگ فەرشەکانی لە نێو گژ و گیا دا وون بوون. لە ئاخری مەیدانەکە دەرگای گەورە و کورتی کلیسایەک بەر چاو دەکەوێ. لە سەرووی وی پەنجەرەیەکی کون کون دەڕوانێتە دەرەوە.

خانوەکان و کۆلان و مەیدانە کچکەکە، گشتیان چۆل دێنە بەر چاو. سوالکەرێکی شرە پۆش بە وێدا تێدەپەڕێ و بە بێ وەستان ڕێگای خۆی درێژە پێدەدا. کچۆلەیەک لە دەرگای ماڵێک دێتە دەر و دەڕوانێ و پاشان دەچێتە پشت دارێکی بە لق و پۆپ و بە نێو لقە دارەکاندا چاو دەگێڕێ.

خوشکی قەشە بە براکەی دەڵێ:

– باشتر بوو شەربەتی تەمری هیندیت کڕیبایە. چونکە جێژنی لە دایکبوونتە. باشبوو ڕیشت تراشیبایە.

قەشە لە وەڵامدا دەڵێ:

– جێژنی لە دایکبوونی من ! بە ڕاستی بۆ جێژن گرتن چەندە کاتێکی باشە. بەڵام ئەم لاوانە، شەربەتی تووی فەرەنگیش کاریان تێدەکا. شەربەتی تەمری هیندی لە شارەوە دە بوتڵدا دێت. بەڵام( ماتالنا ریکوتا ) کە تووی فەرەنگی و کارگ و ترێ دێنێ، لە چیاوە دێت. بۆیاغی کەوش و دوگمەی قۆڵ و مەکارۆنی زەعفەران لێدراوی ( پانتانلا) و ڕەنگی قژی( شەوانی ڕۆژ هەڵات) بۆ قژی مادام ( ئاوانجلینا) و یەقەی ئاهاری و ئەشیا بۆ قیتکردنی سمێڵە شۆڕەکانی (مارکۆ تولیۆ زابالیۆنە) و تەواوی ئەم شتانە لە شارەوە دێن. بەڵام ( بونیفازیۆ پاتاکا) کە خەڵک پەنیری مەڕ و دەڵەمە وپەنیری( موزارل)ی لێدەکڕن و (شیان کالا) ئەو کەسەی دار و خەڵوز دێنێ، لە چیاوە دێن. ئاوایە شانۆی ڕەنگاو ڕەنگی کە دۆن بنەدێتو لە ناویدا دەژی.

خوشکی قەشە دەڵێ:

– ( شیان کالا) کە شت بە شت دەگۆڕێتەوە، گەڕاوەتەوە. ئەو لە جیاتی خەڵوز ،

جگە لە پیواز و لۆبیا چیتر وەر ناگرێ قەشە دەڵێ:

- دیسـان مـاوەیەکـە دوای خـواردن، مـەعدەم تـرش دەبێ. جـۆشـی شـیرینیش قیمەتی سێ ئەوەندە زیادی کردوە. پێت وانیە ئەم لاوانە وەدرنگی کەوتبن؟ جۆشی شیرینیش وەک دەرمان کنێچ و تیغی(تەئمین ١) لە شارەوە دێن.

خوشکی دەڵێ:

- ئەی بابە ،( تەئمینی)چی؟ کاتێ بەو تیغانە ریشت دەتاشی، لەو کاتە زیاتر ریشت دەبڕی کە بە گوێزانی قەدیم دەت تراشی.

قەشە لە وەڵامدا دەڵێ :

- مارتا گوێ بدمیە.(تەئمین) هەمیشە شتێکی ڕاژەیە. خەراب نە بوو ئەگەر (تەئمینی) کشتیش ناوی گۆڕا بایە و بە مەترسی کشتی ناو نرابایە. بەڵام تۆ ئێستا بە دەنگی بەرز دەیەیڤی. لە بیرت نەچێ کە مەبەست لە تیغی( تەئمین) تیغی نیشتمانیە و برینی ئەم تیغانە هەرچی بن برینی وڵات پارێزین، جگە لە مە، کاتێ باشی بیر لێ بکەینەوە شاگردە قەدیمیەکانی من پێیان باشترە شەراب وەخۆن. چونکە ئەوان ئیتر منداڵ نین.

مارتا ڕادەبێ بە پارێز تەواوی ئەو شەرابانەی کە بۆ لاوان دەبن، دەیانهێنێ تا لە سەر مێزێکی بەردی مەڕمەڕ ڕێزیان بکات کە لە باخچە دا لە نێو گوڵان دانراوە. ئەم کـارە بە گوێرەی ئاینێکی تایبـەتیە کـە بۆ زوو هاتنی مـیوانان بە ڕێوە دەچێ. پاشان مارتا خەریکی کاری خۆی دەبێ و مەکۆ بە دەزووی ڕەش داوێتە سەر دەزگا و دەڵێ :

- دەزانی کە بەخشداریان لابردوە؟ دیارە بەخشداری تازە هێشتا غەریبە. وا دیارە سەبارەت بە شەڕی ئەفریقا ٢ خەریکە هێندێ گوڕینی دیکەش پێک بێنن.

قەشە دەڵێ:

زەمانی شەڕ سەر دەمی کار و کاسبیە. ڕاگواستن و گۆڕین هەمیشە لە شارەوە دەست پێدەکرێ. بەخـشـدار ویشکنێـر و چاوە دێر و ئەسـقـۆف و وتـە بێـژ ویەکێتیەکان و قەشەکانی عیسایی بۆ پەند و نسحەتی مەسەلەی دینی هەموویان لە شارەوە دێن. ڕۆژنامەکان، گۆرانیەکان، بۆ نمونە ئاوازی( تەرابلس ئەی هەتاوی

---

١ـ تەئمین ناوی کارخانەیەکی تیغی ریش تاشینە

٢ ـ مـەبەست شـەڕی ئیـتـاڵیـایە کـە مـوسـولینی لە گـەڵ حـەبەشـە سـازی کـرد.

جوانی ئەڤین) و( والانسیا) و شتی دیکە وگرامافۆن، دەزگای تەلەفون و تێلگراف و بێتەل، ڕۆمان و کارت پوستاڵی - یش لە شارەوە دێن. ئەوەی لە چیاوە دێت بریتییە لە: ( ئانتی فـۆنا)ی برای دینی ئەو قـەشـە کـبـوشـیـیـە بە هەمـبـانەی سـواڵ و سەدەقەوە.....

ڕۆژانی سێ شـەمۆ( شـاتاپ)دێتـە بازار. شـەمۆ( مـاگاشـیا) بۆ تـوتن و خـوێ، پیرێژنی جادوگەر بە گیای حەکیمـایەتی و کەوڵی کودەڵە بەرازی هیندی و پێستی مار بۆ چاو وزار لە ( کاساڕۆلا) وە دێت.

مارتا دەڵێ:

- بیستووتە کە ( کلاریسا) بۆتە دەزگیرانی میکانیستی پالاوگە؟ ژن هێنان لە سەر دەمی شەڕ دا، تۆو چاندنە لە شۆرەکات. هەودای دەزگاکە گرێی کەوتۆتێ و مارتا بە ناچاری ڕا بوە گرێیەکە بکاتەوە.

دۆن بنە دیتو کەوتۆتە فیکر و ئاخرمکەی دەڵێ :

- ژنان خـۆشبەختێکن کە بە چارەنووسی بوکی شەڕ دێنە دنیاوە... شـاعیری ئەمانەتێکە وەدەست دێت، بەلام بوکی شەڕ و پانوسقـۆفی نیـعمـەتێکی مادر زادە. دیارە مەبەستم کلاریسا نیە کە بە ڕواڵەت لایەنی ئەحمەقی زیاترە. وانیە ؟

مارتاڕای خۆی دەر دەبڕێ و دەڵێ :

-« کلاریسا » یانی زەوی چاک. زەویەک بۆ چاندنی گژنیژ.

- بۆ چما ئەو میکانیکە دەیەوێ کارخانە بە جێ بێلێ و خەریکی چاندنی گژنیژ بێت.؟

مارتا لە ڕوونکردنەوەی قسەی خۆیدا دەڵێ:

- بە پێچەوانە. ئەوە « کلاریسـا »یە دەیەوێ زەویەکی خۆی بفرۆشێت. کونجی ئیتر برەوی نەماوە. پێشتر کونجی بۆ شاری دەچوو، ئێستا کەس نایەوێت. لایان وایە بەرهەمێکی گران قیمەت ودێهاتی و دەشتەکیە.

- سـەر دەمـێک ڕاست بێژیش تا ڕادەیەک پێشکەوتنی هەبوو، بەلام ئیـمـڕۆ بازاری نیە. پابی گەورە ئەوی بە کالایەکی دێهاتی و دەشتەکی پڕ خەرج دەزانێ. لە کاتێکا درۆ و مەرایی کالایەکی نەرم ومـەخمـەری و هەمیشە بە برەو وهەرزان و بەکەلکە.

ئێستا مارتا ناچار بوە جارێکی دیکەش ڕابێ و بچێ هەودا بادراوەکەی لە دەزگادا بسوڕێنێ. هەر لەو کاتەشدا هەودایەک لە بیرەوەری خەفەتباری لە ناخیدا

دەسوڕێ و بادەدرێ.

پاپی گەورە بە زمانی خۆی بە مارتای گوتبوو:« مادمارزێل! ئەم برایەی تۆ وەک دێهاتیان درشت و بێ ئەدەبە. ئەخلاقی ئەوتۆ بۆ مامۆستایەکی پۆلی نێونجی کە خێزانی هەرە دەوڵەمەند و بە شەرەفی سەر بە ئێمە کوڕەکانیان بۆ خوێندن دەنێرنە لای وی، بۆ ئێمە قبول ناکرێ.» و چونکە دەبێ دانی پێدا بنێین کە پاپی گەورە خۆی نە درشت بوو نە بێ ئەدەب و دەیزانی کە دۆن بنەدیتو لە هەموو کارەکانی کە پێوەندیان بەوەوە هەبوو ئەخلاقەن پیاوێکی بە ئەدەب و بە توانایە، بە بیانووی نەساخی و پیری کۆتایی بە خزمەتی مامۆستای پیر هێنا.

لەو کاتەوە قەشە لە گەڵ خوشکی لە گوندی( ڕۆکادی مارسی) لە باخچەی بچوکی خۆی خانە نشین ببوو. تەنیا خەریکی موتالای شوێنەوارە کلاسیکیەکان دەبوو کە حەزی لێدەکردن. لە گەڵ شێعر و گوڵکاری و هەرچی هۆی جوانی جیهانە و بە پێڕەوی لە « مۆدە» گۆڕانی بە سەر دا نایە، خۆی خەریک دەکرد.

ڕەنگە کلاسیکیەکان لە بەر ئەوە کە ئەو لە کار و باری سیاسی بێگانەیە، بۆ تێگەیشتنی کارەساتەکانی جیهان ئەوەندەیان یارمەتی نەداوە، بەڵام لە جیاتیان فێریان کردوە کە بە هەموو توانا لە شکڵی هەرە تازەی ژیانی دەور و بەری خۆی بێزار بێت. دۆن بنە دیتو کە پیاوێکی ئارام و هێدی و دڵپاک و دوور لە هەرا و کێشەی بێجێیە، لە کن بێگانان جگە لە ئەمەگداری بۆ چەند مامۆستای یونانی و ڕۆمی و هۆگری دێهاتیی بە وڵاتی خۆی و بە وەرزێرە هەژارەکان، هەستێکی دیکە دەر نابڕێت. لە گەڵ ئەوەش لە پشتی ئەم ڕوو تەنکی دێهاتی، بیر ئازادییەکی تایبەتی کە سەبارەت بە هەڵکەوتی کۆمەلایەتی ئەو ئازایانەیە، لە گەڵ دڵپاکییەکی گەورە شاردراوەتەوە. بەڵام ئەم دڵپاکییە بۆ پینە کردنی پێداگرتن لە سەر بیر و ڕای خۆی، لە ڕوانگەی هێندێ قەشەی کلیساکانی جیرانی کە ئەو هێندێ جار بەرەو ڕوویان ڕک و ڕاست قسان دەکات، بەس نیە. ناچار گەیوەتە بار و دۆخێکی ئەو تۆ کە مەیدانی تێکۆشانی ژیانی لە مەودای نێوان باخچە و کتێبخانە دا تەنگە بەر بۆتەوە. ئاخرەکەی تەواوی خزم و کەسی لێی تەکیونەوە. ئەو خزمانەی کە بە شێوەی قەدیم بابەڵباب خاوەنی خانو بەرە و زەوی و زار بوون و بەڵام پاش ماوەیەک ڕۆژگاری خۆشتر، ئێستا بە هۆی بوومە لەرزە و شەڕی جیهانییەوە فەوتاون و نابوت بوون. بەڵێ خزمەکانی ، ئەویان بە کەسێک نە زانیوە کە چاوەڕوان بوون لە بەرانبەر کار بە دەستانی دەوڵەتیدا پشتیوانیان لێبکات، هەستێکی تاڵ و نا

لەباریان لە ئاست وی هەیە. بەڵێ ئەگەر ئەو ئەخلاقێکی هێدیتر و کەمتر سەر کێشی هەبایە، خۆی لە ژیانی گۆشە گیریدا قەتیس نەکرد بایە، لەوانە بوو لەم سەردەمەی خۆ بە خۆییدا کە بە بێ پشتیوان و پاڵپشتی شوێنە بەرزەکان، تەنیا کار کردنی شەرافەتمەندانە فایدەی نیە، دەیتوانی ببێتە پشتیوانیان. کە وا بوو چونکە جگە لە خوشکی لە هەموو ئاڵقەیەکی نیزیکی بێبەش بوە، هەموو محەبەت و خۆشەویستی خستۆتە سەر چەند لاوێک کە ڕۆژێک شاگردی وی بوون و هەمیشە بە دڵسۆزییەکی باوکانە هەوڵ دەدات تا بکەوێتە نێو ڕەوەندی ئاڵو گۆڕی بە پێچ و پەنا و ناتەبای ژیانی ئەوان.

مارتا چەند کەسی لە وان داوەت کردوە تا ئیمڕۆ لە (ڕۆگا) بێنە شوێنی گۆشەگیریی مامۆستای پێشووی خۆیان و سەرەتای حەفتا و شەشەمین ساڵی تەمەنیش جێژن بگرن. تکاشی لێکردوون تا هاوڕێکانی دیکەشیان کە ئەو ناو ونیشانیان نازانێ لە گەڵ خۆیان بێنن. دڵە خورپەشیەتی کە نەوەک خواردنەوەی تەواوی ئامادە نەکرد بێ و نە کا ئەم دوازدە لیوانەی سەر مێز بەش نەکات.

مارتا چنینەکە درێژە پێدە دا و لە گەڵ هاتوو چۆی مەکۆ، ئەو جادە و کوێرە ڕێیانەی کە دەبێ میوانی پێدا بێن، چاو لێدەکات. لە لای ڕاستە ڕێگای ئاسنە و شەقامی میللییە کە لە شارەوە دێت. لای چەپە جادەی ئەیالەتییە لە چیاوە دێتە خوار. بەرانبەریش دەشتی سەوز و پانی « فۆچینۆ»یە کە جۆگەی ئاو و ڕیزە داری تەوریزی خەتیان کردوە. لە دەشتی « فۆچینۆ» ڕاست و چەپ، شار و گوند، خاوەن شەریکە و وەرزێرەکان دەگەنە یەک و بەرانبەری یەک دەوەستن.

دۆن بنەدیتو دەڵێ:

– لاوەکان بۆیە وەدرنگی کەوتون کە ئوتوبوسی پۆست و قەتارەکان لە کاتی خۆدا ناگەن. چونکە توریستی بێگانە ئیتر نایەنە وڵاتی ئێمە، بەرنامە و سەعات لە گۆڕێدا نیە. دیارە دەزانی کە تەنیا بۆ ئیتالیە فەقیرەکان نیە.

لەو لای « ڕوکادی مارسی» زەوی وردە وردە بۆ لای قوڵایی بەرینی گۆلی پێشووی فۆچینۆ کە ئێستا وشک بوە و بۆتە موڵکی شازادەیەک بە ناوی«تورلونیا» دێتە خوارێ. لە دەوری ئەم دەشتە پان و بەرینەی شکڵ سەدەفی کە پڕە لە کشت و کاڵی گەنم و چەوەندەری سەوز، ئاڵقەیەکی گەورە لە تەپۆلکی پەڵە پەڵە سەری هەڵداوە و لە سەر نیزیکەی هەموویان گوندێکی بچوک بە قەڵایەکی کۆن و دوکەڵاوی و بە بورج و دیوار دەبینرێت. لە شوێنێک کۆی خانوەکان وەک هێشوە ترێ دیارن.

لە شـوێنێکی تر تەنیـا وەک خـەتی دیواری درێژ دەبینرێن. لە بن گـردێکی دیکە خـانووی قـەدیمی وەک ئەشکەوت بە سـای بناری گـردەکـە دروست کـراون. ئاواییـەکانی بە ناوی قەدیمی و بە داستـانی کەونارایی. بەڵام بەشی زۆریان لە بوومە لەرزەی دوایدا وێران بوون و پاشان بە شکڵێکی خەراب دروست کراونەوە.

لە پشت گـردەکـانەوە زنجیـرە چیـای بەرز کـە لە بەر لافـاو دادڕ دادڕ بوون، سەریان قوت کردۆتەوە. بناری چیاکان بە لای هێڵی ئاسندا وشک و برنگ و وەک ئێسکی مردوان ڕووت و قووتە. بەڵام بە لای« پسکا سرۆلی» دا سەوز و پڕ لە دار .

دەنگە دەنگێکی نادیار کە کاتی ڕۆژ ئاوا لە لای « فۆچینۆ» وە بۆ لای « ڕۆکا» دێت، جگە لە هەستی دوور کەوتەیی و تەریک بوونەوەی ئەم گوندە بچوکە، چیتری لێ شین نابێ. لە بەر دەرگای خانوەکان کە ئێستا تارێک داهاتوە، ژنی ڕەشپۆش و پیـر و چڵکن دەر دەکـەون. ژنانی تر کە تەشـتی مـسـیـان لە بـان سـەریە و لـچکەی خۆیان لە ژێر چەنە گرێداوە، بە کاوە خۆ لە کانی دەگەڕێنەوە. ژنێکی ڕەشپۆشی دێهاتی کە کێژۆڵێکی زەرد پۆش بە دوای خـۆدا ڕادەکێشـێ بە مەیداندا تێدەپەڕێ و دەچێتە ژووری کلیسـاوە. جوتیـارێکی پیریش کە سـواری کەر بوە و بە پانیە لێی دەدا، بە وێدا ڕادەبڕێ. پاشان کوڵانەکان چۆل دەبن و « ڕۆکا » دیسان وەک دیمەنی گوندێکی سووتاو و چۆل دێتە بەر چاو. لەم ماوەیەدا هـاتوو چۆ بە شەقامی میلیدا زۆر تر بوە. کامیۆنی ئەرتەشی بە دوای یەکدا لە هەرەکەت دان. مارتا دەڵێ:

– من نازانم بۆ چی باوکی پیـرۆز لە بارەی ئەم شـەڕە تازەیەی کە وا لە ئەفریقا ئامـادە دەکرێ، وشـەیەکی ڕک و ڕاست نابێـژێ.؟ ئەمڕۆ بەیانی کە لە نوێژی مەسح دەهاتمەوە کنچـتـای ژنی نانکەر پێـشی پێگرتم. کـوڕەکـەیان بردۆتە سـەر بازی، دەیویست بزانێ کە پاپی گەورە سەبارەت بەم شەڕە دەڵێ چی.

دۆن بنە دیتو لە وەڵامدا دەڵێ:

– خوشکی خۆشە ویستم، باوکی پیرۆز باش دەزانێ کە ئاخافتن بە زاری پڕەوە زیان بە لەشساخی دەگەیەنێ. ( مـەبەستی ئـەوەیە کە زاری باوکی پیرۆزیان دروە ئەو ناتوانێ ئیراد بگرێ و قسە بکات )

پیرە مێرد لە پڕ بە بیستنی هەرا هوریای لای جادەی ئەیالەتی ڕاست دەبێتەوە بەڵام زانینـی هۆی ئەم هەرا هەرایەش ئەوەندە ئاسـان نیە. دیارە هـەورێکی بارێک لە تەپ و تۆز لە جـادە هـەسـتـاوە و ڕەز و باخـەکـانی داگـرتوە. لە نێـو ئەم هەورە دا، مێگەلە مەڕێک بە شەپۆلی ڕەنگ زەرد دێتە پێش. کەرێکیش لە دوای مێگەل دەبینرێ

کە چیغێکی حەسیری و جەواڵ وستڵی شیر دۆشین و قالبی پەنیر ساز کردنیان لێ بار کردوە. بە دوای کەرەکە دا شـوان دێتە پێش کـە سـەگی سپی گەورە دەوریان گرتوە. دواتر، ترومبیلێکی بچوکی سەر داپۆشراو کە دوو کەسی سوار بوون دێت و دەنگی شوان دەدەن کە: « ڕێگا بدە و لای چەپی جادە چۆل کە.»

بەڵام بێفایدەیە. شوان وەڵام ناداتەوە و بە ئاماژە و دەست وا نیشـان دەدا کە نابیسێ و کەرە. بەڵام کابرای کەڕیش دەبێ بزانێ کە ترومبیل ناتوانێ هەمیشە بە دوای مـێگەلدا بڕوا. بۆیە لاوەکـان هەرا و هاواری خـۆیـان توند تر دەکـەن. دیارە ئەگـەر سێ گـەمـاڵی گـەورە و دڕ بە قـەڵەدەی ئـاسن و بە گـوێ بڕاوی وبە چاوی سووڕەوە دەوری شوانیـان نە گرتبایە، بە کار هێنانی زۆر بۆ ئەم دوو لاوە وەک ئاو خـواردنەوە بوو. یەک لـە لاوەکـان جلی ئەفـسـەری لە بەر دایـە. لە پشـتی فـەرمـانی ترومـبـیل خـۆ هەڵدێـنـێ و هەڕەشـە لە شـوان دەکا و بە توندی داوا دەکـا ڕێگا چۆل بکات. شوان لە نێو گەماڵەکانیدا بێ ئەوەی وەسەر خۆ بێنێ هەر وا نیشان دەدا کە تێنـاگـات و باشـتـرە وازی لێ بێنن. ئەم بەزمـە مـاوەیـەک درێژە دەکـێـشـێ. ئەو دەم قەشە بە نێو تەپ و تۆز دا بۆ لای مێگەلە مەڕ دەچێ و سڵاوێکی گەرم لە شوان و لە دوو لاوەکە دەکات کە سواری ترومبیلن.

قەشەی پیـر لاوەکان بە خێر دێنـێ و پاشان بە زمـانێکی خۆش بە شوان دەڵێ: « ئەوانە دۆستی من و بۆ سەر دانی من هاتوون.»

شوان کـورج ئاهەنگی بزووتنەوەی دەگۆڕێ و دەڵێ:« بۆ چی ئەتان گوت دەچینە سـەر دانی دۆن بنە دیتو.؟» پاشـان دەنگی گـەمـاڵەکـان دەدا ومـێگەلە مەڕ خـێـرا دەکەوێتە لای ڕاستە و ڕێگا بۆ ترومبیل دەکرێتەوە.

قەشە ڕوو دەکاتە خوشکی کە ئەویش بۆ پێشوازی هاتوە و بۆی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ :« ئەو ئـاغـایە هەر چەنـدە لیـبـاسـی نیـزامی لە بـەر دایە، ئەندامی حـیـزبی دەوڵەتی نیە. بەڵکوو ڕک و ڕاست « کۆنچیتینۆ ڕاگۆ »ی خۆشە ویستی منە. ئەوەی دیکەش کـە وەک قـەشـەیـەک دەچێ کە لە ڕەوشـتی کـەشیشـان هـاتبێتە دەر، ئەوە دوکـتـور« تۆنزیۆ سـاکـا» یە حـەکیـمی ڕەسـمیـە. ئەوانە هەر تکیـان لە بنەوە کـوڕی باشن.

بەمحاڵەش ئەم دوو لاوە هێشتا سەر سوڕ مانی کەڕ و لاڵی مەسڵەحەتی شوان بەری نەداون. کنچێتینۆ دەپرسێ:

– ئەم کابرا هیچ و پوچە ناوی چیە ؟

قەشە بە پێکەنینەوە دەڵێ:

– من گەیشتومە تەمەنی ٧٥ساڵی بێ ئەوەی قەت جاسوسیم کرد بێ. ئێستاش بۆ دەستپێکی ئەم کارە درنگ بوە. لە کاتێکا باسکی هەر تک شاگردی قەدیمی خۆی گرتوە، بۆ لای باخ دەچنە پێش.

بەڵام شوانیش لە هەقانیەتی خۆی ئەوەندە دڵنیایە کە هەر وا هاوار دەکا: بۆ چی نەتانگوت دەچنە مالی دۆن بنەدیتو.؟

مارتا بۆ ئەوەی سەرنجی لاوەکان لە سەر شوان وەرگێڕێ پێیان دەڵێ: « فەرموون دانیشن و پشوێک بدەن.» پاشان لە کاتێکا دوو بارە دەچێتەوە پشتی دەزگای جۆلایی و دەڵێ: « ئەوانیدیکەش بەم زوانە دەگەنێ .»

بەڵام ڕووداوی کەڕ و لاڵی مەسڵەحەتی شوان وەها کۆنچینتۆی سەر سام کردوە کە ناتوانێ تووڕەش بێ. دۆن بنە دیتو هەر چەند پێی باشتر بوو لەم ڕوونکردنەوە واز بێنێ بەڵام دەڵێ :

– خۆشە ویستم! سەر سوڕ مانی تۆ فایدەی نیە. پێویست ناکا منێکی کە کارم بە سیاسەت نیە بۆت ڕوونکەمەوە کە لیباسی نیزامی تۆ بۆ وەرزێڕانی فەقیر و هەژار و بۆ شوانان چ مانایەکی هەیە. ئەوانە ئەگەر ئەفسەرێکی ئەرتەشی لە جادەیەکی چۆل دەبینن، تەنیا بە وەندە واز دێنن کە خۆیان کەڕ و لاڵ بکەن. تۆ دەبێ فرە مەمنون بی کە لەوەش خەراپتر ناکەن. ئەو ڕۆژە کە گوێچکە کانی کەڕ ی مەسڵەحەتی بکرێنەوە و زمانەکانی لاڵی مەسڵەحەتی وەزمان بێن، ئەو ڕۆژە سەرەتای دەمێکی فرە دەردەدار دەبێ کە من ئاواتم ئەوەیە کە بەشی تۆی تێدا نەبێ.

کنچتینۆ تەماشایەکی دوکتور ساکا دەکا و وەک بخوازێ پێی بلێ لەو قسانە زیاتر چاوەڕوانی شتێکی دیکەم لە قەشە نەدەکرد و سەر کۆنەشی بکات کە بۆ چی لە گەڵ خۆی بۆ ئەم داوەتەی هێناوە. بەڵام دوکتور دەیەوێ مەسەلەکە پوش بە سەر بکات. و دەڵێ :

– مامۆستای خۆشە ویست! ئێمە بۆیە هاتووینە شوێنی گۆشە نشینی تۆ تا پێت بێژین تۆ بە تەنیا نی و ئێمە وەلامان نە ناوی. تەواوی ئەو کەسانەش کە تۆ ڕاتهێناون...

دۆن بنەدیتو قسەکەی دەبڕێ و لەم کاتە دا کە ئاهەنگی دەنگی پڕە لە مەحەبەت و خۆشەویستی نیهانی دەڵێ :-DEUS MIHI HARS OTIA FECI)

سوپاس بۆ خودا کە ئەم دەرفەتەی بۆ من پێکهێناوە) دیداری ئێوە بە ڕاستی بۆ من فرە بە تام و چێژە و دەبێتە هۆی ئەوە کە من زۆر لە نامرادییەکانم لە بیربەرمەوە. ئێستا دانیشن و بحەسێنەوە. نەک لێرە لە سەر زەوی. ئەوە کە گیا نیە. ئەمەیان پنگێکی سەحراییە، ئەویتریان ڕیحانی کێوییە و تڵخونە ئەوەی خوارەوە تر جەعفەری و گژنیژە. ئەمەی قەراخیان نەعنەیە. ئەوانە گشتیان سەوزی قەدیمی و باش و ساخن.

هەر سێکیان لە سەر نیو تەختێکی بەردی مەڕ مەڕ لە ژێر دارێکی سەوز و جوانی زەیتون دادەنیشن. پیرە مێردی ئێمە لە نێوان ئەم دوو لاوە دانیشتوە. تا ماوەیەکی زۆر لەم سەفا و ئارامییەی باخ، جگە لە دەنگی دەزگای جۆلایی مارتا و دەنگی قاچی و مەکۆ و شانەی دمزگا کە کارێکی شەریف و قەدیمییە، دەنگی دیکە نایە. پیرە مێرد دەپرسێ:

– ئێستا لویجی کاند لورو چدەکات؟ لەو کاتەوە هیچ ئاگام لێ نیە.

دوکتور نونزیۆ ساکا دەڵێ:

– ئەو پێش دوو ساڵ لە لیبی بە کەوتوویی مرد. بۆ من وەک برایەکم لە کیس چوو بێت وابوو. پاش تەواو کردنی خوێندنی موهەندیسی ماوەیەک لە سەر حیسابی خۆی کاری کرد و پاشان سێ ساڵ بێکار مایەوە. ناچار قبوڵی کرد بوو وەک کارمەندی ئیدارەي موهەندیسی بچێتە لیبی. بۆ بەڕێچوونی ژیان ئامادە بوو بچێتە هەموو شوێنێک. دوو حەفتە پێش گەڕانەوەی کە دەیویست ئامۆزای من بخوازێ کۆچی دوایی کرد. بنە ماڵەی «کاند لورو» کە بە خوێنی جەرگ هۆی خوێندنیان بۆ ئامادە کرد بوو، ئێستا بێکەس و بێ نانهێنەر ماونەوە.

پیرە مێرد بێدەنگ دەبێ و دوو بارە دەپرسێ:

– باتیستا لۆباتۆ چدەکات؟

– کاری ئەو یاری (سکوپونە) کەس دەرۆستی نایە.

– ئاخر بە ڕۆژ چدەکات؟

– بەیانیان دەنوێ. کە بۆنی کرد دایکی نانی ساز کردوە، هەڵدەستێ. پاشان لە ماڵێ دەر دەگەوێ و بە دوای (سکوپون) دا دەگەڕێ. کاتێ هەست دەکا نان ئامادەیە دەگەڕێتەوە. پاشان دوو بارە بە دوای یاریدا لە ماڵ وەدەر دەکەوێ.

پیرە مێرد دەپرسێ: «کە وابوو ئەو قەت کار ناکات»؟

– یەکشەمۆیان بیلیارد یاری دەکا.

پیرە مێرد سەر ڕادەوەشێنێ و بێدەنگ دەبێ. دوو بارە دەپرسێ :
– ئانتونیۆ سپرانتز چدەکا ؟
ساکا لە وەڵامدا دەڵێ:
– ڕەنگە وەک تۆش ئاگا دار بی ئەو پاش وەر گرتنی دیپلۆمی نێونجی. درێژەی بە خوێندن نەدا. تا ئەم دواییانە لە ڕێگای داهاتێکی کەمی دوکانی بزمار فرۆشی کە باوکی بۆی بە جێ هێشتبوو، ژیانێکی نەمر نەژی هەبوو. دەساڵی تەواو لە بەرانبەر ویستی سفتەکان و قەرزداری و ئیجرائیەی جەریمەکانی ناڕاستی لە بەر ڕۆنی بۆگەن و ساردینی ڕزیو وهەرشتەی کەپەک لێدراو و تەرازوی لاسەنگ خۆی ڕاگرت. زۆری پێنەچوو ڕایگەیاند کە نابوت بوە. ئێستا لە ترسی قەرزداران کە خۆیان لێ ماتکردوە کەوڵی بکەن، لە ماڵێ نایەتە دەر. بەڵام ئێستا پتر لە ژاندارمان دەترسێ.
– کارلۆ کایونە چدەکات ؟
– ئەو بە نەخۆشی سیل مرد. ژنێک و دوو منداڵی لە پاش بە جێ ماون.
– ژنەکەی لانی کەم شتێکی هەیە پێی بژی. نا ؟
کنچتینۆ وەڵام دەداتەوە :
– نا، بەڵام جوانە.
پیرە مێرد بێدەنگ دەبێ. ئێستا ئیتر کارگەی جۆڵایی مارتاش لە کار کەوتوە. سێبەری ڕۆژ ئاوا بە سەر دەشتی فۆچینۆ دا دەکشێ. دۆن بنە دیتۆ دوو بارە دەپرسێ:
– باشە. بلێ بزانم« وەردونە» چی بە سەر هاتوە ؟ ماوەیەکە لێی بێخەبەرم .
– ئەو ئێستا لە ئیدارەی ماڵیاتەکان لە بەخشی خۆیدا کارمەندێکی گچکەیە. زۆری هەوڵدا لە ڕێگای سیاسەتەوە بە شتێک بگا. کاتێ تازە لە دەبیرستان هاتبوە دەر دەستیکرد بە هاتوو چۆ بۆ مەجلیسی سۆسیالیستەکان و ساڵی ١٩٢٤ ڕەگەڵ « ئاوانتینیست» ەکان کەوت پاشان لە ئەنجومەنێکی نهێنیدا ناوی خۆی تۆمار کرد. ئاخرەکەی هەوڵیدا کە ڕەگەڵ ئێمە بکەوێ و لە ساڵی ١٩٢٧ لەم کارە دا سەر کەوت بێ ئەوەی فایدەی هەبێت. ئێستا کاری هاندان و نووسینی نامەیە بۆ کار بە دەستانی سەروو دژی ئەو کەسانە کە شانسی سەر کەوتنیان لەو زیاترە. بەڵام تا ئێستا لە پشتی دەفتەری ئیدارەی ماڵیاتەکان نەبزووتوە. ئاخرەکەی قین و ئێرەیی وایان لێکردوە کە وەک ناوەکەی قورس و ناڵە بارە.

- بەڵام باوکی پیاوێکی فەقیر نیە، چما ناتوانێ یارمەتی بکات ؟
کنچتینۆ لە وەڵامدا دەڵێ:
- باوکی مردوە و هەر چی بوویەتی  بە سەر نۆ منداڵ. شەش کیژ و سێ کوڕ دابەشکراوە. ئەو شەش کیژانە یەک لە یەکێ ناحەز ترن و هەر بۆیە خەڵک نازناوی « شەش عەنتەر» یان پێداون.
لێرە دا ساکا لە کنچتینۆ دەپرسێ:
- بە ڕاستی( پێترۆ سپینا چی) دیسانیش هەر کەلانتەرە.؟
دۆن بنە دیتو بە سەر سوڕ مانەوە دەپرسێ:
- چما ئەو ئیتر پارێزەر نیە ؟
کنچتینۆ لە وەڵامدا دەڵێ :
- ئەو هێشتا ناوی پارێزەری لە سەرە بەڵام چونکە داوا و داواکارێک لە گۆڕێدا نەبوو، هەوڵی دا تا بوو بە کەلانتەری« ئۆرتو نادی مارسی» کە ناوچەیەکی بچوکە و هیچ دزی و مزیيەک نیە. لە لایەکی تریش لە بەر ئەوەی کە ئێستا کەلانتەری بەخشە ئیتر مافی پارێزەری نیە و ناتوانێ موشتەری بۆ خۆ پەیدا بکات. لە گەڵ هەوەڵین ڕووداوی خەرابی ئیداری کە ببێتە هۆی لێ ستاندنەوەی کارەکەی، بەرەڵای کۆڵانان دەبێ.
دۆن بنە دیتو دەپرسێ:
- باشە، بێژە بزانم ئێستا« دێ پرە تورو» چدەکات.؟
ساکا لە وەڵامدا دەڵێ :
- من هەر ئەوەدە دەزانم کە دەورەی شەش مانگەی لە زانستگا خوێندوە و پاشان چۆتە بنیاتی ڕێگای ئاسن. لام وایە هێشتا کارمەندی ڕێگای ئاسنی ڕۆمە.
کنچتینۆ لە ڕاستکردنەوەی پەیڤی ویدا دەڵێ:
- چەند ساڵێکە لە ڕێگای ئاسن وەدەریان ناوە. من حاشا ناکەم کە « دێ پرە تورو» باشترین شاگرد بوو لە زمانی لاتیندا. بەڵام بە بڕوای من ئەو هەمیشە بیرێکی ئاڵۆز و نیوە سۆسیالیستی هەبوو. لە گوندەکەی خۆی لە گەڵ ژنێک نێوانی خۆش کرد کە بەرگ دروو بوو ، جگە لە مەکینەی دروون هیچی دیکەی شک نەدەبرد. ژنەکە زوو تێگەیشت لە گەڵ کێ پێوە بوە، دیارە بڕیاری دا منداڵێکی لێ پێک بێنێ. کابرا ناچار بوو بیهێنێ. لەو کاتەوە بەرگدروو هەموو ساڵێ منداڵێکی تەحویل دەدا. پاش چوار ساڵ ئێستا ئەم دوو کەسە بەو منداڵەوە کە پێشتر هەیان

بوو، پێنج منداڵیان هەیە. لەو ماوەیەدا لە بەر بیری گومانلێکراوی و دژی میللی لە ڕێگای ئاسن دەریان کــرد. کــەســــێکیش لە ڕێگای ئـاسن دەر بکرێ لە هیچ ئیدارەیەکی دەوڵەتی کاری نادەنێ. بنیاتە تایبەتیەکانیش بۆ پەیدا کردنی کادری خزمەت دەبێ سەر لە دەفتەری کار دۆزینەوە بدات. ئەو دەفتەرانەش بە ڕەسمی پێیان گوتراوە کە کار نەدەن بەو کەسانە کە لە باری سیاسییەوە گومانیان لێدەکرێت. خەریکبوونی پیشەی دەستیش بۆ شان و شەوکەتی خۆی بە عەیب دەزانێ. چونکە مرۆ ناچێ پاش دە ساڵ خوێندن بچێ ببێتە دارتاش. بەم جۆرە ئێستا ئەو بێکاری دایمییە. لەو لاشەوە ژنی بەرگدروو هەمیشە یا سکپڕە و یا شیر دەدا بە ئاخرین منداڵی. هەر بۆیەش ناتوانی موشتەری بەرگ دروون پەیدا بکات. زۆر جار لە ماڵی ئەم چارە ڕەشانە نان وەگیر ناکەوێ. ئەو دەم کاری لەوە باشتری وەگیر ناکەوێ کە بچێ لە مەیخانە ئارەق بخواتەوە. کاتێ سەر خۆش بوو بچێتەوە ماڵ و لە گەڵ ژن و منداڵانی شەڕ بکات تا جیرانەکان بێن لێکیان بکەنەوە. ئەو دەم خەڵک دەڵێن بزانن ئەوانەی لە مەدرەسەی گەشیشان خوێندن تەواو دەکەن، چی یان لێ پەیدا دەبێ.!

دۆن بنە دیتو بە زەحمەت ڕا دەبێ. سەر و چاوی ڕەق و باریکی کە ڕەگی شینی باریکی لێ دەر کەوتوون، خەم و ڕەنجێکی قوڵ نیشان دەدەن. چەند هەنگاوێک لە نێو باخدا دەسوڕێتەوە. پاشان بێ ئەوەی هیچ بڵێ، دێتەوە ژوور. مارتا کاری چنینی خۆی تەواو کردوە. ئیستوانەی دەزگای کە هەوداکانی پارچەی داوێنە سەر، بەتاڵ بوە. بەڵام مارتا هەر وەک پشتی ژان بکا، هەر لە سەر دەزگا دانیشتوە. پاشان دەست بەو پارچەیە دا دێنێ کە هێشتا لە بەر چاوییەتی و ڕوو دەکاتە دوو پیاوی لاو کە لە بن داری زەیتون دانیشتوون دەڵێ:

– ئەو شەمەدەیە دیاری منە بۆ دۆن بنە دیتو بە بۆنەی ساڵی لە دایکبوونی. ئەو ناوی دۆن بنە دیتو بە بێ ناز ناو، بە ڕێز و لە سەر خۆ دێنێتە زمان.

نۆنزیۆ ساکا دەڵێ:

کیژی خۆشە ویست!ڕۆژ نیە کە تۆ دیاری گەورەتر نەدەی بە برای خۆت. واتە تۆ هەموو ڕۆژێ ڕۆژێک تەمەنی خۆت بە دیاری دەدەی بە برات.

مارتا سوور هەڵدەگەڕێ و سەر ڕادەوەشێنێ. لە برای خۆێ باریکتر و باڵا بەرز ترە. بەڵام چونکە باڵای چەماوەترە لە باڵای براکەی، هەر چەندە دە ساڵ لەو بچوکترە، پیرتر دێتە بەر چاو. نێو چاوان وچاو وزاری هێشتا هاو ڕێکی خۆیان

پاراستوە. چونکە ماندوە، بە کاوە خۆ لە میوانان وە نیزیک دەکەوێ و لە ژێر داری زەیتون لە نێوانیان دادەنیشێ. پاشان نارام و هێدێ دەست بە قسان دەکات:

– ژیان وەک دیاری دەدرێ بە هەمووماں، چەندە دیارییەکی بە نرخە. دیارییەکە ئەگەر بە لەچەری و ئێرەیی بۆ خۆمانی ڕابگرین، دەفەوتێ و وشک دەبێ. بەلاّم ئەگەر لە ڕێگای خەڵکدا بەختی بکەین، زیاد دەکا و جوانیش دەبێ. لەم قسانە مەبەستم خۆم نیە کە لە پەنا براکەم دا بە بەختەوەری دەژیم و هەزار کەڕەت لەوە زیاتر کە دەبێ بێدەم و ناتوانم، وەر دەگرمەوە.

لە ئاهەنگی قسەکانیدا شتێکی وەک ئاواز هەیە، ئاوازێکی خەمهێنەر و کاردانەوەیە لە تەمەنی ڕابردوو، نیگەرانی و ورووژانێکی تایبەتی وئیرادەیەکی شەرماوی تا نەهێڵێ ئەوان وابزانن کە ئەو ژنێکی چارە ڕەشە و بە شێوەکە بۆتە قوربانی.

کنچتینۆ لە بەرچدانەوەی قسەکانی ویدا دەڵێ :

ئاخر هەر ئەوە نیە ئەگەر مرۆ هەموو شتی خۆی فیدای خەڵکی تر بکات، خۆی دەست بەتاڵ و بێبەش دەمێنێ و بەم چەشنە لەم چێژ و نیعمەتە چاو دەپۆشێ کە ژیان پێی بەخشیوە.

مارتا لە وەلاّمدا دەڵێ:

– لە ڕاستیدا ئەو نیعمەتانەی ژیان بە ئێمەی بەخشیوە بە نرخن، بەڵێ بە نرخ و سەر سوڕ هێنەر. کەسێکی دەیەوێ چێژیان لێ وەرگرێ. کەسێکی لەم ڕێگایە دا شەو ورۆژ لە هەولدایە تا لەزەتیان لێ بچێژێ، کاسێکی وا لە ڕاستیدا چێژ وەر ناگرێ، بەڵکوو بە خێرایی ئەو نیعمەتانە دەسووتێنێ و دەیانکات بە خۆڵەمێش. وای، چەند نیعمەتی سەر سوڕ هێنەر! بەلاّم ئەو کەسەی بە پێچەوانە لە بیریان دەباتەوە و خۆشی لە بیر دەباتەوە کەسێکی وا لە بەرانبەر ئەوەیدا دەیدا، هەزار ئەوەندە وەر دەگرێ و لە ئاخری تەمەنیشیدا ئەو نیعمەتەی لە سروشتی وەر گرتوە لە وجودی ئەو دا وەکوو پنجی گەورەی سووره گوڵ لە مانگی مای دا دیسان گوڵ دەکاتەوە.

نۆنزیۆ ساکا دەڵێ:

– ئەو دەمی کە ئێمە منداڵ بووین و لە سەر نیو تەختی دەبیرستان دەرسمان دەخوێند، دۆن بنەدیتو ئەو قسانەی پێدەگوتین. بەلاّم ئاخر فێرکردەکانی ئەو بە کاری چیمان هاتوە؟ ئەو فێر کردانە بۆ « باتیستا لۆ پاتۆ» و «لویچی کاندە لورو» و

« ئانتۆنیۆسپرانتزا » و « دی پره تورو » و « کارلۆ کایونه » و ئەوانیتر فایدەی چی هەبوە.؟

دۆن بنه دیتو جارێکی دیکەش دێتەوە ژوور و بەستەیەک کاغەزی زەردی بە دەستەوەیە. بە دوو شاگردی قەدیمی خۆی کە لە کن مارتا دانیشتوون دەڵێ:

– ئێوە دەبێ لە گەڵ چی پێک بگرن؟ وچەی چارە ڕەشی ئێوە لە گەڵ چی نەشێ دابنێن ؟ ڕەنگە ئێوە وەک ئەو منداڵانە بچن کە لە گۆڕە پانێکی گشتی دانیشتوون و بە دەنگی بەرز بە هاواڵەکانتان دەڵێن:« ئێمە بلوێرمان لێدا و ئێوە سەماتان نەکرد. ئێمە مەرسیەمان خوێندەوە، ئێوە نە گریان » ئاخر هیچ شتێ لە سەر ئەم جەغزە نە سوڕا کە بەڵێنیان بە ئێوە دابوو.

چاوەکانی ڕوونی قەشەی پیر کە لە هەتاوی بەرە و خۆر ئاوا شۆقیان وەر گرتوە، نورێکی پاک و ئارام دەخەنە سەر روخساری وی. هەوای دەنگی پتەو و ژمارده و خەفەت هێنەرە. هەر وەک دەچێ پیاوێک کە ماوەیەک بەدوای وەڵامی مەتەڵێکدا گەڕا بێ و نەیدۆزیبێتەوە و کەم کەم تێدەگات کە وەڵامی نیە. پاشان دەڵێ:

– ئەوە وێنەیەکی کۆنە کە پێش پازدە ساڵ کاتێ دەمانویست لێک جیا بینەوە گیراوە. ئەوەش وەرەقەی ئاخرین دەقی ئیتالیاییە کە وەک تەکلیف بە ئێوەم دابوو. سەر خەتی دەقەکە ئاوا بوو:« بە ڕاستی بێژن گەرەکتانە لە ژیاندا چی بن وچ مانایەک بۆ ژیان قایلن ؟ من ئێستا سەر پێیی بە لاپەڕەکانی دەقی ئێوە و « کایونە » و « دی پرەتورو » و «کاندە لورو » و «سپیرانتزا » و « لوپاتو » و هاواڤالانی دیکەتاندا هاتمەوە. بەڵێ بە شەرمەوە لای ئێوە دان پێدا دەنێم کە هیچیان لێ تێناگەم. تەنانەت وردە وردە دێ لە خۆم دەپرسم کە ئەوە دێنێ بۆ ڕوونکردنەوەی مانای ئەوانە داوای ڕوونکردنەوە بکەم ؟ بە قەولی ئەو کابرای فەرەنسەیی کە لە سەدەی دواییدا ژیاوە و وەک ئێوە لە گەنجیەتی دا لە مەدرەسەیەکی ئاینی تەربیەت کراوە لەوانەیە ڕاستییەکی خەفەت هێنەر بێ. بەڵێ دۆستە خۆشەویستەکان، ڕەنگە ئەو ڕوونکردنەوە خەمهێنەر بێت. ئێستا دۆن بنە دیتو دەنگی گیراوە. لە کاتی ئاخافتندا گومانێکی تایبەتی لە خۆ نیشان دەدا . دەڵێی لە سەرەتاوە لە دڵدا قسەکانی خۆی گوێ داوەتێ، دەڵێی موفەتیشی لە ناخی خۆیدا هەیە و یا حاڵەتێکی نزیک بینی هەیە ودەیەوێ بە نێو هێندێ شتی نا دیار دا تێپەڕێ و دەترسێ زیان بگەیێنێ، بەڵام نەک بە شەخسی خۆی، بەڵکوو بە شتەکان.

دۆن بنە دیتـۆ لەو پەڕە زەردانەی کـە لە دەسـتی دان هێندێکیـان دەکـاتەوە و دەڵێ :

ــــلەم جـۆرە نووسـینانە دەبێ هێندێ شت وەر گـری و هێندێکیش فـڕێ بدەی. هـەموویان بە شێوەی کاردۆچی ١ و پاسکۆلی ٢ و دانونزیو ٣ پڕن لە وشـەی بەتاڵ و زیادی. لەوە زیاتر سـاکاری تایبـەتی شـاگردانی پۆلی ناوەنجی کـە بە دەسـتی کـەشـیـشـان ئیدارە دەکـرێ بەر چـاو دەکەوێ. لـە وانە دا ئارەزووی گـەنجـایەتی و ڕەنگدانەوەی قـەراردادی بە هـەڵاو بگری تەرکی دوژمنایەتی کە هێشـتا مـەرەکەبی ئیـمزای وشک نـە بووبێتـەوە، دەبینرێ. بەڵام لە نێو تەواوی ئەم مـەتڵـەبانە ولە پشت پەردەی فـیزی ئەدەبی وشـتی دەستکردی زیادی و ئیحسـاسـاتی ڕۆژ دا، هـەست بە هـەبوونی شـتێکی بنچینـەیی دەکرا و ئێسـتاش دەکرێ کە پێوەندی بـە ئێوە و وچەی ئێوە وە هـەیە. شـتێکی کە لە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەکان و چاو پێکەوتنی بابەتی کە من بە گـوێرەی ئەرک چ کـاتی دەرس گـوتن و چە کـاتی وەرزش لە بـارەی یەک یەکی ئێوە و لە بارەی کۆی ئێوە وەک یەک دەسـتـە لە مـاوەی چەند سـاڵدا ئەنجـامم داوە، ڕوون بۆتەوە. بەڵێ کاتێکی ئێـوە پاشـان چوونە نێو ژیانی کۆمـەڵایەتی ئەم شتە نەک هـەر پەرەی نەگرتوە، بەڵکو لاشی داوە و کـەوتۆتە ژێر کۆیلـەتی و فـەرمـانبـەرداری و خـەراپ و دزێو بـوە و ورد و تێکشکاوە. ئێوە ئێسـتا تەمەنتان لە نێوان سی و دوو و سی و چوار سـاڵ دایە. بەڵام هـەر لە ئێسـتـاوە وە ک ئەو پیرە مـێردانە دەچـن کـە خۆرەی داتەپاوی ئەوانی خوارد بێت. دیارە ڕووی قسەکانم لە گەڵ باشـترینی ئێوە، واتە لە گەڵ ئەو کەسانەیە ئەوەندە بە هۆشن کە ڕوخانی خۆیان تێبگەن.

کنچێتینۆ قسەکانی وی دەبڕێ و دەڵێ:

– دۆن بنە دیتۆ ی خۆشە ویست! مەدرەسە کە دەشتی ژیان نیە. لە مەدرەسە دا بە خـەون و خـەیـاڵ ڕادەبوێرن بەڵام لە ژیاندا پێـویسـتـە خـۆت لە گـەڵ دەور و بەر ڕێکخـەی. ئێمـە لە مـەیدانی ژیاندا خـۆمـان بەرەوڕوی واقعیـەتێکی قـەدیمتر لە خۆ دەبینـین کـە دەبێ لە بەرانبـەر ئەو دا سـەر دانوێنین. مـرۆڤ نابێتـە ئەوە کـە خـۆی

---

١– کاردۆچی(١٨٨٥–١٩٠٧)شـاعیر و ڕەخنە گری ئیتالیایی کە دژی ڕومانتیزم ڕابەری بەڵام خۆشی پتر فورمی پێ گرنک بوو.

٢–پاسکۆلی(١٨٥٥–١٩١٢) شـاعیری ئیتالیایی و دانەری شیعری بچوک کە لە ڕوانگەی خەیاڵ و وشەوە زۆر جوانن

٣– دانۆنزیۆ(١٨٣٦–١٩٣٨)نووسـەری ئیتـالیایی و دانەری ڕۆمانەکانی بە نرخ، لە شەڕی گەورەدا بەشێکی شانازانەی هەبوە. وەرگێر م.ق

دهخوازێ ببێتێ.

نۆنزیۆ ساکا له ڕوونکردنهوهی قسهکانی ویدا دهڵێ:

– ئهگـهر ئهو خۆ ڕێکخستنه له گهڵ دهور و بهر به هۆی داب و شـوێنی تازه و جل و بهرگی یهکسان سـهر بگرێ، ئهو دهم هـهول دهدهن که شهخسی خۆو کۆمهڵانی خهڵکیش قانیع بکهن که گۆڕانکاری پێکهاتوه.

کنچێتینۆ ڕادهبێ و کـهمێ له باخدا دهخولێتهوه تا پێشی ئهم باسـه ی گرتبێت. به سهر ڕهفیقهکهیدا دهگوڕێنێ و دهڵێ :

–تۆ دۆسـتێکی فـره ئازیزی، بهڵام ناهومـێدێکی زۆر پیـسی که بڕوات بـه سـهر کهوتن نیه.

دۆن بنه دیتو که پاڵی وهدارێکی سهروو داوه بێدهنگ دهبێ. نونزیۆ ساکا له پهنا مـارتا ماوهتهوه و هـهول دهدا تا پاسـهکه بۆ مهسـهلهیهکی بێ ژانه سـهر بهرێت. بۆیه به دۆن بنه دیتو دهڵێ:

– لام وایه ئاخــرین دهرســـێکی پێـــتگوتین له بارهی تـراژیدی یـونان بـوو. چ شیکردنهوهیهکی له بیرنهکراوت ئهنجام دهدا.

دۆن بنه دیتو قسهکهی دهبڕێ و دڵێ:

له گهڵ ئهوهش نه خوێندنی تراژیدی یونان و نه باس و شیگردنهوهی من لهمباره وه، هیـچیان به کـاری ئێـوه نههـاتن. جگه لهوه نه تـانتوانیـوه ئهو تراژیدییه ڕهشـهی که خـهریکی ژێر و ژوور کردنی ئێـوه بوه بێزانن و بـهر بهرهکـانی بکهن. ئهوه که له سـهر دهمی تازه دا مـرۆڤ بتـوانێ تهنیـا له گـهڵ « دڕام» ه کانـی تێکهڵ بێ و نهک له گهڵ« تراژیدییهکـان» درۆیهکی بێشـهرمانهیه کـه پێـویسـته تهنیـا به ڕووداوه نووسـی فریو دهر و ڕۆژنامـه نووسهکانی بسـپێرین. کاتێکی هـهر ئێسـتا کنچـێتینۆ ئیعـترافی کـرد که مـرۆڤ ناتوانێ ببێته ئهو شـته که خۆی دهیـخوازێ، بێ ئهوهی خـۆی بزانێ ڕک و ڕاست شیـرهی تراژیدی تازهی ڕونکردهوه. بێگومان قهزا و قـهدهری کهونارای یونانیـهکان، واته « ئانانکه» یـا « نمزیس » وه دوای ئێـمـه نهکهوتوون بهڵام ئاخـر ئهو چاره نووسـه تازه و ئهم قـهزا و قـهدهره شـووم و تازه پهیدا بووهی کـه نهیهێشـتوه ئێـوه ببنه ئهوه کـه خۆتان دهتـانویست، کـامـهیه ؟ ئهو هێـزه دڵڕهشـهی که له مـاوهی پازده سـاڵی دواییـدا، واته له زهمانی گرتنی فیـوم ٤ تا داگیر کردنی کارخـانهکان و

٤– ئانانکه و نمزیس خودای جۆر به جۆری یونانی بوون. دهڵێن نمزیس خودای تۆڵه و داد بوه

٥– فیوم : لهنگهر گایهکی یوگوسلاوی یه که له شـهڕی دوومـی دنیا گردا ئیتالیا گرتوویهتی وهر گێر م. ق.

لە زەمانی دابەزینی بورسەکانی کار و تا کاتی پاکردنەوەی دەزگای فاشیزم لە ساڵی ١٩١٩ وچەی ئێوەی بە شکان مەحکووم کردوە، کامەیە؟ و ئەمە کام هێزە لە ئێوە کە کاتۆلیک بوون، لە سەرەتاوە ناسیۆنالیست، پاشان سۆسیالیست، لە دوایە کئۆپراتیویست(لایەنگری هەرەوەزییەکانی کۆمەڵایەتی) لە ئاخریشدا لە کاتی ئێستا دا- ئەگەر بەڵگە و نیشانە بە هەڵەیان نە بردبم - دوو بارە ناسیۆنالیستی دروست کردوە. ئەوە کام شەیتانی تازە پەیدا بووە کە هیچ شتێ ناتوانێ نەرمی بکات؟ کام قەزاو قەدەری تازە و دڕندەیە کە شوێنی قەزا و قەدەری قەدیمی گرتۆتەوە و هەر وەک سەر خۆشێک لە گەڵ ژیانی ئێوە تەختە نەرد یاری دەکات؟

مارتا لە پڕ ڕا دەبێ و بۆ لای ئەو مێزە دەچێ کە بوتڵی خواردنەوە پیاڵەی لە سەر داناون. ئەو دەم دەپرسێ:

- پێتان وایە ئیدیکەش بێن ؟

کنچتینۆ لە وەڵامدا دەڵێ:

- بێگومان دەیانویست بێن بەڵام ڕەنگە پاشان لە بیریان کرد بێ لە کاتی خۆیدا بگەنە قەتار و یا ئوتوبوسی پۆستی.

مارتا دەیەوێ پیاڵە زیادییەکان بەرێتەوە ئاشپەزخانە. دۆن بنە دیتو پێی دەڵێ:

- پیاڵێکی زیادی بۆ دۆن پیچیریلی لێرە بێڵەوە. خوشکی قەشە بە دەنگی ئیعتراز و تەنانەت بە ئانقەست دەڵێ:

- ئەومان کە بانگ نە کردوە.

دۆن بنە دیتو دەڵێ : هەر بۆیە سەر و کەللەی پەیدا دەبێ. پاشان ڕوو دەکاتە لاوەکان و لێی زیاد دەکا:

ئێوە بێگومان « پیچیریلی» تان لە بیرە. ئەو تاقە کەسێکە لە نێو ئێوە دا کە کەشیشی کردۆتە پیشە. دایک و بابی ئەو کە لە وردە مالیکی دێهاتن، توانای ئەومیان نەبوو کە خوێندنی وی درێژە پێ بدەن. ناچار چوە کن قەشەکانی سالزین و خەریکی خوێندنی زانستی دینی و حیکمەتی ئیلاهی بوو. ئیجازەی کەشیشی وەر گرت. لە گەڵ بوو بە کەشیش سالزینیەکانی بە جێهێشت و بۆ قەلەمڕەوی ڕوحانی خۆی گەڕایەوە. ئەم کارەی وی سەبارەت بە مامۆستاکانی کارێکی ڕاست نەبوو. ئێستا لە کەشیش نشینێکی بچوکی ئەم ناوچەیە پێش نوێژە بەڵام نارازیە چونکە دەیویست لە مەدرەسەی زانستی دینی و یا لە قەڵەمڕەوێکی گەورەتردا ببێتە قەشە. ئێستا بۆ ڕاکێشانی لوتف و مەرحەمەتی ئوسقۆفی گەورە، بۆتە جاسوسی نهێنی

وی. هیچ کاتێ لە چوونی بۆ ئەو شوێنانە کە بە گومانی وی ڕەنگە قسەی وا بکرێ کە نرخی ڕاپۆرت دانی بۆ ئوسقۆفی گەورە هەیە دریخی ناکات. هەر بۆیە دەتوانن وا بزانن کە ئەو ئێمە بە دیداری خالیسانەی خۆی سەر بەرز بکات.

لەو ماوەیە دا تاریک داهاتوە و کاری مارتای بۆ تێکردنی شەڕاب دژوار کردوە. مارتا دەڵێ:

- دانیشن و بخۆنەوە. دۆن بنە دیتو دەڵێ:

– خوشکم دەیویست شەربەتی تەمری هیندی تان بۆ ساز بکات بەڵام درنگ وەبیری کەوتەوە.

کنچتینۆ لە وەڵامدا دەڵێ:

– ئەمە دڵسۆزی یەکی دایکانە بوە. کە وابوو کیژی خۆشە ویست پێت وا بوو ئێمە پێویستمان بە پاڵاوتنی خوێن هەیە.؟

مارتا دەڵێ :

– دەبێ بچینەوە ژووری. لاوەکان بۆ بردنە ژووری پیاڵە و خواردنەوەکان یارمەتی دەدەن. قاتی خوارەوە لە وەتاغێکی گەورە و تاقانە پێکهاتوە. کە هەم ئاشپەزخانەیە و هەم لە ڕۆژەکانی باراندا ژووری کارە و هەم بە دابی گوندییەکان ژووری میوانانە. گۆزەی نەخشاوی دێهاتی لە سەر ڕەفعەی کتێبخانە دانراون. لە لای ڕاست و چەپ دیزە و تاوە و هەوری مس ڕیز کراون. لە بان بوخاری گەورەی دیواری، بەنکە بیباری سوور و هێشووی سماق و سیر و پیواز هەڵواسراون. لە پێش بوخاری چەند کۆنە کتێبی تۆزاوی دەبینرێن. لە گۆشەیەکی وەتاغ کە بێگومان هی مارتایە تاقەیەکی بچوک بە کاغەزی تۆڕی لە گەڵ پەیکەری نیو تەنەی مریەم لە گێچی ڕەنگی لە نێو گوڵی دەستکرد دەبینرێ. لە هەوای گیراوی وەتاغەکەدا بۆنی تایبەتی کونسیرو لە گەڵ سرکە و بیسکویتی بەیات پڕی کردوە.

مارتا دیسان دەڵێ: « دانیشن و بخۆنەوە »

لە دەرگا دەدەن. دیارە دۆن پێچیریلی یە تەشریفی هێناوە. دۆن بنە دیتۆ هەر وەک وێستاوە و پاڵی وە بوخاری داوە، پێشوازی لێدەکات. دۆن پێچیریلی لێی دەچێتە پێش و دە ئامێزی دەگرێ و بە زمانلوسی دۆستایەتی خۆی ڕادەگەیێنێ. دۆن بنە دیتو وەڵامی لە ئامێز گرتنی دەداتەوە و نیشانی دەدا کە بچێتە کن میوانەکانی دیکە و پێی دەڵێ:

- دانیشە و بخۆوە. پیاڵەی زیادی یان بۆ تۆ داناوە.

دۆن پێچیریلی لە چاو قەڵەوە. دیارە چاک دەخواتەوە و دەخوا و خۆش لە وەڕە. ڕوو خـــۆش و ئاواڵەیە. بۆ ئەوەی درنگ هاتنی پینە بکات، دەڵێ :« تاریک بوو، ناچاریش بوو ڕۆژنامەی ئوسقۆف نشین بنووسێ. پاشان لە سەری دەڕوا و دەڵێ:

– سەر خەتی وتارەکە ئاوایە:« بەڵای سەر دەمی ئێمە »

دۆن بنە دیتو لێی دەپرسێ: « ناچار لە بارەی شەڕ و بێکاری وتارت نووسیوە.؟

دۆن پیچیریلی بە ساردی وەڵام دەداتەوە:

– ئەوانە مەسـایلی سیاسین. ڕۆژنامەی ئوسقـۆف نشین تەنیا باسی مەسەلەکانی ڕوحانیەت دەکات. هەر چۆنێک بێ لە ڕوانگەی ڕوحانیەتی خالیس. بەڵای سەر دەمی ئێمە بە بڕوای من بێ عیسمەتیە لە شێوەی لیباس پۆشیندا. بۆ بە بڕوای ئێوەش هەر وا نیە.؟

دۆن بنە دیتو هەر وا کە دەچاوەکانی ڕاماوە لە سەر خۆ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

– بەڵای سەر دەمی ئێمە نەبوونی ئیخلاس و پاکییە لە بەینی ئینسانەکاندا. نە بوونی باوەڕ نەکردنە بە یەکتر. گیانی پیسی ( یەهودا سکریتی) یە کە دەسەڵاتی ژیانی کۆمەڵی ژاراوی کردوە.

دۆن پیچێریلی لە باسەکە خۆ دەدزێتەوە و دەڵێ:

– لە قەڵەمڕەوی کەشیشی مندا لە سایەی خوداوە لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییدا پێشکەوتنی مەزنی مەعنەوی وەدەست هاتوە. بەو مانایە کە ژمارەی ئیقرار کردن سەتا چل و دابی(عیشای ڕەببانی)سەتا سی زیادی کردوە.

دۆن بنە دیتو دەڵێ: « پیچێریلی فەقیر !لە پێشدا باسی ڕوحانیەتی خالیس و پێشکەوتنی مەعنەوی دەکەی، پاشان وەک بەقاڵێک دم لە ئەژمار و سەتا چەند وەر دەدی.»

دوکتور ساکا کۆخە دەیگرێ. مارتا وێنەی ساڵی ١٩٢٠ کە قەشە لە نێو شاگردەکانی خۆی دانیشتوە، لە دەستی برای وەر دەگرێ و لە بەر ڕووناکایی لە سەر لێوی بوخاری دادەنێ. هەرسێکیان لە وێنەکە ورد دەبنەوە لە پێشدا هەر کەس بە دوای ڕەسمی خۆیدا دەگەڕێ. پاشان لەو دۆستانەی دەگەڕێ کە لە مێژە نەیدیوە و پێوەندییان پێکەوە نیە. بیچمەکانی ڕابردوو لە زەیندا زیندوو دەبنەوە. لە گەڵ قیافەکانی کە ئێستا بە دەستی گرژی ژیان ڕەسم کراون، فەرقیان هەیە. لە ڕەسمەکە داکنچێتینۆ لە ڕیزی یەکەمدا لە سەر هەرد دانیشتوە و لاقی هاویشتوونە

ســەر یەک. ســەری لوس تاشـیـوە. دم و چاوێکی ورد و گـرژ و ڕەش ئەســمــەر و گـرینۆکـانەی هەیـە . چاوەکـانی هـەر وەک پێـشـوو مـاونەوە بەڵام قـژ و ڕیش بزنـی هێناویانەتە سـەر بیـچمی تفەنگچی شـارسـتـانی. پێش پازدە سـاڵ کـەس نەیدەزانـی دێتە سـەر ئەو شکڵە. ساکا لە هەموان کەمتر گۆڕاوە، تەنیا نێو چاوانی بە وەرینی قژی لاجانگی پانتر دیاری دەکات. لە ڕەسمەکە دا ئەو لـە پشت سـەری دۆن بنەدێتو دانیشتوە و ملی باریکی لە نێو شانانی وەدەر ناوە.

کنچتینۆ لە پڕ دەپرسێ: باشترین شاگردی تۆ کامانەن؟ قەشە لە وەڵامدا دەڵێ:

– باشـتـرین شـاگردی من ئەوانە بوون کە تەنـیا بە خـوێندنی کـتێـبی دەرسـی وازیان نە دەهێنا. ئەوانەی کە تینویی فێر بوونیان نە دەشکا.

هەر سێک شاگردی قەدیم تێکڕا هاواریان کرد: ناویان بێنە .

قەشـە بزەیەکی دێتێ و پاشان دەڵێ : « پێترۆ سپینا » ئێستا لە کوێیە و چی بە ســەر هاتوە؟ لە ڕەسمـەکـەدا پێتـرۆ سـپینا لە لای ڕاسـتـەی قـەشـە دانیـشـتـوە و کەشـیش دەسـتی لە سـەر شـانی داناوە. سـپینا قـژی بڵاو وچاوی بە فـیـز وتوڕەی هەیە وکـراواتی خـوارە. لە بەر ئەوەی کـەس وەڵامی قـەشـەی نەداوەتەوە، دوو بارە دەپرسێ: – نەتانگوت پێترۆ سپینا چدەکا و ئێستا لە کام وڵات دەسوڕێتەوە؟

هەر سێک لاو ناڕەحـەت دەبن و لە بنەوە سـەیری یەکتـر دەکەن. پیرە مێرد ڕوو دەکاتە کنچتینۆ و بە جیددی لێی دەپرسێ:

– ئەگەر لە بیرم نە چوو بێتـەوە پێتـرۆ سـپینا باشـتـرین دۆسـتی تۆ بوو. واتە ئەڤینداری وی بووی. ئێستا ئەو لە کوێیە، خەبەری چیت لە وی هەیە.؟

ئەفسەری گەنج لە کاتێکا خۆ لە نیگای قەشە دەدزێتەوە دەڵێ:

– من بۆ چی بزانم، من کێشکچی ئەوم ؟

پیرە مێرد لە پەنا بوخـاری ڕاوەسـتـاوە. لـەم وەڵامـە جۆرێ ڕەنگی دەبزرکێ کە نیزیکە بکەوێ. بە هەنگاوی سـەبروکە دەچێتـە کن کنچـتـینۆ و سەری دەگرێتـە نێـو دەسـتـە لەرزۆکـەکـانی. سـەیری چاوەکـانی دەکا و لە کاتێکا ئەسـرینی دە چاوان گـەڕاوە دەڵێ: « منداڵە فـەقـیـرەکەی من ! چۆن وات لێـهـاتوە؟ نازانی هـەر ئێـسـتـا وشـەی چەندە دزێوت بە سـەر زمـانـیدا هات ؟ وشـەی مـەترسـیـداری ئەو تۆ کـە لە کتێبی« ژنێز» ۱ یشدا نا دۆزرێتەوە. لە کاتێکا « ژنێز » خۆی لە کتێبەکانی هەرە

---

۱ – ژنێز یا خلقەت. کتێبی ئەوەڵ لەسەفەری پێنجگانەی تەورات کە باسی ئەفسانە دروست بوون و داستانی مبادی تا مەرگی یوسف و لە دایکبوونی موسا دەکات

خەرایە.

دۆن بنە دیتو لە کاتێکا کنچتینۆ بە ترسەوە تەماشای دەکا و بەڵام لە وتەکانی تێناگا سەبروکە قسەکانی درێژە پێدەدا و دەڵێ: « کاتێ هەرتکیان گەیشتنە مەزرا، قابیل خۆی بە سەر هابیلی برای دادا و کوشتی. ئەو دەم خوای تەعالا بە قابیلی گوت: چت لە هابیلی برات کرد ؟» قابیل لە وەڵامدا گوتی : « من چو زانم خۆ من کێشکچی وی نیم »

قەشە لە ئەفسەری گەنج وەدوور دەکەوێ و سەبروکە دەچێتە قوژبنی ژوورەکە، ئەو شوێنە کە پەیکەرێکی بچوکی مریەم لە نێو کاغەزی ڕەنگاو ڕەنگدا لە سەر تاقچە دانراوە. لە وێ دادەنیشێ قسەکانی بەمجۆرە درێژە پێدەدات :

– پێترۆ سپیناشاگردێک بوو لە هەموانم پتر خۆش دەویست. ئەو خۆی قەت هەستی بەوە نە دەکرد. بەڵام باشترین شاگردی من بوو. ئەو تەنیا بە وەندە ی لە مەدرەسە فێری دەبوو وازی نە دەهێنا. تا ئەوەی نەدەکرد. تینوویەتی نە دەشکا. هەمیشە نیگەران و زۆر جاریش ڕێک و پێک نە بوو. لە گەڵ ئەوەش سەبارەت بە ئیراد گرتنی لە سزادانی هاوڕێکانی کە بە ناهەقی دەزانین، هەمیشە تەمبێ دەکرا. ئەو دۆستەکانی فرە خۆش گەرەک بوو. لە ڕادە بەدەر. کاتێک دەیزانی لە کێشەیەکدا ئەو خاوەن مافە، هیچ شتێک نەیدەتوانی بێدەنگی بکات.

دۆن بنە دیتو لە نێو لاپەڕە زەرد هەڵگەڕاوەکانی ئاخرین تەکلیفی ڕێنووس، کە شاگردەکانی لە مەدرەسە نووسیبوویان ڕێنووسی پێترۆ سپینا دەبینێتەوە و دەڵێ:

– ئەوەیە سپینا، گوێ بدەنێ:« ئەگەر ئەوەندە داخدار نەبایە کە دوای مردنم ڕەسمەکەم لە میحرابی کلیساکان بکێشن و هێندێ کەسی نە ناسیاو کە زۆربەیان ژنی ناحەز و پیرن دەستی پاڕانەوەم بۆ درێژ بکەن و بمپەرستن، دەمویست ببم بە یەکێ لە پیرۆزەکان. دەمویست نەک لە بەر نیعمەتەکانی مادی و بارو دۆخی ڕۆژ، نەک لە بەر پێداویستییەکانی دەوروبەر بژیم بەڵکوو هەموو کات ژمێرێک لە تەمەنم بە بێ لە بەر چاو گرتنی ئەنجامی کار لە پێناو شتێکدا تەرخان بکەم کە خۆم بە هەق و ڕاستی دەزانم.»

دۆن بنە دیتو درێژە بە قسەکانی دەدا و دەڵێ:

– پێش پازدە ساڵ کاتێ ئەم ئیعترافنامەم خوێندەوە، گومانم لە ڕاستی و پاکی پێترۆ سپینا دا نەما. بەڵام ئەوەم نەدەزانی کە ئەو دەبێ تا چ ڕادەیەک جڵەوی قەڵەمەکەی بۆ وشە و ڕستە داتاشین بەرەڵا کرد بێ. ئەو دەم بە گوڕ و تاسەوە

ژیانی پیـرۆزەکـانی دەخـوێندەوە. چونکە تەنیـا چەند سـاڵ بوو، باوکی مـرد بوو، بەدبەختیەکانی بنە ماڵەی مەیلی بیر کردنەوەی لەودا بە هێز کرد بوو.

مـاوەیەکی دۆن پیچێریلی چاوە ڕوانە پیر مێرد بێدەنگ بێت تا ئەویش وە قسـە کەوێ. ئاخرەکەی دەڵێ :

- لە سـاڵی ١٩٢٠ سپینا دەیویست ببێـتە کـەشیش. بەڵام لە ١٩٢١ چوە نێو کۆمەڵی لاوانی سۆسیالیست. یانی بوو بە بێدین و ماتریالیست.

دۆن بنە دیتو بە ساردی دەڵێ: « من کارم بە سیاسـەت نیە »

قەشەی گەنج بە هەڵچویی دەپرسێ :« بێدینی و خەبات لە گەڵ خودا، بە ڕای تۆ جێگای سەرنج نین ؟»

پیرە مێرد بە هێدیێ وەڵام دەداتەوە :

- ئەو کـەسـەی نان بە مـەزمندی ڕۆژ ناخـوا، ئەو کـەسـەی بە گـوێرەی هـەل و مـەرجی ڕۆژ ناژی، ئەو کەسەی نە بۆتە عەبدی نیعمەتی مادی و بەستراوی مادی نیـە، ئەو کەسـەی بە بێ گوێدان بە پاشـە ڕۆژی کـار بۆ حـەقیقـەت و داد پەروەری دەژی، ئەو کەسە بێدین نیە. چونکە لە ئەبەدیەتە و ئەبەدیەت لە وجودی ئەو دایە. تۆ ئەی پیـچێریلی خـۆشە ویسـت! تۆ دەتوانی زۆر شت و لە وانە فێڵی کـەیشتن بە پلە بەرزەکـان فێری من بکەی بەڵام من لە زانستی کەلام و ئەدەبیات دا مـامۆستـای تۆ بووم. وشە گەل من ناترسێنن. باشە، ساکا تۆ پێم بێژە هیچ ئاگات لە پێترۆ سپینا هەیە؟ ئەو لە کوێیە و چدەکات؟

ئەو دەم دوکتور ساکا لە وەڵامی پیرە مێرد دا دەڵێ :

- سپینا سـاڵی ١٩٢٧ گیرا. بردیان بۆ دورگـەیەک. سـاڵی دوایی لەو دورگـەیە ڕایکرد، چوە فەرانسـە. لە فـەرانسـە دەریان کرد، چوە سویس، لە وێش دەریانکرد، چوە لوکزامـبورگ. لە لوکزامـبورگ وەدەریان نا، پەنای بۆ بەلژیک برد. ئەگەر لەوێ دەریان نە کـرد بێ، دەبێ ئێـسـتـا لە بەلژیک بێت. چۆن دەژی ئـاگـادار نیم. بەڵام گـومـانم لە ودا نیـە ئەو لە زرنگیـدا دەسـتی شـەیتـانی لە پشـتـەوە دەبەسـتێ. لە خزمێکیانم بیستوە نووشی سنگ ێشە بوە.

دۆن بن دیتو بێدەنگ دەبێ. پاشان ڕوو دەکاتە مارتا ی خوشکی و دەڵێ :

- گورگەکان لانی خۆیان هەیە، باڵەوری ئاسمانیش هێلانەی خۆیان هەیە بەڵام ئادەمـیـزاد جـێگای نیـە بە ئاسـودەیی سـەری لێ بنێـتـەوە و بە گـوێرەی خـەونە پاکەکـانی سـەر دەمی لاوێتی ژیانـی خـۆی درێژە پێبـدات. بەڵام مـیللەتی مـەسیح

وەک دڕندەیەکی پیس لە ڕاوگە دا ڕاوی دەنێن.

مـارتا بە پەشـۆکاوی سـەیری برای دەکـا. سێ لاو ڕادەبن کـە بڕۆن و دەڵێن: « درنگە با بڕۆین »

دۆن بنە دیتو و مـارتا میوانان بەڕێدەکەن. دۆن پیچێریلی کوێرە ڕێی لای چیا دەگرێتە بەر. کنچتینۆ و نۆنزیۆ سواری ماشێنی خۆیان دەبن و بە ڕێگای لای هێڵی ئاسندا بۆلای ڕاست دەکـەونە ڕێ. پیـرە مـێـرد و خـوشـکی تا دوور دەکـەونەوە تەماشایان دەکەن.

کاتێ هێندێ دوور دەکەونەوە کنچتینۆ بێ ئەوەی سـەیری دوکتـور بکا دەڵێ: « سپینا لە ئیتـالیـایە. لە بەلژیک گـەڕاوەتەوە. پۆلیس بـە دوایدا دەگـەڕێ. لـە وانەیە ئێستا گرتبیان. بەڵام چبکەم ئەو شێتە.

لە حـەوا لـە سـەر بسـتـوی « فورکـا کـاروزۆ» پەڵە هـەوری سپی و بچوک بۆ لای دەشـتـی فـوچینۆ دەڕۆن. هـەورێکی ڕەشی بە سـام بە دوایانەوەیە دەگـرمـێنێ و بروسکان دەدا . بایەکی سوک هـەلیدەکاتێ. سـەحرا دەلەرزێ و باران دایدەداتێ.

## ٢

ڕۆژێکی سەر لە بەیانی دوکتور نۆنزیۆ ساکا یان بۆ سەر نەخۆشێک بانگ کردوە. جۆتیارێکی گەنج خەڵکی گوندی «ئاکوافرەدا» بە سواری گاری لە دوای هاتوە. دوکتۆر تاوێک تەماشای دەکا و دەڵێ:

– دەڵێی یەکتر دەناسین ؟

کابرا لە وەڵامدا دەڵێ :

– من « مۆلاترۆ کاردیلە» لە بنە ماڵەی کاردیلەی خەڵکی ئاکۆ فرەدا-م. بەڵێ ڕاستە یەکتر دەناسین. بابە گەورەم ئیجارە داری کۆنە ئاش و زەویەکانی کلیسا بوو. چەندە زەوی باش و بە ڕێژەو بوون. بابی منیش سێ ساڵان ڕەزی ماڵی ئێوەی بە ئیجارە گرتبوو. پاشان گیر و گرفت و داواکاری دادگا و نەساخی و شتیتر ڕووی تێکردین. دوو برام لە بیرزیل دەژین. ئیتر نامە نانووسن.

دوکتۆر دەڵێ : « ئێمە یەکتر دەناسین. باشە کێ نەخۆشە ؟»

گاری بەرەو یا دەڕوا ، بایەک کە بارانی بە دواوەیە. کاردیلە دەڵێ :

– لە ئاخری مانگی نیساندا باران بەکەلکە. کاتێ منداڵ بووم تۆ لە مەیدانی ئاکوافرەدا بۆ کلیسا و خەڵک وتارەت دەدا . لە سەر ئالاکە وشەی « ئازادی» نووسرا بوو. بنە ماڵەی ئێمە لایەنگری ئازادی بوون. ئەوە هەر دوای شەڕ بوو. ئازادی ڕێگە درا بوو. ئەو دەم کلیسا لایەنگری دەوڵەت نەبوو. بەڵکوو لای میللەتی دەگرت. ئێمەش لە لایەک بووین، بەڵام دوایە پەڕ وەرگەڕا .

ئێستا گاری لە بەر باران دەڕوا . ئەو بارانە لە سەرووی زەویە قوڵەکانەوە دێت کەمەزرای « پالانتێن» لە دەشتی شکڵ سەدەفی فۆچینۆ یەک دەگرنەوە. هەر لە ئێستاوە پەردەیەکی خاکی ڕەنگ بە سەر بەشەکانی « ماگلیانۆ» و «لاسکورکلا» کشاوە. کاردیلە قسەکانی درێژە پێدەدا :

– ئێستا ژنان و پیرە پیاو بۆ کلیسا ماونەوە. ئێمەش سەرمان بەر داوەتەوە. باوکم تەمەنی حەفتا ساڵە و هێشتا دوعا خوێنی کلیسای « سن ساکرە مێنت» ە.بەیانی یەکشەمۆیان پێشنوێژی « مەسحە» ڕۆژەکانی هەینی پیرۆز و« جێژنی خودا » چاکەتی سوور دەکاتە بەر و لە گەڵ دەستە دەڕوا و لە دوعای بە کۆمەڵدا

بەشدار دەبێ. ئێمە هەموو ساڵێ دوو چەڵەنگ شەڕاب نەزری کلیسای ئاکوافرەدا دەکەین. گشت مردوەکانمان لە نوێژ خانەی سن ساکرە مێنت لە گۆڕستانی ئاکوافرەدا لە لای ڕاستەی دەرگای نوێژ خانە ناژراون. مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە لە خەڵکی تر زیاتر نین. بەڵام خۆم دەزانم بۆ چی باسی ئەوانە دەکەم. مەبەستم ئەوەیە کە ڕێگامان یەکە.

دوکتۆر دەڵێ : « ئێمە یەکتر دەناسین. بەڵێ دەناسین. نەخۆش کێیە ؟ خزمتە ؟

ئێستا گاری لە جادەی ئاکوافرەدا لا دەدا و بە نێو مەزرای نۆک و باقلاندا، بە لاڕێدا دەڕوا. کاردیلە دیسان دەست پێدەکات:

– لە گەڵ ئەوەش دەکرێ لە ڕێگای جیاوازەوە یەکتر بناسین. ئێمەی جۆتیار ئەربابەکان بە هۆی زەویەکان و پێناسەکانیانەوە دەناسین. بەڵام داخوا بۆ ناسین ئەوە شێوەیەکی ڕاستە؟ مرۆڤ کار دەکا، شت دەکڕێ، دەفرۆشێ، ئیجارە دەکا، بۆ ئەم کارانە بەڵگە و ناسنامە پێویستە، بۆ کار کردن دەڕواتە دەرەوە، سەر و کاری لە گەڵ سەت ئیدارە دەبێ، لە گەڵ سەت کەسی جۆر بە جۆر دەبێتە ئاشنا، بەڵام داخوا ئەوە شێوەی یەکتر ناسینە.؟ بەڵام من کاتێک لە « ئەستاک » لە نیزیک مارسی کارم دەکرد، لە وێ کاناڵێکی گەورەی ژێر هەردیان ساز دەکرد. ڕۆژێک هاوڕێکانم پێیان گوتم: « لێرە هاو نیشتمانیەکی تۆ هەیە کە پیاوێکی خوێندەوارە» من لە بەر خۆمەوە دەمگوت کە ڕەنگە کەسێک بخوازێ گاڵتەم پێبکات. گوتم من بەڵگە و پێناسەی خۆم هەیە. ئەوەی پێویستیش بوە بیدەم داومە.. کە وابوو ئەو کابرایە چی لە گیانی من دەوێ؟ ئاخرەکەی کابرا هات و منی دیتەوە. دەستی کرد بە پرسیاران لە بارەی« ئاکوافرەدا » و مەزرای « پالانتین» و ژیانی خەڵکی وێندەرێ. پاشان باسی« فۆچینۆ» ی نیشتمانی خۆی کرد. بە دوای ئەوە دا شەوانە یەکترمان دەبینی. دەچووینە سەر لافاو شکێنی« ئەستاک» لە سەر هەرد دادەنیشتین و تا لای نیوە شەو قسەمان دەکرد. پاش چەند شەو هەر چی دەمانزانی بۆ یەکترمان باسکرد بوو. ئیتر یەکترمان باش دەناسی. دەستمان کرد بە باسی ئەو شتانە کە تا ئەو دەم بە تەنیایی بیرمان لێکرد بۆوە. زیاتر ئەو قسەی ڕاستی دەکرد. هێندێ جار منیش. ئێستا ناتوانم لێرە ئەم قسانە بە دەنگی بەرز بۆ تۆ بگێڕمەوە. چونکە پێیان پێدەکەنی. هەر چۆنێک بێ کارەکەم درێژە پێدا . ڕۆژێ هەشت سەعات کار بوو، لە گەڵ ئەوەش هەموو دوو سێ سەعات کاری زیادیان دەکرد تا هەقی زیاتر وەر گرن. بەڵام من کە هەشت سەعات کارم تەواو دەبوو ڕام دەکرد بۆ سەر لافاو

شکێن تا بچمە کن ئەو پیاوەی کە دەمزانی چاوە ڕوانمە. پێکەوە لە بارەی ئینسان و زەوی و ژیان دەدواین. من بیرم لەوە دەکردەوە: ئەوەیە ئەو کەسەی کە لە هیچ بارێکەوە، نە بۆکار، نە بۆ بەڵگە وناسنامە کارێکم پێ نیە. ئەویش نەک وەک قەشەیەک، نە وەک مامۆستایەکی مەدرسە، و نە وەک تەبلیغاتچیەک کە خۆیان هەموو شت دەزانن و تەنیا بۆ قانیع کردنی خەڵک موچە وەر دەگرن، بەڵکوو وەک ئینسانێک دێتە کن من. ڕۆژێک ئەو پیاوە لە وێ ڕۆیشت و ئیتر ئاگام لێ بڕا.

دوکتۆر قسەکانی دەبڕێ و دەڵێ: «دەتوانم هەست بکەم کە ئەو کەسە کێ بوە؟»

– جارێ ڕاوەستە بۆت باسکەم کە من پێش دوو ساڵ کاتێک لە جێژنی« بارتو لومە» دەگەڕامەوە لە ڕێگای «ماگلیانۆ» سەگێکم دیت کە ترومبیل قاچی شکاندوە و لە پەنا جادە کەوتبوو کە مرۆڤ بەزەیی پێدا دەهات. من گەماڵەکەم خستە سەر گاری و بە دەسرەیەک قاچیم پێچا و هێنامەوە ماڵ. پاش دوو مانگ گاریچییەکی خەڵکی« لاسکورکلا‹» پەیدا بوو، چونکە خاوەنی گەماڵەکە بوو، سەگەکەی لێ وەر گرتەوە. هاوینی ڕابردووش مەڕێکم لە سەر جادە دیتەوە دەشەلی. ئەو حەیوانەم لە تەویلە لە نێوان کەر و مانگا دا جێکردەوە. پاشان خاوەنەکەی هات و بردییەوە. ئەوە خۆی نەریتێکە. بەڵێ، ئەو کەسەی کە لە «ئەستاک» لە گەڵی بیوومە ئاشنا، دوێنشەو لە دەرگای خانووی منی دا. بۆ هەوەڵین جار توانیم بیناسم.

نونزیۆ ساکا بە ترسەوە دەپرسێ: «پێترۆ سپینا لێرەیە؟ تۆ من دەبەیە لای ئەو؟»

کاردیلە گاری لە جادە لادە دا ولە گۆشەیەک ڕایدەگرێ. هەرتکیان دادەبەزن. کاردیلە ئەسپەکەی لە دارێک دەبەستێتەوە و جلێکی سووری دەخاتە سەر پشتی. دوکتۆر بە قیافەیەکی خەفەتاوی سەرێکی ئەملاولا دەکا. باران خەریکە لێی کاتەوە و بۆ لای «تاکلیاکوزو» دەچێ. بەڵام هەوری تازە لە لای «ئاوەتزانۆ» وە دەگەنێ. ئەم دوو پیاوە لە پەنا گاری قسەکانیان درێژە پێدەدەن.« مۆلازو کاردیلە» لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:

– بەڵێ، ئەو پیاوە لە دەرگای ماڵی منی دا و هەر چەند تای لێبوو، نەیدەویست بێتە ژوور. چەند هەنگاوێک پێکەوە ڕۆیشتین، لە ئاوایی چووینە دەر و بە نێو مەزرا دا ڕۆیشتین و هێندێ باسی «ئەستاک» مان کرد. پاشان ئەو بۆ منی باسکرد کە بە نهێنی گەڕاوەتەوە ئیتالیا و لە ڕۆم نیزیک بوە بگیرێ. گوتی پێوەندی لە گەڵ

هاوڕێکانی پچڕاوە و لانی کەم تا ماوەیەک بێ مەترسی پێوە بوون ناتوانێ ئەم پێوەندییە دوو بارە بەر قەرار کاتەوە. بە منی گوت کە چەند ڕۆژ لە ژێر باران لە مەزرا ئاوارە و سەر گەردان بوە. بەڵام ئیتر ئێستا ناتوانێ ئەم وەزعە درێژە پێبدا چونکە تای زۆرە پاش کومانێکی زۆر بڕیاری داوە بێتە ماڵی من و تا چاک دەبێتەوە من لە ماڵی خۆم ڕایدەگرم. ئەو بە منی گوت تۆ کارگەری و من سەبارەت بە کرێکارانە کە بۆ ئیتالیا گەڕاومەوە خەیانەتم پێ مەکە. شەوی ڕابردوو لە تەویلەدا شاردمەوە. ئێستا تەنیا شتێک لە تۆ دەپرسم: دەکرێ چ کارێک بۆ ئەم پیاوە بکەی.؟ داخوا دەکرێ هەر ئاوا وازی لێ بێنین تا بمرێ ؟

دوکتۆر بە وشکی وەڵامی دایەوە: « دەبوایە لە دەرەوە، هەر لەم وڵاتە مایایەوە کە لێی بوو.»

- بەڵام ئەو ئێستا لێرەیە و ئێمە لە دەرگای ماڵی خۆمان دیتومانەتەوە. ڕاست وەک سەگێک و یا مەڕێکمان دیبێتەوە. داخوا دەبێ لێگەڕێین بمرێ ؟

دوکتۆر لە وەلام دا دەڵێ: « بشمرێ هیچ لە دەست نادا. ئەو تەنیایە. بەڵام من ژن و منداڵم هەیە. بیر و ڕای سیاسی ئێمە لێک جیاوازە.»

کاردیلە دەڵێ: « لێرە باسی سیاسەت لە گۆڕێدا نیە. مەسەلەی ئینسانی لە گۆڕێدایە. لە کتێبی فێر کردەکانی ئاینیدا کە بە منداڵی پێیان لە بەر دەکردم نووسراوە: ئاو بدەی بە تینوان، لیباس بدەی بە ڕووتان، میوانان ڕابگری، خزمەتی نەخۆشان بکەی. نە نووسراوە ئەو نەخۆشانە عیلاج بکەی کە وەک تۆ بیر دەکەنەوە، بەڵکوو تەنیا نووسراوە نەخۆشان چا بکەیەوە و وەسەلام!. دیارە ڕاستە کە ئەو دەم کلیسا لە گەڵ میللەت بوو نەک لە گەڵ دەوڵەت. لەوانەیە ئیمڕۆ ناوەرۆکی کتێبی فێرکردنی دینیشیان گۆڕیبێ.»

دوکتۆر دەپرسێ: « ئایا ئەو خۆی تۆی بە دوای مندا ناردوە؟ ئەو بە تۆی گوتوە کە من دەناسێ ؟»

- ئەو بە منی گوت لە گەڵ تۆ هاو دەرس بوە. بەڵام نەیدەویست بە دوای تۆ دابێم. لە پەنای کاری گفتگۆ دڕ ێژەی دەبێ. پاشان هەر تک بێدەنگ دەبن. پیاوێکی گوندی بە کەر و بارە دارێکەوە بە وێدا تێدەپەڕێ. پاشان پیرێژنێک بە بزنەوە بەوێدا دەڕوا. کاردیلە لە شک دایە کە ڕاستی هەموو شتێ بڵێ یان نا. ئاخرەکەی بڕیار دەدا و دەڵێ :

- ڕاستیت دەوێ ئەو نەیدەویست بە دوات دا بێم. دوێ شەو بە منی گوت:« من

لە بەر کرێکاران گەڕاوەمەوە بۆ نیشتمانم داوای یارمەتی لە تۆ دەکەم کە کرێکارێکی بە شەرەفی. بەڵام دوکتۆر ساکا ڕووناکبیرێکە. ئەو دەبێ شوغڵەکەی بپارێزێ. بێجگە لە وانەش ئەو کابرایەکی ڕووناکبیرە کە لە گەڵ دەزگای ئوسقۆف پێوەندی هەیە. بۆ ئەوەی سەرنجی گار بەدەستان بۆ لای خۆ ڕابکێشێ، دوور نیە پێمەوە بکات.» بەڵام باوەڕم بە قسەی وی نە کرد. ئەو ئەوەشی گوت کە تەنیا پیاوێکی پیر هەیە کە لە یارمەتیدانی وی ناترسێ. ئەو قەشەیەکە لە دەبیرستان ماموستا بوە. بەڵام ئەو زۆر پیرە و هەر بۆیەش دڵی نایە کە مەترسییەک بۆ ئەو پێک بێنێ. ئیمڕۆ بەیانی دیتم حاڵی زۆر شڕە. بۆیە بێ پرسی وی لە دوای تۆ هاتم. وای دابنێ مەرێکە و دەبێ دە فریای کەوێ.

دوکتۆر ساکا پاڵی وە تەکەری گاری داوە. بە نیگەرانی و بە هیلاکی سەیری دەور و بەری خۆی دەکا. ئاخریەکە تینێک وەبەر خۆی دەنێ و دەڵێ :

– هەر چۆنێک بێ پێویستە ئەو لێرە بڕوات. زووش دەبێ بڕوات. من تێدەکۆشم ڕازی بکەم کە خێرا بڕوا. ئەگەر پێویستی بە دەرمان هەبێ بە ناوی خێزانی ئێوە ڕەچێتەی بۆ دەنووسم. خوا بە دادمان بگا.

کاردیلە دەڵێ:

– ئەو لێرەیە، لە پشت ئەم دارە گوێزە لە تەویلە دایە. تۆ دەتوانی تەنیا بچیە لای من لێرە دەمێنمەوە و ئاگادار دەبم.

دوکتۆر لە پشت دارە گوێز لە بەر دەرگای تەویلە پیرە مێردێکی چکۆلە وتێک شکاو دەبینێ کە لیباسێکی خاوێنی لە بەردایە. لەوە تورە دەبێ کە بۆ چی کاردیلە نەیگوتوە کە کەسێکی دیکەش لەوێیە. دەپرسێ:

– نەخۆش لە کوێیە ؟

پیرە مێردی کورتە باڵا لە وەڵامدا دەڵێ: « کێ تۆی ویستوە ؟»

– مۆلازۆ کاردیلە بە منی گوتوە کە نەخۆشێک لێرەیە.

پیرە مێرد لە کاتێکا ڕادەبێ ولە چاوانی ساکا ڕادەمێنێ، دەڵێ :

– من ئەسپاردبووم ئەو کارە نەکات. ئەو دەم دوکتۆر نونزیۆ ساکا بە سەر سوڕ مانەوە « پێترۆ سپینا » ی دۆستی کۆنی دەبیرستانی خۆی دەناسێتەوە.

چاوی گەورە و قوڵ و گەش. لێوی باریک، گوێچکەی ناسک بە ڕەنگی ڕوون و پڕ خوێن، و قژی پڕ و ئاڵۆز، تەنیا شتێکە لە سەر و سیمای قەدیمی ویدا ماوەتەوە و ئەمڕۆ دەڵێی لە مستێک قوڕی سوور کراوە و قەڵشیو دروست کراوە.

ساكا غیرەت وەبەر خۆ دەنێ و بە زەحمەت دەڵێ:

– تۆ لە تەمەنی منداڵی. واتە ٣٢ ساڵی بەڵام وەک ٦٠ ساڵە دێیە بەر چاو. ئەدی چۆن خۆت وا گۆڕیوە ؟

سپینا وەک منالێکی فێڵی کرد بێ و یاری برد بێتەوە قاقا پێدەکەنێ. پاشان بۆ دوکتۆر روون دەکاتەوە کە پێش ئەوەی بۆ ئیتالیا بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەر وچاوی خۆی بگۆڕێ و وابکا پۆلیس نەیناسێتەوە ماوەی چەند حەوتوو بە ماجومێک کە مادەی ئەسلی وی « تەنتۆرایۆد» ە لە سەر دم و چاوی خۆی کاری کردوە و بەو ماجومە ئاوا چرچ و کنجاوی کردوە کە بێتە سەر شکڵی پیرە مێردان.

سپینا دەڵێ:

– ئەو ماجومە داهێنانی خۆمە. لە وانەیە بە کاری شتی دیکەش بێت. کاتێ ئیدەیالی لاوێکی حاڵ ناونجی ئیتالیایی تەنیا ئەوە نەبێ کە بکەوێتە بەر سەرنجی کچانی توریستی سویسی و ئەمریکایی و ئامانجی جیدیتری پێ نیشان بدرێ، رەنگە پێویست بێ لە جیاتی بنیاتەکانی ئێستای جوانکردن، بنیاتێکی ناحەز کردنی دەستکرد بۆ لاوانی جوان و ژیکۆلی و لوت بەرز ساز بکرێ.

دوکتۆر ساکا بە حەپەساوی سەیری روومەتی گۆڕاو وشکڵ پیری هاو تەمەنی خۆی دەکا. سپینا هەر گیز بەو جۆرەی کە دەبوایە ببێ، لاوێکی جوان و شیک نەبوە بەڵام بزۆزی و رک و راستی قسەکانی هەمیشە روناکییەکی داوە بە قیافەی و لە کن ژنان جوانی نیشان داوە. ئەو بێ ئەوەی لاوێکی بێشەرم و پڕ ئیدیعا و « دۆنژوان» بوو بێ، بە ژنبازێکی بە تواناو شێلگیر ناسراوە. ئێستا چۆن پیرەوی لە بیر و رایەکی سیاسی توانیویەتی وای لێبکات کەروومەتی خۆی وا ترسناک بکا ولە هەرەتی لاوێتیدا ئاوا پیری نیشان بدا.

دوکتور ئیراد دەگرێ و دەڵێ:

– لە گەل ئەو هەموو زەحمەتەی کە بۆ گۆڕینی قیافەی خۆت کێشاوتە، پۆلیس دیسان تۆی ناسیوەتەوە.

سپینا لە وەڵامدا دەڵێ:

– پۆلیس بە هیچ جۆر منی نە ناسیوە. تەنیا پاش پێوەندی لە گەڵ تەشکیلات بێگومان یەک لە جاسوسان توانیویەتی خۆ دەوێ بخزێنێ و پۆلیس خەبەر دار بکات. هەلاتنی من لە بەر ئەوەیە کە پۆلیسی رۆم رەسمی قەدیمی منی لە لایە و بۆ هەموو شوێنێکی ناردوە. جگە لەوە من نەمویستوە لە رۆم بمێنمەوە. من هاتوومەوە

ئیتالیا تا له نێو جۆتیارانی هەژاردا کار بکەم.

ئەم فـیلْه کـه وەک فـیلْـەکـانی ڕومـانتـیکی سـەر دەمـی شـۆڕشی ١٨٤٨ دەچێ دوکتۆری خسـتۆته بیری واقعیەتێک و بەڵام منداڵانه و به ترس که هەر چۆنێک بێ بۆ لای ئەو کشاوە. دەنگی کامیۆنێک له جادەی میللی له جێی ڕادەپەڕێنێ.

سـپینا به زەردە خـەنه پێی دەڵێ: « مـەترسـە، دانیـشـە. دەنگی کامـیۆن دوور دەکەوێتەوە.»

دوکتۆر له کاتێکا له بەر نیگای سپینا خۆ لادەدا، دەڵێ :

- دانیـشـتن لێره بێـفـایدەیە، من خـەیاڵی زۆر بڵـەییم نیـە. من لـه سـەره تاوه نەمـدەزانی بۆ دیتنی تۆ دێمـه ئێـره، ئێـسـتـاش کـه هـاتووم تەنیـا بۆ ئەوەیه کـه نەسحەت بکەم تا زووه لێره بڕۆی و بۆ خاتری بەرژەوەندی خۆت و ئیمـەش بچیەوه دەرەوە.

سپینا دەڵێ: « سوپاسی پەندەکانت دەکەم بەڵام ناچمه دەرەوە.»

ساکا دەپرسێ:

— بۆ چـی هـاتوویـەوه ئیـتـالیـا؟ تۆ کـه ئازادیت خـۆش دەوێ بۆ لەو وڵاته نا مێنیەوه که ئازادی تێدایە.؟

سپینا له وەڵامدا دەڵێ: « من بۆیه گەڕاومەوه که بتوانم پشوێک بدەم.»

ساکا دەڵێ :

- شـۆڕشگێڕه مـەزنەکـان، واته مـامۆسـتـاکـانت. ئەو کەسـانەی سـەبارەت به پێـشکەوتنی بیـر و باوەڕی خـۆیان چەند سـاڵان کـاریان کـرد و ئاخـرەکـەی دام و دەزگای دیکتاتۆریان تێکدا، تەمەنی خۆیان له دەرەوه بردە سەر. تۆ ناتەوێ وابێ ؟

سپینا له مانای ئەم ئیرادە تێدەگات. له وەڵامدا دەڵێ:

- تۆ هەقـتـە. من نازانم خـۆم بـۆ نەخشـێکی گـەورەی سیـاسی ڕابگرم. من شـۆڕشـگێڕێکی خـەرابم. بەڵام له بارەی ئاوارەیی هەر باسی لێ مـەکە. نەقڵی من وەک نەقڵی شـەرابەکانی وڵاتی خۆمانە. کاتێکی بۆ ئاو وهەوایەکی دیکه یان دەبەن، خـاسـیـەتی خۆیـان له دەست دەدەن. له کـاتێکا شـەرابەکـانی دیکه به پێچـەوانه هەر دەڵێی بۆ ناردنه دەرەوه باشن.

ساکا دەپرسێ: « ئەگەر بتگرن چی ؟»

- دیاره زیندان به ترسە. بەڵام واش نیه که وام لێبکا نیشتمان به جێ بێڵم. من جیهان وەتەنیم. بەڵام دوور له نیشتمان وەک ماسیەک دەچم که له ناو هاتبێته دەر.

ئیتر ئاوارەیی بۆ من بەسە. زیاتر لەوە ناتوانم سەبر بکەم.

نۆنزیۆ ساکا لە گەڵ ئەوە کە دەستەکانی بە لاسا کردنەوە لە « پۆنس پیلات» ١ دەبزێوێ،دەڵێ :« کە وا بوو پێوەندی بە منەوە نیە و من دەست لەم کارە هەڵدەگرمی

سپینا دەڵێ :

-خۆشحاڵم کە دەبینم بە گوێرەی ئایاتی ئینجیل قسان دەکەی. وا دیارە فێر کردەی ئایینی بۆ تۆ فایدەی هەبوە. پاشان لێی زیاد دەکا و دەڵێ:

– من پێریشەو لە کاتێکا لە بەر نۆبەتیە دەلەرزیم و تا مێشکی ئێسکانم تەڕ بووم و لە برسان و لە تینوان دەمردم لە « مۆنتە دلا کروچە» بەرانبەر دەبیرستانی پێشووی خۆمان شەوم بردە سەر. ئەو خانوەشم دیت کە هەشت ساڵ پێکەوە تێیدا بووین. دەبێ ئەو باخچانەی لە باخی ماڵەکەدا گوڵمان لێ دەچاند هێشتا مابن. ئایا شەمدانەکانی منت لە بیرە؟ بێگومان لە قاتی دووەم هێشتا ئەو ژوورە گەورە هەیە کە لە وێدا تەختخەوی من و تۆ ئەوەندە لێک نیزیک بوو کە بێ ئەوەی سەر پەرستی مەدرەسە بزانێ تا نیوە شەو قسەمان دەکرد. داخوا ئەم نەخشە خەیاڵیانەت لە بیر ماون کە پێکەوە دەمانکێشان؟ لە بیرتە « دۆن بنە دیتو» هەڵبژاردەی شاعیرەکانی سەردەمی کەونارای بۆ لێک دەدایەوە.

دۆن سیلۆجیسمۆ» ئوسوڵ و قایدەی ئاقڵ و مەنتیقی فێر دەکردین. « دۆن زاشئۆ» دەقەکانی باوکانی ڕوحانی پێشووی بۆ شی دەکردینەوە. « دۆن فلۆریندۆ» کردەوە و قەولی قارەمان و پاشایانی باس دەکرد. لە سەر مێزی خواردن لە ژووری سفرە خانە هەر جارەی یەک لە ئێمە بە نۆرە دەبوایە شەرحی حاڵی یەک لە شەهیدان و یا یەک لە پیرۆزان بە دەنگی بەرز بخوێنینەوە. کاتێ ئێمە لەو دنیای غەیرە واقعی هاتینە دەر کۆمەڵ و کلیسا و دەوڵەتێکمان دیتەوە کە لە گەڵ ئەوەی فێری ئێمەیان کردبوو فەرقی زۆر بوو. هەر یەک لە ئێمە ناچار بووین ڕێگای خۆمان هەڵبژێرین. یانی سەر بە خزمەت بسپێرین. و یا یاخی بین. لە پێشوودا ڕێگای نێوە ڕاستیش لە نێوان ئەم دوو ڕێگایە دا هەبوو. بەڵام دوای شەڕ ئەو ڕێگایانە لە وچەی ئێمە بەسترا. لەو کاتەوە تا ئێستا چەند ساڵ ڕابردوە؟

---

١ – پونس پیلات حاکمی ڕۆمیی فەلەستین. لە گەڵ ئەوەش کە بڕوای بە وە هەبوو کە عیسا بێتاوانە، تەسلیمی دوژمنانی کرد. بۆ ئەوەی بەر پرسی لە سەر شانی خۆی لابەرێت، گوتی :« ئاو بێنن. ئاویان هێنا و دەستەکانی شوشت و گوتی: لە مەرگی عیسا دا من بێ خەتام. ئێوە بەر پرسن !« ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ مانای وایە کە من بێ تاوانم .

پازده ساڵ. و ئەگەر کەسێک ئێستا من و تۆ لێرە ببینێ ناتوانێ هەست بکات کە ژیانی ئێمە تا تەمەنی بیست ساڵی لە یەک خەت دا چۆتە پێش و هەر تکمان بۆ داهاتوو یەک خەونمان دیوە.

ساکا هەست بە نارەحەتی دەکات:

- بەڵێ ڕاستە. ئێمە ئێستا سەر بە دوو دەستەی لێک جیاوازین.

سپینا بۆ ڕاستکردنەوەی وتەی وی دەڵێ:

- بە دوو مرۆڤایەتی لێک جیاواز. لە ڕاستیدا لە نێوان خەڵکی ئازاد و کۆیلە جیاوازیەکە تەنیا ناکۆکی ساکاری دەستەیی نیە. بەڵکو ناتەبایی مرۆڤایەتییە و ئەگەر ئەڵمانیەکان وشەی «ڕەگەز» یان قوڕاوی نەکرد بایە، دەمگوت ناتەبایی ڕەگەز. بەمحاڵەش ئەگەر من ئەم وشەیە بە کار دێنم لە بەر ئەوەیە کە بۆ دەربڕینی ئەوەی دەمەوێ بیڵێم، وشەی تر نا دۆزمەوە. لە بار و دۆخی ئێستا دا کە بە کردەوە لە پەنای دەسەڵاتی تۆ دام، نیشاندانی ڕێز گرتن لە تۆ و لە و کەسانەی وەک تۆ ڕەفتاریان کردوە پێویستی بە تەقەلایەکی من هەیە کە ئەو کارە لە توانام دا نیە. لە لایەکی دیکەوە ئێستا بۆ حیساب پاک کردن زۆر زوە، تۆ دەتوانێ بڕۆی.

پێترۆ سپینا دەگەڕێتەوە ئەو تەویلەیە کە وڵاخەکانی لێ هاتوونە دەر. لە بەر ئەوەی هیلاکە لە سەر کورتانی کەرێک دادەنیشێ. دوکتۆر لە دوو دڵی دایە. پاشان لێی دەچێتە پێش و دەڵێ : «لانی کەم با تەماشات بکەم. من دەتوانم لە ڕێگای کاردیلە وە دەرمانت بۆ بنێرم»

سپینا بە زۆری کراسەکەی هەڵدەداتەوە. سەری وەک پیران ویێستی سووتاوی دم و چاوی، فەرقێکی سەیر لە گەڵ لەشی نەرم و ساف وسپی وەک لاوانی تازە پێگەیشتووی ئەو نیشان دەدا. دوکتۆر بە سەر سینگی دۆستی نەخۆشی خۆیدا دا دێتەوە وبە دڵسۆزی تەواو هەموو دەندەکانی سینگی دەکوتێ و گوێچکەی پێوە دەنێ نەبزی دەست و دڵی نیمتیحان دەکا ولە هەناسەکانی کە بە زەحمەت لە سییەکانی دێنە دەر ورد دەبێتەوە.

ئەومندەی تەماشا دەکا، سپینا توانای خۆ ڕاگری نامێنێ، لە سەرکورتانەکە دەکەوێ، لار دەبێتەوە و بە چاوی نیوە قوچاو سەبروکە لە سەر هەرد درێژ دەبێ. ئێستا هەستێکی باشی و برادەری سەر دەمی گەنجی ساکا دادەگرێ و دەڵێ:

- گوێ بدەیە پێترۆ، دۆستی من، باشە ڕک و ڕاست پێکەوە بدوێین. تۆ نابێ بمری. نۆنزیۆ دەستی دەکوشێ، باسی ئاوات و نامرادی و بەد بەختی و درۆ و

پیلان و نارەحەتیەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆی دەکا و دەڵێ:

– ژیانی ئێمە هەمووی هەر کاتییە. هەموو لایان وایە ژیانی ئێستا ژیان نیە. ئێستا دەبێ بسووتێ و بسازێی، دەبێ سوکایەتی قبوڵ بکەی، بەڵام ئەوە هەمووی کاتیە، ئاخرەکەی ڕۆژێک دێ کە ژیانی واقیعی دەست پێدەکا. بەڵێ، ڕۆژێک ئێمە خۆ بۆ مردن ئامادە دەکەین. مردن بەو داخەوە کە ژیانمان نەکردوە. هێندێ جار ئەو فیکرە هەراسانم دەکات کە : مرۆڤ لە جارێک زیاتر نایەتە دنیا، ئەو تەمەنە یەکجارەکییەش دایمە لە بوونی کاتی و لە چاوە ڕوانی ڕۆژێکدا بە سەر دەبا کە ژیانی واقعی دەست پێبکرێ. بەڵێ، تەمەن هەر بەم شێوەیە تێدەپەڕێ. کەس لە ئێستا دا ناژی، کەسیش نیە کە بتوانێ ئەوەی لە ڕۆژ دا کردوویەتی بە حیسابی داهاتی لە باری خۆی دابنێ. کەس نیە بتوانێ ئیدیعا بکا«ژیانی لە فلان کات و لە فلان شوێن دەست پێکراوە!» ئەو کەسانەش کە لە دەستەبەندی دەوڵەتی دان و لە زێدمیی ویش کەلک وەر دەگرن، دەبێ لە گەل کەین و بەین بژین بێزاری ئەوانیش لە ئالۆزی و ئەحمەقی ئەم دەزگایە لە خەڵکی تر کەمتر نیە. ئەوانیش لە کاتی بووندا دەژین وتەمەن لە چاوەڕوانیدا دەبەنە سەر.

سپینا دەڵێ :

– نابێ چاوەڕوانی بکێشی. لە ئاوارەییشدا تەمەن لە چاوەڕوانیدا ڕادەبرێ، دەبێ هەنگاو بنێی، دەبێ بڵێی:«لەم ڕۆوە ئیتر بەسە !»

ساکا بە ئیعتراز دەڵێ : « ئەگەر ئازادی نەبێ، چی؟»

سپینا لە وەڵامدا دەڵێ ؛

– ئازادی شتێک نیە بە دیاری بدرێ بە کەس. دەتوانی لە وڵاتێکی دیکتاتۆریدا بژی و ئازادیش بی. تەنیا ئەوەندە بەسە کە دژی دیکتاتۆر خەبات بکەی. مرۆڤێکی بە مێشکی خۆی بیر دەکاتەوە ئازادە. بە پێچەوانە، دەتوانی لە وڵاتێکی هەرە ئازادی سەر زەوی بژی، بەڵام ئەگەر ڕەزیل و نۆکەر سیفەت بی، ئازاد نیە و سەرە ڕای نە بوونی گوشار و مەجبور کردن دیسان کۆیلەیە. نابێ سواڵی ئازادی لە خەڵک بکەی بەڵکوو دەبێ بە شەڕ وەدەستی بێنی.

نۆنزیۆ بە نارەحەتی و بیر کردنەوە ڕادەوەستێ و پاشان دەڵێ:

– تۆ دیاردەی تۆڵە سەندنەوەی ئێمەی. تۆ باشترین ئەندامی پەیکەری ئێمەی. تێبکۆشە بە هێز بی، زیندوو بی، ئاگات لە سلامەتی خۆت بێ.

پێترۆ بە توندی دەڵێ:

-نۆنزیۆ، ئەگەر گەڕانەوەی من بۆ ئیتالیا هەر ئەوەندەی فایدە بوو بێت کە ئەم دەنگەی تۆ زیندوو بکەمـەوە و دۆسـتی کۆنی خـۆم بدۆزمـەوە،بەسـە. ئەوە هەمـان دەنگی پێشووی تۆیە، دەنگی شەوەکانی سپی دەبیرستـانە کە لە کات دا هەمـوو ژوورەکانی خەو، لە خەو دادەبوون.

کاردیلە دێتە دەرگای تەویلە و ئاوی بارانە لە سەرتا پای دەچۆڕێتەوە و دەڵێ:

- باران لێی ناکـاتەوە و لەم دەور و بەرانـەدا زیندەوار نـابینرێت. دوکـتـۆر و کاردیلە ئەو لاتر دەچن بیر لەوە دەکەنەوە کە چۆن دەتوانن بە گورجی چاری حاڵی نەخۆش بکەن. کاردیلە سـپینا لە ئـامێز دەکا و دەیبـاتە عەمـباری کا کـە لە بان تەویلەیە. دوکتۆر بە سپینا دەڵێ:

- تۆ جـارێ لێرە خـۆ وەشـێـرە. ئەشێ تەواوی ڕۆژ ئیـسـتـراحـەت بکەی ئەوەی پێویستە کاردیلە بۆت دێنێ. لەو ماوەیە دا هەول دەدەین پەناگایەکی ڕاحەتترت بۆ بدۆزینەوە. سپینا لە نێو قسەکانیدا دەڵێ:

- من جارێکی تر نیشتمان بە جێ ناهێڵم.

دوکتۆر لە وەڵامدا دەڵێ : « بە داخەوە ئەگەر بشخـوازی ناتوانی سەفەری درێژ بکەی. ناتوانی بە نهێنی لە چیاکانی ئالپ تێپەڕی. دەبێ بۆ چەند مانگ پەناگایەکت بۆ بدۆزینـەوە کـە لێـرەش زۆر دوور نەبێ و ئەمین و ڕاحـەت بێ. پـاشـان هـەر چۆنی دەتەوێ وابکە.

پێترۆ سپینا بە تەنیا دەمێنێتەوە و لە سەر کا ڕادەکشێ. دوای ڕۆژەکانی ترس و ڕاکردن ئێستا دەتوانێ بحەسێتەوە و لە گەڵ سوکبوونی نۆبەتیـەکەی بێتەوە سەر خۆ. لەو ڕۆژەوە کە گەڕاوەتەوە بۆ نیشتمان، ئەوە هەوەڵین جارە تاوێک دەحەسێتەوە و دەمـارەکـانی ئاسـودە دەبن. لە ڕادە بەدەر کەیفخـۆشـە وەک خـۆی پێشـبینی کرد بوو، کـاردیلە پەنای داوە. دەبێ بڕوات بە مـرۆ ڤ هـەبێ. یـتـر بەوە خـۆشـحـاڵە کـە نۆنزیۆ ساکا بە پێچەوانەی خۆی فیکری لێ دەکرد، ئامادە بوە یارمەتی بدات، دەبێ بڕوات بە دۆست هـەبێ. لە گـەڵ بیر کـردنەوە لەم دوو ڕوو داوە، لە خـۆشـیـان حـەز دەکا سـەر مەقولات بدا. بە تایبـەت کە کەسیش نایبینێ. پاشان بیر دەکاتەوە کە دەبێ ئاقڵ و ئارام بێت. چونکە خەباتێکی توندی لە گەڵ مردن لە پێشـە. بەم حـاڵە دوو بارە لە سـەر کا ڕادەکشێتەوە. هەر وەک عیسا منداڵی ئاسمـانی ئاقڵ و ئارام لە ئاخوڕی خۆیدا

دەمێنێتەوە. لە ڕاستیدا بۆ ئەوەی شکڵی ئـاخور تەواو بێت، پێویستە سپینا لە

نێو کەر و گایاندا گەمارۆ بدرێ. ئەمجارەش کەر و گا لە وێن، بەڵام لە خوارەوە، واتا لە تەویلە ئەویش تەنیا لە کاتی شەو دا، چونکە بە ڕۆژ دەچنە لەوەڕ کاتێ کەر و گا دەگەڕێنەوە کە ئەو« دەرکراوەی قانون» ماوەیەکە لە ئاخوڕی خۆیدا خەوی لێکەوتوە. نەرمایی کا خەوی بەسەر دا هێناوە. هەر وا کە ڕاکشاوە هیوادارە خەونی مەزراکانی گەنمی وەرزی هاوین و هێشوە گەیشتوەکان وگوڵەکانی دەشتێ و جریوەی مەلان ببینێ. لەوە تورە و بیزار دەبێ کە دەزانێ پۆلیس خزاوەتە نێو تەشکیلاتی وی و ئەو ناچار بوە کە لە گەڵ ئەو هاوڕێیانەی کە دوای گەڕانەوەی چوو بوونە لای پێوەندی بپسێنێ. بەڵام ئێستا ڕەفتاری کاردیلە و دوکتۆر ساکا هەستی برایەتی لە گەڵ هاو نیشتمانانی تێدا زیندوو کردۆتەوە. هەر وا کە لە نێو کادا ڕاکشاوە، دەزانێ ئەم هەستە لەودا بە هێز دەبێ. دەڵێی لە ناخیدا هەست بە پێوەندییەکی لەشی لە گەل وڵاتەکەی دەکات. هەر دەڵێی گەڕاوەتەوە بۆ ئامێزی دایکی. سپینا لە تاو لەرز دا دەسووتێ. بەڵام هەست دەکات حاڵی باشە. پاش چەند ساڵ بێهێزی و دەر بەدەری ئێستا دوو بارە هەناسە هەڵدەکێشێ. لە پشتی خانووی تەویلەکە جۆگەیەکی پڕ ئاوی ڕوون دەنگی دێت و بە سەر ورتکە بەردی لوس وچڵە گیای باریک دا دەڕوا. ئەوە گرنگترین دەنگێکە لە سەر کا بە گوێی دەگات، دەنگێکە لە درێژەی شەوی بێحاڵیدا بۆ ئەو وەک لالاییە. ئاوازێکی کۆنە کە هەمیشە نوێیە. ئەفسانە و حکایەتی پەریانیش هەر وا پەیدا دەبن. ئێوە ئەی پەری دێهاتی ئەفسانەی جوان بۆ ئەو هاو نیشتمانییەی خۆتان، بۆ ئەو پیاوەی کە شار نشینەکان ڕاویان ناوە، بهۆننەوە.

سپینا زۆر دەنوێ و تەنیا ئەو کاتە وەخەبەر دێت کە دەزانێ کاردیلە خواردن و دەرمانی بۆ هێناوە. نان دەخوا و بە دوای ویدا دەرمان و پاشان لە نێو کا دا دوو بارە دەنوێتەوە. کاردیلە ڕۆژێ سێ جار دێتە لای. بە سواری گوێدرێژ دگاتێ. دادەبەزێ، باری کەرەکەی دێنێتە خوار. هەوساری لە کولمیخێک دەخات کە لە دیواری داوە. دەچێتە تەویلە و بۆ عەمباری کا سەر دەکەوێ. سپینا بزووتنەوەی وی دەناسێ. کاردیلە هەر ئەوەندە دەمێنێتەوە کە پێویستە. کەم قسان دەکا. زوو وەدوای کاری خۆی دەکەوێ. سپینا هەموو جارێ لێی دەپرسێ:

– ئیتر دوکتۆر ساکا خەبەری نیە ؟

– نا، بێخەبەرە.

سپینا چاوە ڕوانیەتی، بە پەلە نیە. پەناگا پەنجەرەیەکی گەورەی بێ دەرگای

هەیە کاتێ خەرمان هەڵدەگیرێ، کایەکە بەوێدا دەکادێنێ دەکەن. هەر لەم پەنجەرە گوشـادەوە لە گـەڵ ئەوەش خـۆی دەخـاتە پـەناوە، دەتوانێ دوورە دیمەنـی بەربلاوی مـەزراش تەمـاشـا بکات. مـەزرای گـەنمی تازە شین بووی بەهـار بە رەنگی سـەوز، مـەزرای باقلە بـە هەزاران چاوی چکۆلە و رەش لە نێـو گـەڵای زێوین و باخـەکـانی رەز. لە کـۆتایی دوورە دیمەن دا، بەشـێکیش لە جـادەی میللی دا دەبینێ. شـەوێک کـاروانێکی درێژی گـاری ڕادەبرێ. قـافـڵـەیەکی درێژە چرای بچـوکـیـان بە نێـو تەگەرەکاندا هەڵواسـیوە و دیارە دەچنە بازار. سـپینا خەوی لێدەکەوێ و لە خـەو دا تا بازار لە گەڵیان دەچێ. لە نێوان دوو خەو دا مـەیدانەکانی ژینی دەور و بەری خـۆی لە نێـو پەنجـەرە گەورەکـاندا تەمـاشـا دەکـات. دژوارە هـەسـتی عـەجـایبی ئەو تاریف بکرێ. بە تـایبەت ئـەو شتـە سروشتـیـیـانە کە لە وێ، لە پێش وی لە جێگای خـۆیانن و لە گـەڵ خـەیاڵی زەینی ئینسـانێکی ئاوارەی وەک ئەو ولە گـەڵ دنیـای خـەیاڵی، لە گـەڵ سـەحرای خـەیاڵی، لە گـەڵ وەرزێڕە خـەیاڵیـیـەکـانی بـەر هەمی خەیاڵیـیەکانی ئاوارەیی ئەو فەرقیان هەیە وزیاتر سـەرنجی ئەو ڕادەکێشن. ئێسـتا سپینا جارێکی دیکە بیری نووسراوەکانی سـەر دەمی ئاوارەیی خۆی دەکاتەوە کە بە شـێوەی ڕیئـالیزمی واقـعی دانراون و ئێسـتـا ئیـمـڕۆ لای ئەو شـوێنی خـەون و ورێنەیان هەیە. لەم واقـعیـەتە ساکارە کە دەیبینێ سەری سوڕ ماوە. لە بەر چاوی مـەزرای واقـعي و گوندی واقـعي و کەری واقـعی دیارن. بەڵێ مـەزرای سـروشـتی و دێهاتی سـروشـتی و کەری سـروشـتی، ئەو شـتـانە ئێسـتا لە بەر چاوی بەر جەسـتەن و نەک لە زەین و لە خـەیاڵی سـووتێنـەری ویدا. ئەو لەشـی نەخـۆشـی خـۆی هەر وەک شتێکی سروشـتی لە پەنا شـتی دیکەی سروشـتی بە چاو دەبینێ. هەر وەک شـتێک لە نێو شـتـەکـانی تر. تەنانەت نە وەک شـتێـکی ناوکی و یا بنچینـەیی، بەڵکوو وەک شتێکی سروشتی لە نێو شتە سروشتییەکانی دیکەدا، جەستەیەکی بابەتی و دیار، جەستەیەک کە لە خاک پەیدا بوە، جەسـتەی سپینا لە وێ لە سەر کا ئارامی گرتوە. لە لایەکی وی ئاڵقەیەکي درێژي نان هەیە و لە لایەکی دیکەشی گۆزەڵەیەکی شەراب. ئەمە خواردنێکە کاردیلە بۆی هێناوە. کا زەردە و نان قاوەیی و شەڕاب سوورە.

سپینا چەند دەفتەری نوشتاوەی لای خۆی ڕاگرتوە کە یاد داشتی وین لە بارەی کشت وکـاڵ. هەر چەند ئەگەر ئـەو دەفتـەرانە پۆلیس بیانگرێ بۆ وی ترسی هەیە بەڵام نـایەوێ لە بـەینیـان بـەرێ. پێی وایە لە وانەیە ئەم دەفـتـەرچانە بۆ کـارێکی گرنگتر بە کار بێن. بە تایبەت ئەگەر قەرار بێ چەند حەوتوو لە خەباتی تێکۆشان و

کاری تەشکیلاتی دوور کەوێتەوە. سپینا بێ سەرنجدان پەڕەکان هەڵدەداتەوە و بە سەریان دا دێتەوە بەڵام ناتوانێ بیانخوێنێتەوە. ئێستا وا دێتە بەر چاوی وەک بە زمانی چینی نووسرا بن. ئەو لە ناخدا هەمیشە لە تیئۆری بێحاڵ بوە. ئەو بۆ کار و کردەوە هاتبۆوە ئیتالیا نەک بۆ بیر کردنەوە.

ڕۆژێکیان دوکتۆر ساکا بە درێژی بۆ کاردیلە باسی ڤیتامینەکان دەکات و نەتیجە دەگرێ کە سپینا پێویستی بە خواردنی زیاتر هەیە. لەو ڕۆژەوە جۆتیار نان و شەرابی سپینا دوو ئەوەندە زیاد دەکات.

سپینا قەت شەڕاب خۆر نەبوە بەڵام بۆ سافکردنی ئیشتیای لە تامی سەدەفی دەریایی و کەلەمی بوریانی(شارلرو) و « سرن» ئێستا بە دڵی خۆی شەڕاب دەخواتەوە. هێندێ جار کاردیلە دەتوانێ لە ماڵی خۆیان بە دزی دایکی پەنیر و سوسیۆنی سیر لێدراوی بەراز بدزێ، لەو کاتە دا بۆ سپینا جێژنی بە ڕاستییە.

شەڕاب هەمیشە سپینا لە نەشەیەکی کەمدا ڕادەگرێ. جارێکیان کە سپینا لە ڕادە بەدەر شادمانە کاردیلە بە نامەیەکی دوکتۆر ساکا وە دەگاتێ کە لە وێدا بە ڕستەیەکی وەک پێشگۆیی نەخشەیەک نیشاندراوە کە نیشانی دەدا سپینا لە گوندێکی کوێستانیی بۆ ماوەی دوو سێ مانگ لە پەنا دا دەبێ تا چاک دەبێتەوە.

سپینا ئەو دەم لە چۆنیەتی ئەم نەخشەیەی کە لە ماوەی چەند حەوتوو خۆ شاردنەوە ئەمنیەتی وی دابین بکات، سەر دەر ناکات بەڵام هەست دەکا کە مەبەست پەناگایەکە کە نەک هەرهەوەس ئەنگێز دەبێ بەڵکوو زیاد لە هەموو شت ئەوی سەر گەرم دەکات و هەر بۆیەش قبوڵی دەکا.

بەیانی ئەو ڕۆژە سپینا لە خەو دایە کە دوکتۆر ساکا کاتی ڕۆژ ئاوا دەگاتە لای، سپینا لە تەویلە دێتە خوار، فتیلەکە هەڵدەکات دۆستی خۆی دەبینێ کە بوخچەیەکی گەورەی پڕ لە لیباسی کەشیشی و شتی دیکەی بە دەستەوەیە. لەو کاتە دا سپینا ناتوانێ نارەحەتی تایبەتی خۆی بشارێتەوە و دەڵێ:

– ساڵەهایە کە من خوم لە دەرەوەی کلیسا دەزانم و دەبێ دانی پێدا بنێم کە لە پۆشینی لیباسی کەشیشی بێزارم. ئەم کارەئەتکی حورمەتە کە لە ئەخلاقی مندا نیە.

نۆنزیۆ ساکا لەم دوو دڵیە شاد دێتە بەر چاو و دەڵێ:

– ئەگەر من تۆم نە ناسیبا و بیرم کرد باوە کە ڕەنگبێ لەم لیباسە کەلکی دوور لە ئەدەب و ئیحترام وەر بگری، ئەوەم بۆ تۆ نە دەهێنا. لە تەویلە لە بەر ڕووناکایی

کەمی چرای نەوتی و لە خزمەت کەر و مانگایان کە سەیریان دەکەن لیباس دێتە گۆڕین. بێگومان مانگا هیچ لەوە تێناگات، بۆیە لە هەرد دەنوێ و چاو لە سەر یەک دادەنێ و خەوی لێ دەکەوێ و یا لانی کەم خۆی دەخەو دەکات. بە پێچەوانە، کەر هەر وا وێستاوە و سەیریان دەکات. وادێتە بەر چاو تەماشا کردنی حەیوان دوکتۆر نارەحەت دەکا چونکە کەر سەر بە لایەکی دیکەدا وەر دەگێڕێ. کەر تەسلیم دەبێ و بەلام دیسان سەر بادەداتەوە وبە شێلگیری تەواو لە پیاوێک ڕادەمێنێ کە لە عەمباری کا هاتۆتە خوار و ئێستا خەریکە عەبای ڕەش و درێژی کەشیشی دەکاتە بەر کە پێشەکەی بە دوگمەی بچوک ڕازاوەتەوە.

نۆنزیۆ ساکا دەڵێ: « بەرخ بۆ ئەوەی ورگی نە درن، دەچێتە پێستی گورگەوە »

چاوەکانی سپینا لە ڕوومەتی سووتاویدا حاڵەتێکی ڕێزداری منداڵانە بە خۆوە دەگرن. نۆنزیۆ ساکا بە دەنگێکی نیوە جیددی بە بۆنەی دانانی سپینا بە پلەی کەشیشی ئەم وتارەی خوارەوی پێشکەش دەکات:

– وەک خۆت ئاگاداری ئەم لیباسە یاد گاری ڕازی کەونارایە و لە لایەن قەشەکانی« ئیزیس» و« سراپیس »بە ئێمە گەیشتوە. ئەم لیباسە کۆبوونەوەکانی « نصارا »کە هەولیان دەدا ڕازەکانی دنیای مەسیحیەت لە پیسیەکانی جیهان بپارێزن و « فضایل و ملکات جبلی» کەمایەتیەک کە لە دەردوەی کۆبوونەوەکان دەژیان و بەلام دژایەتیان دەکرد، بپارێزن هێنایانە نێو کلیسای کاتۆلیک. بەم چەشنە داب و سوننەتێکی کە بەر دەوامیان زیاد لە سەر دەم و زەمانەیێکە کە تێیدا پێک هاتوون و لە مەزەبێکەوە بۆمەزەبێکی دیکە و لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکەیان گواستۆتەوە. ئێستا ئەی ئەو کەسەی کە بۆ ڕازەکانی نوێی شۆڕشگێڕی، بۆ ڕازەکانی مادەی خەریک یاخی بوون دەستنیشان کراوی، تۆی کە کراسە ڕەشەکان دەکەیە بەر کە بەر لە هەزاران ساڵ دیاردەی فیداکاری و ئیلهامی بان سروشت بوە...»

سپینا بز یەکی دێتێ. دوکتۆر ساکا لە درێژەی وتارەکەیدا هەر بەم هەوایە دەڵێ: « من نازانم بۆ چی ئەو زانا ماتریالیستە لیباسێکی وەک ئەو کراسەی بۆ ئەندامانی دەستەی نێو نەتەوەیی کرێکاران پێشبینی نەکردوە و یا لانی کەم دەستوری نەداوە کە تەواوی کەسانی ئەو دەستەیە نێوە ڕاستی سەری خۆیان بتراشن تا کارمەندی دەوڵەت و ئەمیندارۆشیکەرەوەی دەقی پیرۆزلەکەسانی ئاسایی جیا بکرێنەوە کە بی وەر گرتنی کارتی ئەندامەتی دەچن و هەقی ئەندام دەدەن.

کات تێدەپەڕێ، ساکا دەپرسێ:

- ناوت چ دەبێ ؟

سپینا بیر دەکاتەوە و پاشان سپادا پێشنیار دەکات

نۆنزیۆ لە وەلامدا دەڵێ: « زۆر باشە کە وابوو ئێمە ناوت دەنێین « دۆن پاولۆ سپادا »

- بۆچی دۆن پاولۆ ؟

- چونکە پێترۆ سپادا لە پێترۆ سپینا زۆر نیزیکە و وێک دەچن. کە وابوو ناوی تۆ دەبێتە دۆن پاولۆ سپادا. خۆ لە بیرت ناچێ.؟ کلاو و کتێبی دوعا و دەسحێب و زننارت لە جانتا دایە.

قەشە دەڵێ:

- زۆر باشە Proce damus in Pace بە ئەمانی خودا.

٣

دۆن پاولۆ بە گار یـەکی بێ سـەر پۆش لە جۆری « ڤیکتۆریا لـ ئانیبال سۆفریتۆ کە ئەسپێکی کوێت رایدەکێشێت، لە کاتێکا خۆی لە گاری دا مات کردوە، ڕێگای بەرینی مەزرای« پاڵنتین» بە جێدێڵێ و دەگاتە دەشتی فۆچینۆ.

ئێستا ڕاست سـەعاتێکە کە خۆر لە پشتی چیای پاراسانۆ سـەر وەدەر دەنێ. دەنگی لاقی ئەسپ لە سـەر ڕێگا، سـەگەکانی نێو تەویلە دەوەڕێنێ. لە پشت چەند پەنجەرەیەکی کە هێشتا ڕووناکن سیمای کونچکاو دەر دەکەون.

بەم چەشنە دۆن پـاولۆ سپـادا پاش دە سـاڵ دەر بەدەری بۆ وڵاتێک دەگـەڕێتـەوە کـە لە وێدا لە دایک بوە و هـەڵیداوە. لە لای چەپی وی لە ڕووناکایی ڕەنگ پەڕیوی ئاسـۆ بالای چیـای ولینۆ بە دوو لوتکەی سـەر بـە بەفـر داپۆشـراو سـەری بەرز کردۆتەوە. لە بناری چیای ولینۆ تەپۆڵکە و بەرزایی ڕەڵمی بە جێماو لە لافاوەکان وردە وردە کە بۆ لای دەشت دادەکشێن نابوت دەبن ولە سێبەری کە بە سەر مـەزرا دا هاتوە دەگـەڵ زەوی دەبنەوە یەک. گـاری لە گـوندی « ئاومتزانو» تێـدەپەڕێ کـە کۆشک و خـانووی کـوێسـتـانی لە پەنا کـۆمـەڵێک کۆخی بچوکی لە قوڕ دورسکراو قوت بوونەوە.

بیست سـاڵ دوای بومە لەرزەی ساڵی١٩١٥ هێشتا دیمـەنی تێک ڕوخاوی چەند مـاڵ کە گیا لە سـەر وێرانیـەکانیـان ڕواوە دەبینرێن. دۆن پاولۆ کە لە نێو گاری پڕ تەکاندا مات بوە پێی سـەیرە کە توانیویەتی بەم هاسانیە بۆ وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە و بەم هـەموو گوندانە دا تێپەڕێ بێ ئەوەی کەس بیناسێ و ترسی بۆی هـەبێ.

ئانیبـاڵی گاریچی کـە لە جێگای خـۆی دانیشـتـوە و سـەبر قـەننە دەکێشێ. بۆ پێشگری لە یۆرتمەی ئەسپەکەی جگە لەوەی کە جار و بار لغاوی ئەسپەکە بکێشێ هۆیەکی دیکەی نیە. جارێک لە دۆن پاولۆ ئاوڕ دەداتەوە و دەڵێ :

- وەسـتـا لیـتـریو تاڵبـەندی « ناکـوا فـرەدا » ناڵێکی لێدە دا ولیـرەیەکی وەر دەگرت، بێگومـان دەزانی مـەبەستم ناڵی ئەسپە. بەم پێییـە من هـەمیشـە لیـرەیەکم دەدایە. ڕۆژێک پێی گوتم باشترە لە جیاتی لیرەیەک دوو هێلکەی بدەمێ. لای ئێمـە لە بارەی هێلکە دەبێ ژن بڕیار بدەن. ژنی منیش ئەم پێشنیارەی پێ خەراپ نەبوو.

لەو دەمــەوە لە جـیـاتی هەر نالّێک دوو هێلکەمــان دەدایە. دوێنـێ ئاسـایـی بە دوو هێلکەوە چوومە کن وەسـتـا. بـەڵام وەسـتـا« لتریو» گـوتـی دەبێ سێ هێلکان بدەی چونکە بە هۆی شـەڕەوە نالّ گران بوە. ئەسپەکەمی نالّ کرد و چووم بە ژنەکەم گوت لە بەر شـەڕی تازە هێلکەیەک قـەرز دار بووم. ژنم دەسـتی کرد بە قیژە قیژ و گـوتی ئەم قسانـەم بە گوێ داناچێ. ئیمڕۆ دوو جار بە پێش دوکانی وەسـتـا « لتریو» دا تێپەڕیوم هـەر تک جار پێی گوتم: ئەو هێلکانەی مە چییان لێهات؟ هێشتا مریشک هێلکەی نـەکردوە؟ لە وەڵامدا گوتم تا بەیانی ڕاوەسـتـە. سـبـەی هـەوا دەگـۆڕێ. ئەم پەڵە هـەورە لە سـەر « پچینا » دەبینی؟

کاتێ ئانیبـاڵ ئاوڕی داوە تا بیر و ڕای کەشیش لەمبارەوە بپرسێ، دیتی خەوی لێکەوتوە. گاری کەیوەتە دوو ڕێیانـێک. ئێسـتا ئانیباڵ بە گوێرەی ڕێبازی قەرارداد بۆ گەیشتن بە « فوسـادی مارسی» واتە بەو گوندەی کە قـەشـە دەیویست شـەو لە وێ بەرێتـە سـەر، دەبوایە ڕاست بە کوێرە ڕێی چۆلی « فۆچینۆ» دا تێپـەڕێ. دۆن پاولّۆ بۆ ڕۆیشتن بەم ڕێگا چۆلە دا پارەیەکی زیاتری داوە. چونکە لە ڕاستیدا دەیەوێ لەو جـادەیە خـۆ بپـارێزێ کـە بە تەنیـشـت فـۆچینۆ دا دەڕوا وکـورتتـرە و بـەڵام پێش گـەیشتن بـە «فۆسـا» بە نێـو چەند بەخش دا تێدەپەڕی. ئەو لە ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێگا دوور ترە دا گوتوویە:

من لە بارەي دەشــتـی فـۆچینۆ و شـێـوەی کـشـت و کـاڵی تازەی وێندەرێ و جۆگەکانی ئاودێری تاریفم بیستوە، بۆیە پێم باشە بەو ڕێگایە دا برۆین هەر چەندە ڕاستە ڕێ نیە.

بەڵام ئێسـتـا خەوی لێکەوتوە و کە وابوو ئەو جۆگە لانـەی دەیویست بیان بینێ مەگـەر لە خـەو دا بیـان بینێ. بەم چەشنە ئانیـبـاڵ نیزیکـترین ڕێگا دەگرێتە بەر. جـادە بە بەرز و نەوی سـوکـەوە درێژەی هەیە. لە یەکێ لەم هەورازانـە دا دۆن پاولّۆ وەخـەبەر دێت. ئێسـتـا لە عاسـمـان لە سـەر دەشتی فۆچۆنۆ شکلّی عەزیا و ماری عاسمانی پێکەوە نووساون. کەشیش ئاگاداری لارێیی گاریچی دەبێ و دەپرسێ:

– ئەوە هەمان ڕێگای قەرار دادییە ؟

ئانیبال لە وەڵامدا دەڵێ : « سبەی هەوا دەگۆڕێ.

– ئەوە لەو کوێرە ڕێیانەی فۆچینۆیە ؟

– ئەگەر سەرماتە پێم بێژە

دۆن پاولّۆ بە جیدی دەپرسێ : « داخوا جۆگەیەک دیارە ؟»

جۆگەیەک لە گردی دێتە خوارێ و بە بن پردێکدا دەڕوا کە لە سەر جادە دروست کراوە.

ئانیباڵ لە کاتێکا بە دەست جۆگەلەکە نیشان دەدا دەڵێ :

– ئەوەش جۆگە. پاشان لێی زیاد دەکا و دەڵێ:

–بەڵێ، ئالبەندی «ئاکوا فرەدا» لە جیاتی ئاڵێک سێ هێلکەی دەوێ. چونکە قیمەتی ناڵ لە بەر شەڕی تازە گران بوە.

دۆن پاولۆ ئیتر نا خەوێ، بەڵام گوێش ناداتە قسەکانی گاریچی. بێدەنگیەکی کوتو پڕ بە سەریدا زاڵ دەبێ . بیرەوەری منداڵی و گەنجیەتی دێنێتەوە بەر چاو. ڕێگا بەردەلانە. گاری هەڵبەز هەڵبەزیەتی. دۆن پاولۆ هەموو پرد و جۆگە و ڕەز و دار و شتە قەدیمییەکان کە زۆربەیان لە گەڵ شتە تازەکان تێکەڵ بوون، دەناسێتەوە.

لە سەر دوو ڕێیان بەر لەوەی بگەنە ئورتا، لە تاریکیدا قاوەخانەی ئاکۆسانتا بەدی دەکات. ژنی قاوەچی بە یارمەتی کیژەکەی کە ئێستا گەورە بوە، خەریکە کورسییەکان دەباتە ژوور. واتە کیژی « ئاکواسانتا » ئەوەندە گەورە بوە! کە وابوو دەبێ ئاکواسانتا پیر بوو بێت. دە دوازدە ساڵی دیکە، ئەم کیژەی کە ئێستا منداڵێک زیاتر نیە بە نۆرەی خۆی دەبێتە مودیری قاوەخانە و کیژەکەی بۆ بردنە ژووری کورسییەکان یارمەتی دەدا. چەرخی ڕۆژگار هەر وا دەگەڕێ.

تەگەری گاری بە نێو بەرد وگڵمەتی جادە دا دەچنە خوار و بە زەحمەت دەسووڕێن. بەڵام لە پڕ لە سەر پێچێک هەوەڵین خانوەکانی گوندی « ئورتا » دەر دەکەون. ئەوەتا لە چوونە ژووری گوندی فانۆسێکی بەرقی لە سەر دوکانێکی ڕەشی چەرخ سازی هەڵواسراوە، ئەمە ئەو گوندەیە کە ئەو لێی لە دایک بوە.

دۆن پاولۆ چاوانی دەقوچێنێ. نایەوێ هیچ شتێ ببینێ. هەوەڵین بوونەوەرێک کە ئاگاداری هاتنی گاری دەبێ« نرون» سەگی چەرخ سازە کە دۆن پاولۆ باشی دەناسێ. «نرون» بە گوێرەی عادەت دوو سێ جار دەوەڕێ، پاشان لە پشت دەرگای دوکان ڕادەوەستێ و هێندێ مرە مر دەکا. گاری لە کاتی تێپەڕبووندا لە درگا دەخشێ. ئەودەم «نرون» قوڕەیەکی درێژ وگوێچکە ڕووشێنەر دەکێشێ. «فاوت» دێڵە سەگی پاسداری باخی پشتی کلیسا کە دۆن پاولۆ ئەویش دەناسێ وەڵامی ئەو قوڕەیە دەداتەوە. « فاوت» لە «نرون» دەپرسێ « چ خەبەرە؟» نرون بە توڕەیی وەڵامی دەداتەوە: « چۆن چ خەبەرە ؟» بۆ نا بیسی چ خەبەرە ؟« فاوت» لە وێ لە

پشتی کلیسا نازانی چ باسە، دیسان دەپرسێ: ئاخـر چ خـەبەرە، چبوە ؟ ئەودەم نرون بە تـورەیی سێ چوار جـار ئاوا دەقـورێنێ. یانـی:« بۆ نابیـسـی چ خـەبەرە ؟» ئێستا گاری لە مەیدانی گوندی تێدەپەرێ. ئەودەم «فاوت» یش وەک شێتان دەست بە وەڕین دەکـا و تولەکانی لە خـەو هەلدەسـتێنێ. لە گەلّ وان دەست دەکا بە خۆ هەلاویشتن بە دیواری باخـدا و تا دەتوانێ دەوەڕێ. تولەکـانی خـەوالّوو لە گـەلّ دایکیـان دەست بە وەڕین دەکـەن:« چ خـەبەرە؟» چ خـەبەرە ؟ دایک بە تورەیی وەلام دەداتەوە: « چۆن چ خەبەرە، بۆ، نازانن چ خەبەرە ؟» ئەودەم هـەموو سەگەلی دەور و بەر یەک لە دوای یەک دەست بە وەڕین دەکـەن. « شـیـری» سـەگی شـوان، سـەگەلی دیکە کـە لە دەوری ئاشی نوسـتـــوون، واتە ئەو سـەگـانە لە خـانو و ئیـداران بەستراونەوە و سـەگی گاریچیـەکانی کە پاسـەوانی تەویلەکانن، وەخـەبەر دێنێ. « کالون» سەگێکی کورگییە بە دەنگی بە سامی خۆی سەگەلی خانوەکانی کوێستانی سەر گردەکان، واتە سـەگەلی ڕاو ێ و تولە فەرنگییەکان ژنە بە فیزەکان داڕۆژێنێ.

دۆن پاولۆ هەر وا چاوی بەسـتـوون ئێـسـتـا سی چل سـەگ لە چوار لای گوندی دەوەڕن و دەلورێنن. گاری لە ئاخرین مالّەکانی « ئۆرتا »ش تێپەڕیوە بە لام سەگەل هەر وا دەوەڕن. پاشـان یەک لە دوای یەک بێـدەنگ دەبن. لە هـەموان بێ حـەیا تر « کـالون» ە، کـاتێ ئەویش بێـدەنگ دەبێ، دۆن پاولۆ چاوان دەکـاتەوە گـاری بـە پێش حـەوزی فـوارەدا تێدەپەڕێ کـە تایبـەتی بۆ ئەو ولاخـانەیە کـە لە مـەزرا دەگـەڕێنەوە. لەسە حەوزی فوارە تەتەلّەیەکی مس دەبینرێ لە سەری نووسراوە: بە هیممەتی بنە مالەی سپینا دروست کراوە.

دۆن پاولۆ بە گاریچی دەلّێ: « من تینوومە. ڕایگرە »

لە گـاری دێتـە خـوار، بە لوێچی دەسـتی ئاو دەخـواتەوە. بە دەسـتـە تەڕەکـانی نێـوچاوانی تەڕ دەکا کـە لە گـەرمـان دەسـووتێ. جـادە ئیـتر بەردەلان نیـە و ئەسپ دەتوانێ بە یۆرتمە بڕوا. ئەو دەم دۆن پاولۆ پشت لە ئەسپ دادەنیشێ و تەماشای ئاخـرین چراکـانـی گـوندی خـۆی دەکـات. هێشـتـا دە دوازدە پەنجـەرەی ڕوناک لە تاریکایی شەو دا دەبینرێن کە وردە وردە دەکوژێنەوە. یەک لەو سەرە لە سەر گردی دەکوژێتـەوە، یەکـیتر لە خوارێ لە نیزیکی ئاش، یەک لە لای چۆم و پاشـان یەک لە لای گۆڕسـتان. پاشان دیسـان لە سـەر گردی دەکوژێتـەوە، پاشان یەک لە گۆڕسـتان و یەکێ خـوار تر و ئاخردکەشی ئاخرین چرای گۆڕسـتان دەکوژێتەوە. ئێستا ئیتر لە سێ پەنجـــەرە زیاتر ڕونـاکـیــان نەمــاون و چونکە شـــەویش درنگە لە وانەیە

پەنجەرەی وەتاخی نەخۆشان بن. دۆن پاولۆ هەموو خانو و کوچە باخ و پەنجەرە و باخەکان دەناسێتەوە. گاری بە تەنیشت کانگای قەدیمی« پۆزولان» کە ڕۆژێک هی باوکی بوە و ئەو کاتێ مندالّ بوە لەوێ لە گەلّ منالّە کرێکاران گەمەی کردوە، تێدەپەڕێ. لە پەنا جادە لە سەر گردی ڕەزی خۆی دەناسێتەوە کە تاقە مێراتی باوکی بوە و بۆی بە جێماوە. دار هەنجیرەکان هەر وا لە جێی خۆیانن بە لام دیار نیە دارە گێلاس و گوێزەکان چییان لێهاتوە. گۆیا مامی کە بەر پرسی پاراستنیان بوە ئەو دارانەی بڕیوە. دۆن پاولۆ چاوی پڕ دەبن لە ئەسرین. بەلام لە پڕ گزە بای شەوانە بۆ لای ڕۆژ هەلات دەسوڕێ وبا هەلّیدەکاتێ. لە لای ڕۆژ هەلات خشە خش دەکەوێتە نێو داران، مانگ هەلّدێ، دۆن پاولۆ مل بە لاوە دەنێ و خەوی لێدەکەوێ.

لە گوندی« فۆسادی مارسی» لە پێش میوانخانەی « تورمنسل» ئانیبال وە خەبەری دێنێ. بەر لە گەیشتن لە کەشیش دەپرسێ:« ئاغای کەشیش دەکرێ ڕاسپاردەیەک بۆ من بنووسی ؟

دۆن پاولۆ دەپرسێ : ڕاسپاردە بۆ کێ و بۆ چی ؟

ئانیبالّ تاوێک فیکر دەکاتەوە و دەلّێ: « ئێستا ناتوانم عەرزت بکەم ، بەلام ئاخر ڕۆژێک هەر بە کار دێت. تۆ دەتوانی ڕاسپاردەیەکی گشتی بنووسیت.

کەشیش دەلّێ: « ئاخر من تۆ ناناسم »

ئانیبالّ دوو بارە جادەی « ئاکوافرەدا » دەگرێتە پێش دەلّێ :« زۆر باشە، شەو بە خێر!»

دۆن پاولۆ بە زەحمەت بۆ ژووری خۆی سەر دەکەوێ. ئەوەندە هیلاکە دوو بارە خەوی لێدەکەوێتەوە. بەیانی زوو لە خەو ڕادەبێ، بەلام لە بەر تەمبەلّی ماوەیەکی درێژ لە جێدا دەمێنێتەوە.

دوکتۆر ساکا دەستوری تایبەتی بۆ نووسیوە کە :« کەشیش لە دەرەوەی قەلّەمڕەوی ڕوحانیی خۆی دەبێ چۆن ڕەفتار بکات.» دۆن پاولۆ سپادا کە قەشەی کەشیش نشینی فراسکاتییە، ئێستا هاتۆ تا لە گوندی کوێستانی« پێتراسکا» بەخشی قەلّەمڕەوی ڕوحانی کەشیشانی « مارس» چاک بێتەوە و سلامەتی خۆی وەدەست بێنێتەوە.

لە دەستورە تایپکراوەکاندا ئەم گیر و گرفتانەش پێش بێنی کراون کە ڕەنگە تووشیان بێت و چۆنیش بە سەریاندا زالّ بێت. دۆن پاولۆ دەیانخوێنێتەوە و دوو پاتیان دەکاتەوە. لە بەر ئەوەی ئەو کاریچییەی کە قەرارە بە دوایدا بێت و بیباتە «

پیتراسکا » تا دوای نیوەڕۆ نایە، تەواوی بەیانی لە ژوورەکەی خۆیدا دەمێنێتەوە. بە خۆشییەوە دەبینێ کە ئەو ژوورە ئاو و دەست شۆیی هەیە. پاش ماوەیەک مانەوە لە عەمباری کا، دەست و دمو چاو شوشتن بە ئاوی ڕەوان چێژی هەیە. جگە لەوە ئەم دەست شۆییە نیشانەی پێشکەوتنی ولاتەکەیەتی. لە بان دەستشۆیی بە خەتی گەورە نووسراوە:« لە موسافیرانی بە ڕێز داوا دەکەین کە میز دە دەست شۆیی نەکەن، چونکە بۆگەن دەبێت.» لە گەڵ ئەوەش دەست شۆیی بۆگەنیوی هەر لێدێت.

دۆن پاولۆ تەماشای ئاوێنە دەکات. پیش هەرەکەتی لە « ئاکوافردا » قژەکانی زۆر کورت کردوە. ئێستا بەو عەبای ڕەشی کەشیشی و قژی تاشراوی بیچمێکی سەیری لێ پەیدا بوە. وەختە ئەوەندە بە خۆی پێبکەنێ کە ئاوی لە چاوان بێت.

عەباکەی لە پێشەوە ٢٨ دوگمەی هەیە. خەمی ئەوە دایگرتوە کە هەر کاتێ دایکەنێ و بیکاتەوە بەری ئەشێ ٢٨ دوگمە بکاتەوە دایخاتەوە. پاشان تێدەگا کە ئەوەندە بەسە دوگمەکان تا نێو قەد بکاتەوە و عەباکەی بە سەریدا بێنێتە دەر و یا بە خوارەوەدا دەبەری کاتەوە. هەر چەندە ئەم جۆرە لیباس داکەندنە ژنانەیە و وە پێکەنینی دەخات. بەڵام قۆرتێکی دیکەی دێتە پێش. خەمی ئەوە دەیگرێ لە وە کە کاتێ بخوازێ شتێک لە گیرفانی دەربێنێ ناچار دەبێ داوینی عەبای هەڵداتەوە. داخوا ئەو لە کن خەڵک عەیب و گاڵتە نیە ؟ بەڵام پاشان لە ئاستی گیرفانانی کەلێنێک لە عەباکەیدا دەبینێتەوە کە بە هاسانی دەتوانێ دەست بخاتە گیرفانی. ئەو کەشفە شادی دەکات. تەنانەت لە وەش تێدەگات کە لیباسی کەشیشی هەر چۆنێ بێت، کارێکی گران نیە. لە سەر نانخواردن دۆن پاولۆ لە گەڵ خاوەنی میوانخانە کە بیوە ژنێکە بە ناوی « برە نیچە جیراسولە» دەبێتە ئاشنا.

دیوارەکانی سالۆنی نانخۆری بە لاپەڕی ڕەنگیی گۆڤارێکی ناسراوی حەفتەیی ڕازاوەتەوە. ڕەسمەکانی نیشاندەری شانۆی وروژێنەرن. لە جێیەک ڕەسمی کیژی سوژنەوانی ڕێگای ئاسنە کە دەیەوێ قەتارێک لە تەسادوفێکی حەتمی نەجات بدا. شوێنێکی تر ڕەسمی فرۆکەیە. هەڵۆ پەلاماری داوە. ڕەسمێکی دی قەفەسی باخی وەحشە کە لە نێو شار شکاوە و درندەکان هاتوونە دەر و سەریان دە دووی خەڵک ناوە.

مادام « برەنیچە » لە پێش مێزی کەشیش دادەنیشێ تا دەردی دڵی بەدبەختیەکانی خۆی بۆ باسبکات. ئەم ژنە کرستی نە بەستوە. زۆر ئارەقە دەکا و مەمکە گەورە و شل و بڵەکانی وەک دوو مەلەوان کە هیلاک بووبن و نەتوانن خۆ لە

سەر ئاو ڕابگرن. کاتێ « برەنیچە» لە بارەی کلیساوە دەست بە قسان دەکات، دۆن پاولۆ قسەکانی دەبڕێ و دەڵێ : «بە داخەوە من بەشی کەشیش نشینی ئێرە نیم. لە « فراسکاتی» بۆ حەسانەوە هاتوومە ئێرە.»

برەنیـچـە نارەحـەت و بێـدەنگ دەبێ. لە دەرەوە هـەتاوە. دۆن پاوڵۆ لە سـەر تەختێکی پێش میـوانخانە دادەنیشێ. پێنج شەش لاوی جوانی کڵاو بە سەر و سیفاری پێنەکراو لە سەر لێوان کە نیوەی دوگمەی باڵتۆیان دانەخراوە،لە سەر مێزێک دانیشتوون و خەونوچکە دەیان باتەوە و هەر دەڵێی زیندوو نین. لەولاتر چەند لاوی بێکار یاری وەرەق دەکەن و بەڵغەمیان لە هەموو لاوە وەک پەپولەی زەرد دەفڕێنن. زۆربەی ئەم لاوانە نیشانەی حیزبی دەوڵەتیان لە جێ دوگمەی خۆیان درووە. لە نێویاندا پیاوێکی بە تەمەنتر کە وەک قومار کەری خانە نشین دەچێ، بە سمێڵێکی بادراو بۆ بالا و ڕیشێکی بزنی و کلاوێکی لێوار پان لە سەر، لە گەڵ لاوەکان قومار دەکات. قاوەی خۆشی دەخواتەوە و دەنگی مڵچەی زاری دێت. لە گەڵ دیتنی کەشیش بۆ پاراستن لە چاو و زار دانیشتوان وریا دەکاتەوە و دەڵێ : « ئاسن ! ئاسن !»

ئەوانەی خەونوچکە دەیانباتەوە لە خەو ڕادەبەڕن و بە پەلە بە دوای شتێکی ئاسندا دەگەڕێن. ئەوانەی شتی ئاسن نادۆزنەوە دەست دە گیرفانی پانتۆڵەکانیان دەنێن. دۆن پاولۆ ئەم فێڵە دەزانێ و کەمی ماوە بە جنێو وەڵامیان بداتەوە. بەڵام بێدەنگ دەبێ. بە تایبەت کە دژ کردەوەی ئەم لاوە بێکارانە ناو ونیشانەی کەشیشایەتی وی مسۆگەر کردوە.

مەیدانێکی بچوک لە پێش میوانخانە بەرد ڕێژ کراوە. بارەگای حیزبی دەوڵەتی لە ئاخری مەیدانەکەیە کە ئالای لە سەر هەڵکراوە. ڕەسمێکی گەورەی هامبرت شاش بە سمێڵی گەورەوە لە وێ لە تالاری شارداریيە. دوکانێکی پارچە فرۆشی لە گۆشەیەکی مەیدان هەیە کە تۆپی کەتان و چارشێوی ژنانەی بە ڕەنگی تڵخ و توند لێ داتراوە. پارچە فرۆش لە پێش دوکانی خۆی دانیشتوە و سمێڵی ئەستوری بە شکڵی دوو شاخەی دوو چەرخە بۆ لای سەرو باداوە.

مێش دەوریان داوە، جار و بار وەک گا دەنگێکی لێ دێتە دەر و تفێک تا نێوە ڕاستی مەیدان فڕێ دەدا. گۆشەی ئەو مالانەی کە بە سەر مەیدانەکە دا دەڕوانن، کە بە شکڵی مەڕ مەڕ ڕەنگ کراون. هێندێ نووسراوەیان لە تاریفی لێهاتوویی

---

قـارەمـانێكی بە ناو بانگی مۆتۆڕ سـوار، بە سـیـمی تەلەفـونەوە هەڵواسـراوە. بوونی قەشـەیەكی غەریب بۆتە هۆی كۆبوونەوەی دەسـتـەیەک لە سـواڵكەرانی ڕەش و ڕووت كە مێشی یەكجار زۆر دەوریان لێداون. یەكی نەقوستان كە بە دار دەستیش بە زەحـمـەت دەتوانێ بە ڕێگادا بڕوات، بە ناوی گشت پیرۆزەكان داوای سـواڵ و سەدەقە دەكات.

دۆن پاولۆ دەگەڕێتەوە بۆ میوانخانە. « برەنیچە» لێی وەنیزیک دەكەوێ غیرەتێک وە بەر خۆ دەنێ و دەڵێ:

– تۆ وەپیـاوێكی بـاش دەچي. كـیـژێک لێـرە لە سـەرە مـەرگ دایە.. دۆن پـاولۆ دیسان قسە كەی دەبڕێ و دەڵێ:« بە داخەوە من بەشـی كەشیش نشینی ئێرە نیم » ئیتر« برەنیچە» ناتوانێ پێشی گریانی خۆی بگرێ و دەڵێ :

– كە وابوو ڕێگا بدە با ڕوو داوەكەت بۆ باسكەم. كیژەكە نایەوێ كەشیشی ئەم ناوچەیە بێتە بان سەری چونكە خزمیەتی. من پێم گوت قـەشـەیەكی غـەریب هاتۆتە ئێرە لە ڕێگایەكی دوورەوە هاتوە. ئەو پەسندی كرد كە تۆ بچیە بان سەری.

دۆن پاولۆ دوو بارە دەڵێ: « بە داخەوە من بەشـی ئەم كەشیش نشینە نیم.»

« برە نیچە» بە گریانەوە سەر ڕادە وەشێنێ:

– چۆن دەتوانی كیژێكی فەقیر بە بێ كەشـیش و بەمـحالە و بێ دوكتۆر بەرەڵا كـەی تـا بمرێ. ئەگـەر ئـەسـپـێک بێـتـە مـردن دوكـتـۆری حـەیوان بانگ دەكـەن و دراوسێیكان بۆ یارمەتی بانگ دەكەن.

دۆن پاولۆ بە سـەر سوڕ مانەوە دەپرسێ: « بۆچ بێ دوكتۆر ؟»

« برە نیـچـە» لە وە دەترسێ كـە زیاد لە ئەندازە هـەڵە وەڕی كرد بێ. سـەیرێكی دەوور و بەری خـۆی دەكا و پاشـان بە ترسـەوە دەپرسێ: « داخـوا دەتوانم بـە نهێنی شتێكت پێ بڵێم.»

دۆن پاولۆ بە ئامـاژەی سـەر وەڵام ئەرێ دەداتەوە.

« برە نـیـچـــە » بە گـــریان بـە هەوایـەكي لە ســـەر خـــۆ دەست بە گـــێـــڕانەوەی داستانەكە دەكات :

– كیژەكە بێمێردە. چوە خۆڵی وەسـەر خۆ كردوە. ئەو دەم بۆ ئەوەی ئابڕووی نە چێ و شـەڕافـەتـی بنە مـاڵەی بەڵە دار نەبێ هەوڵی داوە منداڵەكە فڕێبدات. قـانون ڕێگا نـادا و ئەگـەر دوكـتـۆر و یا مـامـان و یا هـەر كـەسـێک بیـەوێ بـۆ كـارێكی وا یاریدەی ژنێک بدات، سـزای زیندانە. ڕوو داوی ئاوا زۆر قـەومـاون كـە هـەموویان

کەوتوونەتە بەندیخانەوە. ئەوەندە بەسە کە ڕۆژنامەکان بخوێنییەوە. هێندێکی وا هەن تووشی ڕۆژی ڕەشتریش هاتوون. کیژی سەر دەفتەری « فۆسا » کە چوار مانگە سگی پڕ بوو، ئاوی ژاولی خواردەوە. کیژێکی دیکە کە خزمەتکاری کەلانتەر بوو، چوە « تیولی » تا خۆی بخاتە ئاو هەڵدێر. ئەم کیژەی ئێستا باسی دەکەم هەولی داوە بە تەنیایی خۆی نەجات بدا. چاری نەبوو جگە لەم دوو ڕێیە کە یەکیان هەڵبژێرێ – بێ ئابڕوویی یا مەرگ – ئەو مردنی هەڵبژارد. ئێستا لە سەرە مەرگ دایە. دوکتۆر ناتوانێ بچێتە بان سەری. چونکە دەیکاتە سوڕەتە مەجلیس و ڕازەکە بلاو دەبێتەوە. نایەوێ کەشیشی ئێرە بچێتە بان سەری. چونکە خزمیەتی. دیارە ئەو خەتای کردوە، بەلام بەخشین هەموو کەس دەگرێتەوە. مەسیح بۆ خاتری هەموو دنیا لە سەر چوار میخە گیانی دا. دۆن پاولۆ لە عەجەبەتان لە جێی خۆ وشک بوو. برەنیچە ئامازەی پێدەکات کە وەدوای کەوێ تا شتێکی دیکەی بۆ باسبکات. قەشە بە دوایدا دەچێتە قاتی یەکەم. برەنیچە دەچێتە ژوورێک و دۆن پاولۆ بە دوایدا. ژوورێکی نیوە تاریک، بۆنی دەرمانی ضد عفونی لێدێت. تەختێکی ئاسنی بچوکیان لە قوژبنێک لە ژێر خاچێکی گەورە داناوە. برە نیچە بە سەبروکە بانگ دەکات : « بیانکینا !»

شتێک لە جێیەکە دا دەبزوێ. لە نێو پرچی ڕەشی کە بە سەر سەرینەکەیدا بلاویوونەوە، ڕوومەتێکی وەک مانگ و منداڵانە و تێک شکاو لە دەرد و ژان دەر دەکەوێ. دۆن پاولۆ هەست دەکا کە برەنیچە لە ژوورەکە چۆتە دەر. مات و سەر سام لە پەنای ڕادەوەستێ. تاوێک وڕ دەبێ و بیر دەکاتەوە کە بە سەبروکە بچێتە دەر. بەلام چاوە داپچڕاوەکانی کیژی لە سەرە مەرگدا نیگەرانی وین. ئەگەر بڕوا و نەخۆش هاوار بکا چۆن دەبێ؟ چۆن ئەم نەخۆشە سەرە مەرگە تێبگەیەنێ کە کەشیشی بە ڕاستی نیە. لە لایەکی دیکەشەوە خۆ تێوەردان لە گاڵتەی ئاوا، کارێکە لێی بێزارە. دۆن پاولۆ ڕادەوەستێ و نازانێ چبکات. لە دەستورەکانی دوکتۆر ساکا دا ئەم شتانە پێشبینی نەکراون. نەخۆشی بەد بەخت هەر وا بە چاوی زەقەوە لە کەشیش ڕاماوە. ئەو دەم دۆن پاولۆ سلاو دەکا و لە سەر نوکی پێ لێی دەچێتە پێش. لە سەر نەخۆش دادێتەوە و دەستی دەگرێ و ماچی دەکات. چاوی کیژ پڕ دەبن لە ڕۆندک. شەمەدێکی تەنک، قالبێ جەستەی ناسک ولاواز و مەمکی قوتی وەک لیمۆ و قاچی باریکی ئەوە. کەشیش پێی دەڵێ :

– منداڵی ئازیز، منداڵی خۆشە ویستم ! من لە هەموو شت ئاگا دارم تکات

لێـدەکـەم هـیـچی دیکەم پێ نەڵێی. تکا دەکەم ئێـتـر خـەم و خـەفـەتی سـەرشـۆڕی نەخۆی، ڕەنج و دەردی خۆت تازە نەکەیەوە. تۆ پێویستت بە ئیعتراف بە گوناحانت نیە. پێشتر ئیقراریان لە تۆ وەر گرتوە.

ئەو دەم نەخۆش دەپرسێ : « کە وا بوو تۆ لە گوناحی من خۆش دەبی ؟»

– بەڵێ، منداڵی ئازیزم! تۆ بەخشراوی. چۆن دەتوانم تۆ نە بـەخـشـم. تۆ تاوانی گوناحی خۆت داوە ئەم تاوانەش زۆر قورس بوە.

دۆن پاولۆ دەسـتی کـیـژی گـەنج دەگرێتـە دەست. دەسـتی هەر دوکـان گـەرمـە. کیژەکە دەپرسێ :

– دەڵێی تۆش تا و لەرزت هەیە. بۆچما تۆش نەخۆشی ؟

دۆن پاولۆ بە سەر تەکاندان وەڵامی ئەرێ دەداتەوە و بە بزەیەکەوە دەڵێ :

– منیش وا سزا دەدەمەوە.

لە کۆڵان دەنگی« ماگاشیا » ی کاریچی دێت کە دەڵێ :

– کوا ئەم کەشیشەی دەچێتە « پیتراسکا »

دۆن پاولۆ بە کـیـژی جـوان دەڵێ :« من دەبێ بڕۆم. تۆ هێچ مـەترسێ چونکە بەخـشـراوی. بەڵام لە کـۆمـەڵگایەکی چەپەڵدا کە تۆی مـەجـبـور کردوە تا لە نێوان مەرگ و بێ ئابڕوویدا یەکیان هەڵبژێری، بەخشین هەر نیە.

« مـاگـاشـیـا » ی پیر لە پێش میوانخانە دانیشتوە. ئەو پێشـتـر شۆرباوی خـۆی خواردوە و ئێستا خـەریکە نانەکە بە شـەراب تەڕ دەکا. زەلامێکە باڵا بـەرز، ڕیش دار، چوار شـــانـە و زەبەلاح. لە جـیـاتی باسکی چەپەی کـــە بڕاوەتەوە، قــۆڵی چاکەتەکەی بە شانی داداوە. کـەشیشی لە سـەر کورسی لە پەنا خـۆی دادەنێ و گارییەکەی بە کاوە خۆ دەکەوێتە ڕێ کە دێڵە کەرێک ڕایدەکێشێ. قەشە دەپرسێ:

– لە مێژە باسکتیان بڕاوەتەوە.؟

– پێش دوو ساڵ لە « شاند لور » بڕیانـەوە ئاخ و ئۆف فایدەی چی هەیە؟« خودا مێشەکان بۆ کەری پیر دەنێرێ »

ماگاشیا هەوسارەکان لە ئاڵقەی پێش عارەبانە دەبەستێ، سەبیلەکەی پێدەکا و لە ڕوونکردنەوەی کاری خۆیدا دەڵێ:

– ڕاگرتنی هـەوسـارەکان بە دەست هیچ پێـویست نیە. ئەم دێڵـە کەرە دەسـاڵە هەمـوو حەوتوان ئەم ڕێگایە دەبڕێ و هـیچ مەترسی ئەوەش نیـە کـە لە ڕێگا لابدات. تەنانـەت دەزانێ بۆ ئاو خـواردنەوە و بۆ دەست بـە ئاو گـەیاندن لە کـوێ بوەسـتێ.

دەشزانی کە هەموو هەوراز و لێژێک بە چەند ببڕێ.

ماگاشیا لە « فۆسا » کڵاوێکی تازەی کڕیوە و کڵاوە کۆنەکەی بە دەزوو لە بەری وی دروەوە و لە سەری ناوە. لە پێشدا کڵاوەکان لە بان سەر و پاشان وەک سەر بازێکی جەنگی بە لا سەر و پاشان بە لا گوێچکەیەکی ترە وە دەنێ و بەڵام ئاخرەکەی سەر ناکەوێ وەک گەرەکیەتی لە سەری بنێ. دێڵە کەری فەقیر کە لە گاری بەستراوە بە کەشیشی نیشان دەدا و دەڵێ :

– ئەم حەیوانە ناوی « باد پا » یە. باد پا یانی تیژرۆ. بەڵام ئێستا پیر بوە. بۆیە وا بە سەبر دەڕوا.

کەشیش دەڵێ: « ئێمەش پیر بووین. »

ماگاشیا دەڵێ: « دیسان خۆش بە حاڵی کەر. کەر تەنیا تا بیست و چوار ساڵ کار دەکات. بەڵام هێستر ٢٢ ساڵ و ئەسپ ١٥ ساڵ کار دەکات. بەڵام مرۆڤ تا حەفتا ساڵ و زیاتریش. خوا بەزەیی بە حەیوانات داهاتوە و نەک بە ئادەمیزاد. هیچ ناکرێ چونکە هەقیەتی هەر چی دەیەوێ وابکات.

گاری بە پێش تەویلە دا تێدەپەڕێ، « باد پا » بە دەنگ و هەوایەکی ناخۆش دەزەڕێنێ و پاشان هەنگاو توند دەکا تا ئەو جێیە لێی ڕادەوەستێ. لە تەویلە زەڕەڕەیەک وەڵامی دەداتەوە. ماگاشیا دەڵێ :

– ئەوە یەکێ لە دۆستانی قەدیمی« بادپا » یە. کاتێکی بادپاگەنج بوو،لە گەڵ ئەم هەڤاڵەی کەین وبەینی هەبوو، بۆیە هەموو جارێ کە بێرە دا ڕادەبرێ هەر تکیان سڵاو لێکتر دەکەن. بێگومان ئێمرۆ هەر تکیان پیر بوون بەڵام دڵ قەت پیر نابێ.

کە لە گوند دەر دەکەون، جادە دەبێتە هەوراز. کەشیش تەواوی چیا و دۆڵ وەزرا و ڕێگاکان دەناسیتەوە. تا گاری دەچێتە پێش جادە هەر وا بە سەر دەشتی سەوز و شکڵ سەدەفیی فۆچینۆ دا دەڕوانێ کە وەک زاری گەورەی ئاگر پژێنێک دەچێ. لە دەور و بەری ئەم زارە گوندەکان هێشتا شوێنە واری بومە لەرزەیان پاراستوە و وەک کەندووی قەڵشیوو وێران دێنە پێش کە بەشێکیان ئاوەدان کرا بنەوە. هێشتا بۆنی ئاو وئاگر لەم عەردە دێت. گاری ماگاشیا هەر وا سەبر دەڕوات. عارەبانێک کە گیای لە سەرە و زەلامێک لە بانی خەوی لێکەوتوە، دەیگاتێ و وە پێشی دەکەوێ. بڕێک دوور تر عارەبانەیەکی تر کە گایەک و مانگایەک دەیکێشن وە پێشی دەکەون. خێزانێکی وەرزێریش کە ژن و مێرد و منداڵ سواری کەرێک بوون، وە پێشی دەکەون. ژنەکە مەمکی وەدەر خستوون ومنداڵەکە شیر دەدا.

ماگاشیا لە کابرای کەر سوار دەپرسێ: « ئەمساڵ بەر و بوو چۆنە ؟»
- چەندی بڵێی خەراپە.
ماگاشیا بە سرتە بە کەشیش دەڵێ :« ئەوە مانای وایە ئەمساڵ بەر و بوویان زۆر باشە.»
- کە وابوو بۆ چی پێچەوانەی گوت ؟
- چۆن بۆ چی ؟ بۆ پاراستن لە چاوی پیس
کەشیش دەپرسێ :« بەر و بوو لە لای ئێوە چۆنە ؟»
ماگاشیا نیشانەی خاچ دەکێشێ و لە وەڵامدا دەڵێ : ئیفتیزاحە.. بە ڕاستی ئیفتیزاحە
کەشیش دەڵێ: « لە گەڵ ئەوەش تا ئێستا هەوای باشبوە »
ماگاشیا دەڵێ : « خەتای ترومبیلانە بە بۆنی پیسی گازەکان حاسڵات خەراپ دەکەن.

لە لایەکی جادە نێوە نێوە کۆگا بەرد ڕۆ کراون. لە پەنا ئەم کۆگا بەردانە بەرد شکێن لە بن لق و گەڵا دانیشتوون و بە کوتک بەردان ورد دەکەن. کاری ماگاشیا لە گوندی« لاما دیمارسی» تێدەپەڕێ. لە سەر دەرگایان شاخی گایان بۆ چاو وزار هەڵاوسیوە. ژنەکان وەک هەموو شوێنێ لە سەر کانی چاوە ڕوانی نۆرەن. پیرە پیاو لە بەر دەرگا خەریکی سەبیلە کێشانن. ژاندارمیش دە لیباسی یەک ڕەنگی ژمنراڵەکانی دەورانی پێش شەڕ بە تەنیا لە شەقامەکان دێن و دەچن. لە دەرەوەی گوندی « لاما» نوێژ دانێک بە ناوی «مریەمی دەست لێ نەدراو» دروست کراوە. ماگاشیا نیشانەی خاچ دەکێشێ و دەڵێ :

- ئەوە نوێژدانی حەزرەتی مریەمە کە بە یادی موجیزەیەکی قەدیم بە ناوی نوێژدانی « گوڵی سوور» دروستکراوە. لەو ساڵە ڕاست لە نێوە ڕاستی مانگی ژانویە دا گوڵی سوور پشکووتن و گێلاسیش پێگەیشتن و مەریش زان. بەڵام خەڵک نەک هەر خۆشحاڵ نە بوون، بەڵکوو ترساشن. گریمان دەدرا کە ئەم بەخشینەی عاسمان، بانگەوازی کارەساتێکی گەورە بێت. قەزا و قەدەر هەر لەو ساڵە دا تاعون هات.

- کە وابوو ئەم نوێژدانەیان بۆ دروستکرد؟
- بۆ ئەوەی حەزرەتی مریەم قینی بنیشێتەوە. پاشان لێی زیاد دەکا و دەڵێ:
- ئەمساڵ دیسان ساڵێکی باشە. بەڵام نەک لای ئێمە. مەبەستم ئەوەیە بۆ

خــەڵکی دیکە ئەمســاڵ بە کـشــتی ســاڵێکی باشــە. خــوا دەزانێ دیســان چ بەد بەختیەکمان بە سەر دێت.

لەو لای نوێژ دان ڕێگا بە شێوەی مار پێچ بە نێوان دوو گردانددا دەڕوا. بە سەر پردێکدا تێدەپەڕێ و دەچێتە دۆڵی « پیتراسکا ».

چەند ژن دەســتــەیەکـیــان پێکهــێناوە و مــانگایەکی پیــر بە دوای خــۆیــاندا ڕادەکێشن. بەڵام مـانگا بە دیتنی پرد جەنە دەگرێ و قـاچ لە هەردی قایم دەکات و بە هیچ قیمەتێک نایەوێ قـاچ هەڵبڕێ. یەک لە ژنەکان دەڵێ: « سنددان کوشتوو تۆ زۆر جار بەم پردە دا تێپەڕ بووی، ئێستـا بۆ ناتەوێ؟ شـەرم ناکەی ؟ بە ڕاستی دەبێ شەرم بکەی. بۆ لە خۆڕا جەنە دەگری؟

گـاری مـاگـاشـیـا بە دۆڵی پیتـراسکا دا، کە لە هەوڵەوە بەرینە و پاشـان بە لێژی بەردەلانـی پڕ لە بەردی هـەتاو بردوودا، ســەبر ســەبر دەڕواتە پێش. لە خــوارەوەی بەردەکان ، لەو شوێنانە کە سێلاو لم و لیتەی لێ بە جێ هێشتوە، زەوی بچوک هەن کە هەرزن و پەتاتەیان لێ چاندوون. ئەم زەویە بچوکانە، نەک بە هەکتـار، بەڵکوو بە گەز و تەناف دەیانپێوون. لە بناری چیا پارچە زەوی کێڵراو هەن کە هەتوانـی سـەر برین وەبیر مرۆڤ دێننەوە. لە تەواوی ناوچەکان کە بڕوکە زەویەکی شایانی کشت و کاڵ پەیدا بوە، نیشانەی تێکۆشانی ئادەمیزاد بەر چاو دەکەوێ. گاری و عارەبەکان بە پێکهێنانی دوو شوێنی قوڵی وەک هێڵی ڕێگای ئاسن، جادەی تەنگی ویلایەتیان بڕیوە کـە لە درێژایی بەردەلانـدا سـێـلاو کـێـشـاویـەتی. گـاری دەڕواتە پێش. هـەتا زیاتـریش دەڕوا بنـارەکـانـی دۆڵ لە بەر گــەرمــای ســووتێنەر وســێــلاوەکــان و باو کێژەڵوکە لوسـتر وقەڵشیوتر و کرێنتر دەبێ. بزنەکان لە چڵە گیای نێو بەردان کە دەنک دەنک پەیدا دەبێ دەلەوەڕێن و ڕیشی شەیتانیی خۆیان بەرەو قەشـەی غەریب کە بە گاری هەڵگری توتن و خوێ سـەفەر دەکا ڕادەوەشێنن. سەر کەوتن لە بناری چیا دژوار تر دەبێ. بۆ سوک بوونی بار، ماگاشیا دادەبەزێ.

لە سەر پێچێک خانوێک دەر دەکەوێ کە بە شکڵی خانو بەرەی « ڕینسانس» لە سەر تەختە بەردێک دروست کراوە. دەرگا و پەنجەرەکانی توند داخراون. ماگاشیا لە باسی ئەم خانوە دا دەڵێ :

– ئێرە خـانووی کوێستـانیی « سیمونە سکارافا » یە. ئەو پاش ئەوەی سی ساڵ لە بیـرزیل بردیە سـەر و لە کـشـتی قـاوە سـامانێکی زۆری وە سـەر یەکنا، ویسـتی بگەڕێتەوە نیشـتـمـان تا بە دڵێکی ئاسودە لە سـامـانی خـۆی کەلک وەر گرێ. ئەم

خـانوه کویستانیـەشی بۆ خۆی دروستکرد. بەلام هێشتا حەفتەیەک تێیدا نە ژیا بوو، شێت بوو، وای لێهات ناچار بوون بیبەنە نەخۆشخانەی « ئاکویلا » لە « سانتا ماریای کۆلە ماجیو » هێشتاش هەر لە وێیە. بەراستی ئەرزشی چی هەبوو کە بۆ پەیدا کردنی سامان ئەو هەموو زەحمەتە بکێشێ.

لە نێو دۆڵەکە دەستە هەورێک لە بزووتن دان کە لە چیاکانەوە بۆ لای دەشتێ دێن ، واتە لە کـوێستـانەوە بۆ لای شـار لە خـاچێکی دار کـە لە کویە بەردێک قـایم کراوە ئەم نووسراوە بەر چاو دەکەوێ: « ٢٢ ی ئوتی ١٩٠٩ »

ماگاشیا دەڵێ : « ئەلێرە « دۆن جیۆ لو» سـەر دەفتەری « لامـا » یان ڕووتکرد و کوشتیان. لە شیکردنی جەستـەی دەر کەوت حـەوت چەقۆیان لە دڵێ دابوو. کـەس نەیزانی کێ ئەو بەڵایەی بە سـەر هێنا . دۆن جـیـۆلۆ بە سـوتی سـەتا سی پارەی بە قەرز دەدا . پاش کوشتنی وی سوتخۆری نەما .

لە قولایی دۆڵ هەوەڵین خانوەکانی « پیتراسکا » دەر دەکەون. ماگاشیا دەڵێ :

– ئەمـە لەو گوندانـەیە کـە شـانسی نیە. دوو جـار لافـاو وجـارێکیش بومـە لەرزە وێرانی کردوە.

کەشیش دەپرسێ: « ئێستا حەشیمەتی چەندە.؟»

– هێشتا چل مالێک دەبێ. ئەوانەی کە دەتوانن بۆ دەشت بار بکەن.

لە لایەکی جادە دیسـان کـویـەیەکی بەرد دەبینرێ کـە خـاچێکی داری لێ قـایم کـراوە. لە سـەر خـاچەکـە نـووسـراوە:« ١٥ی مـانگی مـای ١٩٢٣ » مـاگـاشـیـا بۆ ڕوونکردنەوەی وی دەڵێ :

– لێـرە « ونچـنزینـۆ سـاپـونـە» بە هـاندانی هـەسـتـی ئێـرەیی کـوژراوە. ئەم « وینـچنزینـۆیە» لە گـەڵ ژنێکی ئـەمریکایی تێکەڵ ببـوو. کـاتێ مـێـرد لە ئەمـریـکا گەڕایەوە، گەرووی ژنـەکەی لە خـەوێدا بە تیغی ڕیشتـاشـینێ بڕی و پـاشـان هـاتە ئێرە و لە پشت تەختە بەردێک خۆی لە « وینـچنزینۆ» مات کرد کە بۆ سەر کار بێرە دا هاتوو چۆی دەکرد. کـاتێ وینچنزینۆ هات ئەمـریکـایی خـۆی پێدادا و بە داس سەری لێکردەوە. پاشـان وە چیا کەوت بەلام پاش سێ مانگ گرتیان و بە سی ساڵ زیندان مـەحـکوم کـرا . کـیـژێکی هەبوو ئـێـسـتـا گـەورە بوە. بێ ئەدەبی نـە بێ ڕێی کەوتۆتە جندە خانەکانی نزیک سەر بازخانەی شاری ڕۆم. کیژێکی خەراپ نەبوو.

گـاری بە پێش خـاچێکی دیکە دا دەڕوا . مـاگـاشـیـا دیسـان دەست بـە گێڕانـەوەی نەقلێک دەکا و دەڵێ:

– لێرەکانەش ...
کەشیش قسەکەی دەبڕێ و دەڵێ:
– بێگومان لێرەش بەد بەختییەکی تر ڕوویداوە،
– تۆ لە کوێ دەزانی ؟
– ئاخر تۆ جگە لە داستانی بەد بەختی چیدیکەم بۆ باس ناکەی. چما دەتەوێ بمترسێنی ؟ داخوا دەکرێ لێرەش کارەساتێکی ناخۆش ڕووی نەدابێت ؟
ماگاشیا دەڵێ: « ڕووداوە باشەکان لە بیر دەچنەوە بەڵام بەسەر هاتی خەراپ و ناخۆش هەمیشە لە بیر دەمێنێ و لە باوکەوە بۆ کوڕ سینگ بە سینگ نەقڵ دەکرێن. کەسێکی مردوە ئەگەر پیاوێکی باش بوو بێت، یەکسەر دەچێتە بەهەشت. بەڵام ئەگەر بە گوناحباری کوژرا بێ هەر لەم دۆڵە دا دەمێنێتەوە. بۆیە هەمیشە باسی دەکەن. کەسێکی بکوژرێ ئیتر ڕوحی ئارامی نابینێ. ساڵەکانی هەوەڵێ ڕێبوارەکان بێ ئارامی ڕوحی بەردەێک داوێنە شوێنی جنایەتەکە. ئێوەی کەشیش پێچەوانەی ئەوە دەڵێن. لە گەڵ ئەوەش وەزعەکە هەر وایە وەک من گوتم.
ئێستا گاری بە پەنا هەڵدێرێکی لافاو دڕدا ڕادەبرێ. ماگاشیا دیسان دەڵێ :
– لێرە برای فەقیری من بە گارییەوە هەڵدێرا، شەو بوو. بە بارە توتن و خوێیەوە لە فۆساوە دەگەڕاوە. ڕاست لەو شوێنە بوو شەیتان لە سەر ڕێگای سەوز بوو. فەقیرە تەنانەت دەرفەتی نەهێنا نیشانەی خاچیش بکێشێ. هێستری گاری دەکێشا ڕەوییەوە و بۆ دەرباز بوون لە چنگ شەیتان بە لای چەپە دا خلیسکا و کەوتە قوڵایی دۆڵەوە.
ئێستا لە نیزیک لافاو گر خانوێکی چۆل لە سەر گردێکی بچوک دەر دەکەوێ. ماگاشیا دەڵێ:
– ئەوە خانووی جندوکانە.
کەشیش دەپرسێ: « چۆن ؟ جندوکەش خانوویان بۆ خۆ دروست کردوە؟ لە کاڵتە دەر چێ کارەکانی وان زۆریش خەراپ نین. ماگاشیا حەوسەلەی کاڵتەی نیە و دەڵێ: « بنە ماڵەی « کولامارتینی» خەڵکی « پیتراسکا» ئەم خانوەیان دروستکرد. بەڵام هێشتا تەواو نەببوو، جندوکە داگیریان کرد. پاشان کەس نەیتوانیوە لە ناویدا نیشتە جێ بێت. لەم دۆڵە دا هەموو کەس ئەم خانوە بە پەناگای« گوناحکاران» ناو دەبەن. ئێستا ئاخرەکەی دەگەنە پیتراسکا. شێست خانووی قەڵشیوی دوکەڵاوی کە بە دەرگا و پەنجەرەی داخراو دیارن بێگومان هێندێکیان چۆلن. گوند لە

مەیدانێکی رەحەتی ئاسا کە سروشت لە پانایی دۆڵدا هەڵی کەندوە، دروستکراوە. هێندێ لە خانوەکان بە وێنەی خانووی خۆ ڕاگر لە بەرانبەر بومە لەزە دروست کراون کە لە وەتا بوومە لەرزەی دوایی بۆتە ێیجباری. لە دەور و بەری ئەم مالانە چەند خانووی بچوکی لە قوڕ و بەرد و سوالەت دروستکراو، قوت بوونەوە. لە هەمووی ئەم مالانە بێجگە لە دوو خانووی نەختێ باش چیدی بەر چاو ناکەوێ. یەک لە وانە کە بە پردێەوە نووساوە، موسافیرخانەی « ماتاڵنا ڕیکۆتا» یە کە کەشیش پێویستە لەوێ بێتە خوار. ئەویتریان کە گەورەتر و قەدیمیترە و لەو پەڕی گوندی لە نێوە ڕاستی پارچە زەویەک بە داڕێژراوی بەرد، دروستکراوە. ئەوە مالی دەولەمەندی بنە مالەی « کۆلامارتینی» یە و تاقە مالی ئاوەدانی« پیتراسکا » یە کە لە لافاو وبومە لەرزە پارێزراوە.لە نیزیک مالی« کولامارتینی» گۆڕستانی گوندی و کلیسایەکی بچوک هەیە کە هەیوانی ڕووی لە دۆڵە.

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « داخوا لەو کلیسایە دا نوێژی مەسح-یش دەکرێ؟»

ماکاشیا دەڵێ :

– ئیستا سی ساڵە ئەم کلیسایە کەشیشی نیە. خەڵکی ئەم گوندە زۆر فەقیرن. لە کوێ دەتوانن خەرجی قەشە بکێشن.

لە دەور و بەری گوند و گۆڕستان زەویەکان بە پارچەی فرە بچوک دابەشکراون. مەزراکان ئەوەندە بچوک ودیواری بەردی سنوورەکانیان ئەوەندە زۆر و بەرزن کە لە دوورەوە مرۆڤ وادەزانێ شارێکی وێران و چۆل دەبینێ. چەند سەت میتر ئەولا تر لە « پیتراسکا » دۆڵ دەبەستریٚ و ئیتر ڕێگا نامێنێ. دوو جۆگەلەی باریک لە و سەری دۆڵەکە وە دێنە خوارێ ە بەر لەوەی بگەنە« پیتراسکا » تێکەڵ دەبنەوە. ئەم دوو بەشە بە هۆی پردێکی دار یەک دەگرنەوە. حەوزێکی قوارە لە پێش موسافیر خانەیە. منداڵێک کە خوێنی لە کەپۆی هاتوە لوتی دەشواتەوە وئاوەکە سوور هەڵگەڕاوە. ژن و کیژی گەنج لە ژێر پردەکە لە پەنا سێلاوگر دانیشتوون وجلەکانیان دەشۆن. ماکاشیا لە پێش موسافیر خانە کە « ماتالنا» لە وێ چاوەڕوان وێستاوە، کاری ڕادەگرێ. پیرە مێردێکیش دەگاتە وێ کە بالاپۆشێکی دێهاتی لە خوری ڕەش بە خۆ داداوە و سەر و ڕیشی تەواو سپی بوە. پیرە مێرد قولاپێکی ئاسنی لە سەر شانە، بەلام ئەم ئامرازە شتێکی لە فیزی وی کەم ناکاتەوە کە لە ناو چاوانیەوە دیارە. هەموو شت لە وێدا قەدیمە، تەنانەت قسەکانی پڕ لە ئەدەبیش کە بۆ بەخێر هێنانی کەشیش بە سەر زمان دادێن. لە بالا پۆشەکەی

هێشتا بۆنی خوری مەر دێت.

ماگاشیا دەیناسێ و دەڵێ :« ئاغای پاسکاڵ کولا مارتینی . »

دۆن پاولۆ داوای لێبوردن دەکا، هەست دەکا حاڵی باش نیە و لە بەر هیلاکی پەکی کەوتوە.« ماتالنا» ڕاست دەیباتە دیوێک کە بۆی ئامادە کردوە. خەو !

دۆن پاولۆ لە تاریکیدا دەنگی ژنێک دەبیسێ کە کوڕەکەی بانگ دەکاتەوە. کوڕەکە وەدرنگی کەوتوە و لە گەڵ هاڤالاتی یاری دەکات. بانگ دەکات: ڕاوەست دایە، هاتم، ئێستا دێمەوە.

٤

لە مەیدانی نێوان موسافیرخانەی« ماتالنا ریکۆتا » و پردی پیتراسکا بەیانی یەکشەمۆ ئاهەنگی ناو لێنانی کەرێک بەڕێوە دەچێ کە لە ئاخرین بازار دا کڕاوە. لاوێک هەوساری کەری بە دەستەوەیە و جۆتیارێکی پیریش بە دار لێی دەدا و پاش هەر دارێکیش هەر تک زەلام بە گوێی کەرەکە دا هاوار دەکەن: « گاریبالدی! »

گاریبالدی ناوێکە بۆ ئەو کەرەیان هەڵبژاردوە. لە قاموسی وەرزێراندا ئەم ناوە بە واتای بە هێز و ئازا و قەوت دێت. ناو لێنانەکە درێژە دەکێشێ چونکە بێگومان کاتی گەرەکە تا کەر تێبگات کە ناوی گاریبالدییە. وەرزێری پیر بە بێ هەستی قین و تورەیی، بە توندی لە پەراسووی ئەم حەیوانە دەدا و هەر دەڵێی دۆشک دەکوتێ. پاش هەر دارێکیش پیرە مێرد و لاو بە گوێی حەیواندا دەچرپێنن« گاریبالدی »!

کەر تەماشایان دەکا و هەموو جار سەر ڕادەوەشێنێ. جوتیاری پیر لە پەراسووی دەدا و هەر جارە لایەکی دەکوتێ. دەیان و دەیان جار ناوی « گاریبالدی » قارەمان و زەبری ئەو دارانەی وە پەراسووی حەیوان دەکەون لە مەیدانی پیترۆسکا بە نۆرە دەنگ دەدەنەوە. ئاخرەکەی جوتیاری پیر هیلاک دەبێ و بە لاوەکە دەڵێ: « ئیتر بەسە . بێگومان حەیوان تێگەیشتوە. »

ئەودەم لاو بۆ ئیمتیحان مستێک کا هەڵدەگرێ و دەچێت لە سەر پرد نیشانی دەدا و لە دوورەوە بانگ دەکات« گاریبالدی » کەر بە غار دەچێتە لای. لاو دەڵێ : « ڕاستە، تێگەیشتوە. »

دۆن پاولۆ لە جێدایە و تای هاتۆتێ، لە پشتی پەنجەرەوە لە سەر یەک چەند جار ناوی گاریبالدی دەبیسێ، مات و نیگەران دەبێ، ئایا لە وانەیە حیزبی کۆماریخواز لە پیتراسکا ئەوەندە بە هێز بێت ؟

کەشیش لە مالتانا ریکۆتا دەپرسێ: « چیاسە؟ »

– شتێکی گرنگ نیە. « شاتاپ » ی پیر کەرە تازەکەی خۆی ناو لێدەنێت »

شاتاپی پیر لە سەرانسەری دۆڵ بەم ناوە ناسراوە. ئاهەنگی ناو لێنانی خۆشی هەر وا بەڕێوە چوە. بە گەنجیەتی لە کن کابرایەکی ئەمریکایی بە ناوی « کارلۆ کامپانلا» ی خەڵکی پیتراسکا خزمەتکار بوە، ناو براو لە شاری نیۆیۆرک لە

شەقامی « ملبۆری» زستانان خەڵوز فرۆش و هاوینان سەهۆڵی فرۆشتوە. لە ڕاستیدا ئەوەی لە وڵات ناوی « کارلۆ کامپالا» بوو، لە نیۆیۆرک بە ناوی « مستر چارلزلیــــتل بیل یـخی -زخـــــاڵی»(Charles Little_ Bell,Ice and Coal)ناســرا بوو. وەک حەیوانی چوار پێ خزمەتکارەکەی دەکار دەکرد. هەموو جار کە ئەم حەیوانە بەد بەختە وەزمان دەهات،

« مستیر لیتل بیل» بە تووڕەیی بە سەریدا دەیگوڕاند کە : شات ئاپ!! Shat up « شات ئاپ» بە زمانی ئینگلیزی یانی « بێدەنگ بە - کڕ بە »، بەڵێ پاش ئەوەی شاتاپ چەند سالان لە ئەمریکا ژیا، لە زمانی ئینگلیسی جگە لە « شات ئاپ» چیتر فێر نەبوو. ئەوەشی وەخت و بێ وەخت دوو پات دەکردەوە. جارێک نەبوو کە ژنەکەی زمانی بگەڕێ، شەپێکی لێ نەداو بە ئاماژەی قامکی فەرمانی بێدەنگی نە داتێ و نەڵێ «شات ئاپ» بەمجۆرە وشەی شاتاپ هاتە نێو زمانی ناوچە و تاقە وشەی ئینگلیزی یە کە خەڵکی پیتراسکا مانای دەزانن وتاقە نیشانەی کلتوری تازەی بێگانەیە کە بە کلتوری کۆتی ناوچەوە نووساوە.

دۆن پاولۆ لە تەختی خەو دێتە خوار و دەچێتە بەر پەنجەرە و دەیەوێ ئەم پیاوە ببینێ. شاتاپ وکەرەکەی لە کۆڵانی باخی نیزیک پردی دار بۆ لای چۆم دێنە خوارێ. لە دەرگای کۆڵانی با خ تەتەڵەیەکی کۆن بەر چاو دەکەوێ لە سەری نووسراوە: « ڕشتنی زبڵ و پیسایی لێرە قەدەخەیە.» لە نووسینی ئەم ڕاستییە دیارە کە ئەو شوێنە پڕە لە زبڵ و سوالەت و شووشە شکاو وکۆنە کەوش وخواردەمەنی ڕزیو و پاشماوە و شتی دیکە. ڕەنگە ئەو مەسەلەی نیشان نەدا کە خەڵکی پیتراسکا زۆر بە تەنگ پاک و خاوێنیەوەن بەڵام لانی کەم نیشانەی ئەوەیە کە خوێندەوارن.

دۆن پاولۆ نەک هەر خوێندنەوە شارەزایە، بەڵکوو نووسینیش دەزانێ. تەنانە بە شێوەی ئەدەبیش. لە گەڵ ئەوەش تەواوی زانست و زانیاری وی ناتوانێ بۆ چارە سەر کردنی مەسەلەی دژواری پاک و خاوێنی یارمەتی بدات. ئەم مەسەلەیە لە ڕوانگەی دۆن پاولۆ وە ئەگەر نیشانەی وەزعی ژیانی خەڵکی دێهاتی خوارووی ئیتالیا نە بایە و لە لایەکی تر ئەگەر بە پێچەوانەی تەواوی ئەو بێبەشیانەی کە تا ئێستا توانیبووی خۆیان لە بەر ڕابگرێ، بۆ ئەوەشیان هەر دەیتوانی و پێویستیش نە بوو لێرەدا باسی بکات.

لە پیتراسکاش وەک زۆربەی دێهاتەکانی درواسێ ئاودەستی تایبەتی نیە. بە

گوێرەی داب و نەریت سێ جۆر ئاودەستی گشتی بوونەتە باو کە بریتین لە سێ پنچکە دڕوو کـە هێندێ لێک دوور لە سێ جـێگا لە قـەراخ چۆم چەقـێنراون. لە بەهاردا ئەم دڕکانە گەڵا و لق و پۆپ دەر دەکەن و دادەپۆشرێن. کەسێکی لە پشت ئەو پنچکانە دادەنیشێ کەم و زۆر لە بەر چاوان دیار نیە. بەڵام لە پایزدا وەزعەکە دزێو و دژوارە. دابەکەش وایە هەر یەک لەم سێ پنچکانە بۆ چینێکی دیاریکراوی دانیشتووی گوند دانراون. پنچکی هەوەڵیان بۆ وەرزێرانی هەرە فەقیر، پنچکی دووهەمیان بۆ وردە مالیکان دانراوە، پنچکی سێهەم بۆ ژنانە. منداڵ دەچنە پشت کلیسا. ئەم دابە هەمیشە لە بەر چاو دەگیرا و جگە لە سەر دەمی پاش شەڕ، واتە سەر دەمێک کە بە ڕواڵەت بە « مەترسی سوور » ناسرا بوو، ئەم دابە تێکنەچوو. ئەو دەم وا هاتە پێش کە وەرزێرە فەقیرەکان ئیتر نە دەچوونە پشت پنچکی هەوەڵێ و بە فیزەوە دەچوونە پشت پنچکی دووهەم. بەم کارە لە سەرە تاوە وردە مالیکەکان سەریان سـوڕ دەمـاو باوەڕیان نەدەکـرد، پاشـان بوو بە بێـزاری و توڕەیی و هەڕەشەش ئەوان لە یەکتریان دەپرسی: « ئەدی ئێمە بچینە کوێ ؟ »

ئەو دەم « ماتالنا ریکوتا » دەیگوت: « ئەی وای دین لە دەست چوو. »

بە خۆشییەوە ئەو سەر لێشێواوییەی لە بارەی مەزهەبەوە بە هۆی شەڕ لە بیر و باوەڕی خـەڵکدا پێکهاتبـوو، نەمـا. نەزم و زاکـون دوو بارە هاتەوە جێ. کـەلک وەر گرتن لە پشتی پنچکەکان وەک خۆی لێهاتەوە.

دۆن پاولۆ لە بەر ئەوەی هەم قـەشـەیە و هەمیش نەخـۆشـە، لە بواری ئەدەب و پاکی و هەم لە ڕوانگەی پاک و خاوێنیشـەوە نا توانێ بچـێتـە پشت ئەو پنچکانە، دیارە ناتوانێ بچـێتـە پشتی کلیسـاش. کـە وابوو زیاتر لەوە هەست بە توڕەیی و شەرمەزاری دەکا کە بێتە باسکردن. ئەو بۆ ئیتالیا گەڕاوەتەوە تا لە وڵاتدا خەریکی کاری شۆڕشگێڕی بێ. هەزاران گریمان و پڕۆژەی زانستی سەبارەت بە مەسەلەی کشت و کاڵ لە مێشکی خۆدا جێکردۆتەوە. ئێستا لە ئەنجامدا بەرهەمی تەواوی ئەوانە بۆتە ئەوە کە هەموو ڕۆژێ لە گەڵ گێر وگرفتی پێداویستی هەرە سەرەتایی ژیان دەست بە یەخە بێت. ماتالنا لە قاتی یەکەمی موسافیر خانە ژووری خاوێن و تەختی خەوی دوو کەسەی خۆی کە سێ چوارەمی ژوورەکەی گرتوە بۆ قـەشـەی تەرخانکردوە. تـەنیا جێگای مێزێکی بچوک وکورسییەک و ڕوو شوێیەکی لە ئاسن ڕەنگ کراو ماوەتەوە. لە بان تەختەکە پەیکەری بە خاچ کێشراوی مەسیح دەبینرێ کـە ئازای بەدەنی بێـڕەنگ و بێـخـوێنە و لەشـێکی بێ هەست و داتەپاوی وەک

ڕوخساری ورزێڕانی فەقیر و برسی دەچێ. بەرەو ڕووی پەیکەری مەسیح قولکەیە کە پەیکەرێکی بچوکی سپی عاسمانیان لە مریەمی دەست لێ نەدراو لێداناوە کە سگی پڕە و خەریکە شەیتان سەر کوت دەکات. ئاخری مانگی مای واتە مانگی مریەم و عەزیایە. ماتالنا هەموو شەوێ چرایەکی ڕۆنی زەیتوون لە بەرانبەر پەیکەری سپی و عاسمانی مریەم هەڵدەکا تا لە شەڕی دژی دوژمنان یارمەتی پێبکات.

ئێستا دۆن پاولۆ حالّی زۆر خەرایە. ئاو و هەوای کوێستان وەک چاوە ڕوان دەکرا حاڵی ئەوەندە باش نەکردوە. تەواوی ڕۆژ لە جێدایە و بە سەعات لەم تەختە دوو کەسیەدا بە خۆڕایی جینگلان دەدا و ئەم دیو وەو دیو دەکات بێ ئەوەی بتوانێ تاوێک ئاسودە بێ. شە و ڕۆژ بۆ ئەو کۆتاییان نایە.

دۆن پاولۆ بۆ تەواو کردنی شانۆ سازی و ئەنجامی نەخشی کەشیشایەتی خۆی چەند کتێبی ئایینیشی لە دوکتۆر ساکا وەر گرتوە. لە وانە کتێبی دوعا و پەندی» سنت ئالفوس ماری دی لیکوری» و « فیلوتە» و شەرحی حالّی» کامیل دون لیس» لە پیرۆزەکانی» ئابرۆتزە» لە سەدەی پازدەهەم و شەرحی حالّی» سن ژان بوسکو» لە پیرۆزانی» ۆیە مۆنی» لە کۆتایی سەدەی دوایی و ئاخرەکەشی نامیلکەی داب و ڕەسمی ئاینی.

دۆن پاولۆ لە پێشدا ئەم کتێبانە پەڕ پەڕ وەر دەگێڕێ و بە گوێرەی هەڵکەوت لە هەر شوێنێ بۆ دەر باز بوون لە ژیانی نە گۆڕی کە ئەو تێیدایە، چەند دێڕێک دەخوێنێتەوە هەر وەک لە هەر پەڕێکی چاپی یا ڕومانی پۆلیسی و یا نامیلکەیەکی دەرمانی هەر وا دەکات. لە سەر دەمی گەنجییەتی دا زۆر لەو کتێبانەی لە بەر دەست دابوە. ئێستا زۆر لە لاپەڕە عەکس دارەکانی. رەسمە لە بیر چوەکانی وەبیر دێنێتەوە. لە گۆشەی هەرە نهێنی بیریدا خەیاڵی مەترسیداری سەر دەمی منداڵی وردە وردە گیانیان دێتەوە بەر و دەر دەکەون. بەمجۆرە دۆن پاولۆ هەست دەکات کە بۆ لای ئەم کتێبە پیرۆزانە دەکێشرێ. وای لێدێ هەموو شەوان دەست بە خوێندنەوەیان دەکا و ئەوەندەیان دەخوێنێتەوە تا چاوەکانی هیلاک دەبن.

بێ ئەوەی خۆی ئاگادار بێ لە وجودی ئەو دا، ئەو منداڵە بێ گوناحە لێک دەدرێتەوە کە هەموو شەو بۆ فێر بوونی دەرسی شەرعیات دەچوو تا بۆ هەوەڵین قبوڵی دینی مەسیح خۆ ئامادە بکات. ئەو منداڵە دەبیرستانیە لە وجودی ئەو دا گیان دەگرێتەوە کە بە حەز و هۆگری تەواو شەرحی حالّی پیرۆزانی دەخوێند و لە

بارەی هەل و مەرجی ژیانێکی دوور لە هەلپەرستی لە گەڵ « دۆن بنە دیتو» باسی دەکرد. بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ وتو وێژێکی لە سەر خۆ لە نێوان ئەم لاوە کە هێشتا لە وجودی ئەو دا نە مردوە و ئەو شۆڕشگێڕەی کە ئێستا بوونی لە گەڵ وجودی ئەو لاوە تێکەڵ بوە بە ڕێوە دەبات. بێ تاقــەتیــیــەکی لە ڕادە بەدەر کــە بەر هـەمی نەخۆشییەکەیەتی، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، دۆن پاولۆ بۆ ساڵەکانی سەرە تای گەنجیەتی دەگێڕێتەوە. چونکە زۆربەی کات نەخۆش بوە و لاوازی و کز بووە و لە لایەکی تریش تاقانەی بنە ماڵێک بوە کە هەمیشە دایک و دایە گەورە و پور و کوڵفەتی ماڵ ئاگاداریان کردوە و بە هێزیان کردوە. بە جۆرێک هەمیشە خۆی لە کەش و هەوایەکی گەرم و پڕ لە محبەت و دڵسۆزی ژنانە دا بوە. ئێستاش کە دەستی قەزا و قەدەر وای لێکردوە تا پەنا بۆ کەش و هەوایەک بەرێ کە لە بواری کۆمەلایەتییەوە چەند پلە لە کەش و هەوای گەشە و هەڵدانی خۆی نزمترە.- واتە بۆ پیتراسکا-. دیسان ژنەکانن کە لە بەر هەر چی بێ دێنە لای و تەواوی دەنگ و باس و شوێنە واری ژیانی دەرەوە کە ڕۆژانە پێی دەگا، لە بەر ئەوەی پیاوەکان لە سەر کارن، ژن و منداڵ پێی دەگەیێنن. ئەو ژن و منداڵانەی کە هەموویان بە زاراوی خۆی و دایکی قسان دەکەن.

« ماتالنا» بوونی قەشەیەک لە موسافیر خانەی خۆی بە ڕەحمەتی خودا دەزانێ. کارەکانی خۆی وا ڕێک دەخا کە بە هەر بیانوێک بێ زیاتر لە کن کەشیش بێت. کەشیش لە هەر ماڵێک نیشتە جێ بێ، نابێ هیچ بەلایەک ڕووی تێبکات. ترسی نەخۆشی هەمیشە« ماتالنا» لە دڵە ڕاوکە دا ڕادەگرێ. لە بان موسافیر خانە لەو شوێنە کە دوو پلوسک یەک دەگرنەوە، سەرە کایەک بە دوو شاخی گەورەوە قایم کراون.

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « ئەم شاخە کایانە بە کاری چی دێن.؟»

« ماتالنا» لە کاتێکا نیشانەی خاچ دەکێشێ لە وەڵامدا دەڵێ:

– بۆ پاراستن لە چاوی پیس. بەڵێ تەنیا بۆپاراستن لە چاوی پیس. چونکە ئەم شاخانە بۆ پێشگری لە بەلای دیکە بە کار نایەن. لە ڕاستیدا موسافیر خانەی ماتالنا سەرە ڕای بوونی ئەم شاخە کایانەش لە بومە لەرزەی ساڵی ١٩١٥ لە گەڵ گەلێک ماڵی دیکە وێران بوو. ماتالنا دەگێڕێتەوە کە :

– ئەم موسافیر خانەیە لە سەرە تاوە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە ئێستا هەیە. مێردە فەقیرەکەی من شەش ساڵی تەواو لە ئارژانتین زەحمەتی کێشابوو تا توانی

ساختمانی ئەو تەواو بکات. تەنیا سێ مانگ لە تەواو بوونی تێپەڕیبوو کە بومە لەرزە وێرانی کرد. من حەفتەیەکی تەواو لە ژێر خاکدا مامەوە. ڕاستیت دەوێ من نەمدەزانی بومە لەرزە هاتوە. وام دەزانی ئێمەیان بە چاوەوە کردوە و تەنیا موسافیر خانەی ئێمە وێران بوە. هەر بۆیەش کاتێ دوای حەفتەیەک خۆڵە کانی سەر پەناگای منیان لا برد و کولانەیەکی گەورەیان بۆ هێنانە دەری من کردەوە، غیرەتی ئەوەم نەبوو بێمە بەر ڕوناکایی. بە خەڵکم گوت لێگەڕێن با هەر لێرە بم. ئیتر ئارەزووی ژیانم نیە. بەڵێ، بە ڕاستی نەمدەویست ئیتر بژیم. بەلام خەڵک دڵخۆشیان دامەوە و لە پشت کولانەکەوە پێیان گوتم کە نیزیکەی تەواوی گوند وێران بوە. نیزیکەی تەواوی «مارسیکا» وێران بوە. زیاتر لە سێ بەشی لە گەڵ خاک بۆتە یەک و تا ئێستا پەنجا هەزار مردوویان بژاردوە. ئەم کارەساتە لە چاوی پیس نەبوە. بەڵکوو سزایەکی خواوەندی بووە. مەسەلەیەک هەیە دەڵێ: «بەلا کە زۆر بوو خۆشە»

مێردە فەقیردکەی من بۆ ئەوەی بچێتە شەڕ، گەڕاوە بۆ ئیتالیا. لە ماوەی شەڕدا زیانی پێنەگەیشت. دوای شەڕ دیسان گەڕاوە بۆ ئارژانتین و پێنج ساڵی دیکەش بە هەر زەحمەتێک بوو کاری کرد تا ئەو پارەیەی بۆ تازە کردنەوەی ساختومانی موسافیر خانە پێویست بوو، پاشە کەوتی کرد. ساختومانی تازەی موساقیر خانە تازە تەواو ببوو و مێردەکەم لە سەر و بەندی گەڕانەوە دا بوو کە لە پڕ نامەکانی بڕان. دوای شەش مانگ لە لایەن بەخشدارەوە کاغەزێکم بۆ هات، من ترسام و پێم وا بوو مەسەلەی باجی تازە هاتۆتە گۆڕێ. چوومە وێ. یەکێ لە کارمەندان گوتی: مێردەکەی تۆ لە ڕووداوێکدا کە لە وانەیە بۆ هەموو کەس بێتە پێش،مردوە. کەوتۆتە ژێر ترومبیل. من دەستم بە هاوار و گریان کرد و گوتم بێگومان ئەو بەلایەی لە چاوی پیسەوە بە سەر هاتوە، چونکە دەبوایە بگەڕێتەوە و لە خانووی تازەی خۆی کەلک وەر گرێ. بەلام ئەو کار مەندە گوتی : لە چاوی پیس نیە، ئەمە ڕوو داوێکە ڕەنگە بە سەر هەموو کەس بێت. لە گەڵ ئەوەش دوور نە بوو لە چاوی پیس بێت. دیارە قەشەکان دەڵێن بڕوایان بە چاوی پیس نیە. بەلام ئەگەر بە ڕاستی بڕوایان پێ نەبایە، لیباسی ڕەشیان لەبەر نەدەکرد.

جگە لە وەش« ماتالنا » ڕۆژەکانی هەینی و چوار شەمۆ گۆشتی ناخوا، بە بڕوای وی مانگی مارس مانگی«سن ژۆزێف» ومانگی مای مانگی« حەزرەتی مریەم » ومانگی ژۆئن مانگی«ساکرە کور» و مانگی نوامبر مانگی مردوانە. ماوەیەکی

تەمەنی لە چل تێپەڕیوە و لە نێو موسافیر خانە دا بە سەر و قژی ئاڵۆز و شانە نەکراو دێت و دەچێ. خۆی زۆر هیلاک دەکا تا خواردنێکی باش بدا بە کەشیش. باش هەموو خواردنێکیش چاوە ڕوانی سوپاس دەکات. بەلام بێ قایدەیە، دۆن پاوڵۆ قەت نەوسن نەبوە. لە لایەکی دیکەش لە پیتراسکا خواردەمەنی جۆر بە جۆر نیە کە هەڵبـژاردنیـان دژوار بـێ. نانی لە شـەرابدا خـواسـاو «تلـیت» هێـشـتـا لەو خواردەمەنیانەیە کە لە هەموو شتی پێخۆشترە. لە گەڵ ئەوەش ماتالنا هەموو ڕۆژێ بەیانی دەچێتە لای تا پرسیاری لێبکا کە بۆ نیوەڕۆ چی بۆ دروست بکات. ئەوە خۆی خواردنێکی ڕۆژانەیە.

ڕۆژێکیان قەشە وە ئامان هات و بۆ ئەوەی بە یەکجاری کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنێ، بە ماتالنا دەڵێ:« هەرچی ئاسایی خەڵکی پیتراسکا دەیخۆن ئەوەم بۆ بێنە» ماتالنا گرژ دەبێ و بەلام ئەم فەرمانەش ئەنجام دەدات. بەم جۆرە بەیانیان پارچە نانێکی گەنمە شامی و بیباری شین و خوێ و ڕۆنی زەیتونی بۆ دێنێ و شەویش سوپی لۆبیای بۆ ساز دەکات. ئەم بەرنامەی خواردن دوو ڕۆژ زیاتر دەوام ناهێنێ چونکە مەعدەی دۆن پاوڵۆ جگە لە شۆربای شەو چیدیکەی پێناکەوێ. ئێستا ماتالنا سەر کەوتوە و لە سەر کەوتنی خۆی کەلکی خەراپ وەردەگرێ. جارێکی دیکە عەزابی بەیانیان دەست پێدەکاتەوە. پیـریژن بڕوایەکی پتەوی بە عیلاجی مەعدە هەیە و بەیتا بەیتا دەڵێ:

– دەرمـانی هەرە باش بۆ ئەم نەخـۆشـیـیـە هێلکەی تازەیە. هەر بۆیەش لە باخچەی پشت موسافیر خانە دە دوازدە مریشک ڕادەگرێ. کە مریشک هێلکەی کرد، گورج بۆ نەخۆشی دەبات. کاتێ مریشکێک هێلکەی وەدرنگی دەکەوێ ماتالنا بە دوایدا دەگەڕێ و بە قامکی گچکە تاقی دەکاتەوە تا بزانێ هێلکەی پێیە یان نا. دوای تاقیکردنەوە لە باخچە ڕا بانگی قەشە دەکات و دەڵێ: « نیو سەعاتی دیکە هێلکە دێتە دەر.»

بەڕاستیش دوای نیو سەعات مریشک هێلکە دەکات مریشکێکی ڕەش لە نێو مریشکەکانیدا بە ناوی«پتلا» بۆ هێلکە کردن لە هەموان کات ناسترە. « پتلا» گەڕان و هەڵبەز هەڵبەزی نێو موسافیرخانەشی پێخۆشە. زۆر جار تا ژووری نەخۆشیش سەر دەکەوێ. کاتێ کە توانی لە ژێر تەختی خەو دا خۆ بشارێتەوە، ئیتر نە هەرەشە و نە لینگە کەوش ناتوانن بیهێننە دەرێ. ماتالنا ناچار کەڵە شێر بانگ دەکا. ئەو دەم « پتلا» کە هەست بە دەنگ و هاتنی کەڵە شێر دەکات، بۆ ئەوەی

خافڵگیر نەبێ، بە ناچاری لە پەنجەرەوە دەر دەپەڕێ.

ماتالنا کوڕێکی هەیە بە ناوی« ئامریکۆ » منداڵێکە وە پیران دەچێ. چەند دانی پێشەوەی کەوتوون بە شتێکی کەم دەست بە گریانێک دەکا ناتوانی کوێت لێبێ. ئامریکۆ لەو منداڵانە نیە کە وەک ددانی مارین. دایکی بانگی دەکا و دەڵێ :

– کوڕە وەرە بڕۆ لە کن ماگاشیا کیلۆیەک خوێ بکڕە. هەتیو ڕادەبێ، دەهەنگاو دەڕوا و ڕادەوەستێ تا شتێک لە هەردی هەڵگرێتەوە. پاشان دەگەڕێتەوە ودەچێ لە بەر ماڵێ دادەنیشێ. دایکی بە توندی دەڵێ: «چیم پێگوتی ؟»

ئامریکۆ بە سەر سوڕ مانەوە تەماشای دەکات، ئەمجار ماتالنا بە سەریدا دەقیژێنێ: « گوتم بڕۆ لە کن ماگاشیا کیلۆیەک خوێ بکڕە.»

هەتیو هەڵدەستێ، دە هەنگاو دەڕوا . قامکی دە لوتی وەر دەدا و دەکۆڵێ، پاش تاوێکی قامک دە کونە کەپۆی دیکەی ڕادەکا و کۆڵین درێژە پێدەدا .پاشان لە پڕ دەست بە شین و گابۆڕێک دەکا ئەو سەری دیار نەبێ.

ژنەکانی دراوسێ لە ماڵ دێنە دەر. ژنی دیکەش دەگەنێ و دەنگی گریانی ئامریکۆش زیاتر گوێچکە کەڕ دەکات. ئەو دەم ماتالناش دەگاتێ و بە قاپێکی متبەقی کە بە دەستییە وەیە ئەوەندی لێدەدا پشووی لێدەبڕێ.

بەیانی « کیارنیا پاتاکا » بە بزنێکەوە دەگاتە موسافیر خانە. ماتالنا هەوڕێک هەڵدەگرێ و بزنەکە دەدۆشێ و قەترەی لێدەبڕێ ئەو دەمە پیاوەکان هەموو چوونە سەر کار. ژنەکان بە پەلە خۆ دەگەیێننە بەر پەنجەرەکان و یا لە بەر دەرگا دادەنیشن تا ئەسپێ و ڕشکی ماڵێ پابکەنەوە.

کاتی نیوە ڕۆ« فیلومنا ساپونە » بە مناڵێکی شیرە خۆر و هێندێ کاهو بۆ سەلاتەی دۆن پاولۆ دەگاتێ. فیلومنا کاهوەکان دادەنێ و لە نێو دەرگای موسافیر خانە دادەنیشێ. یەقەی خۆی دەکاتەوە ومەمکەکانی وەدەر دەنێ ومنداڵەکە گورج پێیاندا دەنووسێ. فیلومنا ڕای سپاردۆتە کن کەشیش کە ئیقراری لێ ببیسێ بەڵام کەشیش گوتوویەتی چونکە کەشیش نشینی ئێرە نیە ناتوانێ.

لە مەیدانی نێوان موسافیرخانە و پردی دار، منداڵی کەورە مەشقی نیزامی و دابی ڕێکخراوی دەوڵەتیی «بالیلا» ١ لاسا دەکەنەوە لە سەر دیاریکردنی دوژمن

---

١– ژان باتیست بالیلا(١٧٢٥–١٧٨١)لاوێکی ئیتالیایی خەڵکی ژێن کە ساڵی ١٧٤٦ دژی دەسەڵاتی ئوتریشییەکان بە سەر ئیتالیادا خەڵکی وروژاند.. لە ١٩٢٦ ناوی بالیلایان دا بە منداڵانی ٨تا ١٤ ساڵەی فـــاشـــیـــســت کـــە دەچوونە نێـــو ڕێکخـــراوێکی نیـــزامی تـایبـــەتی

کێشەیان لێ پەیدا بوە و هەموویان لەوە سکالایان هەیە کە دوژمن زۆر جار دەگۆڕێ. سێ منداڵ بە نوێنەرایەتی ئەوانیتر دێنە کن دۆن پاولۆ و دەپرسن :

– ئێستا دوژمن کێیە ؟

کەشیش بە سەر سوڕ مانەوە دەپرسێ : « کام دوژمن ؟ »

یەک لە منداڵەکان بە دڵنیاییەوە دەڵێ: ئەو دوژمنەی بە میرات ماوەتەوە.

– دوژمنی میراتی ؟ کەشیش باش تێناگا و یا خۆی لە نەفامی دەدا . یەک لە منداڵەکان ڕونی دەکاتەوە :

– لە مەشق دا دوو لا هەن. لایەکیان ئیتالیاییەکانن و لایەکەی تر دوژمنی میراتییە. ماوەیک بوو خانمی مامۆستا بە ئێمەی دەگوت: دوژمنی میراتی فەرەنسە و یوگوسلاوین. پاشان گوتی : ئەڵمانین. دوایە گوتی : ژاپونین. ئیمرۆ بەیانی بە مەی گوت:« ڕۆڵەکانی من دوژمنی میراتی تازەی ئێمە ئینگلیزە.» بەلام لە کتێبی دەرسی ئێمە دا بەشێک هەیە بە ناو و نیشانی :« دۆستایەتی دێرینی ئینگلیز و ئیتالیا » ئەوەی کە ئێمە تێناگەین کامیان هەڵەیە، خانم مامۆستا یا کتێب ؟

دۆن پاولۆ لە وەلامدا دەڵێ:« کتێبی دەرسی ئێوە ساڵی ڕابردوو چاپکراوە کە وابوو هەرچی تێیدا نووسراوە کۆن بوە.»

منداڵەکان دەڵێن:« باشە کە وابوو تا دوژمنی میراتی خۆمان کە ئینگلیزە نابوتی بکەین :

قەشە بە ئیرادەوە دەڵێ:« ئینگلیزەکان لە وشکانی شەڕ ناکەن. ئەوان لە دەریا دا شەڕ دەکەن.»

منداڵەکان بڕیار دەدەن بچن لە چۆمدا شەڕ بکەن. دۆن پاولۆ لە پشتی پەنجەرەوە سەیری هەوراز و نشێوی شەڕ دەکا.

دوژمنی تازەی میراتی زوو دەشکێ، بەلام حیزبی میللی کە تا میشکی ئێسکانی تەڕ بوە لە شەڕ دێتە دەر.

منداڵانی گوندی کۆمەڵێکی جیا بە گوێرەی داب و زاراوی تایبەتی خۆیان دادەمەزرێنن. لەو کۆمەڵە دا قارەمانانی بەرد هاوێژ و بازدان لە خەندەک و ڕاوی مار مێلکە و میز کردنی بەرە و با ، ناویان دەنووسن.

منداڵە کچکەکان یاری « شەشخان » یان پێ خۆشترە. چوار گۆشەیەکی درێژ بە خەڵوز لە سەر هەرد دەکێشن و پاشان ماڵ ماڵ دابەشی دەکەن و ژمارەی بۆ

دادەنێن. دژواری یارییەکە لەوە دایە کە دەبێ مەڕ مەڕەکە بە نوکی پێ بەرێتە نێو مـاڵەکە و نابێ لە سـەر خـەتیش بوەستێ کە بە خەڵوز کێشـراون. ئەگەر بوەستێ، دەسـووتێ و دەبێ لە سـەر ڕا دەست پێبکاتەوە. دۆن پاولۆ بە منداڵی لەم یارییـەدا وەستا بوو.

دایکەکـان لە بەیانیـەوە تا ئێـوارێ بە دوای منداڵەکـانیـاندا هاواریانە، دەنگدانەوەی سـامناکی جنێو وتوک و دوعـایان ئەوەندە بۆتە کارێکی ئاسایی کـە کەس بـە گرنگی نازانێ و زۆرتر لە حەوابڵاو دەبێتەوە. «فیلومینا ساپونە» بـە سەر کـوڕەکـەیدا دەگـوڕێنـێ و دەڵێ:« ڕەببی ڕۆڵە وەک «سـن بارتولومـە» جـەرگت بکەیە کەباب ڕۆڵە .»

« کیارینا پاتاکا» هاواری کیژەکەی دەکا و دەڵێ:« خوایە هەر تەک چاوت وەک چاوی «سنت لوسی» بێننە دەرێ و بیانخەنە بەری دەستت.!

« ئانۆنزیاتا‹ لە کـاتێکا لانکی منالەکـەی ڕادەوەشـێنێ دەڵێ:« لای لای کـوڕی نازدارم. لایلای تـاجی سـەرم، لایلای زیاتر لە دوڕ و گـەوهەرم، لایلای ئەسـتێـرەی بەیانیم!»

« ئانتۆنیا»ی بەرگدروو بە سەر کیژەکەیدا چەماوەتەوە و دەڵێ :

– لایلای مەلائیکەی عاسمانی، لایلای بووکی پاشا، لایلای مرواری گەوزیو.

دوای نیوەڕۆ ژنان لە نێوە ڕاسـتی کۆڵان خـەریکی کاری ماڵ دەبن: یەکێ جلە تازە چۆراوەکـان هەڵدەخـات، یەکی دیکە پەتاتە سپی دەکا، یەکیـان کراسـی پینە دەکا، چـوارەمی لەشی منداڵەکەی دەخـورێنێ و ئەسـپێیـانی لێ دەدۆزێ. ئەو ژنانەی هیچ کـاریان نیـە لە سەر بەردەکانی پێش موسافیـرخانە دادەنیشن. هەمـوویان پێ پەتـی و شـڕە پۆشـن و بـە قـژی چـەور و ئاڵۆزیان وەک ئەو بزنانـە دەچن کـە تازە دۆشـراین. یەک لەوان « جزیرا »، پیرێژنێکە ئەوەندەی برسـیـەتی کێشـاوە و منداڵی وەسـەر یەک ناون وەک خـەڕەک دەچێ و هەمـیـشـە لە بەر ژان و ئازار دەناڵێنێ. نیزیکەی هەموویان باسی منداڵ بوونی خۆیان دەکەن.

« ئانۆنزیاتا » بەو زوانە چوارەمین منداڵی دەبێ. « لیدوینا » تا ئێستا ١٨ منداڵی بووە. ڕەحـمـەت سـەری مـنداڵی هەوەڵە، ئەوانیـتـر بە تەنیـایی ڕێگای هـاتنە دەری خۆیان دەدۆزنەوە. یەکی دیکە« ئانینا ستـرادۆنە» سگی پڕە و دەست لە سگی دەدا و دەڵێ: « سـەری لێـرەیە و لاقـێکی لێرە و یەکی لەولایە. ئەوە دەبێ کـوڕ بێ، چونکە لوشک داوێ.»

« جزیرا » دەڵێ ئەوە بە دەست خودایە. خودا بە گوێرەی گوناحمان ڕەفتارمان لە گەڵ دەکات. هەر دەردێک نیشانەی سزایەکە. دەستـەیەک منداڵی نێوە ڕووت و قوڕاوی لە دەور و بەری قـوڵکەیەکـی پڕ لە ئاوی حـەوزی فـوارەیی یاری دەکـەن وتا سـەر و کەللەی«سـینیـۆرینا پاترین یانی» مامـۆسـتـای مـەدرەسـەیان دەر نەکـەوێ ڕاناکەن.

زۆربەی ژنەکان لە چاوەڕوانی مێردەکانیان کاتێ هەوای خۆش بێ، سوپی شەو لە کۆڵان لێدەنێن. سـەرئاورەیەک کە دەورەی ئاگرەکەی بە بـەرد گرتوە، دادەنێن و دیزەیەکی مس یا تەنەکەیەکی نەوتی لە سەر دادەنێن

لە گەڵ تاریکی هەوا « کریسـتینا » دێتـە موسافیـر خانە و بۆ چرای مـریەمی دەست لێنەدراو ڕۆن دێنێ. ئێسـتا دۆن پاولۆ دەنگی ئەم کیژە گەنجە دەناسێ کە بە دڵسـۆزی لە حـاڵی وی دەپرسێ و چند شت ڕادەسـپـێـرێ و لە بارەی باشـتـرین شـێـوەی خزمـەت و ئاگاداری نسـحـەتی« مـاتالنا » دەکات و پاشـان بە پەلە دوور دەکـەوێتـەوە. دۆن پاولۆ هێـشـتـا کـریسـتـینای نەدیوە. بەڵام لە ڕێگای مـاتالناوە زانیویەتی کە ئەو سـەر بە تاقە بنە مـاڵەی وەزع و حـاڵخۆشـی« پیـتراسکایە » چەند سـاڵان لە بنیـاتێکی ئایینی کە ژنە تەرکە دنیاکان بە ڕێوە دەبات، خـوێندوویەتی و ئێسـتا خـەریکە بگەڕێتـەوە ئەم بنیـاتە تا بچێتە ڕیزی ژنانی تەرکە دنیا. دوکـتـۆر ساکاش لە بارەی ئەم کیژە وەک کەسێکی لە ڕادە بەدەر ژیر و بە تەربیەت قسەی لە گەڵ کردوە. کریسـتینا لە ماڵێ کاری زۆرە و خۆی تەنیا هەموو کار و باری ماڵ بە ڕێوە دەبات. یارمـەتی بە نەنکی دەکا کە تەمەنی نیزیک سەت ساڵە. بە دایک و باب و پوری ڕادەگات کە لە هەموانیان پیر ترە. جگە لەوانە ئاگای لە براکەشی دەبێ کە لە خۆی گەورە تر و تەمبەڵ و بێکارەیە. لە گەڵ ئەوەش سـەبارەت بە تەربیەتێکی کە لە مـەکتەبی ژنانی پیرۆزدا وەری گرتوە، تەواوی خـەڵکی گوندی ڕێزێکی تایبـەتیان بۆی هەیە. ئەو زۆر جـاران دەچێـتـە مـاڵی فـەقـیـران تـا یارمـەتیـان پێـبکات و لە بچوکترین کاری ژیاندا ڕێنوێنییان دەکات.

« کاسارولا » ژنی جادوگەر هاتۆتە کن کەشیش تـا لە گیای جـادوویی خۆی کە دەرمـانی کۆخـەیە بیـداتێ. نەخـۆش پێـشکێـشی وی ڕەت دەکـاتەوە. « کاسـارولا » ژنێکی بێـحـەیای کـەپۆ پانی لێـو ئەسـتوری وەک لێـوی قـولە ڕەشـانە. بۆ ئەوەی پارێزگـاری و ڕیازەتی خـۆی باشـتـر بە کـەشـیش نیـشـان بدا دەست دەکـا بە خوێندنەوەی ویرد و دوعای دەر کردنی شەیتان و جندوکان بە زمانی لاتینی. پاشان

دوگمـەی یەقـەی بلوزی دەکاتەوە و مـیـداڵ و خـاچ و زیننار و ئەو نیـشـانانەی بە سنگیەوە هەڵاوەسیبوون، نیشانیان دەدا و دەڵێ:

– خودا تەنیا بە سەر چاکە دا حوکمڕەوایە، نەک بە سەر خەراپە دا. ئەگینا بۆ چی کەشیشەکانی خۆی ئەگەر نەخۆش دەبن، چاکیان ناکاتەوە. ئێستا ئەی ئاغای کەشیش بڵێ بزانم بۆ چی لە بەر خودا ناپاڕێیەوە کە ساخ و سەلیم لە جێ ڕاستت کاتەوە،؟

دۆن پاوڵۆ لە وەڵامی ژنی جادوگەر دا هەر ئەوەندە دەڵێ : « بڕۆ ووین بە .»

کیـژی ئانتۆنیای بەرکدروو نەخـۆشـە. « کاسارولا » بۆی دادەنێ هەمـوو ڕۆژێ بیانیان پیاڵەیەک شەڕاب بخواتەوە. بەڵام دایکی دەڵێ کە کیژەکەی تەمەنی لە سێ ساڵ زیاتر نیە.

– سێ ساڵە؟ باشە. کە وابوو ئێواران پیاڵەیەک شەڕابی دەر خوارد بدە.

کوڕی قـون ئەستوری« لیدونیـە» ڕۆژی سێشەمۆ مردوە. لە هەژدە منداڵان دووی زیاتر بۆ نەمـاونەوە. ڕۆژی شـەمە « کـیـارینا پاتاکا » منداڵی مردوە و لە نۆ منداڵان تەنیا دووی بۆماونەوە. دوو منداڵی دیکە بە کۆخە ڕەشە مردوون. دایکیان دەستی بە شین و گـریان کـردوە.«ئانوزیاتا » ڕۆژی سێ شـەمـۆ کـچی بوە. ڕۆژی پێنج شـەمـۆش« ئانیـتـا سـتـرادونە » کـوڕی بوە. ئەمـانە هەمـوو لە گـوند ڕوویانداوە. هەموویان بە درێژی ئەوانە بۆ یەکتر دەگێڕنەوە. دۆن چیپریانۆ کەشـیشی پیری « لاما » کە ماستریئانجولا بە دوایدا چوە لە کاتی خۆیدا کەیوەتە مـاڵی«لیدوینا» تا تەرمی کوڕەکەی پیرۆز بکا.

بەڵام کاتێ « شاتاپ» بۆ کیژی مردووی « پاتاکا» بە دوایدا چوە، دۆن چیپریانۆ عـوزر و بیـانووی هێناوەتەوە و گـوتوویە: « منداڵ کـە دەمـرن دەچنە ئیـعـراف و پێویستیـان بە هیچ داب و ڕەسمێک نیە. ئەسڵەن کاری وا پێوەندی بـە کەشیشەوە نیە. دابی ناشتنی منداڵ با لە گەڵ قەشەش بێت، کارێکی ئاساییە.» منداڵی مردوو لە سـەر دەسـتی ژنێک کـە لە خـزمـانی ویە، بێ ئەوەی کـەسی لە گـەڵ بچێ، بۆ گـۆڕسـتـان دەبرێ. ژن خـۆش دەڕوا و تـابوتی بچـوک وەک سـەوەتەی میوە لە سەر سـەری دادەنێ. منـداڵی «لیـدووینا » مـاریتـای پوری بردیە قـەبرسـتـان. چونکە کەشـیش لە گەڵ مـەیتی ئەو منداڵە بوو، دایکی داوای کـرد کە موزیکیشی لە گەڵ بێ. کە وابوو لە پێشدا مـاریتا تابوتی گچکەی منداڵەکەی لـە سەر سـەری دانابوو، پێش کـەوتبـوو.لە دوای ئەو« دۆن چیـبـریانۆ» بە عـەبا و حـەمـایلەوە لە کـەڵ سێ

موسیقا چی- شەیپور وقەرەنەی وترومپێت- دەژەن. هەر پێنجیان بە هەنگاوی رێک بە هەوای ڕینگی سەما هەنگاو دەنێن و گۆرانی کۆنی زەمانی پێش شەڕ دەخوێنن کە بەم شیعرانە دەست پێدەکرێ:

« کاتێ ئالوبالوەکان رەش بن ، ئەی کیژی مانگ روو من پێت دەڵێم...»

پاش ناشتنی منداڵەکە« ماریتا » هەر چوار زەلامان بۆ ماڵی خۆی بانگ دەکا و شەرابیان دەداتێ. قەشەی « لاما » لە سەریەتی بە تەواوی پێداویستییەکانی خەڵکی پیتراسکا رابگات. وەک شوشتن( غسل تعمید ) و ناشتن و مارە کردن و..

بەڵام وردە وردە کە پیر دەبێ کەمتر خۆ بە خەڵکەوە ماندوو دەکات.

بە خۆشییەوە لە گوندەکانی کوێستان بە رێوە بردنی داب و رەسمی شوشتن و ناشتن و مارە کردن بۆکەشیش بۆ دەورەی دیاریکراو دانراون. بۆ نموونە مانگەکانی ئوکتۆبر و نوامبر مارەیی بە رێوە دەچن. لە نێوان مانگەکانی مای و یولی چاوەڕوانی منداڵ بوون دەبن. ئەمە جۆرە بڕیاریکی سەپێنراوە و کەم کەس دەتوانێ لێی دەر چێ. هەر چی بێت هێندێ منداڵ چەند مانگ پێش لە دایکبوون دەمرن. هەر دەڵێی کوشتارێکی تایبەتیە لە منداڵانی بێگوناح دەکرێ.

« ترازاشیارڤا » ش سگ پڕە. شەوێک خەونی دیوە کە منالەکەی بە کوێری دێتە سەر دنیا. ژنی فەقیر هاتۆتە کن دۆن پاولۆ و لە ژێر تەختەکەی چۆکی داداون و گوتویە:

: لە خەوێم دا منداڵەکەی لە سگم دایە بە کوێری دەبێ. جگە لە تۆ ئەی کەشیشی میهرەبان هیچ کەس نیە نەجاتی بدات.

کەشیش لە وەڵامدا دەڵێ:« ئەی ژنی فەقیر بە داخەوە من سەر بە کەشیش نشینی ئێرە نیم.»

ژن دەست بە گریان دەکا و دەناڵێنێ و دەڵێ:

- من نامەوێ منداڵەکەم کوێر بێت. بۆ دەبێ ئیدیکە ببینن و ئەو چاوی نە بێنێ. دۆن پاولۆ تێدەکۆشێ کە ئەو فیکرەی لە سەری بەرێتە دەر. بەڵام بێفایدەیە. ژن دەڵێ :« من خەونم دیوە. بەم دوو چاوانەم دیومە ئەگەر تۆ یارمەتیم نەکەی منداڵەکەم بە کوێری دەبێ. ژن نایەوێ بڕوا . دۆن پاولۆ دەزانێ کە ئەگەر لەمبارەوە ویرد و دوعا بخوێنێ و یا بۆ نە هێشتنی شەیتان و جندۆکان نوشتە بنووسێ، دەست بەجێ تەواوی خەڵک روو دەکەنە موسافیر خانە و داوای بیر و راو یارمەتی لێدەکەن. ئەو دەم ناتوانی پێداویستەکانیان ئەنجام بدا . هەموو پێی دەڵێن تۆ کە

یارمـەتی« ترازاشـیـاراڤا » کردوه، دەتوانی کۆمەگی ئیمـەش بکەی. ئەم کـاره جگە لەوه کـە دەبێـتـە چاو بەسـتـەکی و گـاڵتـەیی لە وانەیە سـەرنجی کـار بەدەسـتـانی دەوڵەتیش ڕابکێشێ و وای لێ بێ لە ئاخردا بیناسنەوه و پەرده لە سـەر ڕوخـساری لادەن. لە بەر ئەوه«ماتالنا» بانگ دەکا و دەڵێ :

– تکـا دەکـەم بە زمـانی خـۆش ئەم ژنە لە ژوورەکـەی من وەدەر بنێ. ئـەو هـەر خەونێکی دیتـوویەتی،پێوەندی بە دنیای منەوه نیە. ترازا بە توڕەیی هـەڵدەستێ و بە گریان و هاوار دەڵێ :

– بۆ دەبێ منداڵـی من کوێر بێت؟ ئاخـر دەبێ کـەسێک غیـرەتـی هـەبێ هۆی ئەم سـزایە بۆ من ڕوونکاتـەوه. بۆ دەبێ منداڵی من بـە کـوێری لە دایک بێت و منداڵی دیکە چاو ساغ بن و ئی من نا ؟

« ترازا » چاوه ڕوانی وەڵامـە. بەڵام دۆن پاولۆ نـایەوێ باس و دەمـبـەدەمـەی لەگـەڵ بکات. ترازا دیـسـان چۆک دادەدا و ڕوومـەتی لە هـەرد دەخـشـێنێ. سـەر لە هەردی دەدا و قژی دەڕنێتەوه، ڕۆندک دەڕێژێ و بە دەنگی بەرز قسەی بێجێ دەکا:

– بۆ دەبێ ئەو کـوێر بێ؟ بۆ؟ ئاخـر پێم بڵـێن بۆ؟ من دەمـەوێ هۆی ئەوه بزانم. ئیـدیکە ببینن و ئەو نەبینێ. ئیـدیکە بچنە مـەدرەسە و ئـەو نەتوانێ بچێ. خـەڵکی دیکە دزی لێبکەن و ئەو نەزانێ. خەڵک گاڵتەی پێبکەن و ئەو نە بینێ و گەورەش بوو هیچ ژنێ مێردی پێناکات.

پاشان ڕادەبێ و ئارام دێتە بەر چاو. پاشان دەڵێ:

– ئێسـتـا دەزانم چدەکەم. دەچم خـۆم لە پـەنجـەره دەخـەمـە خـوار. تا ئەویش لە گـەڵ من بمرێ. ژن دەچێـتـە بەر پـەنجـەره. بەو گـوڕ وهەڵچـوونە بێگومـان خـۆی هـەڵدەدێرێ. ئێـستـا ژن خـۆی هـاویشـتـۆتە سـەر ئاسنی پەنجـەره کـە لە پڕ هـاواری قەشە ڕایدەگرێ:

– زۆر باشـە. هـەر چی دەتەوێ وادەکەم. بڵێ بزانم چی بکەم.؟

« مـاتـالنا » بە دوای کلیلەکانی کلیسـادا دەچێ کە بە بنە مـاڵەی« کـولامـارتینی» سـپێردراون. لیوانێک ئاوی مـتـفـەرک لە کلیسـا لە گـەل خـۆی دێنێ.« ترازا » سگی هـەڵمسـاوی خـۆی لە کـەشـیش نیزیک دەکاتـەوه و دەڵێ:« سـەری منداڵەکە لێرەیە و چاوەکـانی لە وێن.» کـەشـیش لەو جـێگایە کە ترازا نیشـانی داوه دوو خـاچ بۆ دوو چاوی منداڵـەکە دەکـێشێ و لێـوەکـانی دەبزێوێ گـۆیا دوعـا دەخـوێنێ. ژن شـاد و بەکەیف هاوار دەکا:

– ئێستا ئیتر منداڵەکەم چاک بۆوە و چاوی کوێر نابێ. ژن دەڕوا و دوای تاوێک بە مریشکێکی کوژراوەوە دەگەڕێتەوە.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « ناتوانم وەری بگرم. لە قـەڵـەمـڕەوی من کـەشـیش ناتوانن پێشکێش قبوڵ بکەن»

ژن پێدادەگرێ و دەڵێ: « کە وابوو فایدەی نیە. ئەگەر تۆ ئەم مریشکەم لێ قبوڵ نەکەی، دوعای ڕەحمەت کار ناکا و منداڵەکە بە کوێری دەبێ.»

دۆن پاولۆ دەڵێ : « ڕەحمەتی خوا بێ پاداشە »

ژن ئیراد دەگرێ و دەڵێ: « نە خێر. ڕەحمـەتی بێ پاداش هەر نیە. مریشک لە سەر مێز دادەنێ و دەڕوا.

بەیانی یەکشـەمۆ چەند ژن بۆ نوێژی مـەسح دەچنە لامـا. چار شێـوی ڕەش و دەسمـاڵی ڕەشیان پۆشیوە چونکە وەدەر خستنی مووی سەر لە کەڵ حەیا و پاکی نایەتەوە. کـەوش و گـۆرەویشـیـان ڕەشـە. دۆن پاولۆ لـە پشت پەنجـەرەوە چوون و گەڕانـەوەیان دەبینێ. پیـرەکـانیـان دەسـحـێـبیـان بە دەسـتـەوەیە و سـەبروکـە دەنکەکانیان بە نێو قامکانیاندا دەگێڕن.

ئێوارەی شەمۆ کیژێک بە گـاری مـاگاشیـا کە توتن و خـوێی هێناوە لە گوندی« فۆسـادی مـارسی» یوە هـاتوە. مـاگـاشیـا ڕێگای پێ نیشـان دەدا و دەڵێ:« موسـافیـر خانە وا لە وێیە. دەستی ڕاست ناگەیە پرد.»

کیژی گەنج بوخـچە بە دەست لە موسافیرخـانە وەژوور دەکەوێ و لە مـاتالنا دە پرسێ: « ئایا کەسێک بە ناوی دۆن پاولۆ سپادا لێرەیە؟»

مـاتالنا ئێرەیی بە کەشیشی خۆی دەبا و پێش ئەوەی وەڵامی ئەو کیژە بداتەوە دەیەوێ بزانێ مەسـەلە چیە. بۆیە دەپرسێ:

– چکارێکت هـەیە ؟

– ئەو منـی لە مردن نـەجات داوە. دەمـەوێ سـوپاسی بکەم.مـاتالنا لە وەڵامـدا دەڵێ:« ئەو دۆن پاولۆی لێرەیە دوکتـۆر نیە، بـەڵکوو کەشـیـشـە کـیـژەکـە دەڵێ: « لەوانەیە ئەو نە دوکتـۆر بێ و نە کەشیش. بەڵکوو یەک لە پیرۆزەکانە. من لە سـەرە مـەرگ دابووم. ئەو لە ڕێوە گـەیشت، تەمـاشـای منـی کـرد. دەستـی گـرتم و ئەوەتا نەجاتم بووە.»

ماتالنا تا ئێستا شانازی بە وە دەکرد کە قەشـەیەک لە قەڵەمڕەوی روحانی دیکە لە مـوسـافیـرخـانەیدا میوانە. بەڵام ئەم فـیکرە کە ئەو لە پیرۆزەکـانـی ڕاسـتـییـە و

مـوجیـزەش دەنوێنێ، نارەحـەتی دەکات و دەی وروژێنێ و بۆ ئەوەی نیشانی بدا کە لەم مەسەلەیە بێ ئاگا نیە دەڵێ:

– بەڵێ ئەو لە پیرۆزەکانی ڕاستییە و لێرە وەک ڕوحانییـەکی پیرۆز، وەک پیاوی خودا خەریکی ریازەت وعیبادەتە.

ئەو دەم کیژی « فوسایی» زیاتر وەغیرەت دەکەوێ و دەڵێ :

– لە وانەیە لە پیرۆزێکی ڕاستە قینەش بەرزتر بێ. نەکا هەر حەزرەتی مەسیح خۆی بێ. ماتالنا ئیتر خۆ لە سەر پێ ڕاناگرێ و لە سەر کورسی دادەنیشێ و بە سەبروکە دەڵێ:

– نەکا تۆ شێت بوو بێت؟ ئەم فیکرە لە کوێوە هاتۆتە سەرت کە ئەو لەوانەیە حەزرەتی مەسیح خۆی بێ. بۆ دەبێ حەزرەتی مەسیح بێت ڕاست لە موسافیر خانەی من دابەزێ. چما ئەو لە عاسمان لە دەستی ڕاستەی بابی دانەنیشتوە.؟

ماتالنا بۆیە بە سەبر قسان دەکا تا کەشیش کە لە قاتی یەکەمی موسافیر خانەیە ئەگەر بە ڕاستی عیسا خۆی بێت، نە توانێ قسە گومانلێکراوەکانی ئەو ببیسێ.

کیژی گەنجی فوسایی لە وەڵامدا دەڵێ:

– ئەوە هەوەڵین جار نیە کە عیسا بۆ هاتنە خوار بۆ زەوی و بینینی بار و دۆخی ژیانی فەقیر و هەژاران بە لیباسی گۆڕاو دەر دەکەوێ. پاشان بە دەنگێکی زۆر سەبروکە کە بە زەحمەت دەبیسرێ لێی زیاد دەکا و دەڵێ :

– داخوا تۆ تەماشای دەست ولاقانت کردوە کە بزانی کونن یان نا.؟ ئەوە دڵنیا ترین نیشانەیە کە پێی دەناسرێتەوە. ئەو لە هەر لیباسێکدا دەر کەوێ، ئەگەر بە ڕاستی عیسا بێت، بێگومان ناتوانێ جێگای برینەکانی بزماری خاچ لە دەست و پێیانی بشارێتەوە.

هەر تک ژن بێدەنگ دەبن، نانی شێوی کەشیش کە دوو هێلکە و هێندێ سەلاتی کاهوە لە سەر مێز ئامادەیە. ماتالنا بە دیتنی ئەم خواردنە کەمە لە شەرمان سوور هەڵدەگەڕێ . دانانی دوو هێلکە و هێندێ سەلاتی کاهو لە پێش کوڕی تاقانەی ئاسمانیی خودا بە ڕاستی شەرمە. لانی کەم دەبوایە مریشکێکی بۆ بکوژێتەوە. بەڵام ئەگەر ئەو خۆی نەبێ چێ ؟ ماتالنا لە بەر شک و گومان لە عەزاب دایە و دەپرسێ :

– ئاخر تۆ لە کوێوە دەڵێی لە وانەیە عیسا خۆی بێ؟ چۆن گەیشتوویە ئەم

فیکرە.؟ ڕاستی پێم بڵێ. ئەرێ تۆ شێت نی؟
کیژ لە وەڵامدا دەڵێ:
- من بە دەنگی ناسیم. کاتێ هاتە بان سەرم، دەستمی گرت و گوتی: «ئازا بە کیژم، من لە هەموو شت ئاگادارم» ئەو دەم هەستم کرد ئەم دەنگە دەنگی ئادەمیزاد نیە. من ئادەمیزاد دەناسم. ئەوان وا قسان ناکەن. مامێکم هەیە کەشیشە. کەشیشی « فۆسا » یە. ئەو وا قسان ناکات.
ماتالنا دەپرسێ :« باشە. بڵێ بزانم، ئەگەر ئەو بە ڕاستی حەزرەتی عیسا بێ دەبێ چبکەین ؟ داخوا پێویستە ژاندارمە ئاگادار بکەین ؟ لە سەر دەرگای موسافیر خانە ڕێ و شوێنێک بۆ خاوەن موسافیر خانان ڕاگەیەنراوە. بەلام هاتنی عیسایان لە وێدا پێشبینی نە کردوە. ئەم دوو ژنە لە کاتێکا ناهێڵن هەناسەیان بێتە دەر لە سەر پەنجەی پێ لە پەیژەی قاتی یەکەم سەر دەکەون. لە دەرگا دەدەن، کەس وەلام ناداتەوە. دەرگا دەکەنەوە، بەلام کەسی لێ نیە.
ماتالنا خەریکە بکەوێتە هەردی. بە سەبروکە دەڵێ : « ئەوە غەیب بوە غەیب.!»
پیاوێکی ئاسایی کە لە موسافیرخانەیەک دابەزێ، هەر چەند نەیەوێ حیسابی خۆشی بدا، ناتوانی وا وون بێت و بە حەوادا بڕوا. هەر تک ژن بە ترسەوە لێک دەڕوانن. لەو کاتە دا لە لای باخچەوە دەنگی کۆخە دێت. ژنەکان بۆ ولا ڕادەکەن دۆن پاولۆ لە بن دارە هەنجیرێک دانیشتوە، بێ هەڕەکەتە و ڕەنگی وەک مردوان سپی هەڵگەڕاوە. دار هەنجیر وشکە وماوەیەکە بە بڕین و سووتان مەحکووم بوە.
دۆن پاولۆ دەپرسێ:« کێ کاری بە منە.؟»
ژنەکان بە ترس و لەرزەوە لێی وەنیزیک دەبنەوە و کیژەکە دەڵێ:
- من « بیانکینا »م بیانکینا جیراسولە خەڵکی« فۆسادی مارسی» و برازای « برە نیچە» من لە سەرە مەرگ دا بووم. هەموو دەستیان لە من شوشت بوو. ئەو دەم کەسێک هات. کەسێکی من قەت نەمدیبوو. ئەو کەسە دەستی بە دەستی مندا هێنا و منی نەجات دا.
دۆن پاولۆ دەکۆخێ . ڕۆژ ئاوا بوە. سێبەری شەو لە قولایی دۆڵ سەر دەکەوێ. کەشیش هەڵدەستێ، ژنەکان باسکی دەگرن و دەیبەنەوە ژووری خۆی. ئەو دەم کەشیش بە ماتالنا دەڵێ:« تۆ ئیتر دەتوانی بڕۆی »
دۆن پاولۆ هیلاکە و لە سەر تەخت ڕادەکشێ.« بیانکینا » لە پەنای دادەنیشێ. پاشان وەغیرەت دەکەوێ و دەڵێ: « دەستەکانت ببینم.»

دۆن پاولۆ بزەیەکی دێتێ و دەپرسێ: « دەتەوێ لە دوارۆژ ئاگادارم کەی ؟»

بیانکینا بە وردی تەماشای دەستەکانی کەشیش دەکا. هیچ نیشانەیەکی برین و داڕوشاوی لێ دیار نیە. کە وابوو ئەو عیسا نیە. بیانکینا خەجاڵەت و خەمگین بێدەنگ دەبێ. پاش تاوێک دەست بە حکایەت دەکا:

- « برە نیچەی پوورم منی لە ماڵی خۆی وەدەر نا و نیتر منی نە گەرەکە.

کەشیش پرسی : « بۆ چی ؟»

« بیانکینا » بە دوای قسەیەکدا دەگەڕێ کە بیڵێ. پاشان دەڵێ:

- لە بەر ئەوەی من لایەنگری ئازادیم. بەڵام پورم موخالیفی ئازادییە. تۆش بێگومان چونکە لە پیرۆزانی لە گەڵ ئازادی موخالیفی.

دۆن پاولۆ قسەکەی دەبڕێ و دەڵێ:« نا، من پیرۆز نیم ولایەنگری ئازادیم.»

ڕواڵەتی بیانکینا وا نیشان دەدا کە بڕوا بە قسەی کەشیش ناکا. مەسەلەکە ئەوەندە گرنگە کە کیژەکە ئامادە نیە وا بە هاسانی دەستی لێهەڵگرێ. بۆیە لە قوڵایی دڵیەوە نیگەرانی خۆی دەر دەبڕێ و دەپرسێ:

- ئەگەر تۆ کەشیشی و لایەنگری ئازادی، ئەدی بۆ چی کلیسا ئێمە لە ئاگری جەهەننەم دەترسێنێ و بۆ چی دڵداری حەرام دەکات ؟ قەشە وەڵامی ناداتەوە. بەڵام بیانکینا پێدادەگرێ و دەڵێ :

- کاتێ من لە گەڵ پیاوێک دڵداری دەکەم، ڕاستە کە عیسا تووڕە دەبێ؟ بۆ چی تووڕە دەبێ ؟ کێ بەو دەڵێ کە تووڕە بێ؟

دۆن پاولۆ دەڵێ: « باشترە ئەم باسە بگۆڕین »

بیان کینا بە پێکەنینەوە ڕازی دەبێ و دەڵێ :

- چۆنت دەوێ. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە دڵداری لە گەڵ پیاو ئەوەندە خۆشە کە پێم وانیە بتوانی کاری لەوە خۆشتر بکەی. داخوا بیر و ڕای تۆ چییە ؟

کەشیش لە وەڵامدا دەڵێ : « گوێ بدەیە بیانکینا! من بە ڕاستی زۆر بە داخم کە سەر بە کەشیش نشینی ئێرە نیم.

بیانکینا دیسان پێدەکەنێ، دەم و چاوی باریک و درێژی لە چوار چێوەی ئاوێنەی وەتاغەکەدا جوانتر نیشان دەدا. ڕەنگە ملی تۆزێک درێژ بێ، بەڵام لێوەکانی سوور و زاری گەورەیە. بە تایبەت کاتێ پێدەکەنێ بە ڕاستی گەورەیە. خۆشی ئەوە دەزانێ، لە گەڵ ئەوەش پێدەکەنێ. گوێچکەی بچوکن. بە هەرەکەتێکی منداڵانە گوێیە کانی خۆی بە جووتە گێلاسێکی هەڵاوەسراو کە لە سەر مێز دیتوویەتەوە،

دەرِازێنێتەوە و پێدەکەنێ. پاشان لە پڕ خۆ گرژ دەکا و بە کەشیش دەڵێ:

– نەکەی لە بارەی منەوە فیکری خەراپ بکەیەوە.

بە ڕاستی کیژەکە زینناریکی ڕازاوە بە وێنەی مـریەمی دەست لێنەدراوی لە ژێر کراسییەوە لە بەر دایە. دوگمەی چاکەتی دەکاتەوە وکراسەکەی ئاواڵە دەکا و ئەو زینناره پیرۆزەی نیشـان دەدا، زیننار ڕەنگی سەوزە و مەمکی تورتی کیژ یش ڕەنگی شیر.

دۆن پاولۆ پاش ڕەبەنی وا دوور و درێژ لە دیتنی ئەم دوو لیمۆ تورت و ناسکانە کە بەر و بوی وڵاتی خۆنی هەست بە دڵە کوتە دەکات. داخ و سەت داخ کە مەجبورە لایەنی پارێزگاری بەرەڵا نەکات.

– پێت وانە بێ کـــە من درۆ دەکـــەم. من لایەنگری ئازادیم بەڵام لایەنگری ئاپینیشم. ئێـمە هـەر چی هەمـانە لە خـواوەیە. خـودا مـرۆڤی لە دوو نیـو دروست کردوە. لە ژن و پیاو. بیری لێ بکەوە. کە ئەگەر خودا بە هەڵە و نەزانـی تەنیا پیاوی دروست کرد بایە، یا تەنیا ژنی خولقاند با، چ دەبوو؟ پەنا بە خـوا. هەرایەک دەبوو ئەو سەری دیار نەبێ.

« بیانکینا » نیشانەی خاچ دەکێشێ. بوخچەیەکی بچوکی لە گەڵ خۆی هێناوە. کەشیش دەپرسێ:

– ئەو بوخچەیەت چی تێدایە ؟

– گشت بوون و نە بوونم لەو دایە. بوخـچـەکە لە سـەر ئەژنۆی خـۆی دادەنێ و دەیکاتەوە. ئەوەی تێـیـدایە نیـشـانی دەدا. سـەرویسـتێکی قـاوە خـۆری چینی و بەستەیەک دەسرەی چنراو. کەشیش دەڵێ:

– ئەوە کە هیچ نیە. ناتوانی بە وانە سەر بە خۆ بژی.

کیژی گـەنج بە دڵ ڕەنجی وەڵامی دەداتەوە: « ئاخر من هێشـتا گـەنجم. جگە لەوە پیاوێکی وەک ئێوە ڕوحانی نابێ هێندە ماددی بێ. دۆن پاولۆ دەپرسێ: « باشە ئێستا کە پورت وەدەری ناوی دەتەوێ چبکەی ؟ »

– من دەمویست تۆ ڕێنوێنیم بکەی. من دەتوانم چی بکەم ؟ هیچ کارێک نازانم. ئەگـەر بمەوێ گـۆڕەوی بچنم لە سـەر داوەکـانی توشـی هەڵە دەبم. ئەگـەر بمەوێ خەیاتی بکەم ،دەرزی دە قامک ڕادەکەم. ئەگەر بمەوێ لە باخـچە کار بکەم، پێمەڕە لە لاقم دەدەم. خوشکەکانی کلیسـا تەنیـا ئەوەیان فێر کردووم کە چێشت لێنێم و گوڵ بدرووم و سـرودی « گـریگۆری » بڵـێـمـەوە. بەم پێیـە نا توانم بچمـە « کـافـە

کۆنسێرتێک»یش که گۆرانی« مەگنیفیکا » و « سالۆر ژینا » بڵێمەوە.
بیانکینا دەست بە گریان دەکا. دۆن پاولۆ دەڵێ:
– جارێ با باسی دوارۆژی دوور لەو لا دابنێین. تەنیا بڵێ بزانم ئەمشۆ دەتەوێ لە کوێ سەر کەیەوە و سبە و دوو سبەی چۆن ؟ چونکە ناتوانی لە ژووری مندا بمێنیەوە.
گریانی بیانکینا توند تر دەبێ و بە گریانەوە دەڵێ: « چ قارەمانە تیەکی گەورە. کەسێک یەکێکی لە مردن نەجات بدا و پاشان لە ماڵی خۆی وەدەری بنێ. بۆ چی نەتهێشت هەر لە وێ بمرم؟ دەبوایە لێبگەڕێی بمرم. بە ڕاستی شەرمە کە ڕەفتاری ڕوحانییەک ئاو بێت.
دۆن پاولۆ بە کیژەکە دەڵێ:« ئەگەر گریان درێژە پێبدەی لوتت وەک تەماتە سوور هەڵدەگەڕێ.»
بیان کینا گریانەکە ڕادەگرێ و پاش تاوێک دەڵێ:
– یەکـــێک لە هەڤـــاڵانی قـــەدیمی دەبیـــرســـتـــانی من بە ناوی « کریستیناکۆلامارتینی» لە پیتراسکایە. ئەویش پیرۆزە بەڵام ڕەنگە ئەم کارە نە بێتە کۆسپ کە یارمەتیم بدا.
ئێستا ڕاست ئەو کاتەیە کە کریستینا ڕۆنی چرای مریەمی دەست لێنەدراو بۆماتالنا دێنێ. ماتالنا ئەوی لە هاتنی «بیانکینا جیراسولە » ئاگادار کردوە و کریستینا لە بەر دەرگای ژوورەکە ڕاوەستاوە. بیانکیناله بەر دەرگا دەست دەکاتە ملی کریستینا وماچی دەکات و لە ڕادە بەدەر نازی دەکات. ئەم دەر بڕینەی هەست وتاسەی وی لە گەڵ وتەی بە مینکە مینگ وسوکە نوزەی دەنگی ناڕوون تێکەڵە.
ماتالنا کورسییەکی دیکە دێنێ و کریستینا دەتوانێ دانیشێ و خۆ جوانکردنە شێواویەکەی خۆی نەختێ ڕێک و پێک بکاتەوە. دۆن پاولۆ لە پێشدا تەنیا لە گەڵ دەنگی وی ئاشنا بوو بەڵام پێشتر هەستی دەکرد دەبێ لەش و لارێکی نەرمو جوانی هەبێ. ئێستا دەبینێ کە زۆر وە یەکێ لە کچەکانی مامی دەچێ کە بە منداڵی یاری لە گەڵ کردوە. ڕوومەتێکی کز و باریکی هەیە کە دەڵێی لە ناخدا سووتاوە و تواوەتەوە. ڕوخسارێکی لە تیپی ڕەگەزە کۆنەکان، پڕ لە نا هومێدی هەست پێنەکراو و ئاگادار لە بێ فایدەیی شتە هیچ و پوچەکان. کیژی گەنج لیباسێکی کچەکانی پانسیۆنی دەبیرستانی ئایینی لە بەر دایە. واتە پێش بەندێکی ڕەشی بەستوە کە مل و سەر دەستەی بە دوگمەن. قژەکانی کە وەک قەترانی ڕەشن

و لە نێوەڕاستی سەری بەشکراون لە سەر لاجانگی سەبروکە دەبزوونەوە و پاشان وەک کاکۆڵی هۆنراوە بە ئاڵقەی ورد لە بان سەری کۆ بوونەوە.

کریستینا سڵاو لە کەشیش دەکا و دەڵێ:

– هەر ئێستا لە ماڵی خۆمان دوای نوێژ وەک هەموو شەویک بۆ چاک بوونەوەی تۆش دوعامان کرد.

دۆن پاولۆ دەپرسێ: بۆ شیفای من ؟

– شەوێکیان کە بابم هاتەوە ماڵ بە ئێمەی گوت: کەشیشێکی غەریب بۆ عیلاج و حەسانەوە هاتۆتە پیتراسکا و پاشان لێی زیاد کرد و گوتی: دوعای بۆ بکەین ئاو و هەوای گوندی ئێمەی پێ بکەوێ.

بیانکینا دەپرسێ:« چۆن ئێوە هێشتا یەکتر ناناسن؟ کریستینا هەوەڵین کەسێک بوە کە خۆشم ویستوە. ئێمە سێ ساڵ پێکەوە لە دەبیرستانی ئایینی دەرسمان خوێندوە. ئەو شاگردی یەکەمی کلاس بوو منیش ناچار شاگردی ئاخر. هەر بۆیەش یەکترمان خۆش دەویست.

بیانکینا دیسان دەڵێ:

– لە ژیندا هەمیشە دەمی وا دێنە پێش کە مرۆ بۆ دڵداری هەوەڵی دەگەڕێتەوە. هیچ دەزانی کە مامۆستا چ نازناوێکی دابوو بە کریستینا. بە مادمازێل موزیک بانگی دەکرد. کریستینا ئەوەندەی موسیقا خۆش دەویست کە من ئێرەییم پێ دەبرد.

دۆن پاولۆ لە کاتێکا چۆتە فیکرەوە تەماشای کریستینا دەکا. ڕوومەتی کیژی گەنج و دەستەکانی لە بەر بێ خوێنی و ڕەنگ پەڕیوی وەک گوڵی سپی وانە.

« بیانکینا » درێژە بە قسەکانی دەدا:

– ماگاشیا بە منی گوتبوو کە تۆ هێشتا لە پیتراسکای. ڕاستیت دەوێ ئەم مەسەلەیە لە لایەک بوو بە هۆی خۆشحاڵی من، چونکە بەم چەشنە تۆ دەتوانی یارمەتیم بدەی. بەڵام لە لایەکی ترەوە داخوا ئەوە جێگای داخ نیە کە کیژێکی وەک تۆ لە کوخێکی ئاوا دا بمێنێتەوە؟ مادمازێل موزیک! تۆ دەبوایە مودیری مەدرەسەی موسیقا و یا لانی کەم ڕاهیبەی دێرێکی گەورەی ژنانی تەرکە دنیا بای.

دۆن پاولۆ داوای لێبوردن دەکا و کتێبی دوعای خۆی دەر دێنێ تامزاحمی کیژەکان نەبێ. کریستینا هێشتا زاری لێک نەکردۆتەوە و چاوە ڕوانە تا « بیانکینا » پشوێک بە قسەکانی بدا . ئەو دەم دەپرسێ :

– ئەوانیتر چییان لێهات؟ « ئینکوراناتا » چدەکا؟
« بیانکینا » لە وەلامدا دەڵێ:
– « ئینکوراناتا » شـایەتنامـەی مامـۆستـایی وەر گرتوە، بـەلام هێشـتا شـوێنێکی نەدیوەتەوە کـاری لێبکات، لـە ئاخرین کۆنکوری ئەیالـەتی بۆ پڕ کردنەوەی دوازدە جێگای بەتاڵ سـەت و هـەشت کـەس داخواز بوون. «ئینکوراناتا» هەولی خۆی دا و تەنانەت لە گەڵ شۆفیری مامۆستـاش نوست، بەلام کـاری دەست نە کـەوت. قـەرار بوو مێـرد بە مـیـرزای کـوێخـای « فوسـا »بکات، بەلام شـەوی بۆکـێنی زانی کـە دەزگیرانی لە گـەڵ خوشکیشی پێوەندی باشـی هـەیە. شـایی تێکدەچێ. جگە لەوە میرزای یاسکراو وەک پاڵووی سواو وابوو، خەریک بوو دەست بگەیێنێتە منیش.
دیارەپیشـەی موشـتـەرییە بە ڕێزەکانی میوانخـانەی « تۆرنسـول» بە قـولی کاری کردۆتە سـەر شێوەی ئاخافتنی« بیـانکینا ». کریسـتینا ناتوانی نارەحـەتی خۆی لای کەشیش لە ڕوو هەڵمالاوی قسـەکـانی «بیانکینا » بشـارێتـەوە. بەلام دۆن پاولۆ بە ڕواڵەت سەر گـەرمی کتێبی دوعـای خۆیەتی و گویا ئاگای لە قسە کردنی کیژەکان نیە.
کریستینا دەپرسێ:« ئانیتا پێتر ئانجلی» چدەکات ؟
– ئانیتا پێتر ئانجلی ئاکوا فره دایی دەڵێی؟ فەقیـرە باوکی مرد. ئێستـا دەبێ فـەقـیـری و هـەژاری تەواو بە سـەر مـاڵەکـەیاندا زاڵ بێ. چونکە چوونی ئێدارە بە پێچەوانەی شـان و شـەوکەتی بنە ماڵەی وانە. شەرافەتی بنە مـاڵەی « پێتر ئانجلی» حـوکم دەکـات کە کـیژی گـەنج بۆ چاوەڕوانیی خوازبێنیکەرێکی دەوڵەمـەند لە مـاڵ دانیشێ.
کریستینا بە ئیرادەوە دەپرسێ: « تۆ چدەکەی کە وا بە باشـی لە ڕەوەندی ژیانی تایبەتی خەڵک ئاگاداری. »
بیانکینا لە وەلامدا دەڵێ :
– لە دەشـتێ هەمـوو شت ئاشکرایە. بە تایبـەت ئەگـەر مرۆ لە مـیـوانخـانەیەکی وەک « تورنسـول» بژی. لە واقعیـەت وتەنانەت زیاتر لە حـەقیقـەتیش لە کارێ خـەڵک ئاگا دار دەبێ.
کریستینا دەپرسێ:« کۆلومبیا »ی ئازیزی مە چی لێهاتوە.؟
– ئەو شـوی بە کـابرایـەکی سـەرۆکی ئیزگـەی ڕێگای ئاسـن کردوە. کـابرا بیوە مێردیک بوو خـاوەنی سێ منداڵ و بە قـەولی کـولومـبـیا بۆتە قـەرەواشی ئەم پیاوە.

خـزمەتكارێكە بە هەموو كارێ ڕادەگا. ئەم سەرۆك ئیزگەیە منداڵی نە گەرەكە. بۆ پێشگری لە منداڵ بوون شتی وا بەكار دێنێ كە ویژدانی ئایینی كۆلومبیا لێی بێزارە. توشی هەر كەس دەبێ دەردی دڵی لە كن دەكا. تەنانەت كار گەیوەتە ئاستێك كە قەشە بە ناچاری دەستی گەیاندۆتێ. وای لێهاتوە ئێستا نێوانی ئیزگەی ڕێگای ئاسن و كلیسا بە توندی تێكچوە.

كریستینا بە نارەحەتیەكی تایبەتی كە ناتوانێ بیشارێتەوە گوێ دەداتە قسەكانی بیانكینا لە بارەی هاو دەرسەكانی كۆنی خۆی. سووراییەكی كەم ڕوومەت و لاجانگەكانی لە ژێر تاجی پرچە ڕەشەكانی ڕەنگ دەدەنەوە. دۆن پاولۆ هەر وا خەریكی خوێندنەوەی كتێبی دوعای خۆیەتی.

كریستینا دەڵێ بیستوومە « ئادالجیزا » ش شووی كردوە .

بیانكینا دەڵێ:

: من و ئادالجیزا ماوەیەک دەزگیرانی پیاوێک بووین. ئەوله ناوچەی « فوچینۆ» سەرۆكی شانەیەكی حیزبی دەوڵەتی بوو. سەگبابێک بوو تای پەیدا نە دەبوو. دیارە من بۆیە واناڵێم چونكە « ئالجیزا »ی لە من پێ باشتر بوو

تەنانەت دەبێ دان بەوە دابنێم كە پاش ژنهێنانیش ساڵێكی تەواو شەوانی چوار شەمۆ دەهاتە میوانخانەی « تورنسول» و شەو لە كەڵ من ڕایدەبوارد. لە ترسی ئەوە نە وەک دەردە سەری بۆ پورم پێک بێنێ، بوونی ئەو سەگبابەم قبوڵ دەكرد. ئاخرەكەی وەک هەموو دەزانن سەبارەت بە سامانی باوكی «ئادالجیزا »ی هێنا بوو. باوكی یەک لە مودیرەكانی بانگی كشت و كاڵی ویلایەت بوو. كاتێكی بانگی كشت و كاڵ بەسترا « ئادالجیزا » ناچار بوو بۆ ڕزگاری باوكی لە زیندان بەشە میراتی دایكی لەم ڕێگایەوە فیدا بكات. پاش ئەو ڕۆژە ئادالجیزای فەقیر مێردی نەدیتەوە. ئێستا لە بەر ڕێک نەكەوتنی ئەخلاقی بە قانون لێک جیا بوونەوە.

كریستینا دەپرسێ:

– كە وابوو ئێستا باوكی توشی نەداری و فەقیری بوە. ئەو چۆن دەژی و خەریكی چیە؟

– لەم دواییانە دا شۆرباوی دەوڵەتی بە سەر بێكاراندا دابەشدەكا. ئەو بە لوتف و بێ فیزی مەلائیكەی ڕەحمەت، نان و شۆرباو دابەشدەكا. شۆرباوە زیادییەكەش بۆ خواردنی بانگداری پیر و نابوت دەباتەوە ماڵێ.

كریستینا بە تێكنانی برۆی كە تا نێو چاوانی هەڵكشاون، گوێی دەداتێ. پەڕی

ناسکی لوتی وەک باڵی باڵندە لێدەدا . لەم حاڵە دا دەپرسێ:
- ئاوانجلینا چی بە سەر هاتوە؟
- دۆنا ئاوانجلینا ئێستـا ڕێکخـراوی ناوچەیی ژنانی فاشیـست بە ڕێوە دەبا. هەر بۆیەش پێی وایە کە چارە نووسی وڵاتی بە دەستە. ئەو ئاگای لە هەموو شت هەیە، تەنیا ناتوانێ قسە بکات، دیارە دەزانی کە مەبەستم ڕازەکانی دەوڵەتییە.

ئێستـا ئەگەر کەسێک لێی بپرسێ:« بە ڕاستی ئاوانجلینا شـەڕ دەبێ یان نا؟» لە باتی وەڵام دانەوە تەنیـا بزەیـەکی دەڵسـۆزانەی دێتـە سـەر لێـوان. لە جـێـژنی ساڵانەی حیزبی دەوڵەتیدا چۆتە ڕۆم و گۆیا سەرۆکی دەوڵەت( دەزانێ کێ دەڵێم)لە دوو سەت میترییـەوە تەماشای کردوە. لەو ڕۆژەوە ئانجلینا جگە لەم تەماشا کردنە ناموبارەکە کە لە دوو سەت میـترییەوە کاری تێکردوە. لە گەڵ دۆست و ئاشنایانی باسی هیچی دیکە ناکات. فەقیرە هەر بەو نیگایە ئاوس بوە. باوکی « دۆنا ئانجلینا بە زەحـمـەتی زۆر بە دوای پیـاوێک دا دەگـەڕێ کـە نـەخـشی یوسـفی پیـرۆز بۆ منداڵێکی دەبوایە بێـتـە سـەر دنیـا یاری بکات. لەو سـەر دەمی بێکاری کێ لە قبـولکردنی کـاری خـێـر خـۆ لادەدا . لە ئاخردا ئانجلینا یوسـفی پیـرۆزی خـۆی دۆزیوەتەوە. بە هـەڵکەوت بی ئەوەی لە گـەڵ داب ونەریتی مـێـژوویی یەک بگرێتـەوە، ئەم یوسفە پیرۆزە بێکارەش دار تاشە

دۆن پاولۆ خوێندنەوەی کتێبی دوعای تەواو کردوە. دەبینـێ کە کریستینا گرژ بوە و مختە ئەسرینی لە چاواندا کۆ بینەوە.

کریسـتینا بیـانکیناى لە منداڵیـیـەوە دەناسـی. ئێسـتـا وەبیری دێتـەوە کە ئەم دۆستـە کۆنەی هـەر لەو کاتەوە عـادەتی بوە بە ڕەفـتـار و قـسـە بێ ئەدەبییـەکـانی هەمیشە گاڵتە بکات. بەڵام ئەم کارەی بۆ مەحکووم کردنی کەسێک بەڵگەی تەواو نیە. هەر کیـز نابێ کەسـێک بە دیاردەی ڕواڵەتی مـەحکووم بکەی. چونکە ڕواڵەت هەمیـشـە لە واقعیـەت دزێو ترە. بیانکینا لە درێژەی قسـەکانیدا دەڵێ:« کیوسـە پیناسـتراڤا» لە هەموو کیـژەکان بەختـەوەر تر بوە. ئەو ئێـستـا لە ڕۆم لـە خـانوو بەرەیەکی شـاز دا دەژی. خـەرجی خـوێندن دەدا بە برایەکی و هەمـوو مـانگیش خەرجێک بۆ دایکی داماوی دەنێرێ.

کریستینا بە بیستنی ئەوە کە لانی کەم یەک لە دۆستە قەدیمیەکانی توانیویەتی لە ژیاندا سـەر کەوتوویێ، خۆشحـاڵ دەبێ. بەڵام لە وەش سـەری سوڕ دەمـێنێ و دەڵێ:« کیوسەپینا ستراڤا» هەمیشە کیژێکی دڵچاک بوو بەڵام کەمتر نیشانی دەدا

کە چالاک و تێکۆشەر بێ.

بیانکینا لە وەڵامدا دەڵێ:

– ئەو کارەی ئەو پەیدای کردوە پێویستی بە خۆ ماندوو کردنی زۆر نیە. چونکە ئەو بۆتە ڕەفیقی سەنعەتکارێکی دەوڵەمەند و ڕەبەن.لە کاتێکا لە گوندی زانیویانە کە مەسەلە چیە، بنە ماڵەی پێدا دەگرن کە دایکی لە ڕوانگەی پاراستنی ئابرووی خۆی ئەم پارمەتیە کەمە کە کیژەکەی بۆی دەنێرێ وەری نەگرێ. بەڵام پیرێژنی بەد بەخت جگە لەوە هیــچی دیکە شک نابا و بە ناچار ئەو پارەیە وەر دەگــرێ. لە ئانجامدا تەواوی کەسانی بنە ماڵە پێوەندی خۆیان لە گەڵ ئەم پیرێژنە بچڕاندوە و کاتێکی ژنی فەقیر دەچێتە کلیسا، ئیماندارەکان ڕووی لێ وەر دەگێڕن.

کریستینا دەڵێ: « ئێمە بەو زۆر بڵێییە ئاغای کەشیش هیلاک دەکەین. هەڵدەستێ کە بڕوا. بیانکیناش بە دوایدا ڕادەبێ تا ئەو ئاخرین هومیدەی کە بۆ پەنادانی شەو هەیەتی لە کیسی نەدا.

بیانکینا بە قەشە دەڵێ: « من بەیانی دێمەوە. هێشتا قسە زۆرە پێکەوە بیان کەین. بەڵام بەیانی بیانکینا خەبەری نیە. دیار نیە.»

پاش دوو ڕۆژ لە پیتراسکا هەرایەکی سەیر ساز بووە.« شاتاپ» کە بە سواری « گاریباڵدی» بۆ ماڵ دێتەوە دەبینێ لە ئاگردانی خانوە چکۆڵەکەی داوێنی دۆڵ، ناسراو بە « پەناگای گوناحکاران» و سەر بە بنە ماڵەی « کولامارتینی» دوو کەڵ هەڵدەستێ. ئەوە دووکەڵی سووتمان نیە بەڵکوو دووکەڵێکی باریک و سوک و یەکدەستە وەک دوو کەڵی ئاشپەز خانە. بەڵام لە خانوێکی چۆل و دوور کەوتە وەک کەسێک لە وانەیە خەریکی ئاشپەزی بێت. داخوا جندوکەن شۆرباو لێدەنێن؟

دانیشتوانی پیتراسکا بڕوا بە قسەی شاتاپ ناکەن. « فیلومنا سپونە» و« جــزیرا »ی پیرێژن و « لیدووینا » و چەند منداڵ بە پەلە دەچن بزانن چیاســە. ڕێگایەکی دوور نیە. چونکە هەر لە پێچی دووهەمی جادەوە دووکەڵی باریک و ڕەنگ شیری دەبینن کە لە کولانەی « پەناگای گوناحکاران» دێتە دەر. دەرگ و پەنجەرەی خانوو ئاسایی داخراون. ماڵەکە چۆلە. کە وابوو ئەم دووکەڵە چیە؟ داخوا بە ڕاستی جندوکە بۆیان هەیە شۆربا و لێنێن.؟ ژن و منداڵ بۆ پیتراسکا دەگەڕێنەوە. خەڵکی دیکەش بۆ بینینی ئەم ودزعە ڕادەکەن. بیر و ڕای سەیر دەبیسرێن. ئاخرەکەی بڕیار دەدەن بچن بنە ماڵەی « کولامارتینی» کە خاوەنی خانوەکەن، ئاگادار بکەن. لە دەرگا دەدەن بەڵام چونکە کەس نایە دەرگا بکاتەوە ژن لە کۆڵان

هـاوار دەكەن:

– هۆی دۆنا كريستينا ! هۆی دۆم پاسكاڵ! هۆی دۆنا ئادل! هۆی دۆنا سچيليا ! ژن لە ســـەر يەک لە دەرگـا دەدەن. لە ژووریّ دەنگە دەنگ دیّت، بەلاّم كـەس نـايە دەرگا بكاتەوە، چقەوماوە كە دەرگا ناكەنەوە.؟ ژن و منداڵ لە دەرگا دەدەن و هـاوار دەكەن: هۆی پاسكاڵ ! دۆنا كريستينا ! دۆنا ئادل! دۆنا سچيليا !

ئاخـرەكـەی دۆن پاسكاڵـی پيـر بە ڕەنـگی پەڕيو و سـەر و پۆڕێكی ئاڵۆز لە بەر هەيوانی مـاڵە ديّتـە دەر. بێدەنگی قـورس زاڵە. پاشـان دۆن پاسكاڵ دەڵێ:« بڕۆن بە دوای كاری خۆتاندا. چكارتان بە مەيە؟

خەڵک هاوار دەكەن : لە خانووی جندۆكان دووكەڵ ديّتە دەر.

دۆن پاسكاڵ لە ڕووداوەكە ئاگـا دارە بۆيە دەڵێ: « باشـتـرە هـەر كـەس بە دوای كاری خۆيدا بڕوا.

پێداگرتن بێفـايدەيە و خـەڵک ناچار بە گرژی دەچنەوە مـاڵی خـۆيان و هەزاران خەياڵ و بۆ چوون لای خۆيان دەهۆننەوە.

كـاتی شـەو كريسـتينـا بە گوێرەی ئاسا ڕۆن بـۆ چرای مريـەمی دەست لێنەدراو ديّنێتە موسافير خانە. ماتالنا دەڵێ:

– دۆن پاولۆ تكای لە من كردوە خەبەری ئەو كيژەی خەڵكی « فوسادی مارسـی» كە ڕۆيشت و نە گەڕايەوە لە تۆ بپرسم.

كريستينا بە ساكاری وەلاّم دەداتەوە:

– ئەو لە گەڵ ئالبێرتی برام لە كۆخێكی بچـوكی كە لە خـوارەوەی دۆڵ هەمـانە نيشتە جێ بوە.

ماتالنا نيشانەی خاچ دەكێشێ و هاوار دەكا و دەڵێ:

– چۆن ؟ ئەوان پێكەوە لە « پەنـاگـای گـوناحكاران» نيشـتـە جێ بـوون؟ ئاخـر جندۆكە دەيان خۆن.

كريسـتينا ڕۆنەكە دەدا بە ماتالنا و لە حالّی كەشيش دەپرسێ و بێ ئەوەی هيـچ بڵێ. دەڕوا. مـاتالنا ڕادەوەستێ تا كريستينا لە بەر چاوان وون دەبێ تا بە مـالاّندا بگەڕێ و بپـرسـێ :« هيـچ دەزانـن كێ پەناگـای گـوناحكارانی كـردۆتـە مـزڵ؟ چۆن نازانن؟ يانـی هيـچ هەست پێنـاكەن؟ پاشـان ڕوو داومكـە بە ئاو وتاو و سـەر و گوێ بچڕاو،پەيتا پەيتا بۆ مالّێک ڕوون دەكـاتەوە و پاشان بە پەلە دەچێتە مالّێكی ديكە و دەڵێ: « ئێـوەش نـازانن كـە ئێـسـتـا كێ لە « پەناگـای گـوناحكاران» دا دەژی؟ بە

ڕاستی نازانن؟ کە وابوو ئێوە لە چ دنیایەکدا دەژین ؟»

ئەو ڕۆژە هاتوە کـە کـریسـتـینا دەبێ بۆ فـێر بوونی تازە بچێـتـە دێری ژنانی تەرکە دنیا و باوکی پێی گوتوە:

– من کوڕێکم هەبوو لە کیسم چوە. ئێستا تۆش دەڕۆی و بابت بە تەنیا لە گەڵ دایە گەورەت و دایکت و پورت. واتە لە گەڵ سێ پیرێژنی دەستە وستان بە جێدێڵی. بەم چەشنە ئێمە بە ئەسپاردنی ژیانی خۆمان بە دەستی کوڵفەتێکی پیر کە ئەوەی ماویشمانە دەیدزێ، تەمەنمان بە سەر دەچێ.

کـریسـتینا وەڵامی دەداتەوە: « بابە تۆ دەزانی من بە پێچـەوانەی مـەیل و ڕەزای تۆ هێچ ناکەم.

لە گـەڵ ئەوەی کە باب کـیژەکـەی زۆر خـۆش گـەرەکە. لە خـۆ ڕانابینێ لە گـەڵ نەزەری ئەو مـوخـالەفـەت بکا هەر بۆیەش ڕۆژ تێدەپەڕن بێ ئەوەی بتـوانێ بڕیاری ڕەزانیـەت بدا. بە قـەولی خـەکی « پیـتراسـکا » کچ لە پێشدا ئی مـاڵێیە، پاشـان ئی کلیسا. بەڵام باوک دەڵێ:

– من کوڕێکم هەبوو لە کیسم چوو. ئێستا تەنیا کیژێکم ماوە. ئەگەر ئەویش لە بەر ئێمە و سەبارەت بە خۆ ویستی لە کیس بچێ، چی؟ نازانێ بڕیاری چی بدات. لە وەش زیاتر تەنیا ئەو خـاوەنی بڕیار نیـە، لە بان سـەر وی دایە گـەورەش هەیە. کریسـتـینا بێ ئەوەی سکاڵای هـەبێ هـەر وا کـارەکـانی مـاڵ بەڕێوە دەبا. ئاگای لە مـریشکانـە، جێ و بان ڕێک و پێک دەکـا، ژوور و پلیکانان گـسک دەدا. لە مـتـبـەق یاریدەی دایکی دەدا. لیـبـاسـەکـان لـە ئوتو دەدا و بە باخـچـە و مـێش هەنگوێنان ڕادەگا.

ڕۆژێکی بەیانی کـە دۆن پاولۆ لە باخـچـەی موسـافـیرخـانەی مـاتـالنا لە بن دار هەنجیرێک دانیشتوە. کریستینا دێتە وێ و دەسکە پیوازێکی بە دەستەوەیە دەیەوێ شینی کاتەوە. ڕووناکایی بەیانی هەر وا عەبای ئەندامی کیژەکەی داپۆشیوە. چەند مـێش هەنگوین لە بان سـەری هەر وەک لە سـەر گـوڵی بە توز، وزە وزیانـە. دیمەنی ئەم گوڵە بە بڕوای کەشیش کەم و زۆر کەم ڕەنگ دەنوێنێ. ئاخرەکەی غیرەت وەبەر خۆ دەنێ و لە کیژەکە دەپرسێ:

– ببـوورە قـسـەی زیادی دەکـەم. بـەڵام لام وایە لەوە ناڕەحـەتی کـە نەت توانیـوە هێشتا بچیە دێر. داخوا کۆسپێکت لە سەر ڕێگایە و ناتوانی وەڵای بەری ؟

– من ئەگـەر لە وەڵامی تۆ دا سـێ وشـەی گـەورە بڵـێم کـە بـە منداڵی فـێریان

کـردووم و هـەر گـیـز لە بیـرم نە چوونەوە، تکا دەکەم بە بێ ئەدەبیی دانەنێی. ئەم سێ وشـە ئەمـانەن:( Jesus autem tacebat) و ڕەنگە ئەم سێ وشـــەیە لـە تەواوی قسەکانی ئینجیل زیاتر کاریان لە من کردوە. مەسیح ئێمەی فێر کردوە کە کاتێ قسە لە چارە نووسی شەخسی ئێمە دێتە گۆڕی، بێدەنگ بین.

کەشیش دوو بارە دەڵێ :

- لە گـەڵ ئەوەش نا توانـی بڵـێی تۆ ئەگـەر لە دێر بژی یا لە مـاڵ. تەواوی ڕۆژ ببـەسـترێیـەوە یا ئازاد، بۆ هەر شـوێنێ بخـوازی بتوانـی بچی یا نەتوانـی، بۆ تۆ فەرقی نیە

.کریستینا لە وەلامدا دەڵێ :- خۆشبەختی لە بوونی نان و ئاو و کراس دا نیە.

کەشیش هـەناسـەیەک هـەڵدەکێشێ و دەڵێ:

- تۆ ویستیاری خۆشبەختی ؟ ئایا بە ڕاستی لە سەر ئەو بڕوایەی کە دەتوانی خۆشبەخت بی؟

کریسـتینا لەم قسـەیە کـەمێک هەڵدەبەزێتـەوە. تەماشـای کەشیش دەکا. چۆن دەگرێ قسەی وا بە سەر زمانی کەشیش دابێت.؟ نەکا بە مەبەستی داوەری ورد تر بۆ ڕوونکردنـەوەی پێگەیشتن و تەواوەتـی دینی ئەو نەخـشـی وەکیلـی شـەیتـان یاری بکات! کریسـتینا نایەوێ بە پێچەوانەی بیر و ڕای قـەشـەیەکی فـەقیـر و نەخۆشی مەحکووم بە ژیانی تەنیالە و قوژبنە قسەی کرد بێت. بۆیە دەڵێ :

- پێت وانیـە کە بێـدەنگی وەک سـەرە تای بەختـەوەری بێ.؟ بێـدەنـگی ناخ بەو مانایەیە کـە هـەر ئەندامێک لە ئەندامەکان لە جێگای خۆیانن و گشتیان سەر تا پێ گـوێچکەن. چونکە ئەگـەر وانەبێ مـردنە. بێـدەنگی تەواو کـەم خـایەنە بەڵام ئەگـەر بزانی لەو دەمەدا کە تەواوی ئەندامەکان سەرتا پێ گوێچکەن،چ تام و چێژێک هەیە.

دۆن پاولۆ پێی وایە کـە کیژەکە شیعرێکی جوان لە بەر دەخوێنێ. کـەشیش دوو بارە دەپرسێ:

- بۆچـما نـاکرێ لە جـەنگەی هەرا و بگـری شـارێکی گـەورەشدا بێـدنگی ناخت هەبێ؟ ناتوانـی لە نێـو کۆش دا تـەنیـا بی ؟ داخـوا دەبێ ئەوەنـدە بە خـۆمـان بێ بڕوا بین کە بچین خۆمان لە دێر زیندانی بکەین ؟

کریسـتینا لە وەلامـدا دەڵێ: نابێ بێباک بین. دەبێ ئارام و گوێ لە مـست بین و بێلـێن یارمـەتیـمـان بدەن. من لە کـتـێبی قـەشـەیەکی فـەرەنسـیدا خـوێندوومـەتەوە:« داخـوا منداڵ کە تازە لـە دایک دەبێ لە خـۆوە بۆ گرتنی مـەمـکی دایکی ڕادەبێ و یا

دایک جیگەر گۆشەکەی لە ئامێز دەگرێ و بە سەریدا خوار دەبێتەوە تا شیری بداتێ و ژیری کاتەوە.؟

ساکاریی و تەڕ و تازەییکی کە لە وجودی کریستینا دا دەدرەوشێ، لوتف وکێشێکی بێ وێنە دەدا بە قسەکانی. دۆن پاولۆ دەبێ تێبکۆشێ لە بەرانبەر ئەم لوتف وکێشە یە دا خۆ ڕابگرێ. دەڵێ:

– من نامەوێ دەرگای باسی ئیلاهیات لە گەڵ تۆ بکەمەوە. تەنیا من دەڵێم تەماشایەکی ئەم وڵاتە بکەین کە ئێمەی تێدا دەژین و لە زۆر بارەوە بە تەواوی سەرە تایییە. وڵاتێک کە توشی فەقیری توندی ئابووری بوە و زیاتر لە وەش توشی فەقیریی مەعنەوی بوە. ئەگەر جۆتیارێکی فەقیر نا توانێ بە سەر سروشتی حەیوانیی خۆیدا زاڵ بێ» فرانسیسکن» دەبێتە مورتاز. ئەگەر کیژێکی گەنج بتوانێ خۆی لە بەند و داوی کۆیلەتی لەشی ئازاد بکا پەردە بە سەر ڕوخساری خۆی دادا، ئایا پێت وانیە کە سەر چاوەی گەلێک لە دەردەکانی ئێمە بێگومان هەر لەم نوکتەیە دایە؟ پێت وانیە کە دووری مەوجود لە نێوان مەعنەویەتێک کە پەنای بۆ ژیانێکی هاو دوو لە گەڵ خەیاڵی مەزهەبی بردوە و کۆمەڵانی خەڵکێک کە هێزی شەیتانی بە سەریاندا زاڵ بوە، سەر چاوەی هەموو بەد بەختییەکانی ئێمەن.؟ بیر ناکەیەوە کە هەر کیان لە بەرێک لە جیاتی ئەوەی خۆی لە کۆشکێکی ئێسکی فیلدا حەبس بکا، دەبێ لە نێو کیان لە بەری دیکە دا بژی و خەبات بکا.؟

کریستینا لە وەڵام دا دەڵێ:

– ئیماندار هەر گیز تەنیا نیە. بە پێچەوانە کافر هەمیشە تەنیایە هەر چەند لە بەیانیەوە تا ئێوارە ڕۆژی خۆی لە کۆڵانەکانی هەرە شلوق دا بەرێتە سەر. گیانێک خودا نە ناسێ تەنیایە، وەک گەڵا یەکە لە دار کەوتبێتە خوارێ. گەڵایەکی تەنیا بکەوێتە هەردی وشک دەبێ و دەڕزێ. بە پێچەوانە، گیانی سەر بە خوا وەک گەڵایەکی سەر دار وایە و لە ڕێگای شیرەیەکی ژیان کە دەر خواردی دەدرێ پێوەندی بە جەستە و لق و ڕەگ و تەواوی زەویەوە هەیە.

دەنگی کریستینا بیرەوەری ئەم باسە بیر دەخاتەوە کە ڕۆژگارێک لە ناخی قەشە دا لە نێوان دۆن پاولۆی لاو و دۆن پاولۆی شۆڕشگێڕ دا ساز دەبوو. ئەو خۆشی کە تینووی ڕەها وشەیدای ماف و داد بوو، کاتێ لە کلیسا جیا بۆوە تا ڕوو بکاتە سۆسیالیزم، هەر وابوو. بەڵام لەو دەمەوە تا ئێستا چەند ساڵ تێپەڕیوە. ئێستا لەو هەڕەکەتی ساکارانەی وی بۆ لای کۆمەڵانی خەڵک چی ماوەتەوە.؟ ئەو

پاش بچڕاندنی پێوەندی لە گەڵ کلیسایەکی کە لە حاڵی کەوتن و ڕووخاندایە، پاش دوور کەوتنەوە لە هەموو خۆ ڕێکخەری و هەلپەرستی و هە موو جۆرە سازان لە گەڵ کۆمەڵگا ئایا توشی هەلپەرستییەکی دیکە نەبوە کە بە رژەوەندیی حیزبێکی سیاسی خستوویەتە سەر شانی ؟

ئەو لە گەڵ دنیای کۆن و خۆشییەکانی ئەو پچڕاندوویەتی و هە موو جۆرە پێوەندییکی لە گەڵ بنە ماڵەی خۆی بچڕاندوە. وازی لە خوێندن هێنا کە پێی لە هەموو کارێک باشتر بوو، خۆی بەوە ڕازی کردوە کە تەنیا لە پێناو داد و ماف دا دەژی. وچۆتە نێو حیزبێک کە لە وێ پێیان گوتوە حەقیقەت و داد جگە لە خەرافات و دەمارگرژی بۆرژوایی شتێکی دیکە نیە. داخوا هەست ناکات کە خەیانەت بەویش کراوە؟ داخوا لە وانە نیە کە بەرێگای چەوت دا ڕۆیشتبێ؟

بەم چەشنە لەو کاتە دا کە کریستینا قسەکانی درێژە پێدە دا، دۆن پاولۆ لە پڕ لە چەمسەرێکەوە بۆ چەمسەرێکی دیکە دەکەوێتە جوڵە و بزوتن. باسکردن لە نێوان دۆن پاولۆی لاو و دۆن پاولۆی شۆڕشگێڕ سەر دەکتشێتە کێشە ولە ئاخر دا شۆڕشگێڕ سەر دەکەوێ.

دۆن پاولۆ دوو بارە دەڵێ :

– مە بەستەم ئەوە نیە کە لەبارەی مەسەلەی خودایی لە گەڵ تۆ باس بکەم. لە گەڵ ئەوەش ڕێگا بدە کە ئەو پرسیارەت لێبکەم: ئایا بە بڕوای تۆ دەتوانی قبوڵ بکەی کە ئەخلاق تەنیا تیئۆری بێ؟ ئایا ئەخلاق ومەسەلەی ئەزەری لە گەڵ یەکتر جیا و لێکتر بێگانە نین؟ ئایا ڕیشە و مادەی ئەخلاق، واتە ژیانی هاو دوو لە گەڵ پاکی و زێدەیی لە ژیانی ڕۆژانە و کردەوەیی دا نیە.؟

کریستینا لە وەلامدا دەڵێ:

لە یەک کاتدا ناتوانی ببیە عەبدی دوو ئەربابان- خودانان – لە نێوان ڕوح و مادە دا شەڕ لە ئاشتی نەهاتوە. دۆزینەوەی ڕێگای ڕێککەوتنی نێوان ئەم دوانە، دەکاتە فیدا کردنی ڕوح لە پێناو مادە و خەیانەت بە ڕوح بە قازانجی مادە.

دۆن پاولۆ تێکۆشاوە قسەکانی خۆی بە زمانێک دەر ببڕێ کە لە گەڵ لیباسی ڕوحانی ئەو بێتەوە. جگە لەوە ئەمە زمانێکە کریستینا لێی تێدەگات.

کریستینا بە پێکەنینەوە دەپرسێ:« ئایا تاقیکردنەوە تەواو بوو؟»

دۆن پاولۆ لە وەلامدا دەڵێ: تاقیکردنەوە نە بوو. تۆ سەرە هەودای فیکرێکت وەدەستی دام کە کاتێ تەنیا کەوتمەوە بە دوایدا دڕۆم. تاقبوونەوی ئیجباری

پیـتراسكا لـه ڕۆژەكـانی هـەوەڵدا زۆری توڕە كـرد بووم. بـەڵام ئێـسـتـا وردە وردە خـەریكە وەگری دەبم. لە كەشیش نشینی من ژیان زۆر قەڵە باڵغە هـەر بۆیە بێدەنگی و تاقكەوتنـەوەی ئێرە بۆحـاڵی مـن زۆر باشـە. ئێسـتـا كـاتی ئەوەم هـەیـە بیـر لە زۆر مەسـەلە بكەمـەوە كە لە ژیانی پڕ كاریدا دەرەتانی ئەوەم نە بوو بیریان لێبكەمەوە.

كریستینا بە زەردە خەنەوە دەڵێ:

- دەبێ جلـەوی خـۆت بە دەستی بێدەنگی بسپێری هـەر وەک نوقم بووی بێهۆش خۆ بە گەڕیانی ئاوی قوڵ دەسپێری. تەنیا لە كاتێكی وا دا خودا لە گەڵمان دەدوێ. كەلامی خـودا لـه كـاتی بێدەنگیـدا لە شـیری دوو دم پتر كـار دەكـات و تا سنووری نێـوان گیـان و بیـر و تـا جـەمسـەری ئێسكان و تەنانەت مێشكی ئیسكەكـانیش دەچێتە خوار.

كریستینا دەس لە دەستی كەشیش دەدا و دوور دەكەوێتەوە.

دۆن پاولۆ بە تەنیا لە بن دار دەمێنێتەوە و وەک تەرمێكی بێ گیان كە كەوتبێتە گەڕیانی ئاوێكی قوڵ خۆی بە لافاوی بیرەوەرییەكانی دەسپێرێ.

بەر لەوەی بچـێتـە نێو جێگا لە پشت مێزەكەی دادەنیشێ، دەفتـەرە چكۆڵەكـەی هـەڵدەگرێ و لە پشت بەرگەكەی دەنووسێ:

« وتو وێژ لـه گـەڵ كـریسـتـینا » و لە لاپەڕەی یـەكـەم دەنووسێ:« شـیكردنەوە و لێكدانەوەی گفـتگۆی یەكـەم» و پاش بیـر كـردنەوەیەكـی زۆر دەنووسێ: « لەم كـاتەی ژیاندا كـە خـۆم لە هـەموو كاتێ تەنیـا تر و بێكەسـتـر هـەست پێدەكـەم، دانیشتن لەم وڵاتە و پێـوەندی لـە گـەڵ ئـەم بوونـەوەرە سـەرەتاییـانە و چـاو پێكەوتنی ئـەم كـیـژە گەنجە وام لێدەكات تا دوو بارە بیر لەوە بكەمەوە كە پێش پازدە ساڵ چی بووم. من كـەلێک لە نیشـانەكانی لاوێتی خـۆم لە وجودی كریسـتینا دا دەبینمـەوە و دەمـەوێ بڵێم كە ئەو عـەكسێكە لە خـۆم. عـەكـسێكی ژنانە و جوانتـر لە من كـە لە نـاخـدا عەكسێكی ڕوحانیە وەک ئەوەی كە من لەو دەمدا هـەستم پێدەكرد. ئیمڕۆ كە خۆم لە گـەڵ ئەو عـەكسـە دەبینـم، هـەست دەكـەم كـە توشی نـاڕەحـەتیـەكی گـەورە بووم و گومانێكی مەزن سەر تا پێ منی داگرتوە. نەكا خۆشم خەیانەتم كرد بێ.؟

دەست لە نووسین هەڵدەگرێ. دەكەوێتە یادی ئەم ئارەزوە ساكارانە كە ئەویان بۆ هـەوەڵین دەستەی سۆسیالیستەكان ڕێنوێنی كرد بوو. لە ڕاستیدا لەم كاتە دا كە هێشتا لاو بوو كلیسـای بۆیە بە جێ نەهێشـتبوو كە لە ڕوانگەی فیكری و ڕوحی یەوە ئیرادی لێدەگرت و یا زیاتریش هەنگاوی داویشت، بەڵكوو لە بەر ئەوە بوو كە

هەستی بە قەڵشێکی گەورە دەکرد کە کەوتبوە نێوان قەول و کردەوەی کلیسا. کاتێ ئەو چوە نێو دەستەی سۆسیالیستەکان جگە لەم هەستە هیچ پاڵپێوەنەرێکی دیکەی نەبوو. ئەو لە سەرەتاوە شۆڕشگێڕ نەبوو، تەنیا لە نێو دەستە دا وای لێهات. ئێستا ئەوە پازدە ساڵە شۆڕشگێڕە و شۆڕشگێڕی بۆتە پیشەی وی. داخ و حەیف بۆ پیشەیەک کە ئامانجی« ڕزگاری جیهان» بێت.

چونکە ڕزگاری ئیدیکە دەبێتە هۆی نابوتی کەسەکە خۆی. ئێستا دۆن پاولۆ بە ڕوونی دەزانێ کە گەڕانەوەی بۆ ئیتالیا لە ناخەوە هەولێک بوە بۆ ڕاکردن لە پیشەکەی، بۆ دوور کەوتنەوە لە« بوروکراسی ئیدیۆلۆژی» و گەڕانەوەی دوو بارە بۆ ڕیزی خەبات تا ئەم تاسە و گەرمییەی کە ببوە هۆی چوونی نێو بزووتنەوە بە کردەوە وەدەست بێنەوە. ئەم کەشفە ئەو توشی گومان و سەر سوڕ مان دەکات. کە وابوو ئەم پازدە ساڵەی کە بۆ خەباتی سیاسی تەرخان کردوە، بە کاری چیهاتوە.؟ دەچێتە نێو جێگا، بەڵام ئەم پرسیارە خەوی لێ دەڕەوێنێ. دوو بارە هەڵدەستێتەوە و لە پشت مێزەکەی دادەنیشێ دەفتەرەکەی دەکاتەوە و نووسینەکەی ئاوا درێژە پێدەدا:

« ئایا دەکرێ لە ژیانی سیاسی دا بەشداری بکەی و خۆت بخەیە خزمەتی حیزبێک و هەر لەو کاتەش دا پاک و ڕاست بمێنییەوە.؟ ئایا حەقیقەت بۆ من نەبۆتە حەقیقەتی حیزبی؟ ئایا داد پەروەری بۆ من نەبۆتە داد پەروەری حیزبی ؟ ئایا بەرژەوەندی حیزبی لە ئاخر دا بە سەر هەموو جۆرە لێک هەڵاواردنی نرخە نەخلاقیەکاندا سەر نەکەوتوە کە بە هۆی خۆشمەوە تا ڕادەی دەمار گرژی وردە بۆرژوایی دابەزیوە؟

کە وابوو ئایامن لە هەلپەرستی کلیسای لە حاڵی ڕووخان ڕام نە کردوە تا گیرۆدەی هەلپەرستی حیزبێک بم ؟ » ئەدی ئەم تاسە و شۆقی من چی لێهاتوە ؟ ئایا وەپێش خستنی سیاسەت بە سەر تەواوی تێکۆشانی دیکەی ئینسانی و بە سەر پێداویستیەکانی ڕوحیدا، نە بۆتە هۆی فەوتانی ژیانی خۆشم ؟ ئایا منی لە کار و پیشەکانی قوڵ نەگێراومەتەوە.؟»

« مرۆڤ خاوەنی هێزی بێهاوتایە. ئەوەندە بەسە بیر لە کریستینا بکەینەوە. ئیمڕۆ تەواوی دەزگاکەلی کۆنە پەرستی لەم هێزانە کەلک وەر دەگرن. ئەگەر وەک لە گەڵ من کراوە تەواوی ئەم هێزانە بە لای بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیدا بێن ، لە خەباتی سیاسی پیشەییدا ئەو هەموو هێزە چی بەسەر دێت ؟

ئایا باشە ئەوانە وشک بکەین و سەر کوتیان بکەین؟ ئایا بوونی شۆڕشێکی ڕاستەقینە بۆ ئەم هێزانە دەرەتانی هەیە.؟

دۆن پاولۆ کاتێ دەگاتە ئاخری لاپەڕەکە ئەوەی نووسیویەتی دوو بارە دەیخوێنێتەوە و دەبینێ جگە لە ڕێکخستنی پێڕستی پرسیارگەلێک کە بیری ئاڵۆزی وی وەڵامی ڕووناکی بۆیان نیە، کارێکی دیکەی نەکردوە. لە کاتێکدا کە قەڵەم لە نێو قامکانیدایە ماوەیەک بیر دەکاتەوە بەڵام هیچی بۆ نووسین نیە.

٥

کریسـتینا ئەوەندە ژیر و وریایـە کـە لە هیچ شتی جـوان دروست دەکا. زووری دۆن پاولۆ کـە بە چاودێری و سـەلیـقـەی ئەم کـیـژە ڕازاوەتەوە، جـوانتـر و پاک و خـاوێنتـر بوە. وردە وردە کـە دیدار و چاوپێکەوتنی کـریسـتـینا و دۆن پاولۆ زیاتر دەبێ ڕوودەروایسـیـان لە نێـوان کـەمتـر و دۆسـتـایەتیـان پتر دەبێت. دۆن پاولۆ بۆ دەستپێکردنی دەربڕینی مـەتڵەب لە سەرە تاوە لە ترسی ئەوەی ئەوەکو لە بارەی ناو ونیـشـانـی ڕاسـتـەقـینـەی خـۆی تەرەف توشی گـومـان و دوودڵـی بکات، بە پـارێز بۆمەسەلەکە دەچێ. ئەخۆش کەم کەم چیرۆکی سەر دەمی لاویی و هەوەڵین ئەزمونی ئایینی و هەوەڵین هەنگاوی ژیانی ڕاسـتـە قـینەی بۆ دەگـێـڕێتـەوە. تەنیـا شـانۆی بیـرەوەریـیـەکانی خـۆی لە جـیـاتی کەشـیش نشـینی مـارس بە کـەشـیش نشـینی فراسکاتێ دەناسێنێ. ئاخرەکەی بێ ئەوەی بە خـۆی بزانێ ناو ونیشـانی خـۆی بە نەخشـێکی درۆی کە وەستۆی گرتوە، ئاشکرا دەکا و بە ڕوونکردنەوەی شـانۆیەکی زیندووی لاوێتی خـۆی وەها ی دەڕازێنێتـەوە کـە گـیرۆدەی فـیکر و خـەیاڵاتی خـۆی دەبێ. ئەوەندە سـاویلکەیی وسـەفـا و ئیـخـلاس و گـەرمـی لە پەیڤەکـانیدا هـەیە کە کریستینا بە تەواوی ئاشق و هۆگر دەبێ. ڕۆژێک کیژی لاو پێی دەڵێ:

– ئەوەی بۆ منت باسکرد ئـەگـەر نووسـیـبـام و بە بێ هـیچ ڕوونکردنـەوەیەک سـەبارەت بە تۆ دابام بە کەسێک بیخوێنێتەوە، گرێو دەکەم کە خوێنەر دەیگوت:« ئەم کارانە تەنیا بە لاوێکی هـەژدە ساڵە دەکرێن.»

مـوحـەبەت و هۆگـرییـەکی پێکەوەیان پەیدا کـردوە. زۆر جـار کـە تووشـی شـەڕە چەقەش دەبن، پێکەوەیان ئاشت دەکاتەوە.

ئەوەی کـە دۆن پاولۆ ناتوانێ بە قـسـە بە کـیـژی لاوی بڵێ. لە بیـرەوەرییـەکـانی ڕۆژانەی خـۆیدا دەری دەبڕێ. ئـەوەش وەک وتـو وێژێکی نـهێنـیـیـە کـە لە نێـوان ئەو وکیژی لاو دا بە ڕێوە دەچێ. لە وێدایە کە مـەیدان دەدا بە قەڵەمی خـۆی ئەوەی دڵێ پێی تەڵقین دەکا، بە وتەی نەرم و ئاشقانە دەری ببڕێ.

زۆر جار تا شـەو درنگ بۆ نووسینی ئەم بیـرەوەرییانە دادەنیشێ. ئەمـەش جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ویژدان و لە حوکمی ئەوە دایە کە کارنامەی ژیانی شەخسی خۆی

ڕێک و پێک دەکا. لەم کـار نامـەیە دا خـەریکی ڕوونکردنەوەی قـەیرانـی ئەو فـیکرە تایبەتیە دەبێ کە لە سـاڵی ١٩١٩ کردی بە سۆسیـالیست و تەوای تەقەلای خزم و دۆستەکانی باسدەکا کە ویستوویانە لەم ڕێگا چەوتە بیگێڕنەوە. مام و پور و ئامۆزا و کوڕ و کچەکانی لە خۆی گەورە تر کە گشتیان ئەهلی کلیسا و پابەندی داب و نەریتی کـۆن بوون، یەک لە دوای یەک لەگـەڵیـان باسکردوە، لۆمـەیان کـردوە، سـوێندیان داوە، لە بەری پاڕاونەوە و لە ئاخـریش دا هـەڕەشـەشـیـان لێکرد بوو. کاتێکی بەڵگە هەستیـارییەکانی هەموان تـەواو دەبوو و ئەو شـەرمـەزارییان ڕوون دەکردەوە کە داوێنگیری تەواوی بنە ماڵەی سپینا دەبوو و فایدەی نە دەبوو ئەو دەم هەر یەک لە وان دەگەیشتە ئەم پرسیارە بنچینەییە کە :« سۆسیالیست بوونی تۆ چ قازانجێکی هەیە؟» تۆ بەرژەوەندت لەم کارە دا چیە؟

کـاتێکی ئەو لە وەڵامـدا دەیگوت کـە: « من لەم کـارە دا هیـچ بەرژەوەندەێکی مـادی-م نیە.» ئەو دەم ئەو ئینسـانە باش و شـەریفانە پێیـان دەگوت:« کەوا بوو تۆ شێت بووی.» بەمجۆرە لە گەڵ بیر کردنەوە دەگاتە قەیرانێکی تازە کە ئەوی لە خزم و دۆست و لە مـەزهەبی جیـا کـردۆتەوە ولە زیندوو کـردنەوەی ئەم یادە لە ویژدانی خۆیدا هەست دەکات کە کێشـەی ناخی دوو بارە ومخـەبەر دێت و دەگاتە ئەو پەڕی توند و تیژی. ئاخـرەکەی هەست بە شـتێک دەکا کە قەڵشێکی مەعنەوی وجودی وی بە دوو بەش دابەشکردوە. تا ئەو دەمـەی ئـەو لە هەڕەکـەت و تێکۆشـان دا بوو، ئەم دوو بەشـە لە وجـودی دا ڕێک بوون ویەکـێتـیـەکی پتـەویان پێکهـێنا بوو. بەڵام لەو کـاتەوە کـە هەڕەکـەت و تێکۆشـانی نە مـاوە لە نێـوان ئەم دوو بەشـە دا ناکـۆکی و جیاوازی پەیدا بوە. مێشـکی وی لەم نە بوونەی تێکۆشـانـی ئیجبـاریدا لە دەرفـەت دەگەڕێ تا وەک کرمێکی کە شت دەجوێ پێوەندییە لاوازەکانی کە هێشتا لە نێوان دۆن پاولۆی لاو ودۆن پاولۆی شۆرشگێڕدا لە وانەی ماینەوە. بەلامار بدات.

کریسـتینا کتێبێکی سـەبارەت بە دەسـتەی تەبلیغـاتچیەکانی کاتۆلیک لە وڵاتە کۆلۆنیەکان بۆ دۆن پاولۆ هێناوە. ئەم کـتێبە پڕە لە سـەر بردەی تەبلیـغـاتچیـەکان و داسـتـانی جـۆراو جـۆر ی دژواری تەبلیـغـاتی کە ئەوان توشـی هـاتوون و بە هێـزی ئیـمـان خۆیـان لە بەر ڕاگرتوە. چارە نووسی ئەو کەسـانە لە زۆر بارەوە وەک چارە نووسـی خۆی دەچێ. ئەوانیش لە ژیانی ئـاسایی و بنە ماڵەی خۆیان جیا بوونەوە تا دوور لە سـازانکاری تەمـەن بەرنە سەر. ئەوانـیش لە خزمـەتکردنی دوو ئەرباب سـەر پێچییان کردوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانیش ئێستا خزمەت بە دوو ئەرباب دەکەن.

یەکیـان ئینجـیل و ئەویدیکەیان سەرمـایەداری کـۆلۆنیـالیستی. ژیان خـەیانەتی پێکردوون، خـەیانەت بە ئـارمـانیـان کـراوە. خـۆیـان پێیـان وایە کـە خـزمـەتکاری مـەعنەوین، لە کـاتێکا زۆربەیان بێ ئەوەی خـۆیان پێ بزانن لە سـەودای قـورسی کلیسا دا لە گەڵ دەسەڵاتی ئیمپریالیستی وردە پارەیەکی بێزمانن. ئەکا دەرمەتانی ئەوە هەبێ لە بەر چارە نووسی خزمەتکردنی شوم بە دوو ئەرباب ڕابکەن.؟

دۆن پاولۆ دێتە سەر ئەم باوەڕە کە کارەسـاتی ژیانی هەمـوو شۆڕشگێڕێک هەر لەم مەسەلە دایە. پێشتر کاتێ لە گەلێک خەباتگێڕانی حیزبی خۆی پرسیبوو کە لە چ ڕێیەکەوە بوونەتە شـۆڕشگێڕ، زۆربەیان دانیان پێدا نابوو کە وەک ئەو لە سـەرە تاوە لە ڕێگای مـەحکووم کـردنی مـەعنەوی کـۆمـەڵگای کـۆن کـەوتوونـە سـەر ئەم ڕێگایە، ئەو خۆشی سەر بردەی گەلێک شۆڕشگێڕانی خوێندۆتەوە، بەڵام لە هیچیان دا تووشی ئەم نوکتەیە نەبوە کە یەکێک لە ڕێگای بڕوای زانستی و یا لە ئەتیجەی زانستی ئابوری بوو بێتە شۆڕشگێڕ. بەڵام لە ژیانی سیاسی ڕاستە قینەدا ئەم ورووژانەی ئیدەئالیستی دەکەونە ژێر ئەزموونی سـەخت. دۆن پاولۆ بیر لەو ڕووخانە ئەخلاقیـانـە دەکـاتەوە کە ژیانی سیاسی پیشەیی تەنانەت کەسایەتیە هەرە کار کوشتەکانیش توش دەکات. ئەو ئێستا بە تەواوی دڵنیایە کە بڕیاری بە جێهێشتنی دەربەدەری و خـەریک بوون بە کـاری یاسـاخ لە پێداویسـتی سروشـتیی ڕاکردن لەو ئەزمـوونەی ویژدان سـەر چاوەی گـرتوە کـە نایەوێ دان بـە تەسلیم بوون و سـەر سپردەیی خۆیدا بنێ. نایەوێ ئیعتراف بکات کە خەیانەتی بۆ خۆی کردوە. دەیەوێ ژیانی خۆی لە دژواری و سـەختییەکی ئەو تۆ دا ڕابگرێ کە بە کردەوە تەنانەت بۆ ئەوەش کـات پەیدا نەکـات کە بیـر لەو مـەسـەلانە بکاتەوە. ڕووداوی چاوڕوان نەکراو نەخشـەی ڕاکردی ویان تێک داوە. ئێسـتا ئەو خۆی لە حاڵەتێکدا دەبینێ کە کاری بۆ ناکرێ. ئەو ئێسـتا لە بزووتنەوە و تێکۆشـان کـەوتوە. ئێستا کە بۆ وڵاتی خۆی گەڕاوەتەوە دەبێنێ لە گەڵ خۆی تەرەفە. لەم وەزعە تەواوی میکانیزمی ناخی زەبری وێکەوتوە. ئەم دوو بـەشـەی ئەویان پێکدەهێنا لێک جیـا بوونەوە. ئێسـتا دۆن پاولۆ دەزانێ کە تەنانـەت ناتوانێ بیر لە دەرەتانی ئازاد کردنی خۆ بکاتەوە لە بەشێکیان بە قازانجی بەشەکەی دیکە.

ئەم دوو بـەشانە خودی ئەون. ئەوەش دەزانـێ گەڕانەوە بۆ دواوە و گەنج بوونەوە و سـەر لە نـوێ ڕوو تێکردن لە بـیـر و باوەڕی کـەونارای ئـایینی و سـپـاردنی چارە نووس بە دەسـتی خـودای مـەزن، مـەسـەلەیەکـە دەرەتانی نیـە. پەنا بردن بۆ ژیانی

تایبەتی و بێلایەنی و گوێنەدان بە چارەنووسی غەیرە ئینسانی خەڵکی فەقیر و هەژار و قبوڵکردنی دیکتاتۆری، ئەوەش بۆ وی دەرەتانی نیە. ئەوەشی پێناکرێ پیشەی سیاسەت درێژە پێبدا و مل بۆ داب و بڕیارەکانی ڕابکێشێ و درۆ و فێڵ بکا وبەرژەوەندی حیزب بە قازانجی ڕەها بزانێ وبە چاوی دەمار گرژیی وردە بورژوایی سەیری نرخەکانی ئەخلاقی و مەعنەوی بکات. کە وابوو دەبێ چبکات؟ لە ئاخریدا بە خۆی دەڵێ:

– ئەگەر ئەم وەزعە درێژەی هەبێ من شێت دەبم.

ترسی ئەوەی بە سەر دا زاڵ دەبێ ئاقڵی خۆی لە دەست بدا. پێویستە ناوی خۆی، ناوی ڕاستە قینەی خۆی بۆ خۆ دوو پات کاتەوە و هەر چی کە بەشێکی گۆڕینی شکڵی ویە دە لیباسی کەشیشی دایە بیشارێتەوە. دەبێ دەست لە ئەژنۆ و شان و دم و چاوی خۆی بدا. دەستێکی بگەزێ و لە جەستەی خۆیدا نوختەیەکی پتەوی بەریەرەکانی بدۆزێتەوە تا لە بەرانبەر ئاڵۆزی و پەشێوی فیکری ئەودا بەر بەرەکانی بکات. بۆ رزگاری لە دڵە ڕاوکەی ئەو خەباتەی کە لە ڕێگای بەڵگە بەستراوەکانی خۆیەوە بە ڕێوەی دەبات، ڕۆژێک لیباس دەکاتە بەر، لە ژوورێ دێتە دەر و دەچێتە نێو باخ. پەتویەک لە سەر هەرد ڕادەخات و لە سەری درێژ دەبێ. زەویەکی گەرم کە تازە وەرگەڕاوە لە ژێر قورسایی جەستەی ویدا وەک مەمکی پر لە شیری ژن دادەکەوێ. لەو نەرمییە کەیفی خۆش دەبێ. بە بزاوتنی شان و لاقەکانی هەولدەدا پتر لە زەوی بچێتە خوار. دەستەیەک مێرولە کە لە دار هەنجیرێک دێنە خوار و لە پەنا وی لە سەر هەرد لە سەفێکی درێژ دا دەڕۆن و هەر مێرولەیەکیش شتێک لە گەڵ خۆی دەبات. دۆن پاولۆ لە بەر خۆیەوە بیر دەکاتەوە:

– خۆزیا توانیبام هەر لێرە نووستبام و سبەی بەیانی لە خەو هەستابام کەرێکم جل کرد بایە و چوو بامە نێو ڕەز. خۆزیا توانیبام بنووم و پاشان وەخەبەر بێم و نەک هەر سییەکانم چاک بوو بانەوە بەڵکوو سەریشم وەک سەری مرۆڤێکی ئاسایی بایە و مێشکم لە خەیالات ئازاد بایە. خۆزیا توانیبام گەڕابامەوە سەر ژیانی ئاسایی ڕاستە قینە. پێمەڕەم لێدابایە و زەویم کێلابا و تۆوم چاند بایە ونانی خۆم پەیدا کردبا و ڕۆژەکانی یەکشەمۆ لە گەڵ خەڵک قسەم کرد با ومۆتالام کردبایە. خۆزیا دەمتوانی بە گوێرەی قانوون کە دەڵێ:« نانی خۆت بە ئارەقی نێو چاوانی خۆت پەیدا بکە» بژیم.

دۆن پاولۆ لە بەر بیر کردنەوە لەو مەسەلانە ئاخرەکەی دەتوانێ ڕیشەی ئاڵۆزی

ناخی خۆی لەم نوکتەیە دا بدۆزێتەوە کە ئەو خۆی لەم قایدە و قانوونە لای داوە و ژیانی خۆی لە نێوان ڕابواردن لە قاوە خانە و کتێبخانە و میوانخانەکان و ئەم جـۆرە شـوێنانـە دا دابەشکردوە کـە بوونەتە هـۆی پچـڕانی ئەو لـە گـەڵ زەوی، پێـوەندیـیـەک کـە لـە درێژایی سـەدەکـانی دوور و درێژ دا باو و باپیـرانـی وی بەم زەوییەوە فرێدەدا. ئەگەر ئیمڕۆ ئەو لەمافی مەدەنی بێبەش ناسراوە لە بەر ئەوە نیە کە بە پێچەوانەی قانوونە زاڵمەکانی ڕێژیمک ڕەفتار دەکا کە دەسەڵاتی بە دەستە، بەڵکوو لە بەر ئەوەیە کە لەو قانوونەی کۆن سەر پێچی کردوە کە دەڵێ :« نانی خۆت بە ئارەقی نێـــو چاوانت وەدەست بێنە.» ئەو وازی لـە وەرزێڕی هێناوە، نـە بۆتـە شارەییش. لە مەودا ئیتر ناتوانێ بۆ سەر زەوی بگەڕێتەوە. لە بیر کردنی زەویش بۆ ئەو زیاتر لەوە بێدەرەتان دێتە بەر چاو.

با و گێـژەڵوکەیەکی بە سام کە بە سـەر« پیـتراسکا » دا دێتـە خـوار، لە نەکاو گەڕانەوەیەکی چاوە ڕوان نەکراو لە ناکۆکی توندی ناخیدا پێک دێنێ. گەرما لەو پەڕیدا بوو. قورساییێکی خنکێنەر هەوای داگرتبوو، ڕۆژێکی وەک کورەی ئاگر، بە بێ تۆزقـاڵێک هەڵم لە هەوا دا، ڕۆژێکی کـوشـراو وتیـژ، چاوی کـوێر دەکـرد.« پیـتراسکا » وردە وردە دەبوو بە کورەی ئاگر. زەوی وەک لە ژێر گڕی ئەو ئاگرە دا بێ، دەسووتا. وەرزێڕەکان دوعایان دەکرد کە « خودایە وردە بارانێک بنێری » خودا دوعـای وانـی قـبـوڵ کـرد. مـاشـەڵلا لەو ڕەحـمـەتەی ئاسـمـانی و ئەم لوتف و مەڕحەمەتەی ڕەببانی. دەستە هەورێکی ئاوس کە لە لای دەشتی فۆچینو وە هاتوون ئێستا لە سەر دۆڵ کۆ دەبنەوە، ترس بە سەر گوندا زاڵ دەبێ. خەڵک لە هەموو لایەکەوە ڕادەکەن. دایک بە دەنگی بەرز منداڵ و مریشکان بانگ دەکەنەوە. دەتگوت دەردی شێتییان بۆ هاتوە.

دۆن پاوڵۆ دەپرسێ: هێشتا دڵۆپە بارانێک نە باریوە ئەو هەموو ترسە بۆ چییە؟

هێشتا چارەگە سەعاتێک ڕانەبردوە کە عاسمان کون دەبێ. هەورەکانی کۆ بوونەوە لە سـەر « پیـتراسکا » دەقەڵشن و گرمەیەکی بەسـام دەگوڕێنێ. باو باران کە بە سەر گوندەکانی خوارەوەدا زاڵە، ئەو چیایە پەلامار دەدا کە دۆڵی بەستوە.

هەورە تریشـقـە هەورەکـان لە بەر یەک بڵاو دەکا. لە نێوان هەر ڕوناکاییێکی بروسکە گرمەیەکی بە سام گوندی پیتراسکا و هەم چیای پشتی وی دەخاتە ژێر چەکـوچ و بە دوای ئەو دا بۆڕی ئاو دێتـە خـوار. ئەو بارانە سێ شـەو و ڕۆژ لـێی ناکاتەوە. چیا لە هەموو لایەکەوە کەوتۆتە بەر پەلامار و بەڵام تەسلیم نابێ و هەر وا

وەک مـوجـیـزە لە جـێی خـۆی قـایم وەسـتـاوە. پیـتـراسکاش کـە بە بناری چیـاوە نووساوە، هەول دەدا لە جێی خۆی پتەو بمێنێتەوە.

دۆن پاولۆ یارمـەتی مـاتالنا و ئامریکۆ دەدات تا پشـتی دەرگا و پەنجـەرەکانی موسافیر خانە لە بەرانبەر هێرشی ئاو سەنگەر بەندی بکا. بەڵام ئاو لە هەموو لاوە دێتـە ژوور. شەو پڕە لە هـاوار و پـاڕانەوە. بەڵام لە ترسـی لافاو کـەس ناوێرێ بچێتـە دەر. دەبێ تا بـەیانی ڕاوەستن و ئەودەم بزانن کـە لافـاو پردی داری بردوە و ئاو دە دوازدە ماڵی گرتۆتەوە.

مـاتالنا لە بەر ناهومـێدی هەست دەکا کە وا خـەریکە شـێت دەبێ. ژنی فـەقـیر دەناڵێنێ و دەڵێ:

– ئەگەر خـانوەکەم بۆ جاری سێـهەم وێران بێ، ئێستا کە مێردیشم مردوە. کێ بۆم سـازدەکـاتەوە. چەنـد کـەس لە وەرزێران کـە خـۆیان گـەیاندۆتە کلیسـا، زەنگی لابردنی بەڵا و موسـیـبەت لێدەدەن. لە پێش دەرگای مـاڵەکان خـەڵک دیزەی سـەرەو ژێر دادەنێن. ژنیش لە بەر پەنجـەرە مـەلۆتکەی پێـچـراوی خـۆیان نیـشـان دەدەن. تەواوی ئەم داب و نـەریتـە بۆ ڕاکـێـشـانی بەزەیی هێـزی سـروشت بـە ڕێوە دەچێ. بەڵام ئەو هێزە نایەتە بەزەیی. گوڕمی باو باران کەم نابێتەوە و پیتراسکا و چیاکان دەکـوتێ و دەگـوڕێنێ. لە خـوارەوەی دۆڵ هـەوری یـارمـەتی بە باو بـاران دەگـەنێ و ئەوانێش بـە نۆرەی خـۆیان پەلامـار دەبەن. چیـا بـەر بەرەکـانـی دەکات بەڵام داخـوا مـاوەیەکی درێژ دەتوانێ خـۆ ڕابگرێت.؟ ئێسـتـا جارێ خـۆی ڕاگرتوە. تەواوی شـەو کـەس تاوێک ناحـەسێتـەوە. دەور و بەری موسـافیرخـانە دەڵێی بۆتە جێ ژوانی گـاو گـورگ و مـاران. ئاو بـە خـوڕ و هـاشـە هـاش لە هەمـوو لاوە دێتـە ژوور. هـاوار و پاڕانەوەی کە جار و بار دەبیـسرێ لە هیچ کوێ دەنگ ناداتەوە. مـاتالنا بە سـەری ڕووت و لیباسی شڕۆڵ وەک شێتی تورە لە ماڵدا سـەر و خوارێ دەکا و هەول دەدا تا پێیش ئاو بگرێ کە بـە کون وکـاژێراندا دێتە ژوور. دیسـان دەبێ تا بـەیانی سـەبر بگرن تا بزانن کە تەویلەی « جرامتا » لافاو بردوویەتی و گەر و بزنێ ویش نەماون.

مـاڵی نیکۆلا چیکاوۆ تێک ڕوخـاوە. نیکولا و مـاریتـای ژنی بە زەحـمـەت خـۆیان گـەیاندۆتە مـاڵی دراوسـێـیـان. مـیـچی مـاڵی « جـروازیۆ ئامـاتۆڕا » ئاو بردوویە و کیژەکانی خەوتووی، یەکیان زۆر بریندار بوە.

سێهەمین ڕۆژە باران دەبارێ و هەور هەر وا لە سەرانسـەری دۆڵ وەک نەخۆشی کۆخـە دەگـرمێنێ. بەڵا م بای نـایە. دۆڵ وەک کولەکەی پاکـراو دەچێ. ئاو تەواوی

گوندەکانی داگرتوە.

ڕێگاکان هەموو بوونەتە جۆگەلەی ئاو . ژوور و ژێر خانی ماڵەکان پڕ بوون لە خیز و بەردی کە لافاو هێناویەتی. مەعمورەکانی ڕێگا وبان بۆ چا کردنەوەی جادەکان کە لە زۆر جێگا وێران بوە و ساز کردنی پردێکی کاتی لە لاماوە هاتوون. هەر کەسە لە ژێر ویرانیەکان لە شڕە وبڕەی ماڵ دەگەڕێ. هەموو شت ڕەنگی قوڕ و لمی گرتوە و لیتە و قوڕ خۆیان لە هەموو شوێنێ ڕاکردوە. پیاوان لە نێو قوڕ دا وەک خزۆکی گەورە لەوانە کروکۆدیلی درێژ و کیسەڵی زەلام دەچن. گاری ماستر ئانجولا لە لافاو دا نوقم بوە. باب و کوڕ چەند سەعات بۆ دەر هێنانی هەول دەدەن. هاواری یالا یالای باب و کوڕ بەرزە. دەیکێشن و قەوەتی دەدەنێ و دەیکێشن بەڵام کاری نابزوێ. بێ ئەوەی تەگەرەکان ببزوون، لە قوڕ دەچنە خوار.« ماستر ئاجلۆی» لاو دەستی بە فیشقە لێدان کردوە و سیغار دەکێشێ. باوکی بە توڕەیی هاوار دەکا:

– سیغار مەکێشە و قەوەتی بدەیە.

بەڵام لاو سیغاری خۆی واز لێناهێنێ.

– پێتم گوت سیغار مەکێشە و پاڵی پێوە نێ. ڕادەکات لە کوڕەکەی بدا:

– لەعنەت لە تۆ و لەو کەسەی وەسەر دنیای نای. پێتم گوتی

سیغار مەکێشە و فیشقە لێ مەدە.

دۆن پاولۆ هێدی و ئارام بە لایەنگری لە کوڕەکەی وەدەنگ دێ و دەڵێ:

– فیشقە لێدان خۆ تاوان نیە

پیرە مێرد دەڵێ: « کاتێ مرۆ خەریکی کارە نابێ فیشقە لێبدا و سیغار بکێشێ. کار گاڵتە نیە.

– ئەگەر نیشتیای لە سیغار بوو چی؟

– دەبێ ڕاوەستێ تا کار تەواو دەبێ. کار گاڵتە نیە. ئێوە ئاغای کەشیش داستانی« ئورلاندۆی دێو» دەزانن.؟ ئەم دێوە هەر لاقەی کیلۆ میترێک بوو. ڕۆژێک دەیەوێ هەر بۆ کەیف زەوی بکێڵێ. تا ئێوارێ بێ ئەوەی خۆ ماندوو بکا زەوی دەکێڵێ. ئێوارێ گایەکان لە نیر و ئامور دەکاتەوە و دە گیرفانێکی پاتۆڵیان دەنێ و گاسن و ئاموریش دە گیرفانێکی دیکە دەنێ و دەچێ دەنوێ. ڕۆژ و مانگ تێدەپەڕن بەڵام لە مـــەزرای« ئورلاندو» ی دێو دا هیچ شین نابێ. هەر دەڵێی هیــچی لێ نە چاندوە. بۆ چی ؟ چونکە پێیەوە ماندوو نەببوو. مرۆ ئەگەر بخوازێ کارەکەی بەر هەمێکی هەبێ ، پێویستە ڕەنج بکێشێ و لە جیاتی ئارەقە خوێن بڕێژێ.

لەو کـاتە دا کـە باب و کـوڕ بۆ هـێنانە دەری کـاری تەقـەڵای خـۆیان دەست پێدەکەنەوە کەسێک ماسییەکی قزڵ ئاڵاڵە قوڕاو دادەبینێتەوە. تەواوی خەڵکی گوند سەبەتە و دار وقوڵنگ دەست دەدەنێ و بە هاواری وەحشیانە یەکتر بۆ ڕاوە ماسی هاندەدەن و بە پەلە دەکـەنێ. بەڵام مـاسی قـزڵ ئاڵا نیـە. کێ چو زانێ ڕەنگە لە هەوەڵەوە ماسی قزڵ ئاڵا هەر نە بوو بێت.

لەو کاتەدا وەرزێڕەکانی بۆ تەمـاشـا کردنی زەرەر و زیانی زەویە کێلـراوەکان چوو بوونە مەزرا، دەگـەڕێنەوە. « پاسکاڵ جرامـتـا » لە کەشیش نیزیک دەبێتـەوە، کڵاو لە سـەری هەڵدەگرێ، نیشانەی خـاچ دەکێشێ و لە کاتێکا قینی لە گەروو دایە دەپرسێ:

– ئاغای کەشیش تۆ دەبێ بۆم ڕوون کەیەوە کە ئەم خودایە چکارەیە ؟

دۆن پاولۆ نازانێ چی وەڵام بداتەوە. لە گەڵ ئەوەش دەڵێ :

– ئەگەر بەر و بووی تۆ لە بەینچوو، خەتای باو بارانە.

جـرامـتـا سـەر ڕادەوەشـێنێ و عـوزر دێنێتـەوە. ئەو بە هیچ جـۆر نـایەوێ بێ ئیحترامی بە خوای گەورە بکات. تووڕەش نیە، تەنیا دەیەوێ شتێک تێ بگات و بۆیە دەپرسێ:

– ئەگـەر باران بە دەست خودا نیـە، ئەدی چی بە دەستـە؟ ئەگـەر دەسـەڵاتی باران بە دەست ویـە و ڕێگا دەدا بە با کە دەسترەنجی خەڵکی فەقیر خـەراپ بکا، ئیتر ئەوە چ خودایێکە؟ ئایا دەزگایەکی داد نیە کە بە حسابی خوا ڕابگات.؟

« جرامتـا » ی فـەقیر یەک جێ تەویلە و کـەر و بزن و بەر و بووی دوو مـەزرای لە کیس چوە و ئێستا بۆ تەواوی تەمـەنی نابوت بوە. ئێسـتـا بـە دوای بەر پرسـی ئەو بەڵایەدا دەگەڕێ. ئەگەر ئەو بەر پرسە خودا نیە، ئەدی کێیە؟

دوو بارە دەپرسێ:

– ئەگەر خوداڕێگابە خۆی دەدا بنـە ماڵەی فـەقیر مـاڵ وێران بکا، ئایا دەکرێ حیسـابی کردەوەکانی خـۆی بداتەوە بە کەس؟ لەو کـاتەدا« پاسکواندرە» دەگـاتێ و دەڵێ :

– مـرۆ لە ڕۆژ دا لە هـەوای خـۆش و نا خـۆش چاردە سـەعـات کـار دەکـات. بە ڕۆژانە دەچێتـە فۆچینۆ و ڕۆژێ بـە چوار لیرە کـار دەکـات. وەک حـەیوانی چوار پێ دەژی. تەواوی ئەو زەحمەتانە بۆ ئەوەیە کە ڕۆژێک بتوانێ پارچە زەویەک بکڕێ. ئەو دەم باو بارانێک دێت و بەرهەمەکەی خەراپ دەکا. زەوی کە لە کیس چوە بۆ ماڵیات

و باج و خـەرجی خـواردن و کـڕینی تۆیش دیناڕێکی نیـە. ناچار دەبێ زەویەکـە بفرۆشی. زەویەکە دەفرۆشێ و دوو بارە دەست پێدەکاتەوە. واتە دە ساڵی دیکە دوو بارە دەبێ وەک چوار پێ گیـان بکێـشێ تا بـتوانێ هـەمـان پارچە زەوی دوو بارە بکڕێتەوە.

« ماسترۆ ئانجلۆ» قسەکەی دەبڕێ و دەڵێ:

– مرۆڤێکی فەقیر تەواوی تەمەن زەحمەت دەکێشێ، کۆخێک، پەنا گایەک بۆ خۆی دروست بکا بەڵام قەت لە پەنا دانیە. فەقیرە خانوەکە دروست دەکا، بەڵام لە پڕ بوومـــە لەرزە یا لافـاو دێت و شـــڕە و بڕەی لێ بـە سـەحـرا وەر دەکــات. چ پەناگایەکی باش! ئەوی دیکە گیان دەدا تا زەویەک پەیدا بکا و خۆی و خێزانی لە ئەمـــان دا بن. ئەو دەم باو بارانێک دێت و تەواوی بەر و بووی نابوت دەکـــا. چی دەکرێ؟ مرۆ هیچ کات لە پەنا دا نیـە و تاوێک ناکرێ بێ ترس و لەرز ژیان بەرێتـە سـەر. « جـاچینتـۆ کامپـۆ باسور» یش کـە بەر و بوومی لە بەین چوە، ژن برایەکی هەیە کە پارەیەکی کەمی پاشکەوت کردوە. هێناویەتە کن قەشە و پێی دەڵێ:

– بەر و بومی من لە بەین چوە و با هەمووی لە ڕەگ و ڕیشە دەر هێناوە. ئێستا زەویەکە وەک کانگای خیزی لێهاتوە. لەو کاتەوە کە ئەم زەویەم کڕیوە ئەوە هەوەڵین بەرهەمی ئەو بوو کە دەمویست هەڵیبگرم. ئێستا هیچی نەماوە. لام وایە ئەم زەویە بۆیە بوو ماڵم وێران کات. بۆ کڕینی ئەو زەویە خۆم لە سیغار کێشان بێبەشکرد. وازم لە شەراب و خواردنەوەش هێنا. لە گەرما دا پاپەتی دەڕۆیشتم، لیباسی شڕ و دڕاوم دەکردە بەر. کیژێکی شازدە ساڵەم هەر وا بەرەڵا کرد تا کۆچی دوایی کرد. بێ ئەوەی دوکتۆری بۆ بێنم، دەرمانی بۆ بکڕم یا قەشەی بێنمە سەر. خۆشم تەنیا نانی وشکم بە تفی زار قوت دا، لە جیاتی ئارەقە خوێنم ڕشت. گشتی ئەم کارانە بۆیە بوو کە ئەم پارچە زەویە بکڕم، تۆ کە ژن برای منی ئاگات لەو هەموو گەڕیانە هەیە. بەڵام من دەمـەوێ لە خزمەت پیاوێکی پیرۆز دا ئەوەت پێ بڵێم کە من پاش کـڕینی ئەم زەویە یەک دینارم نەمـاوە. ناچار بۆکـڕینی تۆی و دوو تەغـار و گـەرێک هێندێ پارەم قـەرز کـردوە. ئێسـتـا کە بەرهەمـەکـەم لە بەینچـوە. قـەرزەکـەم چۆن بدەمەوە.؟ بۆ شێومردی ساڵی دادێ چۆن تۆی گەنم بکڕم.؟

سکاراملی ژن برای شان هەڵدەتەکێنێ و دەڵێ:

– ڕاستیت دەوێ ئەم مەتڵەبە پێوەندی بە خۆتەوە هەیە.

« کامپۆ باسۆ» کە دەیەوێ گومان لە قسەکانی خۆیدا نە هێڵێ، دوو بارە دەڵێ:

- دڵنیا بە من زەوی خۆم نافرۆشم. ئەگەر کەسێک چاوی لەوە بڕیوە دەبێ پیوی دارکارییەکی حیسابی لە بەدەنی هەڵسوێ. ئەم زەویە وەک پارچە گۆشتێکی لەشم وایە. من ڕەنگە خۆم یا ژنەکەم بفرۆشم، بەڵام قەت زەویەکەم نا فرۆشم. بەم حاڵەش ئەگەر قەرزەکەم نەدەمەوە، قەرزدار زەویەکەم بە ساحیب دەکا. تۆ کە ژن برای منی و چەند قڕانێکت پاشکەوت هەیە. دەتوانی یارمەتیم بدەی.

ژن برا لە وەڵامدا دەڵێ:

- ڕاستیەکەی سوێند بە شەڕەفم هەر کەس خۆی گیر و گرفتێکی هەیە. هەر کەس دەبێ لە فیکری کاری خۆیدا بێت. پاشان ڕێگا دەکرێتەوە بەر و دەر دەکەوێ.

کەشیش و « کامپۆ باسۆ» دیسان تاوێک پێکەوە دەمێننەوە و گفتگۆ درێژە پێدەدەن. کەشیش لە بیری دەچێتەوە کە قەشەیە، گرێی دڵ بۆ کامپۆ باسۆ دەکاتەوە :

- وڵاتێکی گەورە هەیە کە لەوێ بۆ هەوەڵین جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وەرزێران هەول دەدەن جگە لە خاوەن مڵکی تایبەتی لە ڕێگای دیکەوە پەناگا و ئەمنیەت بۆ خۆیان پەیدا دەکەن. کەشیش و کامپۆباسۆ هێشتا هەر لە گفتگۆ دان کە چاویان بە « سکاراملی» دەکەوێ. ئەو بە سواری کەر لە پردی دار دەپەڕێتەوە و بەو جادەیەکدا دەڕوا کە بۆ لای دۆڵ سەرەو ژێر دەبێتەوە. کامپۆ باسۆ ڕەنگی لە ڕوویدا نامێنێ و دەڵێ:

- ئەو نا پیاوە دەچێتە کن ئەو سوتخۆرەی کە پارەی بە قەرز داوە بە من، تا زووتر زەویەکەی لێ بکڕێ.

دۆن پاوڵۆ هەول دەدا ئارامی کاتەوە و دەڵێ:

- لە وانەیە بە هەڵە بچی. تۆ چۆن دەتوانی نیەتی ئەو بزانی؟

کامپۆ باسۆ دەڵێ:

- زۆر لە مێژە ئەو چاوی بڕیوەتە زەویەکانی من. ئەو ناپیاوە لە من بێزار بوو چونکە من بەر لەو توانیبووم زەویەکە بکڕم. ئێستا هەلی باشی بۆ هەڵکەوتوە تا لە بەر دەستی منی دەر بێنێ. نازانی چ سەگبابێکە.

دۆن پاوڵۆ دەپرسێ:« تۆ ئەگەر لە جیاتی وی بای هەر ئەو کارەت نە دەکرد.؟

بەڵام کامپۆ باسۆ خۆ لە وەڵامەکە دەبوێرێ و دەڵێ: « بەڵێ، سەگبابێکی حیسابیە » گورج بۆ ماڵێ دەگەڕێتەوە و بە دەنگی بەرز بە ژنەکەی دەڵێ:

- هەر ئێستا چرایەک لە پێش پەیکەری حەزرەتی مریەم هەڵکە و چۆک دا دە

ودوعا بکه که هەر کسێکی بیەوێ زەوی ئێمە بکرێ توشی بەڵا و موسیبەت بێ. تێگەیشتی ؟

ژن دەپرسێ:« کێ دەیەوێ زەوی لە ئێمە بستێنێ .»

پیاوەکە ئەمر دەکا: دوعا بکە !

ژن چرا هەڵدەکا و لە کاتێکا مێردەکەی ئاگاداریەتی لە حەزرەتی مریەم دەپاڕێتەوە کە هەر کەس فیکری داگیر کردنی زەوی مێردەکەی هەیە توشی بەڵا و موسیبەت بێ.

دۆن پاولۆ کە هیلاک بوە بۆ ژوورەکەی خۆی دەگەڕێتەوە و لە سەر مێز دەفتەری وتو وێژی لە گەڵ کریستینا دەبینێتەوە. دەفتەرەکە لێک دەکاتەوە و دوو بارە چەند دێڕێکی دەخوێنێتەوە و لە پڕ بێزارییەکی توند لە خۆی،لە دڵیدا هەست پێدەکا. لە ئاخری گفتگۆدا دەنووسێ: « وڕێنەی کابرایەکی بێکار »

دەچێتە نێو جێ بەڵام هەر چەندی هەوڵ دەدا خەوی لێ ناکەوێ. دەبێ شەو درنگ بێ کە دەنگی هەراو هاوار لە پێش موسافیرخانە دەبیسرێ. ماتالنا دێتە ژووری دۆن پاولۆ و دەڵێ:

- سکارپا ملی‌یان بە دارە مەیت هێناوەتەوە. خۆی و کەرەکەی لەو شوێنە کە جادە بڕاوە. دەلافاو کەوتوە. کەر تۆپیوە و سکارپاملی-یش لاقێکی شکاوە.

ڕۆژی دوایی« ترازاسکاراڤا » کوڕێکی جوانی دەبێ. منداڵەکە کوێر نیە. بۆ سوپاس و هەقناسی لە کەشیش کە چاوی کوڕەکەی لە بەڵای کوێریی نەجات داوە، دایکی ناوی دەنێ پاولۆ. پاش دوو ڕۆژ نۆرەی سابتایە کە منداڵی بێت.

« دۆن چیپریانۆ» بۆ تەعمیدی منداڵەکان لە «لاما» وە هاتوە. دەستەیەک لە باوەکانی بنە ماڵەکان بە ڕێبەرایەتی« پاسکاڵ جرامتا » دێتە چاو پێکەوتنی قەشەی پیر. جرامتا دەڵێ:

- قینی خودا بە سەر ئێمەی فەقیردا هاتۆتە خوار. بێگوناح بە ئاگری گوناحکاران دەسووتێن. ئێستا ئیتر گومان لە وەدا نەماوە کە لە دۆڵ دا گوناحێکی گەورە کراوە.

«دۆن چیپریانۆ» لە وەڵامدا دەڵێ: « سزای ئێمە لەم دنیایە دا دەبێ لێبوردنی قیامەتمان بە نسیب بکا.

جرامتا لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:

- گوناحی گەورە لە نیزیکی سێڵاو گر و لە« پەناگای گوناحکاران» دا کراوە.

لاوێک لە بنە ماڵەی ئەجیب زادان لە گەڵ جادوو گەرێکی خەڵکی دەشت لە خانووی جندۆکان دانیشتوە دەرگایان لە سەر خۆیان داخستوە. ئێستا ئیتر گومانمان نەماوە ئەگەر کار بەدەستانی دەوڵەتی بۆ نە هێشتنی ئەم ڕیسواییە کارێک نەکەن ئێمە خۆمان بە زۆر دەیکەین.

دۆن پاولۆش دێننە نێو کۆڕی خۆیان. « جرامتا » دەڵێ:

– ئێستا ئیتر گومان بۆ ئێمە نەماوە کە خودا ویستوویەتی ئەم گوناحە گەورە سزا بدات.

« کامپۆ باسۆ» پێشنیار دەکا کە دەبێ خانووی جندۆکان ئاگر تێبەر درێ.

« ماستر ئانجلۆ» لە پشت ئەستور کردنی پێشنیاری ئەودا دەڵێ:

– دەبێ خانوەکە وێران بکرێ، دەبێ لە هەمان کات دا کە ئەم دوانە پێکەوە نوستوون خانوەکە بە خومپارە بتەقێنرێت.

« دۆن چیپریانۆ» ناوبژیکەری دەکا تا ڕێگای چارەی هێمنانە پەیدا بکات بەو مەرجە دۆن پاولۆ کە کیژەکە دەناسێ، لە کەڵی بێ. دۆن پاولۆ لە ترسی دەست گەیاندنی مەعمورانی دەوڵەتی جگە لە تەسلیم و ڕازی بوون، چاری دیکەی نیە.

گەڕیانی لافاو هێشتا درێژەی هەیە. لە بەر ئەوە کامبۆباسۆ هەر تک کەشیشان بە کۆڵی زەلام دەپەڕێنێتەوە ئەو بەر. لە وێوە دۆن چیپریانۆ و دۆن پاولۆ بە پێیان بەرەو خانووی جندۆکان دەڕۆن. هەر هەنگاوێک تا ئەژنۆیان بە قوڕدوە دەبن. دەرگای خانوەکە یەک لایەنەیە. دۆن پاولۆ « بیانکینا » بانگ دەکا بەڵام کەس وەڵام ناداتەوە. ژووری خانوەکە دیمەنی ئەشکەوتێکی واقیعی هەیە. لە خانوەکە دا جگە لە قوڵکی پڕ لە قوڕ ولیتە چیتری لێ نیە. با نیوەی بانەکەی هەڵکەندوە.

« بیانکینا » لە پێش بوخاری هەڵتروشکاوە، پرچەکانی بڵاو کردوون. کۆرەوی لە پێدا نیە. دەستی بە قولاپەی لاقی گرتوە وسەبروکە دەکری. ئالبێرتۆ لە سەر تەلیسە کایەکی شەدار لە پەنای ڕاکشاوە. چەن حەفتەیە ڕیشی نەتاشیوە. قژی درێژ کردوە. لە جیاتی دوگمەی لیباسی نیشانی حیزبی دەوڵەتی لێداوە.

« بیانکینا » دەپرسێ: « خواردەمەنیتان هێناوە ؟»

دۆن چیپریانۆ» دەست بە خوێندنی پەند و دوعایان دەکا کە پێشتر بۆهەڵکەوتێکی وا ئامادەی کردوە. بە تایبەت بەو مەبەستە کە لە کن پیاوێکی ڕوحانی سەر بە کەشیش نشینێکی دیکە خۆی بنوێنێ.

« بیانکینا» قسەکانی وی دەبڕێ و دەپرسێ:

– ئێوە هیچ خواردەمەنیتان پێ نیە؟

ئەو دەم چیپریانۆ بە ئالبێرتۆ دەڵێ:

– ئەوە منم کە تۆم غوسڵی تەعمید داوە و بۆ هاتنە قۆناخی سەرە تایی ئایینی مەسیح ئامادەم کردووی. ئەوە منم کە وەڵامدەری گیانی تۆم لە پێشگای خودادا. ئەوە منم کە تۆم هێنا سەر ڕێبازی مەسیحییەکانی ساکاری«سن فرانسوا» واتە بۆ تەریقەتی (ثلاث) ١

ئالبێرتۆ مات و گێژ چاوی لێدەکا. «بیانکینا» دەیەوێ وەدەنگ بێ. بەڵام دۆن چیپریانۆ ئەمری پێدەکا، بێدەنگ بێ و دوو بارە دەڵێ:

– کـاتێ« پۆوێرلۆ» ٢ لە کـۆشکی کـاناریۆ تەریقـەتی (ثلاث)ی بۆ رزگـاری خـەڵکی دنیا دادەمەزراند، هەوا پڕ بوو لە ئاوازی کاسـەڵە شـینکان. ئەو بە ئەدەب تکای لە باڵندەکان کرد کە بێدەنگ بن. باڵندەکان بە قسەیان کرد. ئێستا ئەی خانم ئێوەش هەوڵ بدەن کە پێرەوی لە باڵندەکان بکەن.

« بیانکینا» ئیراد دەگرێ و دەڵێ: « خۆ تۆ ( سن فرانسوا )نی.

دۆن چیپریانۆ خۆ لە کەڕی دەدا کە گۆیا نەیبیستوە و ڕوو دەکاتە ئالبێرتۆ و لە بارەی گەورەیی و پاکی و ڕێزی سن فرانسوا دەست بە قسان دەکات و دەڵێ:

– بە گوێرەی ئەوەی کە لە بەشێکی کتێبی سن فرانسوا دا هاتوە (پۆوێرلۆ) لە سەر داخوازی پاشای بابل دە چوە نێو تایفەی عەرەبی سەحرایی( سارازن) و نسـحـەتی دەکـردن. شـەوێکیـان چوە مـوسـافـیـرخـانەیەک تا لە ڕەنجی ڕێگا بحەسێتەوە. لەوێ توشی ژنێکی عەرەب بوو کە لەش و لارێکی زۆر جوان و گیانێکی زۆر درێوی هەبوو.

« بیانکینا» دەڵێ من عەرەب نیم.

– بەڵێ ئەو ژنە ویستي کە سن فرانسوا توشي گوناح بکا

سن فرانسوا لە وەڵامدا پێی گوت:

– قەی ناکا من قبوڵی دەکەم. وەرە بچین پێکەوە بنووین

« بیانکینا» هاوار دەکا: « بە بە، لەو پیاوە پیرۆزە !

---

١ – مەبەست بڕوای ڕەهایە بە باوک و کوڕ و ڕوح القدس

٢ – مـەبەست سـن فرانسوا داسیز کەشیش و ڕوحانی بە ناو بانگی ئیتالیایە و دامەزرێنەری تەریقـەتی عـیـرفـانی فـرانسـیـسکنە کـە بە پاکی و ئیـمـانداری ناسـراوە ( ١١٨٢ – ١٢٢٦)

سن فرانسوا بردیه پێش ئاگرێکی گەوەرە. سەرتا پێ خۆی ڕووت کردەوە و چوە نێو ئاگرەکە و بە ژنە عەرەبەکەی گوت:

کە بە دوای ئەو دا بێتە نێو ئاگر و لە م جێگا موجیزە ئاساییەدا لە گەڵی بنوێ. بەڵام ژنی عەرەب ترسا.

بیانکینا دەپرسێ:

- ژنە کە ترسا؟

دۆن چیپریانۆ دەڵێ:

- بەڵێ ژنەکە ترسا.

بیانکینا دەڵێ:

- ئەگەر ئەو بە ڕاستی سن فرانسوای خۆش ویستبایە نە دەترسا. ئەگەر من بام لە جیاتی وی، قەت نە دەترسام.

کەشیشی «لاما» دەپرسێ:

- تۆ نە دەترسای؟

بیانکینا دەڵێ:

- سن فرانسوا بۆ چی لە گری ئاگر دا نە سووتا؟ چونکە ئەو ئاگرەی لە ناخیدا هەڵکرا بوو،لە ئاگری دار بە تینتر بوو. ژنی عەرەب بۆ لە ئاگر ترسا؟ چونکە ئەو سارد و بێ عیشق بوو. سن فرانسوا بانگی وی دەکرد بەڵام ئەو دەترسا. بە ڕاستی ئەو ژنە عەرەبە ئابڕووچوونی جسنی لەتیف بوە.

ئالبیرتۆ لە جێ ڕادەبێ دەچێتە دەر و ئامێزێک دار دێنێ دەیخاتە سەر ئاگرەکە و دەڵێ: هەوای ساردە، دوو بارە لە سەر کا درێژ دەبێتەوە.

بیانکینا ئاگرەکە خۆش دەکا. دارەکان تەڕن و درنگ دەیگرێ. ماشەشی نیە، بە دەستی دارەکان دەخاتە سەر یەک. دەستی دەسووتێ و دەگری. دۆن چیپریانۆ لێی لە قیندایە. نایەوێ هەل لەدەست بدا و دەڵێ:

- ها، تۆش لە ئاگر دەترسی!

بیانکینا لە وەڵامدا دەڵێ:

- بێگومان من نە بۆ ئێوە و نە بۆ مامم کە کەشیشی «فوسا» یە خۆم ناخەمە نێو ئاگر.

دۆن چیپریانۆ لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:

- ئاگرێکی دیکە هەیە کە داییمیە و تایبەت بۆ گیانی ئەو کەسانەیە لە دین وەر

گەڕا بن. لە وێ هەوا تژییە لە دووکەڵی بە ئازار وبۆنی گۆشـتی سـووتاو و هاواری دەردە دار و دەنگی لێکدانی ددانان.

ئالبیرتۆ دەڵێ: « ئێمە خۆمان دەزانین و دان بە گوناحماندا دێنین»

دۆن چیـپریانـۆ دەپرسێ:« ئەگـەر دەرفـەتی دان پێـدانانتـان نە کـردبایە، لە باو باراندا نوقم دەبوون»

بیـانکینا دەڵێ: « ئەو دەم لە گەڵ خـودی خـودا قسـەمـان دەکرد و هەوڵمـان دەدا مەسەلەکەی لێ تێبگەیێنین. ئەگەر ئەشی ویستبایە لێی تێبگات، خەتای خۆی بوو.»

دۆن پاولۆ تا ئەو دەم بێدەنگ بوو. پاشان دەپرسێ:

– بۆ مارەیی نابڕن و یەکتر مارە ناکەن؟

ئالبیرتۆ وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:

– ئاخر بنە ماڵەی من ڕازی نابن.

– بۆ تۆ ئیجازەت لە وان خواستوە ؟

– بنە ماڵەی من ڕازی نابن. ئەوان باش دەناسم.

قەشەکان دەگەڕێنەوە. دۆن چیپریانۆ بە دۆن پاولۆ دەڵێ:

– مـارە کـردن باشـترین ڕێگای چاری ئەم مـەسـەلەیە. تۆ لەم بارەوە لە گەڵ بنە ماڵەی کوڕەکە بدوێ.

« جـاچینتـۆ کـامـپـۆ باسـۆ» چاوە ڕوانە تا لە پەڕینەوەی لافـاو گردا یارمـەتیـان بدات. ئەو لە قەشەکان دەپرسێ: « ئاخری ئەوان چدەکەن.. چ بڕیار دەدەن ؟»

دۆن چیـپریانۆ دەڵێ: « کـارەکـان ڕوو بە ڕا دەبن. تـۆ دەتوانی بە خـەڵکی تریش بێژی کە بەم زوانە هەموو شت چاک دەبێ.»

دۆن پاولۆ لە وە پەشـیـمـانە کە قـبـوڵی کـردوە لەمـبـارەوە لە گـەڵ بنە مـاڵەی کۆلامارتـینی بدوێ. چونکە هەست ناکا کە بۆ ڕاپەڕاندنی کار و باری ژن هێنان و مارە کردن دروست کرا بێت. هەر بۆیە ئەمڕۆ و سبەی دەکات.

ڕۆژێک لە دوای نیـوەڕۆ کـەشـیـش سـەر بە قـەڵەمـڕەوی « کـیـەتی» کـە باوکی ڕوحـانی ئیـقـرار بیـسـەری کـریسـتـینا بـوە لە سـەر دەمـی خـوێندنـی ناونجیـدا، بۆ سـەردانێکی کورت دێتـە « پیـتراسکا». ئەم کـەشـیـشـە بە فـایـتـۆن هـاتـوە و زیاتر لە چەند سـەعـات نامێنێتەوە. لە گەڵ ئەودش دەیەوێ پێش ڕۆیشـتنی لە گەڵ دۆن پاولۆ بدوێ. لە چاو پێکەوتندا بە دۆن پاولۆ دەڵێ:

– مــادمـازیل کـولامــارتـینی بە ڕێـزێکی زۆرەوە باسـی تۆی بۆ کـردووم. کـاتێ

دەمویست لە « مارسیکا » تێپەڕم. لە سەر پێداگرتنی دایکی ڕوحانی مودیری دێر و خوشکانی دێر کە مادمازیل کولامارتینی یان زۆر خۆش دەوێ و زۆریش بە پەرۆشن کە ئێستا لە نێویاندا نیە ئامادە بووم سەرێک لە پیتراسکا بدەم.

دۆن پاولۆ نیگەرانە کە نەکا سەبارەت بە ناو و نیشانی ڕاستە قینەی خۆی میوانی تازە هاتوو بخاتە شک و گومانەوە، بۆیە هەر بەم وەڵامە خۆ ڕازی دەکات کە بڵێ:

– من لە گفتگۆیەکدا کە ڕەنگە لە بنە ماڵەی کولامارتینی دا ڕووی دابێ، تەواو بێخەبەرم.

باوکی ڕوحانی دەڵێ:

– منیش ئاگادار نیم و جگە لە وەش لەم دیدارە دا مەبەستم ئەوە نە بوە کە کیژی لاو بخەمەی ژێر گوشار. لە گەڵ ئەوەش بە ئەرکی خۆم زانی لەم هۆکارانە ئاگادار بم کە ئەم کیژەیان لە لێهاتوویی و کێشی ڕوحانیەتی تایبەتي کە لە گەڵ ناخی ویدا تێکەڵە و گومان لە ڕاستی ئەوە دا نیە، توشی سستی و لالوتی کردوە.

دۆن پاولۆ غیرەت وەبەر خۆ دەنێ و دەڵێ:

– مادمازیل کریستینا لە « پیتراسکا » ش دەتوانی سودی هەبێ.

باوکی ڕوحانی دەڵێ:

– بێگومان وایە. بەو مەرجەی کە تەنیا خەسڵەتی ئینسانی کریستینا لە بەر چاو بگیرێ. لە گەڵ ئەوەش بە سەرنجدانی هەستیاری و هۆشی لە ڕاستیدا بێ هاوتای ئەم کیژە من نازانم لەم گوندە دوا کەوتە و سەحراییەی وەک پیتراسکا، ئەم خەسڵەتە چۆن مەیدانی هەڵدان و گەشە کردن پەیدا دەکات؟ بەڵام شتێکی لەمانە بەرزتر لە مادمازیل کریستینادا هەیە. ئەو لەم خەڵکە بەختەوەرانەیە کە لە گەڵ هاتنە نێو ئەم دنیا هیچە، وەک نوور پاک و سافن و نیشانی بەرخ لە نێو چاوانیاندا نەخشە. دەڵێی هەموو ڕۆژێ دەبنە قوربانی و کراسیان بە خوێنی قوربانی بوونیان ڕەنگینە. بێ ئەوەی تەماشای ڕێگای خۆیان بکەن شەیدا و سەر لێ شێواوی ئەڤین بە دوای بەرخی عاسمانیدا هەنگاو دەنێن کە ڕێگایان پێنیشان دەدا.

ئەم ڕەوانبێژییە کاریگەرییە وتار و مەوعیزەی کەشیشەکانی یەسوعی وەبیر دۆن پاولۆ دێنێتەوە کە دەهاتنە مەدرەسەکەی وی و دەڵێ:

– کەسایەتی مادمازیل کریستینا بە قوڵی کاری کردۆتە سەر منیش. لە گەڵ ئەوەش نا توانم بڵێم کە مانەوەی وی تا ماوەیکي دیکەش لە نێو ئەم خەڵکە گیرۆدە

و بەکارە، بۆ وی بە چارە ڕەشی ببژێردرێ.

باوکی ڕوحانی داماو و خەمگین لە کن دۆن پاولۆ دەڕوا وفایتون دەکەوێتە ڕێ.

شـەوێکیـان دۆن پـاولۆ لە مـاڵی کـولامـارتینی یەکـان مـیـوانە. دۆن پاسکال لە ئاشپەزخانەیەکی گەورە کە دیوارەکانی دووکەڵ گرتوویانە میوانداری لێدەکات. سێ پیـرێژنی سـارد و مـۆن بـە قـژی سـپی لە دەورەی مـێـزێکی گـەورەی دارە گـوێز دانیشتوون و کریستینا دابی بە یەکتر ناساندن بە جێدەگەیێنێ:

– ئەوە دایە گەورەی منە، ئەومیان پورمە، ئەوەشیـان دایکمـە. هەوا پڕە لە بۆنی هەنگوین و مـێو. دۆن پاولۆ لە دڵی خۆیدا هەست بە سەفا و خـۆشی لە ڕادە بە دەر دەکات. دەڵێی دڵی قـەت لـە هەوای منداڵی دەر باز نەبوە. بەڵام کار کـردی ئەو سێ پیـرێژنەی کە لـە دەوری مـێـز دانیشـتوون ئەو دەخـاتە یادی بنە مـاڵەکـانی دیکەی خـاوەن زەوی. بێگومـان مـاتالنا پـێشـتـر لە بارەی بنە مـاڵەی کـولامـارتینی لە زۆر بلێیـیدا درێخی نە کردوە. ئەو بۆ کەشیشی باس کردوە کە دایکی کریستینا ژنێکی پاک و ساکاری بە ڕاستـییە و بە شـتێکی کەم پێدەکەنێ و ئاقڵ و هۆشـی منداڵێکی پێنج ساڵەی هەیە. بەم حاڵە دە ساڵ لە مێردەکەی گەورە ترە. دۆن پاسکال تەنیا لە بەر جیاز خواستوویەتی. تەواوی بنە ماڵە چەند ساڵە بە داهاتی ئەو پارەیە دەژین.

کولامارتینی یەکـان سـەبارەت بـە لـەچەری بێزراوی وەرزێڕەکانن. دایە گەورەی کـریسـتـینا دیکتـاتـۆرێکی بە ڕاسـتـیـیـە. تەنانەت دۆن پاسـکـاڵ خـۆشـی نـاتوانێ لە بەرانبەر ئیرادەی ئەو پێرێژنەدا وستـە بکات. ئەم ژنە بە دۆن پاولۆ دەڵێ کە هەشتاو شـەش ساڵـە. شـەش کوری گـەورە کردوون، دوویان مردوون، یەکیـان لە ئارژانتینە. دوانیان لە ئەمریکای سەروون و لە گەل دۆن پاسکال دەبنە شەش. ئەم شەش کەسە هەموویان هۆی سەر بەرزی بنە ماڵەن. بە ڕاستی ئەو هیچ سکاڵایەکی لە کورەکانی نیـە. بەڵام لە بارەی نـەوەکـانی ؟ باشـترە هـەر باسـیـان نـەکـات. بەرەی تازە خـەریکە تەواوی ئەم مـیـراتانە قـوت بدا کە بەرەی ڕابردوو لە مـاوەی چەند سـەدە دا بە جـێی هێـشـتـوە. ئەو دەم دایە گـەورە لە سـەر قـسـەکـانی دەڕوا و دەڵێ:« دیارە دەبێ کریستینا جیا بکرێتەوە. حیسابی ژنان جیایە. کاتێکی پیاو لە گوڕێدا نە بوو، ئەو دەم ژن ئەرکی دەکەوێتـە سـەر شـان. من لە سـی و پێنج سـاڵی بوومـە بیوە ژن. لەو کاتەوە بۆ منداڵەکانم دایک و بابیش بووم.

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « تۆ دوو بارە مێردت نە کردەوە ؟»

پیرێژن بە سەر سوڕ مانەوە سەیری دەکا و دەڵێ:

- من مێـردەکەم خـۆش دەویست. چۆن دەمـتوانی پیاوێکی دیکەم خـۆش بوێ؟ ئێستا پەنجا ساڵ زیاترە مێردم مردوە. هێشـتا خۆشـم دەوێ. مرۆڤ نا توانێ دوو بنە مـاڵە پێک بێنێ.. پاش ئەم قـسـانـە مـاوەیەک بێـدەنگی دێتـە پێش. بە جـوانی هەست پێدەکرێ کە دایە گەورە قسەی دڵی هەموانی کردوە.

کریستینا خەریکە ئاشپەزخانە دەشوا. دۆن پاوڵۆ بە زەحمەت دەوێرێ تەماشای بکات. ئێستا هەست دەکا کە مانای پاکی چیە و پەردەیەک لە پاکی بۆپاراستنی لەشی خـۆت مـانای چیـە. سێ پیـرژن بۆ نوێژ دەچنە ژووری ژنانـە و لە مـەجلیس دەچنە دەرێ. کریستینا بۆ ڕێز گرتن لـە میوان لە ژوورێدا ماوەتەوە و درنگتـر نوێژ بە تەنیا دەکات.

ئاشپەز خانەی ماڵی کولامارتینی. ئاشپەزخانەی ماڵی دۆن پاوڵۆ وەبیردێنێتەوە کـە بە بومـە لەرزە وێران بوە. ڕوکـاری یەکێ لە دیوارەکـان بە دەفـری مس ودیزە و قابلـەمە و کوپەی گەورە و سـەرە دیزە و ئاشی دەستی داپۆشـراوە. ئاشپـەزخانە دو پەنجەرەی گـەورەی تێدایە کـە پێشـیـان بە ئاسن گـیراوە و هـەر دوکیـان دەڕواننە باخـچە. بـاخـچە کە گوڵی کـەم تێدایە، هێندێ شـمشـادی پڕ گـەڵا بە قـەد دیوارێکی کورت بەرز بـوونەوە. لە ئاخـری باخـچـە چەند گـەندووی مێش هەنگوین دەبینرێن.

دۆنپاوڵۆ ئاقارێکی تەواو ئاشنای دێتە بەر چاو. دۆن پاسـکال دەڵـێ:

- گـوڵ فرۆشـی من لەم دواییـانە دا خـەریک بوو کەوکـەبەکانی« مـەلەکە هێلن» و مێخەکی « سوڵتانی» ووەنەوشـەکانی« دایکە ئیتالیا » بە من بفرۆشێ. من لێم پرسی ئایا بە ڕاستی ئەم کەوکـەبانە مەلەکە هێلن پەروەردەی کردوون و ئەو مێـخەکـانە لە باخی پاشاوە هاتوون و ئەم وەنەوشانە مەلەکە دایک چنیونی.؟ لە وەڵامدا گوتی:

- ئەم ناوانە هیچ پێوەندیان بەم گوڵا نەوە نیە و زۆریش لە وانەیە ناوی دیکەیان بوو بێت. منیش گوڵەکانم لێ نەکڕی. من هـەر گیز ڕێگا نادەم گوڵی حـەرام بە ناو ونیشانی ساختەی نەجیبان لە باخچەی مندا بنێژرێن.

کریستینا لە گۆشەیەکی مێز مـەلافە و سەر مێز و خـاوڵە و لیباسی دیکە لە نوتو دەدا و قەدیان دەکات وەدە سەبەتەیان دەنێ. دۆن پاسکال لە کەشیش دەپرسێ:

- ئێوە دۆن بنە دیتوی کەشیشی« ڕوکادی مارسی» دەناسن؟

دۆن پاوڵۆ بە سەر سوڕ مانەوە دەڵێ:

- دۆن بنە دیتو! بۆ ئەو پرسیارە لە من دەکەی ؟

دۆن پاسکال دوو بارە دەڵـێ:« ئەو بە کریسـتینای گـوتوە نە چێـتـە دێر. دۆن بنە

دیتو یەکێ لە دۆستە قەدیمیەکانی بنە ماڵەی ئێمەیە. پیاوێکی پیرۆزە کە دەزگای پاپ لێی بێزارە. دەبێ بگوترێ پیاوانی پیرۆزی کە نە کەوتبنە بەر گومان و ئازاری کلیسا کەمن.»

کریستینا کاتێ لە ئوتو لێدان دەبێتەوە ئاگر دەکاتەوە و لە پێش ئاگر دان چۆک دادەدا و فوو لە ئاگرەکە دەکات کە بە زەحمەت دەیگرێ. دارەکان ترن و دووکەڵی زۆر دەکەن. دۆن پاسکال دەڵێ:

– زۆرم پێخۆش بوو بیر و ڕای تۆم سەبارەت بە بڕیاری کریستینا زانیبایە. تۆ تا ئێستا لە دەر بڕینی بیر وڕای خۆت پەلەت نە کردوە. من بەوە کەیف خۆشم. بەڵام ئەگەرئێستا داوات لێبکەم مەرحەمەت بکەی چۆنە؟

دۆن پاولۆ وەڵام ناداتەوە.

– ڕەنگە دژ بەوە بی کە کریستینا تا ئێستا نەچوە؟

ئەو دەم دۆن پاولۆ دەڵێ:« هەر لەم پیتراسکایە بوو کە دەقە پڕ ماناکەی ئینجیل سێ وشەیان فێر کردم و ئەوانەن کە: « مەسیح فێری ئێمەی کرد کە بێدەنگ بین » من وەلام لە مە باشترم بۆ تۆ نیە.

کریستینا لە ناخی دڵەوە پێدەکەنێ، لەو دیوی ئاگردان دانیشتوە و لە بەر نیستی ئاگر دان و شۆقی ئاگر سەری نابینرێ. دەنگی لە تاریکیدا دەبیسرێ کە دەڵێ:

– خودا لە هەموو جێیەک هەیە. تەنانەت لە پیتراسکا ش.

بەڵام لە هەوای قسەکانی تەسلیم و ڕەزای لێ دیارە کە نەیتوانیوە تەواو بیشارێتەوە.

دۆن پاسکال شەراب تێدەکا. دوو بوتڵ شەرابی سوور و سپی لە سەر مێز دانراون. دۆن پاسکال دەڵێ:

– شەرابی سوور لە وڵاتێکەوە دێت کە خاکی لە « بوزولان وبای» سیرۆکۆ» دایمە لێی دەدات. شەڕابی سپی لە باخەکانی« ماڵوازی»واتە لە وڵاتێکەوە دێت کە دایم بای شەماڵ لێی دەدات. شەڕابی سوور بۆنی سووتاوی لێدێ و خڵتەی لیوانەکە تامی شیرینی دەدات. شەڕابی سپی ڕوونە و تامی مەیخۆش و قێز هەڵستێنە و مرۆڤ تا ئێسکان دەلەرزێنێ. دۆن پاسکال دەڵێ:

– شەڕابی « مەسح»ی دۆن بنە دیتو لە ژێر زەمینی منەوە دەهات. هەموو ساڵێ کە شەڕابەکانی من پێدەگەن دوو چەلەنگی بۆ دەنێرم.

ئاگـر دەكـوژێتـەوە. لەش و گـەردنی كـریسـتـینا لە تاریكی دێتـە دەر. وەك پاسـارییەكی كـە ئاو بخـواتەوە قـومی بچوك لە پیاڵەی شـەڕابی خـۆی دەدا. دۆن پاسكال دەڵێ:

- باوەڕ بكەن ئەگەر لە بڕیاری سەبارەت بە كریستینا هەستی خۆ ویستی لە لایەن ئنە مـاڵەوە بوو بێت، ئەم خـۆ ویسـتییـە ئەنگیـزەی سـەرەكی نیـە. كـریسـتـینا ئازادە.

كریستینا بە هەوایەكی گاڵتە ئاسایی گوتی:

- من ؟ گورگەكانیش من هەڵناگرن.

دۆن پاولۆ دەپرسێ : « گورگەكان ؟»

ئەو دەم باوكی حكایەتێك لە بارەی منداڵیی كریستیناوە دەگێڕێتەوە: « ئەو دەم كریستینا هێشتا لە بێشكە دا بوو.

چونكە ئەو مـەڕی زۆر خـۆش دەویسـت و ئاغـەڵیش لە زسـتـاناندا گـەرمـە. شەوێكیان بە بێشكەوە چەند سەعاتێك بردمانە ئاغەڵی حەیوانان. گورگێك دەچێتە نێو ئاغـەڵ و دەرفـەت دێنێ كە دوو مـەڕان بخنكێنێ. من كە لە دەنگی كاڕە كاڕی مەڕ ومخەبەر دێم بە سەگەوە دەگەمێ بەڵام گورگ رادەكات.»

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « كریستینا خەوتبوو.؟»

- نا، نا نە خـەوتبوو. بە پێچـەوانە لە بێشكە دا دانیشـتبوو بێ ئەوەی بترسێ گورگی دیبوو ڕەنگە لای خۆی وایزانیبێ كە ئەوە سەگی هارە مەڕ دەخوا.

كـریسـتـینا دەڵێ: « ئەو دەم من ئـەو حـەیوانە دڕندەم بینی كـە مـەڕەكـان دەخنكێنێ. بانگی بابم كرد بەڵام دەنگی كاڕە كاڕی مـەڕە فـەقیرەكـان دیارە دەنگی منیان دادەپۆشی. دۆن پاولۆ بە پێكەنینەوە دەڵێ:

- لە وانەیە گورگ تێگەیشـتبێ كە تۆ هێشـتا بچوكی و گـوتوویە كاتی گـەورە بووی جارێكی تر دێمەوە لات.

كریستینا دەڵێ: « من دەتوانم بەرگری لە خۆم بكەم »

دۆن پاولۆ تاوێك بیر دەكاتەوە وپاشان دەڵێ:

- گورگ چەند جۆرن. گورگی ئەوتۆ هەن كە بە ڕواڵەت وەك بەرخ دەچن.

باوكی كریستینا قسەكەی پشت ئەستور دەكات و دەڵێ:

- ئێمـە پیر بووین، زۆری پێناچێ كە دەمرین. كیژێكی گەنج ناتوانێ بە تەنیا بژی. ئەگەر خوازبێنی كەرێكی باش پەیدا بێت، داخوا ئاقڵانە نیە كە قبوڵی بكەی.

کریستینا لە وەڵامدا دەڵێ: « من نیشان کراوم »
باوکی و دۆن پاولۆ هەر تکیان بە سەر سوڕ مانەوە سەیری دەکەن. کریستینا دوو بارە دەڵێ:
– بەڵێ من پێشتر نیشان کراوم. دەزگیرانی من پیاوێکە تەک و تەنیا. هیچ کاتێ فریو نادات، هیچ کاتێ هیلاک ناکات، هیچ کاتێ تەڵاق نادات. تاقە مێردێکە چاوی لە جەیاز نیە. تاقە مێردێکە قەت نامرێ. تەنیا هاو سەرێکە شەو وڕۆژ، واتە بیست و چوار سەعات ئاگای لە گیان و لەشی منە.
کریستینابزەیەکی دێتێ و دەستی بابی ناز دەکا ودەڵێی دەیەوێ ئەوەش لە قسەکانی زیاد بکات و بڵێ:
– مێردێکە خەزور نا توانێ ئێرەیی پێ بەرێت.
دۆن پاسکال دەڵێ: « بەم چەشنە بنە ماڵەی کولامارتینی دەفەوتێ. کوڕێکی فاسید و کیژێکی تەرکە دنیا.»
کریستینا دەڵێ : « من شەو نخونیم کێشا و فیکرم کردەوە تا تێگەیشتم کە لە ژیاندا کام شت مەجازی و کامیان حەقیقیە.»
هەر سێکیان لە هەوای نیوە تاریکی ئاشپەزخانە دا تاوێک بێدەنگ دەبن. کریستینا شتە ئوتو کراوەکان دە باتە قاتی یەکەم و دەیانخاتە نێو سندوقێک.
دۆن پاسکال دەڵێ:
– تەنیا چوار پارچە زەوی بۆ من ماونەتەوە. کە دوانیان ڕەزن و دوانەکەی تر زەوین. تا چەند ساڵی دوایی ساڵێ لە ڕەزەکان حەوت هەزار لیتر شەڕابم دەگرت. ئیمڕۆ پاش ئەوەی بەڵای « فیلوکسرا » لە مێوەکان دەدا، سەرەڕای ڤیدا کاری زۆر بەرهەمی مێوە تازە نێژراوەکان لە چەند سەت لیتر تێناپەڕێ. لە جیاتی شەڕاب گرتن لە ڕەزەکانی خۆم لە بازاری ئازاد شەڕابم کڕیبایە هەرزانترم بۆ تەواو دەبوو.
پیرە مێرد ڕادەبێ و لە کەشوی مێزی خۆی دەفتەری حیساب دێنێتە دەر. دەفتەرێکی دڕاوی کۆن و لە بەر زۆری پسولە و بەڵگەی نێوان لاپەڕەکان هەڵمساوە.
دۆن پاسکال لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ :
– زەویەکان بە زەحمەت ڕۆژانەی کرێکارەکان دەر دێنن لە گەڵ ئەوەش کە مزەی کرێکار ڕۆژێ چوار تا پێنج لیرە هاتۆتە خوار و ئەمەش بە هیچ جۆر گران نیە. ماڵیاتیش لە گیرفانی خۆم دەدەم. بۆیە چەند ساڵە بە خۆم دەڵێم ئەم زەویانە بۆچ دەکێڵم. ئەو زەویانەی کە تەنانەت موخارجی خواردمەنی ئێمەش دابین ناکەن. من

هەمـوو سـاڵێ ناچارم هەشت قنتـال گـەنم و نیـزیکەی دوو سـەت لیـرە سـەوزی و سێسـەت لیرە پەنیر و گۆشت و ماسی و ڕۆن و ئارد بە نەغد بکڕم. دەبێ پارچەی لیباس و پێڵاویش لەم موخارجە زیاد بکەم تا خێزانی ماڵێ ڕووت و پا پەتی نەبن. ئەم موخارجە لە سەر یەک لە پێنج هەزار لیرە تێدەپەڕێ کە مەجبورم هەموو ساڵێ لە ئاخرین زەخیرەی بنە ماڵە هەڵبگرم کە لە ماوەی پەنجا ساڵدا کۆم کردۆتەوە.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « قەیرانە »

دۆن پاسکال دەڵێ :

– نابوتی یە. ئێمە حکوومەتێکمان هەیە کە ئیدیعا دەکات نەزمی گێڕاوەتەوە نێو وڵات، بەڵام لە ڕاستیدا نابوتی هێناوە. ئێمە هەموو ساڵێ کەمێک دادەبەزین. باوەڕ بکە ئەگەر فیز و دەمار گرژی ناوی بنە ماڵە نە بایە کە ڕێگا نادا ئەو زەویانەی دوو سەت ساڵە ملکی بنە ماڵەی کولامارتینی-ن بیانفرۆشم. ئێستا دەمێک بوو بە لە بەر چاو گرتنی بەرژەوەندی شەخسی خۆم لە شەڕی وانە ئاسودە دەکرد. ئیتر زەوی کشت و کاڵ هیچ نادا بە مرۆڤ. شار هەمووی دەخوا. من لە نیزیک« لاما» خانوێکی کۆنم هەیە بە کاری تەویلە دێت بە ئیجارەم داوە. باوەڕ بکە بۆ نووسینی ئیجارەی وی مەجبور بووم شەش ئەوەندەی وی خەرج بکەم. ئیجارە چاردە جۆر باج وماڵیاتی لە سەرە. بەمجۆرە: قیمەتی کاغەزی تەمر دار، هەقی نووسین، هەقی تۆمار کردن، هەقی خستنە نێو دەفتەر، هەقی کۆپی کردنی نوسخە، هەقی گواستنەوە، هەقی دەفتەر دار، خەرجی وەکالەتنامە، خەرجی ڕوو نووسەکان، کە دەبێ بدرێن بە لایەنەکانی سەودا. ئاخرەکەشی تەمری ڕوونکردنەوەی حیساب بەو مانایە کە تەواوی موخارجی باسکراو دراوە.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « نابوتی یە .»

دۆن پاسکال دەڵێ:

– ئاخری زەمانە. هێکتۆ لیترێکی شەڕابی « پوی دەکرێ بە چل لیرە بکڕی لە کاتێکا موخارجی بەر هەم هێنانی وی بۆ ئێمە لە سەت لیرە تێدەپەڕێ. هەر چۆنێک بێ ئەگەر مرۆڤ شەڕابی بەر هەمی خۆی بفرۆشێ دەبێ هەشتا و پێنج لیرە واتە دوو ئەوەندەی نرخی خۆی ماڵیات بدەی. پێش پازدە ساڵ قیمەتی هەکتارێک ڕەز پەنجا هەزار لیرە بوو. ئیمڕۆ بە یەک دەیەمیش کەس نایکڕێ.

دۆن پاولۆ دەپرسێ:« وەزعی وردە مالیکان چۆنە ؟»

دۆن پاسکال لە وەڵامدا دەڵێ :

– وەزعی وردە مالیکان بە قسە باشە. هەموو وەرزێرێک ئاواتی ئەوەیە ببێتە وردە مالیک. بەڵام کە بوون بە وردە مالیک تازە دەزانن کە وەزعی ژیانیان لە وانیتر خەرابترە. کێڵانی زەوی دەسمایەی گەرەکە. نیزیکەی پێش ٧٠ ساڵ زەویەکانی کلیسا و تەواوی مڵکی ڕوحانیەکان بە قیمەتێکی ئاسایی فرۆشرا و بە سەر وەرزێراندا دابەشکرا. پاش چەند ساڵ وەرزێرەکان مەجبور بوون پارچە زەوی خۆیان بفرۆشن و ئێستا ئەو زەویانە لە دەست دوو سێ خاوەن مڵکی گەورە دانە.

دۆن پاوڵۆ دەپرسێ:« وەزعی وەرزێرەکان چۆنە ؟»

دۆن پاسکال لە وەڵامدا دەڵێ:

– لە وەزعی من باشترە. لەشێکی بە لێدانی قامچی ڕاهاتبێ ئیتر هەست بە ئازار ناکات.

دۆن پاوڵۆ دەڵێ: « ئاخر ئەوانیش گۆشت و پێستیان مەسیحی یە »

دۆن پاسکال لە وەڵامدا دەڵێ:

– هەر گیز نەمبیستوە وەرزێرێک لە بەر ئازار مرد بێت. بەڵام یەکێکی دەناسم بە بیستنی خەبەرێکی خۆش سەکتەی کرد. باوکی « ماسترا ئانجلو» خوا بیبەخشێ- بە جحێڵی نۆکەری بابی من بوو. چونکە ئێمە هەر تکمان خزمەتی سەر بازیمان لە« ئانگۆن» ئەنجام دا. ئەو ڕۆژەی لە سەر بازخانە ئازاد کراین هەر یەکە بۆ سەر گەرمی بلیتێکی لاتارمان کری. ماستر ئانجلۆ بۆی هات و بردیەوە. جایزەکەی دوو هەزار لیرە بوو. من بێ ئەوەی بیری لێبکەمەوە و بۆ بیستنی ئەو خەبەرە ئامادە بکەم لە پڕ مزگێنیم دایە. کەوتە هەرد و تەواو بوو. مرد. دڵی نەیتوانیبوو تاقەتی ئەم خۆشییە بێنێ.

کریستینا لە جێبەجێکردنی لیباسەکانی بۆوە. ئێستا گەڕاوەتەوە لە کن ئەم دوو پیاوە دانیشێ. دۆن پاسکال لە پشت خانوەکەی تەویلەیەکی هەیە کە دوو مانگا و گوێلەکەیەکی مێ و ئەسپێکی تێدا بەستۆتەوە. بۆ سەر دانی ولاخەکان دەچێتە تەویلە. دۆن پاوڵۆ و کریستینا تەنیا دەمێننەوە. دۆن پاوڵۆ دەڵێ:

– پێش چەند ڕۆژ لە گەڵ دۆن چیپریانۆ سەرێکی بیانکینا و ئالبێرتۆ-م دا.

کریستینا دەڵێ: دەزانم. نێو چاوان تێک دەنێ. چاوەڕوانی ئەم باسە بوو. کەشیش لە درێژەی قسەکەیدا دەڵێ:

– هیچیان حاڵیان باش نیە.

کریستینا دەڵێ : « هەست دەکەم »

کەشیش دەڵێ : دەمانویست بینە هاو سەر. ڕەنگە جگە لەوە چارەیەکی تر نەبێ.
کریستینا دەڵێ: « هیچ دەرمتانی نیە . شتی وا نابێ »
هەر چەندی کەشیش بیر دەکاتەوە ناتوانێ هۆی ئەو « ناکرییە » بزانێ.
کریستینا لە ڕوونکردنەوەی قسەکەیدا دەڵێ:
– بنە مـاڵەی کـولامـارتینی ناتوانن لە گەڵ بنە مـاڵەی« جیـراسـولە» پێـوەندی بیەستن.
دۆن پاولۆ دیسان بەڵگەی ئەوە تێناکات. کیژی لاو دوو بارە بۆی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:
– باوکي من پێـوەندییـەکي ئـەو تۆ نەک هـەر بۆ خـۆی بەڵکوو بۆ گـشت باب و باپیرانیشی بە شەرم و ڕیسوا دەزانێ.
کەشیش دەڵێ:« قسە لە باو وباپیران نیە، قسە لە ئالبێرتۆیە.»
کریستینا دەڵێ: « شتی وا نابێ. ئابڕووی بنە ماڵەیەک گاڵتەی پێناکرێ.»
کەشیش بە سەر سوڕ مانەوە دەپرسێ : « تۆش وا بیر دەکەیەوە ؟»
کیژی لاو دەڵێ: « سروشتیە کە منیش وا بیر دەکەمەوە. »
پاشان هەر تکیان لە بارەی باو بارانە قسان دەکەن. دۆن پاولۆ دەپرسێ:
– ئەم باو بارانە زیانێکي زۆری گەیاندوە. من سەرم لە وە دەر ناچێ کـە ئەم خـەڵکە بۆ چی پاش هـەموو لافاوێک خـانوەکانیـان دیسـان لە پەنا لافاو گر دروست دەکەنەوە. بۆ نموونە پشـتی مـاڵی ئێوە کە بەرزە و لە ناوچەکـانی دیکە ئەمـینترە، خانوو لە وێ دروست ناکەن.
کیژەکە بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێ:
– لە نیـزیک لافـاوگـر زەوی هەرزانتـرە. زەوی ئـەم بەرزاییـانـە پشـتی تـەویلەی باوکمن. وەرزێرەکان نایانەوێ بە پارە بیکرن.
دۆن پاولۆ دەڵێ: « ئاخر لە نیزیک لافاو گر هەمیشە لە مەترسي دان.»
کریستینا دەڵێ: « چدکرێ، ژیان ئەوەیە. »
دۆن پاولۆ دەبـێ ئاگـای لە زاری خـۆی بێ تا لە وەڵامـدا وتەی دوور لـە ئەدەب لە زاری دەر نە پەڕێ. هەست دەکات کە لە دەست کریستینا زۆر تووڕە بوە. ئـاخرەکەی دەتوانێ ئەم پرسیارە بکات:
– ئاخـر ئەوە نیـە تۆ هـەمـیشـە پێت وایـە کە سـەقـامگرتـووی داد پەروەری لەم جیهانە دا کارێکی لە کردن نەهاتوە.؟

کریستینا لە وەڵامدا دەڵێ: « قەڵەمڕەوی سەڵتەنەتی ئێمە لەم دنیایە دا نیە.»
دۆن پاولۆ ئیراد دەگرێ و دەڵێ:

– بەڵام زەوی پشتی تەویلە بەشێکە لەم دنیایە. بۆ دەبێ نەیدەی بەو کەسانە کە دەتوانن لە وێ جێگایەکی ئەمینتر لە نیزیک لافاو کر بۆ خۆیان بدۆزنەوە؟

کریستینا لە وەڵامدا دەڵێ:

– خـودا هێندێ کـەسی دەوڵەمـەند دروست کردوە وهێندێ فـەقـیر. هـەر کـەس خۆی وەڵامـدەری ئەو بەشـەیە کە لە خـودای وەر گـرتوە. هـەر کـەس دەبـێ بە بەشـی خۆی ڕازی بێت.

دۆن پاولۆ دەڵێ:

– من لە کاری تۆ سەر دەر ناکەم. تۆ دەتەوێ لە دێرێک گۆشـە نشین بی و ببیـە تەرکە دنیا، بەڵام ئامادە نی لە زەوی پشتی تەویلە دەست هەڵگری.

کریـسـتـینا دەڵێ: « من بۆ خـۆم واز لە هـەمـوو شت دێنم. بەڵام بنە مـاڵەم پلە و پایەکی هەیە کە دەبێ بپارێزرێ.

دۆن پاسکاڵ لە تەویلە دەگەڕێتـەوە. کەشیش هەڵدەستێ و دەچێتەوە موسـافیر خانە. لە کریستینا تووڕەیە. ئەم هۆگرییە بەو کیژەی پەیدای کرد بوو، ئێستا لە بەین چوە. هـەست دەکا ئـەو فـەنـەرەی پێش پازدە سـاڵ ئەوی دژی فـێڵ و مـەکـر وریایی ساردی بێ بەزەیـیانەی ئەربابی کلیسـا هـاروژاند بوو، سـەر لە نوێ لە جـەسـتـەیدا دەکێشـرێتـەوە. ئەو لیـباسـەی لەبەری دایە کۆسـپی ئەوەیە هـەر چی لە دڵی دایە بە کـریسـتـینـای بڵێ و هـەقی خـۆی وەدەسـتـی بدا. ئەو شـتـەی زیاتر لە هەمـوو شت ئازاری دەدا ئەوەیە کە ناتوانێ بە دەر بڕینی بیر وڕا سەبارەت بەو کەر موقدەسەی عیبـادەت فرۆش و لە بارەی ئیدیعای دینداری وی. دەقی دڵی خۆی بە سـەر دا بەتاڵ بکات. ئاخـرەکەی بۆ ئەوەی بێتـەوە سـەر خـۆ لە پشت مـێـزەکەی دادەنیـشـێ و لە دەفتـەری بیـرەوەری ڕۆژانەی خـۆی دا  دەست بە نـووسـینی تەواوی ئـەو مـەتڵـەبانە دەکات کە ئەگەر لەبەر ئیحتیات نە بایە بەرەوڕوو بە کـریستینای دەگوت. ئەو ئاوا دەست پێدەکات:

– خـۆ ویسـتـی دیهـاتی دواکـەوتووترین و حـەیوانیـترین خـۆ ویسـتی یە» هەر بەم هەوایەش نووسین درێژە پێدەدا.

٦

بەهار تێدەپەڕێ و هاوین نیزیک دەبێتەوە. گێلاس تەواو بوە و گەنم پێگەیشتوە. دۆن پاولۆ حـالّی تەواو باشـتـر بوە. بۆیە دەیەوێ تا لە نەرمـی ئاقـاری ژنانە کـە دەوریان داوە ڕابکات و خـۆ دەر باز بکات. لە چاو پێکەوتنی کـریسـتـینا خـۆ دەپارێزێ و تێدەکۆشی تا لە وەرزێران نیزیک بێتەوە. وەرزێر تەواوی ڕۆژ بزرن و تا کاتی شەو کە ڕۆژ ئاوا دەبێ بۆ مالّێ ناگەڕێنەوە. لە کاتێ گەڕانەوە دا پۆل پۆل بە دوای وڵاخەکانیاندا کە هەموو ئامرازی کاریان لێ بار کردوون بە ڕێگا دا دەڕۆن. دۆن پاولۆ لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە ئەوان دەبینێ کە بە زەحمەت و بە کاوە خۆ لە دۆڵ سـەر دەکـەون و شێـوەی ڕێگا ڕۆیشـتنیـان، هەوای تایبـەتی خـۆیانە. یانی جەستەی خۆیان وەپێش دەدەن. ئەمەش لە پاچ و پێمەڕە لێدان پێی ڕاهاتوون. هەر وەها ڕاهاتن بە گوێ لە مستی و کۆیلەتی.

دۆن پاولۆ ئێستا ساخ بۆتەوە. لە مالّ دەچێتە دەر تا لە دەست نالّە و نوزەی ماتالنا دەر باز بێت کە هەر لە ئێستاوە لە باو بارانی داهاتوو ترسی لێنیشتوە. هەر وەها دەیەوێ لە دەست سکالاّ و نالّەی ژنانی تریش کە لە پێش موسافیرخانە خەریکی پینە کردن و ئەسپێ دۆزینن ڕابکات و لە دەست دێوە زمەی بیرەوەری سەر دەمی گەنجیەتی خۆی ڕابکات کە پێی وابوو بۆ هەمیشە بلاّو بوون و بەلاّم ئێستا گەڕاونەوە تا بە یارمەتی تەنیایی و لاوازی جەستەی ئازاری بدەن. جگە لە گشتی ئەمانەش وریایە کە لە گەڵ کریستینا بەرەو ڕوو نەبێت.

بە پردێکدا تێدەپەڕێ کـە قـەڵشی تەختـەکانی وێک نەکەوتوونەوە. ڕێگایەک دەگرێتە پێش کە بەرەو دۆڵ دەچێتە خوار. لە سەر بەردێک دادەنیشێ و چاوە ڕوانی وەرزێرانە کە لە مەزرا دەگەڕێنەوە. دۆن پاولۆ خۆی وەک ماشێنێک هەست پێدەکات کە لە چاکردنەوە بوو بێت وئێستا چاک بوو بێتەوە و هەرەکەتی ئاسایی خۆی دەست پێبکاتەوە و بێتەوە سەر کاری ئاسایی خۆی.

دوو بارە هەست دەکا کە ئەو غەریزەی بەشێکی جیا نەبۆوەی سروشتی ویە، واتە غەریزەی مرۆڤی بەستراوە بە کۆمەڵانی خەڵک. غەریزەی مرۆڤی شۆڕشگێڕ گوشاری بۆ دێنێ. لە دەرەوەی کۆمەڵانی خەڵک و یا کۆسپی ماددی وەک زیندان و

ئاوارەیی کە دەبێتە هۆی بێبەشبوونی لە پێوەندی لە گەڵ خەڵک، وای دێتە بەر چاو کە مرۆڤی شۆڕشگێڕ هەمیشە لە کاری ژیانی خۆی دوور کەوتۆتەوە، وەک ماسییەکی لە ئاو هاتبێتە دەرێ. ماوەیەک کە لە ژێر کار کردی فێر کردەکانی « دۆن بنە دیتو» دا بوە، هۆگریی ئەو بە فەقیران لە بەزەیی مەسیحاییە وە سەر چاوەی دەگرت !

(M iseror Super Turbem). ( واتە فەقیرەکان باڵا سەری کۆمەڵگا)

بەڵام پاشان ئەو هەستە لە ڕوانگەی وی گاڵتە هاتە بەر چاو. لە ناخی نیازیدا بە دۆستایەتی و ژیانی هاو بەش لە گەڵ کرێکارانی کارخانەکان تێگەیشتنێکی ڕووناکی لە وێکچوونی نێوان ژیانی ئەخلاق و چالاک و خەبات بۆ سۆسیالیزم پێکهاتوە و ئەم تێگەیشتنە تا هەودای نهێنی زاتی ڕیشە ئاژۆ بوە.

لە ڕوانگەی وی سۆسیالیزم هیچ کاتێ نە بەرنامە یەکی سیاسی خالیس و نە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی گەم و زۆر پشت ئەستور بە زانست بوە، بەڵکوو خۆی ژیان بوە. واز هێنان لەو ژیانە و پەنا بردن بۆ ژیانێ شەخسی و« خەریکبوون بە کاری خۆیی» بۆ ئەو، بۆ خودی وی، واتە بۆ« پێترۆ سپینا » لە ڕاستیدا بە مانای مردن بوو، وەک ئەوە بوو کە بوو بێتە کەسێکی دیکە. لە بەر ئەوە هەر لە گەڵکوو سلامەتی لەشی ڕێگای داوە خەریکی دۆزینەوەی وەرزێران بوە. ئێستا لە پەنا جادە لە سەر بەردێک دانیشتوە و چاوە ڕوانە کە وەرزێڕ لە مەزرا بگەڕێنەوە. ئەم چاوە ڕوانیە لە ڕوانگەی ویوە تەواو سروشتییە. سەر دەمی منداڵی خۆی وەبیر دێتەوە کە کاتی ڕۆژ ئاواپاش تەواو بوون لە دەرسی شەرعیات لە مەیدانی

« نورتا » چاوەڕوانی منداڵە فەقیرەکانی دیکە دەمایەوە تا پێکەوە یاری« ناقوس» ویا« دز و ژاندارم» و یا «شەڕی فەرانسەیی» بکەن. دیسان وەبیر دێنێتەوە کە درنگتر لە ڕۆم بۆ تە ئەندامی دەستەی قوتابیانی سۆسیالیست و لە پێش دەرگای هاتنەدەری کارخانەکانی « تانابلی» چاوە ڕوانی کرێکارێک وێستاوە، لە دەروازەی « پۆرتاسان جیوۆوانی» تێپەڕیوە و یا دیسان لە پێش « کازۆمتر » لە شارۆچکەی ئەو لای دەروازەی « سن پول » چاوە ڕێی هاوڕێیەکی بوە تا شەو لە گەڵ ئەو بەرێتە سەر. لە ڕاستیدا ئەو چاوە ڕوانی بوون دەزانێ.

هەوەڵ کەسێکی لە ڕێگاوە دەکاتێ « شاتاپ» ی پیرە مێردە لە گەڵ کوڕەکەی و « کاریبالدی» کەرەکەی کە چەند هەنگاو پێش وان کەوتوە و بارە گیایەکی لێ بار کراوە. شاتاپ ڕادەوەستێ و دەڵێ:

– دەمێکە دەمویست بێم لە گەڵت بدوێم. بەڵام پێیان گوتبووم کە تۆ دەکۆخی و نەمدەویست زەحمەتتان بدەم.
دۆن پاولۆ دەڵێ: « ئێستا کۆخەکەم سوک بوە .»
پیرە مێرد دەڵێ:
– قسەکەم ئەوە بوو کە کوڕەکەم زۆری هەوڵ داوە ببێتە ژاندارم و یا سەر باز بەڵام هیچی بۆ نەکراوە. بەلکە تۆ بتوانی ڕاسپاردەیەکی بدەیەی.
کەشیش لە کوڕەکەی دەپرسێ: « بە ڕاستی گەرکتە ببیە ژاندارم؟»
– دیارە، خـەڵک بە خـەراپ باسی ژاندارم دەکـەن بەڵام ئەوە لە بەر ئێـرەییـە. ژاندارم کاری کەمە و داهاتی زۆرە.
کەشیش دەڵێ:
– قسـە لە زیاد و کەمی کار کردن نیە. تۆ کەسێکی کرێکاری، واتە ڕەعیەتی. ئەگەر ببیـە ژاندارم باڵا دەسـتـەکانی تۆ دەتوانن فـەرمـانت پێبـدەن کـە تەقـە لە وەرزێرانـی ناڕازی بکەی. هەر وەک کـارەسـاتێکی ئەو تۆ هـەر لەو نیـزیکانـە لە « سمۆڵنا » و « پڕاتولا » و « پڕەزا » ڕووی داوە.
شاناپ لە گەڵ کەشیش هاو دەنگە و دەڵێ:
دۆن پاولۆ هەقیـەتی. مرۆڤ بۆ ئەوەی باشـتر بژی دەبێ گیـانی خـۆی بفرۆشێ. چاری دیکە نیـە. دەڵێن جـارێک شــەیتـانێکی زەلامـی ڕەشـپـۆش لە ئەشکەوتێکدا دەژیا، کڵاوێکی بەرزی لە سەر دەنا و قامکەکانی وەک قامکی بانگداری گەورە پڕ لە ئەنگوستـیلە بوو. سێ جـۆتیـار دەچنە لای و دەپرسن:« چۆن دەکرێ بێکار کـردن چاک بژی؟» شەیتان لە وەڵامدا دەڵێ:
« دەبێ ڕوحێکی پاکت هەبێ». وەرزێرەکان وەدوای کـاری خۆیان دەکەون. دەچن پشیلەیەک دەگرن وەک منداڵێکی تازە لە دایکبوو لە پارچەیەک وەر دەگرن و دەیبەنە کن شـەیتـان و هـەر سێکیان پێکەوە دەڵێن: « فـەرموو ئەوەش ڕوحـێـک بە ڕاسـتی پاک و بێگوناحـە!» شەیتـان لە پاداش دا کتێبێکیان دەداتێ کە تەواوی دەسـتـوراتی ژیانی باشـتری بێکار کردنی تێدا نووسـراوە. کاتێ کە وەرزێڕەکان دەیانەوێ بڕۆن پشیلە دەست بە میـاو میـاو دەکات. شـەیتـان لە فێڵی وان تێدەگا و کتێبی جادوو لە دەست جـۆتیـارەکـاندا ئاگر دەگـرێ : پشـیلە قـبـوڵ نیـە، دەبێ ڕوح بێنن، ڕوحـێکی ڕاسـتە قینە.
کـوڕەکـەی دەڵێ: « زۆر بـاشـە، منیش وەک خـەڵکی دەکـەم. هـەر چۆنێک بێ

داخوازی من قبوڵ نەکرا. داخوازکەر ئەوەندە زۆر بوون هەر باسی مەکە. »

شـاتـاپ دەڵێ: « بەڵێ، ڕوح زۆرە. بوومـە لەرزە و تەخـۆشی و شــەڕ هیـچـیـان پێنەکراوە. بە ڕاستی ڕوح زۆرە.

کەشیش دەپرسێ: « کەسێکی ڕوحی خۆی دەفرۆشێ ئیتر هیچی نامێنێ کە بیفرۆشێ.»

شاتاپ وەڵام دەداتەوە:

– مادام مرۆڤ زیندوە هەمیشە ئامـرازی باشکردنی کار ئامـادەیە. کە وابوو کلیسا بۆ چیە؟ داخوا کلیسا پێشی تەقە کردن لە ژاندارم دەگرێ؟ کاتێ لە فوسا لە ڕێ و ڕەسمی « جێژنی خودا » لە پشتی کلیسای « سن ساکرەمان» دەستە ڕێدەکەوێ، هەمیشە چوار ژاندارم لە لیباسی ڕەسمی و بە چەکەوە لە وێ ئامادەن. ئێوە جەنابی قەشە فەرموتان لە « پراتولا» ژاندارمەکان تەقەیان لە خەڵکی فەقیر کردوە. ئەم وتەیە یانی ئەو ژاندارمانە پاشان دانیان بە گوناحی خۆیان داناوە بەڵام کێ ئیـقـراری لەو وەرزێڕانە وەر گـرتوە کـە کـوژراون.؟ لەم جـیـهـانەدا لە سـەرما ئازاریان چێشتوە، لەو دنیاش لە ئاگری جەهەندەم دا ئازار دەچێژن.

دۆن پاولۆ دەڵێ: «بە داخەوە نازانم ئێوە بە کێ بسپێرم. من فـەرمـاندەکـانی ژاندارمەری هیچ کامیان ناناسم.

لەو ماوەیە دا کەر لێیان دوور کەوتۆتەوە. پیرە مێرد هاوار دەکا: کاریباڵدی !

بەڵام کەر گوێ ناداتێ و ڕێگا درێژە پێدەدا.

شاتاپ بۆ کەشیش ڕوون دەکاتەوە:

– چونکە برسیەتی، گوێ ناداتە قسەی من. دەزانێ کا و تەویلە هێندە دوور نین. حەیوان کاتێ برسی دەبێ ناوی خۆی لە بیر دەچێ.

شاتاپ و کوڕەکەی شەوباش بە قەشە دەڵێن و دەڕۆن تا بگەنە کەرەکەیان.

پاشان وەرزێڕێکی سـەر خۆش بە سواری گوێدرێژ بەوێدا تێدەپەڕێ و بە ڕاست و چەپدا بە لادا دێت. جارێک ڕاست دەبێتەوە و کەرەکە وەبەر مست و شـەق دەدا و بە سەریدا دەنەڕەێنێ:

– ڕاست بە ڕێگادا دەڕۆی یان نا؟

بە دوای ویدا دەستـەیەک وەرزێڕ دەگـەنێ کە دەورەی گاری مـاکاشـیـایان داوە. وەک جاران باد پای پیر گاری ڕادەکێشێ کە لە هەموو کـاتێ کزترە. مـاکـاشـیـا هەموان بە یەکتر دەناسێنێ. دۆن پاولۆ لە گەڵ وەرزێڕان بۆ گوند دەگەڕێتەوە.

ماگاشیا دەڵێ : « ئێمە هەموومان لە بازار بووین.»

کەشیش دەپرسێ: « چاکتان فرۆشت ؟»

ماگاشیا لە وەڵام دا دەڵێ: « قیمەتی شت دابەزیوە، ئاییننامەی« ئەوپەڕی زۆر» یان بە سەر هەموو شتێکدا سەپاندوە. ئێمە نەماندەویست شتێک بفرۆشین، بەڵام مەجبوریان کردین چونکە ئەگەر نەمانفرۆشتبایە شتەکانیان لە دەستاندین.

زەلامێکی بە پەنا گاریدا ڕادەبرێ دەڵێ:

- قیمەتي بەرهەمي کشت و کال وەبەر ئایینناممەی « ئەو پەڕی زۆر» کەوتوە و دابەزیوە، قیمەتی بەرهەمەکانی شار وەبەر ئایینناممەی « ئەو پەڕی زۆر» نە کەوتوە و چۆتە سەر.

ماگاشیا دوو بارە دەڵێ:

- « جاچینتۆ کامپۆ باسۆ» چونکە یاخی بوو ژاندارم گرتیان. ئەو کە باسی ئایینناممەی بیست، دەیویست شتەکانی نە فرۆشێ و بچێتەوە « پیتراسکا».

دانیل ماڵتا کە وەرزێرێکی ئازایە بە تەنیشت گاریچیدا ڕادەبرێ. کڵاوێکی لێوار پانی ئاواژوو لە سەر ناوە، دەمو چاوێکی ئەستووری هەیە. ماگاشیا بە کەشیش دەڵێ:

- دانیل گوێدرێژێکی نەخۆشی هەبوو کە بێگومان مانگی داهاتوو ناباتە سەر. هێنایە بازار و بە کەرێکی ساخ لە ژنێکی فوسایی قایمکرد.

دانیل دەڵێ: « لە جێژنی پاک دەچمە کن کەشیش و ئیقرار دەکەم. هەموو دەست بە پێکەنین دەکەن.

کوڕێکی گەنج بە ناوی لویچێ باندوچیا بەو دیوی عارەبانە دا دەڕوا. وا دێتە بەر چاو کە شەڕابی خوارد بێتەوە.

ماگاشیا بە کەشیش دەڵێ :

- باندوچیا لە فوسا دەچێتە مەیخانەیەک نان دەخوا و دەخواتەوە و دەرخواردی دانیشتوانی ئامادە بوانیشی دەدا. پاشان بە بیانووی دەست شۆیی دەچێتە باخچەی مەیخانە و بێ ئەوەی پارەی خواردنەکە بدا بە دیواری باخچەدا سەر دەکەوێ و بزر دەبێ. باندو چیاش بەڵێن دەدا لە جێژنی پاک بچێتە کن کەشیش و ئیقرار بکات. دیسان قاقای پێکەنین بەرز دەبێتەوە. دۆن پاولۆ تەماشای ئەو فەقیرانە دەکات کە چۆن بە دزی و بە فریو خواردن ڕاهاتوون. ئەو فەقیرانەی کە هەر لەو ڕۆژە دا کە کار بەدەستانی دەوڵەتی بە ناوی قانوون فریویان داون و ماڵیان

دزیون، خۆیان هەول دەدەن بە فریو دان و دزینی ماڵی فەقیری دیکە تۆڵەی بکەنەوە و ئەوەتا ساکارانە بە کردەوەی خۆیان شانازی دەکەن. هێندێ لەم وەرزێڕە بەد بەختانە نیشانەی دزی و کڵاو چیەتی کە بۆتە عادەتی دووهەمیان و شوێنە واری حەیوانیترین جۆری خۆ پەسندی بە شکڵی ئاشکرا لە شێوەی پێکەنین و سەیر کردندا دەر دەخەن.

لویچی باندوچیا گێڕانەوەی داستانی خۆی درێژە پێدەدا:

- کاتێ خانم ڕزا«جیراسوله» مودیری موسافیر خانە دەزانێ من تەماوم، یەقەی« بیاجۆواکارو» دەگرێ پارەکە لەو بستێنێ بە بیانوی ئەوە کە ئەویش خەڵکی پیتراسکایە. مادام ڕزای فەقیر ڕۆژی لەوە خەراپتر توش نەدەبوو. ئەگەر ئامادە بوان بەڕیوانیان نەکرد بایە، « بیا جیو» تەواوی شتو مەکی موسافیرخانەی دەشکاند. تەختەی گۆشت ورد کردنی هاویشتبوە سەری خانم مودیرە ئەگەر وە سەری گەوتبایە ژنی فەقیر بێگومان مرد بوو.

یەکی دیکە لێی زیاد دەکا:

- بیا جیو تا ئێستا بە تاوانی بەدفەڕی سێ جار کەوتۆتە زیندان. پیاوێکە خەڵکی دیکە حیسابی بۆ دەکەن.

باندوچیا دەڵێ:« کوتەک لێدان شەرمی ناوێ. کوتەک وێکەوتن شەرمە.»

ماگاشیا دەڵێ:

هەوەڵینجار کە بیاجیو کەوتە زیندان، تاوانی ئەوە بوو بە بیور باسکی باوکی شکاند بوو.« واکارۆ»ی پیر لە سەرە مەرگ دا بە منی گوت:« کورم باسکی شکاندووم بەڵام خۆشحاڵم کە وا بەهێزی دەبینم.» باسی پاڵەوانەتی« بیاجیو» درێژە پێدەدەن. بەڵام ئیتر کەشیش گوێی ناداتێ.

لە گەڵ ئەوەش کە وەرزێڕەکان لە دەر بڕینی فیکر و وتەکانیان لە کن دۆن پاولۆ لە هیچ شتێ سڵ ناکەن، دیسان دۆن پاولۆ لەم دیدارە هەڵکەوتوانە ڕازی نیە. خۆی وەک گەڕیدەیەک هەست پێدەکا کە لە ڕێگا توشی دەبن و چەنە بازی دەکەن. نەک وەک شۆڕشگێڕێکی نێو کۆمەڵانی خەڵک کە خۆی نوێنەریان بێت. هەر بۆیەش کەم و زیاد گاڵتەی بە وەزعی خۆی دێت و ئەم هەستە وای لێدەکا کە دەست بداتە کارێکی مەترسیدار. دەیەوێ بە سەر ئەم کۆسپەدا زاڵ بێت کە لیباسی کەشیشی لە سەر ڕیگایاندا پێکهێناوە. هەر لەو کاتەشدا هەول دەدا تا لە شێوەی هەست کردنی وەرزێڕان ورد بێتەوە. لەم نوکتەیەش تێبگات کە ئایا دەگرێ قسەکانی خۆی

بەوان تێبگەیێنێ. دیارە مەبەست ئەوە نیـە کـە لە بەر چاوی گشتی و بە کۆمەڵ قـسـەیان لە گـەڵ بـکات. چونکە ئەم کـارە نەک هەر بێ ئـیـحـتـیـاتی یە،بەڵکوو نەتیجەشی نابێ. بە دەنگی بەرز و لە گەڵ خەڵکێکی زۆر قسە کردن کردەوەیەکی ئاژاوە چیـانەیە و دەیەوێ خـەڵک بۆ ڕاپەڕین هـانبـدا. و دەبێ لـە یەک کـاتدا هەم خەڵک هان بدا و هەم خۆی گەرم دابێ و هـەم بـهارۆژێنێ و هـەم خۆی بـهارۆژێ. بە پێچەوانە، بۆ گرێدانی پێوەندی ئینسانەکان بە یەکتر، بۆ تەڵقینی هەستی بڕوا بە هیـتـر و بڕوا پێکردن بە وان، بۆ گـۆڕینەوەی بیـر و ڕا نەک گـۆڕینەوەی وشـەگـەل، پێویستە دوو بە دوو دانیشی و بە کاوە خۆ بپەیڤی و زۆر جاریش قسە ڕابگری تا دەرفەتی باشتر بۆ بیر کردنەوە بێتە دەست. بەڵام کاتێ دۆن پـاولۆ یەک یەکی ئەم وەرزێرانە دەخـاتە بەر چـاو کـە لە کـۆنەوە دەیانناسـێ تا بزانـێ دەگـرێ لە گـەڵ کامیان بە تایبەتی بدوێ و گەلاڵەی دۆستایەتی دابڕێژێ. هەر یەک لەوانە بە قەست و یا بە زانین بە بەڵگەیەک ڕەت دەکاتەوە. لە گەڵ ئەوەش لە نێو دەستەی وەرزێران کە لە گەڵ ماگاشیا لە بازار دەگەڕانەوە، لاوێک هەیە کە هیچ ناڵێ و چاوی بڕیوەتە کەشیش. ئەم لاوە پا پەتی، شڕۆڵ، بالا بەرز و لاوازە و ئاڵقەیەکی درێژ لە قژمکانی کەوتۆتە سەر نێوچاوانی و حاڵەتێکی وەحشیانەیان پێ بەخشیوە کە لە گەڵ چاوە پاکەکانی – کە وەک سەگی بە وەفا دەچن – لە ناتەبایی دایە. دۆن پاولۆ تەماشای دەکـا و بە ڕوویدا پێدەکەنێ. لاوەکـەش بزەی دێتێ و لێی نیـزیک دەبێـتەوە. کـاتێ دەستە لە پردی پیتراسکا تێدەپەڕێ و بڵاو دەبێ دۆن پاولۆ باسکی لاوەکە دەگرێ و ڕایدەگرێت و پێی دەڵێ:

– دەمـەویست لە گەڵ تۆ قسە بکەم. دەمەویست بیر وڕای تۆ لە بارەی هێندێ شتەوە بزانم.

لاو بزەیەکی دێتێ و بەرەو مـاڵ دەکـەوێتـە ڕێ. دۆن پـاولۆ وەدوای دەکـەوێ. وەرزێری لاو جـار و بار ئاوڕ دەداتەوە و بێ ئەوەی هـیچ بێژێ تـەمـاشـای کەشـیش دەکات. بەڵام وا دێتە بەر چاو نیگای پڕ لە نیگەرانی و دڵە ڕاوکەیە.

خـانووی وەرزێری لاو زیـاتر وە تەویلەی بەرازان دەچێ تا وەک مـاڵ. دەرگـای چوونە ژووری ئەوەندە نزمـە کـە دەبێ سـەر دانوێنێ و هەر لەو کـاتە دا کـاری دوکـەڵکێـشـیش دەکـات. خـانوو ئەوەندە تاریک و پیـسـە بە زەحـمـەت بۆت لێک دەکرێتەوە. تەنیا بۆ دۆشەگێک و بزنێک جێگا هەیە. دۆشەک لە سەر هەرد ڕاخراوە و بزنیش لە سەر کۆگا کایەکی پڕ لە کشپڵ کاوێژ دەکات. دۆن پاولۆ لە بەر بۆگەنی

بەین ولیبـاسـی چڵکن کـە ژوورەکـەیان تەژی کـردوە، تاقـەت ناهێنێ، ناچار لە بەر دەرگا دادەنیشێ. لە کاتێکا وەرزێڕی لاو لە ژوورەکەیدا خەریکی ساز کردنی شێوی خۆیەتی، دۆن پاوڵۆ دەست بە قسان دەکات و دەڵێ :

– لە ڕۆژ هـەڵاتی ئوروپا وڵاتێکی گەورە هەیە، دەشـتێکی پان و بەرینە گەنمی لێ دەچێنن. دەشتێکی ئاوەدانە کە میلیونان جۆتیاری لێ نیشتە جێیە.

وەرزێڕی لاو پـارو پارو نـانی هـەرزن دەبـڕێ و لە سـەر هـەر پاروێک قـاشـێک تەماتە و پەلکە پیوازێک دادەنێ و دەیدا بە کەشیش. دەستە قەڵشیو و ئاوساوەکانی هێشـتا حکایـەت لە کاری مـەزرایە دەکـەن. ئەو کێـردەی نانی پـێ بڕیوە، بۆ هـەمـوو کارێکی بە کار دێنێ. دۆن پاوڵۆ چاو دەقوچێنێ و هەوڵ دەدا پاروە نانەکە قوت بدا . دوو بارە دەڵێ :

وڵاتێکی گەورە هـەیە لە وێ وەرزێڕانـی گوندی و کرێکاری شار پێکەوە یەکیـان گـرتوە. لـەو کـاتە دا مـاتالنا مـاڵ بە مـاڵ بە دوای مـیـواندا دەگـەڕێ. ئاخـرەکـەی دەیدۆزێتەوە و دەڵێ:

– سەعاتێکە شێو ئامادەیە.

دۆن پاوڵۆ دەڵێ:« برسیم نیە. تۆ بچۆوە موسافیر خانە چونکە من دەبـێ هێشتا لە گەڵ ئەم برادەرە قسە بکەم.»

ماتالنا وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:

– ئاغـای کـەشـیش بۆ تۆ نازانـی ئەو فـەقـیـرە کـەڕ و لاڵە و بە ئامـاژە نـەبێ هیچ شتێ تێناگات.؟

کابرا لە وێ لە دەرکی کۆخەکە لە پەنا کەشیش دانیشتوە. دۆن پاوڵۆ تـەماشای دەکا و دەبینێ چاوەکانی پڕ لە ئەسرین بوون. ئەو دەم قەشە بە ژنەکە دەڵێ:

– قەی ناکا تۆ بچۆوە موسافیر خانە. من برسی نیم. هەر تک پیاو لە بەر سەر درانەی دەرگا دەمـێننەوە. ئەوەی قسـەشی پێدەکرێ بێدەنگە. جار و بار سـەیری یەکتـر دەکـەن. بزەیان دێتێ. تەواوی نیشان و شوێنەواری ڕۆژ بزر بووە و جێگای خۆی داوە بە ڕۆژ ئاوا شوێنە واری شەوە دەر دەکەوێ.

دۆن پاوڵۆ یەک دوو جـار دەکـۆخێ. لاوی کـەڕ ولاڵ ڕادەبێ لێفـەیەک لە سـەر دۆشـەکی بان پووش هـەڵدەگرێ و بە دوو دڵێ مـیوانی خـۆی تێوەر دەپێچێ. پاشـان دۆن پاوڵۆ بیر دەکاتەوە کە ئەو لاوە دەبێ بەیانی لە خـەو ڕابێ و بچێتە کار. ناچار هەڵدەستێ و دەستی دەکوشێ و شەو باشی پێدەڵێ.

لە وەتاغی گـەورەی قـاتی خـوارەوەی مـوسـافـیـر خـانە چەند کەس لە وەرزێران جێـیـان خۆش کردوە و خـەریکی قـومـار و خـواردنەوەن. دوو مـێـزی چەور وپیس و چەند سـەندەڵی حـەسـیـر لەو ژوورەدان. عـەکـسـێـکی ڕەنگی سـەرداری بەرپەڕی ونیـزی(١)لە دیوار بەر چاو دەکەوێ. تـەلیـسی پەتاتە و لۆبیـا و نیسک لە قـوژبنی وەتاغ لە سـەر یەک دانراون. ناڵبـەکـیـەکی پڕ لە نۆکی کـولاو بۆ تینوو کـردنی مـوشـتـەریان لە سـەر مـێـزێک دانراوە. مـوشـتـەری لەو نۆکانە دەخـۆن و دەخـۆنەوە و سـیـفـار دەکێشن و دیسـان دەخـۆنەوە و بێ وچانیش تـف فڕێدەدەن.. جـۆرێکە کـاتێ دۆن پاولۆ دێتە ژوور، هەمـیشە ئاگادارە نەخلیسکێ. قسە و باسی پیرە مێردانیش زیاتر لە بارەی قـات و قـڕی و نەخـۆشـیـە کـۆنەکـانە. بەڵام لاوان پـتـر باسی شـار دەکەن.

پیرە مێردێک بە ناوی« فاوا » هەمـوو شەوێ لە قـوژبنێکی دیاریکراو دادەنیشێ. هـەمـیـشـە گـرژ و خـۆگـر چاوی دەهەردی بریـوە و وەک ولاغ کـاوێژ دەکـا و شـتـێک دەجـوێ لە هـەمـوان زوو تر دێت و لە هـەمـوانیش درنگـتـر دەڕوات. لە ڕۆیشـتـندا ئەوەندە سـەر خـۆشـە کە ناتوانێ خـۆ لە سەر پێ ڕابگرێ. کـیـژەکانی دێن و بانگی دەکەنەوە. پاشـان کـوڕەکانی و دوایە ژنەکـەی. بەڵام ئەو گوێیان ناداتێ. ژنەکەی لێی دەپرسێ:

– ئاخر شـەڕاب لە ماڵێش هـەیە.بۆ چی لە شەڕابی باخی خۆمان ناخۆیەوە؟

فاوا لە وەڵامدا دەڵێ:

– شـەڕابی خـۆمـان سـەر خـۆشم نـاکـات. مـاتالنـا و ژنی فـاوا هێندێ شـەڕاب پێکەوە دەگۆڕنەوە. ئەو دەم ژنەکە دەڵێ:

– ئێسـتا ئەو شەڕابەمان هەیە کە تۆ گەرەکتە. وەرەوە لە ماڵێ بمێنەوە.

کـابرا دەڵێ: « کەیفی پێ ناکەم. هیچ شـتێک لە مـالێ کـەیفـخـۆشم ناکـات. دوو بارە هـەمـوو شەوێ لە سـالۆنی موسـافـیرخانە دا دەبیـتە سیـپاڵ. ئاخری ژنەکـەی لە گەڵ ماتالنا دم تێکدەنێ و دەڵێ:

– تۆ نـابێ شـــەڕابی بدەیەی! ئەگــەر ئـەو دەیەوێ شـــەڕاب ژاری مــار بکـات، با بێـتـەوە مـاڵێ. بەڵام فـایدەی نیـە. فـاو هـەمـوو شـەوێ لە سـالۆنی مـوسـافـیرخـانە ئامادەیە. و هـەمیشـەش لە شوێنێکی دیاریکراو دادەنیشێ.

کـاتێ دۆن پاولۆ دێتـە ژوور،« مـاسـتـر ئانجلو» و « نیکولا » خـەریکی قـومـارن. ماستر ئانجلو دەڵێ:

- کاتێ تۆم بینی کە لە گەڵ ئەو کـەڕ و لاڵە قسـان دەکەی پێم وابوو مـوجیزە ڕوویداوە. بەڵام دەر کـەوت تەنیـا هەڵەیەکی ڕووت بوە. دۆن پاوڵۆ لـە سـەر مێـزی ئەم دوو کەسە دادەنیشێ و لە وەڵامدا دەڵێ: « نە موجیزە بوو نە هەڵە »

نیکولا دەڵێ:« ئەو کابرا لاڵە زۆر ناقۆڵایە. ڕەنگە خـودا لە سـزای گوناحـان لاڵی کرد بێ. هەر تک پیاو دوو بارە قومار درێژە پێدەدەن. دۆن پاولۆ دەپرسێ: « ئێستا کە بەرهەم لە بەینچوە، ئەم ساڵ چۆن دەبەنە سەر.؟»

نیکولا لە وەڵامـدا دەڵێ:« ئەگـەر وابایە لە برسـان بمرین، ئێمە تا ئێستا حـەوت کفنمان ڕزاند بوو.»

ئەودەم دۆن پـاوڵۆ دەڵێ:« ئێـوە پێـتـان وا نیـە کـە ڕۆژێک لە وانەیە بار و دۆخ بگۆڕێ.؟»

ئەویتر لە وەڵامدا دەڵێ : « بۆ چی ، پاش مردنی نەخۆش دوکتور دەگاتێ »

دۆن پاوڵۆ لایەنی ئیحتیات وەلا دەنێ و بە شێلگیری دەپرسێ:

- قـەت نە تانبـیـسـتـوە وڵاتی ئەو تۆ هەن کـە لە وێدا بار و دۆخـێکی دیکە سەقامگرتوە.؟

ئێستا ماستر ئانجلو وەڵام دەداتەوە:

- بەڵێ، وڵاتی وا هەنە کە لە گەڵ وڵاتی ئێمە فەرقیان هەیە. خودا گیا لە جێیەک دەڕوێنێ کە مەڕی نیە. مەڕیش لە جێیەک دروست دەکات کە گیای لێ نیە.

دۆن پاوڵۆ هەستی حاڵی کەسێکی هەیە کە کوێرە کوێرە بە ڕێگا دا دەڕوا. لە پڕ جڵەوی دەسەڵاتی لە دەست بەر دەبێ و دەپرسێ: « وەک بیستوومە هەر لەم شارەی خـۆتان کـەسـاني وا هـەن لە نە بووني ئازادی ڕەنج دەکێـشن. ئایا ئێـوە لـە بەر نە بوونی ئازادی قەت ڕەنجو کێشاوە.؟

دەرنگ وەڵامـی دەدرێتـەوە. مـاسـتـر ئانجلو جـامـی شـەڕابـەکـەی پڕ دەکـا و دەیخواتەوە و بۆ لای دەرگا دەچێ، پاشان دەگەڕێتەوە و لە جێگای خۆی دادەنیشێ هەر وەک پرسیارەکەی نە بیستبێ. لە ئاخر دا دەڵێ:

- ئازادی ! بە هەڵکەوت چەندی بتـەوێ ئازادی هەیە. پێـشـتـر ڕێگا نە دەدرا کیژێک پێش مارە کردن لە گـەڵ دەزگیرانی بدوێ. دۆن پاوڵۆ دەڵێ؛ « مەبەستم ئەوە نیە. من سەبارەت بە پێوەندی دەزگیرانان قسە ناکەم.

ماستر ئانجلو دەڵێ:« ئێستا تێگەیشتم »

سەبیلەکەی تێکردوە و کێشاویەتی. کاتێ کوژاوەتەوە، سوتوەکەی سـەر دەستی

بە تال دەکـا و سـەبیلەکـە دەخـاتەوە گـیـرفـانی و پاش تاوێک بێـدەنگی وەڵامی بە خەیالدا دێ:

- بەڵێ ئێستـا وا تێدەگەم. مەبەستی ئاغای کەشیش ئازادی پیاوی بە ژنە. لە نێو ئێمەدا بار و دۆخەکە هەر وەک جاران ماوەتەوە. بەڵام لە دەشتێ چەندی بتەوێ ئازادی هەیە.

دۆن پاولۆ: « منیش تێدەگەم. ئیتر واز لە قسەکانی دێنێ.»

ئێوارەی یەکشەمۆ سالۆنی موسافیرخانە پڕ دەبێ لە حەشیمەت و دەبێتە کێشە و دەبەدەمە. وەرزێرەکان کاتێ شەراب دەخۆنەوە مل دەبەر یەک دەنێن. دۆن پاولۆ لە ژووری خۆیدا دەمێنێتەوە و تا شەو درنگ دەنگی هات و چۆی خەڵک و تەقە تەقی کورسی و پیالە لێکدان و هەرا و هوریای قسە و باسان و بە دوای ئەودا قیژە و هاواری زەلامان و دەنگی کەوتن و فڕێدانی بوتڵ ولیوانان دەبیسرێ.

ماتالنا دەپاڕێتەوە و دەڵێ: « هێدی بن. ئاخر دۆن پاولۆ لەو سەرە خەوتوە.

لە یەکێ لەو شەوانە دا« فرانچسکۆ گراچیا » دەیکاتە هات و هاوار و دەڵێ:

- من پێویستە لە گەڵ کەشیش قسان بکەم. پێی بێتە خوارێ. قسەم لە گەڵی هەیە.

ماتالنا دەڵێ:« نابێ. ئەو ئێستا نوستوە. »

گراچیا هاوار دەکا و پێدادەگرێ و دەڵێ:« پێویستە دەبێ قسەی لە گەڵ بکەم »

دۆن پاولۆ لیباس دەبەر دەکا و دێتە خوار و دەپرسێ:« کێ کاری بە منە »

فرانچسکۆ گراچیا دێتە پێش و دەڵێ:

- من مریدی سان فرانچسکۆم کە ناز ناوی پائولا» و لە پیرۆزەکانی کالانرە. رەسمێکی وی لە مالی منە. کاتێ پێداویستییەکم دەبێ، ژنەکەم مەجبور دەکەم لە پێش ئەو رەسمە دوعا بکات. ڕاستیت گەرەکە کە ئەو پیاوە پیرۆزە موجیزەیەک لە خۆ نیشان نادا. لە سەرە تاوە پێم وابوو خەتای ژنەکەمە کە نازانێ چۆن دڵی وی وەدەست بێنێ.

کەشیش دەڵێ: « من لە گەڵ ئەم مەسەلانە هۆگر نیم »

گراچیا درێژەی پێدەدا: « عەرزم کردی کە لام وابوو خەتای ژنەکەمە بەڵام دەر کەوت کە خەتای رەسمەکەیە. چونکە ئەم رەسمە ساختەیە. لەو رەسمەی لای من سان فرانچیسکۆ ڕیشی هەیە. کاتێ لە «سولمونا» بووم لە کلیسای وێنەدرێ رەسمێکی ئەو پیاوە پیرۆزەم بینی کە بێ ڕیشە. ئەو رەسمەی من هەمە» دۆن

چیپریانۆ»ی قەشەی لاما بە منی فرۆشتوە. چۆن دەکرێ قەشەیەک رەسمی ساختە بفرۆشی.

کەشیش دەپرسێ: « دۆن چیپریانۆ» چی بە تۆ گوت.؟»

گراچیا لە وەلامدا دەڵێ:

- من کە لە « سمولونا » گەڕامەوە بۆ ئیراد گرتن دەست لە جێ چوومە لای و گوتم « ئاغای کەشیش ئەمە خەتای تۆیە کە من تەمەنی خۆم کردۆتە وەقفی پیرۆزێکی ساختە. هەر بۆیەش کارەکانی من قەت سەر ناگرن. بۆ نمونە کاتێ ددانم دێشێ چرای پێش رەسمەکە هەڵدەکەم. ڕۆنی چرایەکە دەسوتێ و تەواو دەبێ، بەلام ددانم ژانی ناشکێ. چیپریانۆ لە وەلامی مندا دەڵێ: « وێکچوون و وێک نەچوونی رەسم گرنگ نیە. بیر و باوەڕ و سەفای دەرون ئەسڵە.» بەلام ئەگەر وێکچوونی رەسم گرنگ نیە، ئێمە رەسممان بۆ چیە.؟ کوڕی من ئێستا سەر بازە. ئەگەر رەسمێک بۆ من بنێرێ و من بزانم ئەوە رەسمی خۆی نیە و رەسمی کابرایەکی دیکەیە، من ئەو رەسمە بۆ لە دیوار هەڵداوەسم.؟ بۆ چی ئەو رەسمەم خۆش گەرەکە

بێدەنگی بە سەر سالۆنی موسافیرخانە دا زاڵ دەبێ. گشتیان چاوە ڕوانی وەلامی دۆن پاولۆن. کەشیش دەڵێ:

- ماگاشیا ڕیشی هەیە. ئێستا ئەگەر رەسمی خۆی بکێشێ، رەسمەکە ڕیشدار دەبێ. بەلام ئەگەر لە ئێستاوە تا ساڵێکی دیکە ڕیشی بتاشی و دوایە بە ڕیشی تاشراو بچێ رەسمێک بکێشێ لەم دوو رەسمانە کامیان ڕاستە و کامیان ساختەیە.؟

گراچیا دەڵێ : « هەر تکیان ڕاستن »

کەشیش دەپرسێ: « چەند ماگاشیا هەن ؟»

گراچیا لە وەلامدا دەڵێ « « یەک »

کەشیش دەڵێ باشە. کە وابوو تۆ یەک ماگاشیا و دوو رەسمت هەیە. ئێستا ئەوەش ڕاست بە سەر سان فرانچیسکۆ ی ناز ناو«پائولۆ» هاتوە.

وەلامی دۆن پاولۆ بە چەپڵە لێدان پێشوازی لێدەکرێ. شەڕابی بۆ دێنن. کەشیش دەبێ دوو بارە بە دەوری سالۆندا بگەڕێ. لێو لە پیاڵەی هەموان بدا. پاشان شەو باشیان پێ دەڵێ و بۆ ژووری خۆی دەگەڕێتەوە. بەلام هێشتا خەوی لێ نەکەوتوە کە دیسان بانگی دەکەن بۆ سالۆنی موسافیر خانە.

سێ کوڕی گەنج کە قوماری« حەفت و نیو» یاری دەکەن لە سەر شای خاچ

لێیان دەبێتە کێشە. لە قوماری « حەفت و نیو» دا وەرەقی شای خاچ دەیباتەوە. ماتالنا هەر دوو دەستی وەرق هەیە. شای خاچی هەر تک دەست ئەوەندە پیس و چڵکن بوە، قوماریان پێناکرێ. بۆ پێشگری لە کێشە دانیل مالیتا پێشنیاری کردوە:

– لە بەر ئەوەی شای خاچی ئەم وەرەقانە ناسراوە وەرن سێ پیک لە جێی شای خاچ دابنێین. سێ پیک کە لە وەرەقەکانی تر جیا ناکرێتەوە دەبێتە شای خاچ.

میکلە ماسکولو ئیرادی گرتوە کە :

– شتی وا نابێ. ئەگەر هەمووشمان هاو دەنگ بین دیسان شتی وا نابێ. چونکە شای خاچ هەمیشە شای خاچە. شای خاچ لە وانەیە چڵکن و نیشاندار و کون کون بێت، بەڵام هەمیشە هەر ئەوە دەبێ کە هەیە. بۆ نموونە ئەمە سەبیلەیە. ئێستا تۆ دەپرسی بۆ چی ئەمە سەبیلەیە.؟ سەیرە، ئاشکرایە ئەوە سەبیلەیە، چونکە سەبیلەیە. نموونەیەکی دیکە: پاپ پاپە. بۆچی ؟ چونکە پاپە. لە بارەی شای خاچیش ئەم مەسەلەیە ڕاستە. شای خاچ شای خاچە و هەمیشە شای خاچ دەمێنێتەوە.

دانیل دەڵێ: « ئەسڵ ئەوەیە کە ئێمە هەموومان موافیق بین و یاری هەر ئاوا بە باشی دەگەڕێ. چونکە کەس ناتوانێ لە پێشدا بزانێ کە شای خاچ بە دەست کێوەیە.

ماسکولۆ قانیع نەبوە:

– تۆ ئێژی دەبێ ئێمە موافیق بین و تەواو. بەڵام ئەوە بەس نیە. تۆ دەڵێی قومار گۆڕانی بە سەر دانایە، ڕەنگە وابێ، بەڵام ئەو قومارە غەڵەت دەبێ. ئەوەڕاست وە ژنێک دەچێ کە بە ئیجازەی مێردەکەی زینا بکات. چما ئەوە گوناح نیە؟ دیارە گوناحە هەر چەند ڕازیش بێت.

شاتاپ کە لە سەر مێزی پیرە مێردان دانیشتوە و گوێی داوەتە ئەم دەمبە دەمەیە پێشنیار دەکات لە دۆن پاوڵۆ بپرسن.

دۆن پاوڵۆ بۆ جاری دووهەم دێتە خوار و کێشەکە لای ئەو باس دەکەن. شاتاپ تکای لێدەکا کە بڵێ کامیان ڕاستە و هەقیان بەدەستە.؟

کەشیش وەرەقی خاچ دەگرێتە دەست و ڕوو دەکاتە مۆکلە ماسکۆڵۆ و دەپرسێ:

– تۆ پێت وایە نرخی ئەو وەرەقە لە خودی وەرەقەکە دایە یا لە ئیعتبارێک دایە

که بۆی قایل بوون.؟

ماسکۆلۆ دەڵێ:« ئەم وەرەقە لە خۆوە نرخی لە وەرەقەکانی دیکە زیاترە چونکە شای خاچە.»

کەشیش دەپرسێ:« وەرەق لە کوێوە هاتوە؟

یەک لە ئامادە بوان دەڵێ: « لە چاپخانە چاپ کراوە.»

کەشیش لە ماسکۆلۆ دەپرسێ: « ئەم وەرەقە بەر لەوەی چاپ بکرێ چی بوە؟»

یەکێک وەڵام دەداتەوە؛ لەتە مقەوایەک بوە وەک مقەوای دیکە.

کەشیش درێژەی پێدەدا : « کە وابوو ئەم وەرەقە نرخی خۆی لە چاپچییەکان وەر گرتوە. هەر لە خۆوە نرخی نیە. یانی نرخی وەرگیراوە. وتەکەم تەواو نە بوە. ئێستا ئەم نرخە وەر گیراوەی وی هەر وەک خۆی دەمێنێ یا گۆڕانی بە سەر دادێت. واتە شای خاچ لە گشت یارییەکان هەر هەمان نرخی هەیە کە لە یاری» حەفت و نیو«دا هەیەتی یا نرخەکەی دەگۆڕێ.؟

ماسکۆلۆ لە وەڵامدا دەڵێ:« نرخەکەی دەگۆڕێ و بە گوێرەی یاری فەرق دەکات،

کەشیش دەپرسێ: « کێ ئەم قومارانەی داهێناوە .؟»

کەس وەڵام ناداتەوە. دۆن پاولۆ دەپرسێ:« پێتان وانیە قومار بازەکان یاریان داهێناوە ؟

گشتیان تەنانەت ماسکۆلو یش پشتی قسەکەی دەگرن کە قومار باز دایان هێناوە. کە وابوو ئیعتیباری وەرەقەکان لە یاریدا قومار باز دیاری دەکەن. کەشیش نەتیجە دەگرێ:

- ئێستا کە ئەم وەرەقەیە نەک نرخی خۆیی، بەڵکو نرخی وەر گیراو یا پێدراوی هەیە مانای وایە ئێوەش دەتوانن هەر چۆنی دەخوازن ئاوای دابنێن.

دوو بارە بە ئافەرین پشتی کەشیش دەگرن و شەڕابخۆرەکان هاوار دەکەن:

- ئافەرین، هەزار ئافەرین. تا ئێستا پیاوێکی ئاوا خودایی و مەزن و تەواو لە گوندی ئێمە دا نەبوە. دۆن پاولۆ ڕوو دەکاتە شاتاپ و دەڵێ:

- سەر دەمێک هەر لەم« پیتراسکا»یە کابرایەک هەبوو بە ناوی« کارلۆ کامپانلا» ئێستا لە نیویورک کابرایەک هەیە بە ناوی« چارلز لیتل بل یخی» ئایا ئەم دوانە یەک کەسن یا دوو کەس؟

هێندێ پێکەوە وەڵام دەدەنەوە: « هەر تکیان یەک کەسن»

شاتاپ کە پرسیار لەو کراوە بە وانیتر دەڵێ: « شات ئاپ!»( بێدەنگ بن)من

دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە و دەڵێ:
- ئەوانە هەر تکیان یەک کەسن، تەنیا ناویان گۆڕیوە.
کەشیش دەپرسێ:« کاتێ پیاوێک بتوانێ ناوی خۆی بگۆڕێ، بۆ چی وەرەقێک ناتوانێ ؟»
دۆن پاولۆ درێژەی پێدەدا:
نموونەیەکـتــان بۆ بێنمــەوە. لەو لایە کــە ڕۆژ هەڵدێ وڵاتێک بوو حــاکم و دەســەڵاتدارێکی هــەبوو، بەڵام لەو کـاتەوە کـە وەرزێران لـە بەرانبـەر فـەرمـانـی ویدا سەریـان بەرز کردەوە. ئەو ئیتر دەسـەڵاتی کۆتایی پێهات. حوکمـڕان نەبوو، بەڵکوو بوو بە حـاکـمێکی پێشـوو، ئیسـتـاش دوور خـراوەیەکی سیاسـییـە. یانی شـتێکە وەرزێڕێکیش دەتوانێ وابێت. کە وابوو چۆنی دەخـوازن و دەتوانن یـاری « حـەفت و نیـو» ئـاوا بکەن. دۆن پاولۆ وەرەقی شـای خـاچ دەداتەوە بە دانیل، شـەو باشـیـان پێدەڵێ و لە گەڵ دەنگی ئافەرینی دانیشتوان دەچێتەوە ژووری خۆی.
دانیل ڕوو دەکاتە وەرەقی شای خاچ و دەڵێ:
- ئێستا کە تۆ پیس و چڵکن بووی لە ئێستا بە دواوە دەسـەڵاتت کۆتایی پێدێت و ئیتر تۆ شـای خـاچ نی. بەڵکوو شـای پێشـووی. پاشـان ڕوو دەکـاتە وەرەقی سێ پێک و دەڵێ:
- لە ئێسـتـا بە دواوە تۆ لە یاری حـەفت و نیو دا، جێگای شــای خـاچ دەگری. مەهێڵە پیس و چڵکنت بکەن ئەگینا تۆش جێگای خۆت دەدۆڕێنی و جێگات دەدرێ بە وەرەقێکی دیکە.
قومار بازەکانی دیکە پێدەکەنن و پەسەندی دەکـەن. یاری درێژە دەکێشێ. بەڵام لابردنی شـای خـاچ لە ڕۆژەکـانی دوایـیشـدا دەبێـتـە هۆی بـاس و لێدوانی نێـوان وەرزێڕەکانی پیتراسکا.
ڕۆژی دوایی مـادمـازیل« پاترینیانی» مـامۆسـتـای گوندی دێتە پێش دۆن پاولۆ و دەناڵێنێ و دەڵێ:
- ئیـمـڕۆ من لە کـلاسی گـەورە سـاڵاندا نەمـتـوانی دەرس بڵـێـمـەوە. کـوڕە گەنجەکان تەواوی کـات هەر باسـی داسـتـانی شـای خـاچ و سێ پێکیان دەکـرد. ئەو باسەیان دوو پات کردۆتەوە کە دوێنێ تۆ لە تالاری موسـافیر خانە باست کردوە.
مـامـۆسـتـا نیشـانی حـیـزبی دەوڵەتی لە سـەر دڵی هەڵواسـیـوە. کـاتێ هـەنـاسـە هەڵدەکێشێ نیشانی سێ ڕەنگ وەک بەلەم بە سـەر شەپۆلدا سەما دەکات.

مامۆستا لە قسەکانی زیاد دەکا :

– خەڵکی ئێرە لە ڕادە بەدەر نەخوێندەوار و ساکارن. ئەگەر بە هەڵکەوت لە کن کەسانی خوێندەواری وەک ئێمە دانیشن، هەمیش پێچەوانەی ئەوە تێدەگەن کە دەگەڵیان باس دەکرێ. مامۆستا ژمارەی تازەی ڕۆژنامەی دیواری « دەنگ و باس »ی ڕۆمی پێیە و دەبێ لە دەرگای کلیسای بدا. بەر لەوەی بە دەرگای کلیسایەوە بچەسپێنێ، دەبێ دەنگ و باسی نێو ڕۆژنامەکە بۆ وەرزێرانی موسافیر خانەی ماتالنا بخوێنێتەوە و باسی لە سەر بکات. لە نێو وەرزێراندا بۆتە قاو کە قەشەش دەیەوێ قسان بکا. هەر بۆیە زیاتر لە جاران خەڵک لە سالۆنی موسافیر خانە کۆ بوونەتەوە. وەرزێرانی وا دێن کە کەشیش هێشتا نەیدیون. هەموویان خوار و خێچ و ڕوخساری خروێلکاوی و ئەحمەقانەیان هەیە. سەریان لە بەر نەخۆشی و نا لە باری کەش و هەوا و هیلاکی شکڵی گوڕاوە. حاڵەتێکی چاو خاینانیان هەیە کە بڕوا بە کەس ناکەن. گەنجەکانیش سیمای وەحشیانە و شەڕانیان هەیە. لە ماوەیەکی کەمدا حەشیمەت دەگاتە سی کەس و هەموویان لە سەر هەرد دادەنیشن. لەو کۆمەڵەی کە لە کۆبوونەوەی وان پێکهاتوە بۆنی بزنی بە تەکە تێکەڵ لە گەڵ بۆگەنی پەین و لیباسی چڵکن و شڕۆڵ و دڕاو هەڵدەستێ. بۆنێکی پیس کە ئینسان دەخنکێنێ.

دۆن پاولۆ لە پەنا مامۆستا لە خوارووی پەیژەی قاتی یەکەم دانیشتوە. مامۆستا لە کن قەشەیەکی بێگانە خۆی لە ڕادە بەدەر زۆر بڵێ و دم هەراش نیشان دەدا. بە بیسەران دەڵێ باش سەرنج بدەنێ وله بیستنی ڕوونکردنەوەی وشە گەلی گران ترسیان نەبێ. پاشان دەست دەکا بە خوێندنەوەی« دەنگ و باسی ڕۆم » و دەڵێ:

– ئێمە پێشەوایەکمان هەیە کە تەواوی نەتەوەکانی سەر زەوی حەسرەتیان هەیە یەکي وایان هەبێ. خوا دەزانێ ئامادەن چەند پارە بدەن تا ببێتە پێشەوای وڵاتی وانیش.

ماکاشیا قسەی وتە وێژ دەبڕێ. ئەو دە مانای هەموو وشەکان ناگات و دەیەوێ بزانێ نەتەوەکانی دیکە ئامادەن چەندە پارە بدەن تا پێشەوای ئێمە بکرن.

مامۆستا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەمە تەنیا شێوەیەکە بۆ تێگەیشتنی گشتی. بەڵام ماکاشیا دەستی لێ هەڵناگرێ و هاوار دەکا و دەڵێ : « شێوەی دەربڕینی تێگەیشتن یانی چی ؟» نەتەوەکان دەیانەوێ پارە بدەن یان نایانەوێ ؟ ئەگەر بە

ڕاستی دەیانەوێ بیدەن ئامادەن چەندە بدەن و کامەیان پارەی زیاتر پێشنیار دەکەن.؟

مامۆستا دوو بارە دەڵێ: ئەمە مەبەست جۆرێک شێوەی دەربڕینە.

ماکاشیا لە وەڵامدا دەڵێ:« کە وابوو ڕاست نیە کە دەیانەوێ بیکرن. ئێستا کە نایانەوێ بیکرن بۆ چی بە درۆ لەو ڕۆژنامەیەدا نووسیویانە دەیانەوێ بیکرن.؟»

شاتاپ دەپرسێ: « ئەوانەی دەیانەوێ بیکرن ئایا قیمەتەکەی نەغد لە مەجلیس دا دەدەن؟

مامۆستا تەماشایەکی کەشیش دەکا و هەناسەیەک هەڵدەکێشێ وا دیارە دەیەوێ بێژێ:« ئێستا دەزانێ کە مرۆڤ چۆن لە گەڵ ورچ بچێتە جەواڵەوە.»

خەبەری دوایی لە بارەی وەرزێرانە.

ماستر ئانجلو دەپرسێ: « وەرزێران ئەوە ئیتر چ شکڵێکە ؟»

مامۆستا دەڵێ:« وەرزێران یانی ئێوە. تا ئێستا چەند جار ئەو مەسەلەیەم بە ئێوە گوتوە، دوو بارە دەڵێ: « شۆڕشی وەرزێری بە هەموو ئامانجەکانی خۆی گەیشتوە.»

شاتاپ قسەکانی دەبڕێ و دەپرسێ :

– وەرزێرەکان ئێمەین؟ مەبەست لەو شۆڕشە وەرزێرییە شۆڕشێکە کە ئێمە کردوومانە ؟

مامۆستا دەڵێ : « بەڵێ، بێگومان »

شاتاپ دەپرسێ:« ئێمە چ شۆڕشێکمان کردوە.؟»

مامۆستا وەڵام دەداتەوە:« ئەم وشەیە دەبێ بە واتای مەعنەوی تێبگەی.»

ماکاشیا قانیع نەبوە و دەڵێ:

– دەوڵەت ئەو پەڕە کاغەزەی بۆ ئێمە ناردوە. لەوێدا نووسیویانە کە وەرزێران واتە بە قەولی مادمازیل وەرزێران شۆڕشیان کردوە و ئەم شۆڕشە بە تەواوی بە ئامانجەکانی خۆی گەیشتوە. دەمەوێ بزانم ئێمە بە کام ئامانج گەیشتووین.؟

مامۆستا لە وەڵامدا دەڵێ: « بە ئامانجە مەعنەوییە کان » مامۆستا زمانی دەگیرێ و هێندێ شتی وادەڵێ کەس تێیناگات. ئاخریەکەی بروسکەی بلیمەتی لە مێشکیدا دەدرەوشێ و لێی زیاد دەکا و دەڵێ:

– شۆڕشی وەرزێری وڵاتی لە مەترسی کۆمونیستی نەجات داوە. لە گەڵ ئەوەش هێشتا ئەم مەترسییە هەر هەیە و دەوڵەت وشیارە.

فرانچسکۆ گراچیا دەپرسێ : « کۆمونیستەکان کێن ؟»
مامۆستا تەواو بوە و پێویستی بە بیر کردنەوە نیە. چونکە لە بەریەتی و دەزانی کە دەبێ چی بێژێ:
– کۆمونیستەکان ئەو خەراپکارانەن کە شەوانە لە گەنداوەکانی شار دا لێک کۆ دەبنەوە. بۆ ئەوەی مرۆ بتوانێ ببێتە کۆمونیست دەبێ خاچ لە ژێر پێدا پانکاتەوە و تفی لێبکات و بەڵێن بدا کە لە ڕۆژی هەینی پیرۆز دا گۆشت بخوا.
مامۆستا هێندێ شتی دیکەش لە ڕوونکردنەوەی خۆیدا دەخاتە سەر بەرنامەی کاری کۆمونیستان کە ماتالنا و وەرزێرە پیرەکان ترسیان لێدەنیشێ بەڵام وادیارە قسە لە بێ باوەڕییە.
مامۆستا درێژە ی پێدەداو دەڵێ:« کۆمونیستەکان کاتی دروێنە دەچنە مەزرا تا خەرمانەکان بسوتێنن.
« پاسکاندرە» ئەم مەتڵەبەی ئاخری پشت ئەستور دەکا و دەڵێ : « لەم دواییە دا لە فۆچینۆ پتر لە ژمارەی ئاسایی ژاندارمی دیون. پرسیویەتی:« ئێوە وا زوو لەم مەزرایە چدەکەن ؟» ئەوان لە وەڵامدا گوتوویانە: « کۆمونیستەکان شەوانە لە دەورەی گوندەکان دەگەڕێن و دەیانەوێ خەرمانان بسووتێنن.»
مامۆستا ڕوونکردنەوەی زیاتری هەیە. شێوەی دەر بڕینی قسەکانی لاساکردنەوەی دەقە ڕەسمیەکانی کتێبە سانسۆڕ کراوەکانە کە بۆ شاگردانی مەدرەسە چاپکراون. فرانچسکۆ گرانچی ڕادەبێ و دەڵێ: «من موافیق نیم » کڵاوەکەی لە سەر دەنێ و دەر دەکەوێ. دۆن پاوڵۆ ش تاوێک دەچێتە دەر و بە بزەیەکەوە لێی دەپرسێ:
– هاوڕێ دەتوانی بە من بڵێی لە گەڵ چی موافیق نی.
گراچیا بە سرتە دەڵێ : « هەر بۆیەم بوو مامۆستا نارەحەت بکەم »
لە ڕاستیشدا بۆ وی زۆر گرانە کە ژنێک بێ دەرس بە پیاوان بڵێ. لە زەمانی پێشوودا لە کلیسا و لە ناوچەی کەشیش نشینەکان ئەلف و بێیان دەرس دەدا. پاشان مامۆستای پیاو پەیدا بوون و مەدرەسە کرانەوە و وەزع زۆر باشبوو. بەڵام ئێستا لە هەموو شوێنێ مامۆستای ژن دەرس بە منداڵان دەڵێن، ئەوەش خەراپ نیە. بەڵام ژن دەرس بە پیاوی گەنج بڵێن.. گراچیا دەڵێ : ئەگەربە پێچەوانەی ئاسایی قەرار بێ ژنەکان فێری پیاوەکان بکەن کە چۆن دەبێ منداڵ دروست کەن، ئەودەم منداڵەکان هەموو خواردێنە سەر دنیا.

دۆن پاولۆ بۆ سالۆني موسافيرخانە دەگەڕێتەوە.

باندو چيا دەپرسێ:« لە بارەی بازار هيچ نە نووسراوە؟ ئاخر ئەو باجەيان بۆ چی لە سەر ئەو پەڕی قيمەتەکان داناوە.؟

بەڵام مامۆستا وەک گوێی نەدابێتێ جولەيەک دەکا و دەيەوێ بڵێ:« شانی ڕۆژنامەيەک کە لە پێتەختەوە بێ لە وە زياترە کە خۆ بەم قۆرياتەوە خەريک بکات.

مامۆستا پاش ئەوەی ئاخرين خەبەر دەخوێنێتەوە و لێکی دەداتەوە باسی يێکێتی وڵاتانی پرۆتستان دژی ئيتاليا دەکات.

لويچی باندوچيا دەپرسێ: « وڵاتانی پرۆتستان کامانەن ؟»

شاتاپ بەر لە مامۆستا وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:

- وڵاتانی پرۆتستان وڵاتە دەوڵەمەندەکانن. ئەو وڵاتانەن کە ڕوحی خۆيان فرۆشتوە. ئەوان لەم جيهانە دا کامەڕانن بەڵام لە دنيای دی جێگايان جەهەندەمە.

ڕوونکردنەوەی شاتاپ گوێگرەکان قانيع ناکا. بۆيە تورە دەبن و هاوار دەکەن کە : مستر « چارلز ليتل بل يخی-زغالی» بوو بە پرۆتستان و باری خۆی بار کرد و ڕۆيشت.

هێندێ دەپرسن :« ئەگەر ئەم وڵاتانەی پرۆتستان دەوڵەمەندن، ئەدی بۆ چی « پرۆتێست» دەکەن ؟

مامۆستا سەر بردەی « لۆتر» (١) دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

- لۆتر کەشيشێک بوو کە وەک هەموو مەسيحيانی ديکە بۆ فەرمانبەرداری و داوێن پاکی و فەقيری سوێندی خوارد بوو. ڕۆژێک لە کەڵ ژنێکی تەرکە دنيا بوو بە ئاشنا و بە توندی دڵی دايە. ئيجازەی لە پاپ خواست کە ئەو ژنە بێنێ. بەڵام پاپ ڕێگای نەدا. ئەو دەم لۆتر دەستی کرد بە ئيراد گرتن. تەواوی ئەو کەشيشانەی کە بە تەنگ نەزر و پەيمان و داوێن پاکييەوە نەبوون ڕەگەڵ وی کەوتن و پرۆتستانيزم لە مەوە پەيدا بوو.

مامۆستا هيچی لە داستانەکە زياد نە کردوە. دۆن پاولۆ دێتەوە بيری کە کاتێکی هێشتا منداڵ بوە يەک لە پورەکانی پرۆتستانيزمی هەر ئاوابۆ باسکرد بوو.

---

لۆتر کەشيشی ئەڵمانی (١٤٨٢-١٥٤٦) کە بناخە دانەری تەريقەتی پرۆتستانيزم-ە پرۆتستان يانی ئيراد گر.

لە زۆر گوندەکانی « ئابروتسە» وشەی پروتستان جنێوێکە لە نێو ( سەر سەری و لاتی بێ دایک و باب و تورکاندا . کەسێکی ڕێز لە بابی خۆی نەگرێ» لات»ە. ئەو کەسەی خوشکی ئەتک بکا» پروتستان» ە. بەڵام ئەوە کەسەی دایکی ئەتک بکات « تورکە».

ماموستا لە ئاخری وتارەکەیدا دەڵێ:

– یەکێتی لاوانی پرۆتستان دژی ئیتالیا و لە ژێر ڕێبەرایەتی ئینگلستان دایە.

ڕاگەیاندنی ئەم مەترسیە شاتاپ نیگەران دەکا و دەڵێ:

– مەلەکە ڤیکتۆریا دەوڵەمەندە و زۆریش دەوڵەمەندە. ئەگەر ئەو دژی ئێمە ڕاپەڕێ، هاوار بە حاڵمان.

مامۆستا وەدوای کاری خۆی دەکەوێ و دەڕوا . چونکە درنگ بوە. دۆن پاولۆ لە گەڵ چەند کەسی دێهاتی لە سالۆنی موسافیر خانە دا دەمێنێتەوە کە باسی شاژنەکان دەکەن. ئەوان شاژنی زۆر ناناسن بەڵام ئەوانەی دەیان ناسن، باشیان دەناسن. یەک لەوان مەلەکە» ژان» ١ کە گایەکی بە خۆ فێر کردوە، ئەوی دیکەیان مەلەکە« سمیرامیس» ٢ە کە جوت بوونی مردنی بە دواوە بوو. یەکی تر مەلەکە « کریستینا » ٣کە تەواوی سەروەت و سامانی خۆی بە سەر فەقیراندا دابەش کرد. یەکی تر مەلەکە«تایتۆ»٤ ژنی مەنلیک و ئاخرەکەشی مەلەکە ڤیکتۆریا دەوڵەمەند ترین مەلەکەی دنیا و چەند کەسی دیکەش. تەواوی ئەو شاژنانە وا لە زەیندا زیندوون کە جیاوازی سەر دەمی ژیانیان لە بیر دەچێتەوە. وای لێدێ کە وەرزێران لە بارەی کێشەی یەک دوانیان داستان بگێڕنەوە.

---

١ـ مەلەکە ژان ناسراو بە مەلەکە شێتە مەلەکەی کاستێلە - ١٤ـ١٥٥٥ ژنی فیلیپ پاشای فەرانسە و دایکی شارلکن

٢ ـ سمیرامیس مەلەکەی جوانی و ئەفسانەیی ئاشور و بابل کە ساز کردنی شاری بابل وباخە هەلاوەسراوەکانی بە ناوی ئەو ناسراون

٣ ـمەلەکە کریستین کیژی گوستاو ئادولف پاشای سوید ١٦٢٦ـ١٦٨٩ کە ساڵی ١٦٥٤ پاش ئەوەی چوە سەر ئایینی کاتۆلیک دەستی لە پاشایەتی هەڵگرت . پشتیوانی لە دکارت کرد و لە پاریس پیاوی دڵخوازی خۆی بە ناوی مونالد شی کوشت و چوە ڕۆم و هەر لەوێش مرد.

٤ ـمەلەکە تایتۆ ژنی مەنلیکی دووهم ئیمپراتوری حەبەشە کە مێردەکە ساڵی ١٨٩٦ ئیتالیاییەکانی شکاند و مەجبوری کردن سەر بەخۆیی حەبەشە بە ڕەسمی بناسن.

شاتاپ دەڵێ: « ئەوەی کە هەمیشە بۆتە هۆی داماوی ئێمەی میللەت ئیحساساتە. هاو سەری لە گەڵ مەلەکەیەکی دەوڵەمەند بۆ میللەتێک بە مانای سوک بوونی باجە. بۆ چی پاشای مە ویستوویە کیژی بزن لەوەڕێنێکی» مۆنتە نگرۆییز بخوازێ؟ لە بەر ئیخساسات. دنیا پان و بەرینە و ئەو هەموو ژنە دەوڵەمەندەی تێدایە. ئەو دەیتوانی ژنێکی ئەمـریکایی، یا فـەرانسـەیی بخـوازێ. دیارە نـابێ لە هـەق بگوزمرین ژنی فـــەرەنسی لوت بـەرزن. بەڵام پاشـــا مـــافی ئەوەی هەیە ژن لە کـــۆشک دابنێ و نۆبەوانیشی بۆ دابنێ و فەرمانیش بدا هەر لاوێکی خەیاڵی نیزیکبوونەوەی کۆشکی هەبێ تەقـەی لێبکەن. حەیف کە ناکرێ فەرمـان بە دڵ بدرێ. کاری دڵە کە پاشا ویستوویەتی کیژی فەقیرێک بخوازێ.

ماتالنا دەڵێ: ژن هێنان و مێرد کردن کارێکی تایبەتییە.

ماگاشیا دەڵێ:

- بەڵام دووکەڵی دەچێتە چاوی ئێمە. چونکە ئێمە دەبێ باج و مـاڵیات بدەین. من کاتێ بیستم کە شـازادەی مە دەیەوێ کیژی بەلژیکی بخـوازێ چوومە پۆستخـانەی فوسا و لە مودیری دەفتـەری پۆستخـانەم پرسـی: ئەو بلژیکییە کێیـە دەیەوێ لە گەڵ ئێـمە خزمـایەتی بکات، شـوێنێکی گـەورەیە، یا لانیٚ کـەم دەوڵەمـەندە.؟ لە وەڵامـدا گـوتی : وڵاتێکی دەوڵەمـەند بوە، بەڵام ئەڵمانیـەکـان تاڵانیـان کـردوە. دەبینی کـە هەمیشە ئیحساسـات لە کار دایە. هەمیشـە هەر هەمان بەزمە. ئاخر ئێـمە بۆ دەبێ لە گـەڵ وڵاتێکی تاڵانکراو خـزمـایەتی بکـەین. ئەو هەمـوو وڵاتە دەوڵەمـەندە هەنە، ئەمریکا هەیە، فەرانسە هەیە. ڕاستە ژنە فەرانسەویەکان سوک و لوت بەرزن، بەڵام ئەگـەر شـــازادەیەک بخـوازێ دەتوانێ ژنەکـەی لە کـۆشک دا حـەپس بکات و تفەنگچیانیشی لە دەورە دابنێ و فـەرمان بدا هەر لاوێکی لە کۆشک نیزیک بێتەوە تەقەی لێبکەن.

هەر ئێستا برای دینی « ئانتي فونا» لە تـەپ و تۆز دا نوقم بوە. بۆ ئەوەی ئاوێک بە سـەر و چاوی دابکات لە سـاڵۆنی مـوسـافـیـر خـانە وەژوور دەکـەوێ. تۆربەی سـەر شانی پەتاڵە. دۆن پاولۆ لێی دەپرسێ:« وادیارە سەدەقەی زۆرت کۆ نە کردۆتەوە؟» کەشیش کبوشی لە وەڵامدا دەڵێ:

- تەنـانـەت ئەوەندەش نیـە کـە قـەرەبـوی پێـڵاوە دڕاوەکـانم بکـاتەوە. لە بەر دەرگـا وێسـتـاوە، کـەوشـێکی داری کۆن و لە کـار کـەوتووی لە پێدایە. قـاچەکـانی لە بەر ئاوسـان و قـەڵشین ڕەش هەڵگەڕاون. مـاتالنا پیـاڵە شـەرابێکی بۆ دێنێ، بەڵام ئەو

نایخـواتەوە. دیارە لە بەر بوونی کـەشـیش لە وێ لە عـەزابدایە. ناشـزانـێ بڕوا یا بمێنێتەوە. دەبـێ بێژێ چە ؟
پێش نوێژەکـانی کـەشـیش نشـینی دراوسێ چەند جـاران ناوی ویـان سـەبارەت بە دوژمنایەتی لە ڕادە بەدەری لە گەڵ وەرزێران بە کەشیش گوتبوو. ماتالنا پێی دەڵێ:
– بێخۆوە شەرمێ مەکە، پێیداکە !
ئەم پێداکردنە شەرم و حەیای کەشیش کبوشی زیاتر دەکات و دەڵێ:
– هـەر کـەس بە جۆرێک عـەبدایەتی خوا دەکا. یەک بە قسـە، یەک بە خێرات، یەک بە پاکی. چارە نووسـی من وا بوە کە بە سـەر شـەقـامـاندا بگەڕێـم و سـەر گـەردان بم. باوکی گەورەی روحانی بە من دەڵێ کە من کەری خودام.
دۆن پاوڵۆ بزەی دێتێ. ئەو دەم کەشـیش کبوشی وەغیرەت دەکەوێ. سـەر هـەڵدێنـێ و وەک ڕەعیەتێکی گوێ لە مست چاوێکی لێدەکات.
کەشیش دەپرسێ: « بۆ چی سەدەقە کەم دەدەن ؟ چما دین و ئیمان کەم بوە ؟
برای دینی ئانتی فونا دەڵێ :
– ئێستا لە دەشـتێ بیمە داهاتوە. کاتێ من بە دابی سـەدەقـە بۆ سن فرانسوا داوای شـتێک دەکەم تا سن فـرانسوا بەر و بومی وان لە تەرزە بپارێزێ، لە وەلامدا دەڵێن: « بەر و بومـان بیمـەیە » دەڵێم کە وابوو سـن فـرانسـوا بەر و بومی ئێـوە لە سـوتـان دەپارێزێ. لە وەلامدا دەڵێن: « لە بەرانبـەر سوتانیشدا بیمـەیە » ئەو دەم من لە خۆم دەپرسـم کـە وابوو لە سـەر ئەو هـەمـوو بیمـە بازییـە بۆ چی نیگەرانن. لە چی دە ترسێن ؟
مـاتالنا دەڵێ:آ فـەقیر هـەمیشـە دەترسـێ. یەک مـاڵێکی هـەیە بوومـە لەرزە دێت، یەک سـاخ و سـەلیمـە نەخۆشی لێ پەیدا دەبێ. یەک پارچە زەویەکی هـەیە، ناچار دەبێ بیفرۆشێ.»
ماستر ئانجلو دەڵێ:
– لە زەمـانی قـەدیم  هـەر پیشـەیەک سـەر بە پیرۆزێک بـوو. بۆ نموونە کـەوش دروو« سن کرە پن » یان هـەبوو. خـەیاتەکان« سن ئومبـونو» و دارتاشەکـان « سن ژوزیف» یان هەبوو. ئێستـاش هـەر پیشە یەک سەندیکای خـۆی هـەیە. بەم حاڵەش لە ڕابردوو باشتر چاو دێریان ناکرێ. ترس و نیگەرانـی هـەر وا مـاوە.
برای دینی ئانتی فونا دەڵێ : « باوکی منیش جـوتیـارێک بوو کە لە ئاگر دا سـووتا. برایەکم بە تاوانی پیـاو کـوژی لە زیندان دایە. برایەکم لە بیـرزیل وەک سـەگ

ڕادەکات
ماستر ئانجلو دەڵێ:« ژیان لە عیبادەتگا باشتر ڕادەبرێ.»
کەشیش کبوشی دەڵێ: « خەرابیش بگوزەرێ مرۆڤ ئەمنیەتی هەیە. لە وێ مرۆڤ کەس و کاری نیە. بەڵام ترسیشی نیە. جگە لە وە هیوایەکیشی هەیە.
دۆن پاولۆ دەپرسێ : « کام هیوا ؟»
برای دینی عاسمان نیشان دەدا.
ماستر ئانجلو وەڵام دەداتەوە: « ئەو ڕێگایە بۆ هەموو کەس نیە. ئێمە هەموو ناتوانین ببینە قەشە.
برای دینی ئانتی فونا دەڵێ :
- شەیتانی خاوەن ملکی، خەڵک بۆ لای خۆ ڕادەکێشێ. باوکم دەیویست ڕەزی پشت قەبرستان بکڕێ بەڵام ئەو ئاواتەی بردە ژێر گڵ. براشم دەیویست هەمان ڕەز بکڕێ، هەر سەبارەت بەو ڕەزە کەوتە زیندان. برای دیکەم بۆ ئەم مەبەستە چوە بیرزیل تا بە پارەیەکی تەواو بگەڕێتەوە ئەو ڕەزە بکڕێ، بەڵام لە وێ نانی نە مر نە ژیشی وەگیر ناکەوێ. لەو ماوەیە دا ڕەز هەر وا دەستاو دەست دەکات و هەر سێ چوار ساڵ خاوەنێک دەگۆڕێ. بزانە تا ئێستا چەند کەسی بە لەعنەتی شەیتان گرفتار کردوە. ناو براو لە ڕوونکردنەوەی قسەکانیدا دەڵێ : ئەم ڕەزەش هەر وەک باخی ڕەزەکانی تر وایە، شتێکی سەیر و سەمەرە نیە. تەنیا قسە لە وەیە کە ڕۆژێ ملکی باپیرەکان بوە. ئێستاش کاتی کۆ کردنەوەی ئیجباری سەدەقە ڕێگا دەخاتە دەور و بەری ڕەزەکە و چاوی بە ڕەزەکە دەکەوێ بێ ئیختیار نیشانی خاچ دەکێشێ. سێ دارە گێلاس لە لایەکی باخەکە هەن کە یەک لە وان پڕە لە گێلاسی لاسک کورت. دوو دارە هەنجیر و دارێکی پوستە و دوو دارە گوێزیش لە وێن. خودی ڕەزەکە سێ مێوی ترێی ساحبی و چوار پێنج ترێی یونانی مالوازی تێدایە ئەویتر ترێی ڕەش و سپی تێکەڵە. وەک بڵێی ڕەزێکە وەک ڕەزەکانی دیکە. کەشیش کبوشی بە سرتە بە دۆن پاولۆ دەڵێ:
- کاتێ مرۆڤ ژیانی روحانیەت هەڵبژێرێ و تەرکی دنیا بکات ڕەنگە هەق وابێ کە لە وڵاتی خۆی ئاوارە بێ. کاتێکی ئاو هەمان ئاو وبەرد هەمان بەرد و گیا هەمان گیا و تۆزی ڕێگاش وەک تۆزی هەمان وڵات بن کە لێی هاتۆتە دنیاوە، تەنیا کوڕینی ناو بەس نیە، ڕەنگە وا باشتر بێ کە نیشتمان بە جێ بێڵێ.
کەشیش بە سەبروکە بە برای دینی دەڵێ:« من چوومە ڕێگای فرە دوور، بەڵام

گەڕامەوە.»

- ڕەنگە مرۆڤ بچێتە جێیەک ئیتر نە توانێ بگەڕێتەوە. برای دینی ئانتی فونا ئەم وتەیەی بە هەوایەکی ئەوەندە کاریگەر دەر بڕیوە کە دۆن پاولۆ دەیەوێ ماچی بکات. بەڵام بە زەحمەت خۆی پێڕادەگیرێ. تەنیا ئەم وشانەی لە زاری دێتە دەر :

- منداڵ. پیرە مێردی خۆشە ویست.

پاشان دۆن پاولۆ جامێک شەرابی دەداتێ و کەشیش ئەمجارە شەڕاب وەر دەگرێ. بەکاوە خۆ دەیخواتەوە و بە پشتی دەستە قەڵشاوەکانی لێوەکانی دەسڕێتەوە و بە ماتالنا دەڵێ :

- ئەوە دەبێ شەرابی فوسا بێت.

مودیری موسافیر خانە پشت ڕاستی دەکا و دەڵێ :« ئافەرین ، شەرابی فوسایە.»

برای دینی درێژەی پێدەدا: « دەبێ لە ڕەزەکـانی نیـوەی ڕێگای قـەراخ و سـەرووی کانگای « پوزولان» بێت.

ماستر ئانجلو دێتە پەیف و دەڵێ:« کە وابوو بە بڕوای تۆ نابێ کار بکەین ؟»

- بۆ چی ، منیش کاتێکی ئاوارەی ڕێگایان نیم کار دەکەم. لە پشتی عیبادەتخـانە مـەزرایەکی پان و بەرین هەیە کـە برایانی دینـی چاندوویانە. لە وێ ژیان ئاسـودە نیە، بەڵام مرۆڤ لە ئەمنیەت دایە.

ماتالنا دەیەوێ لە زمـانی کەشیش ببیسـێ کە ئایا تۆفانێکی وەک تۆفـانی ڕۆژەکـانی ڕابردوو دێتەوە یان نا و دەڵێ:

- من مێردم مـردوە ئەگەر لافاوێکی دیکە خـانووی من وێران کـات کێ دوو بارە بۆم دروست دەکاتەوە؟

برای دینی دەڵێ: « ئێمە ڕۆژی لەوەش خەراپتر دەبینین »

ڕەنگ و ڕووی تێک دەچێ و ئیتر بێدەنگ دەبێ. چۆن برایەکی دینی نە گەیوەتە پلەی فـتـوا دان و بەو سـەر و وەزعی پەرێشـانی زات دەکـا لە کن قـەشـەیەک غـەیبگۆیی بکات.؟ ماتالنا نیشانەی خاچ دەکێشێ و دوو پاتی دەکاتەوە:

- ڕۆژی لەوەش خەرابتر دەبینین !

دۆن پاولۆ بە هـەوایەکی دۆستـانە و بۆ تەشویقی برای دینی لێی دەپرسێ :« باشە چ شتێک دەبینین ؟»

کەشیش کیوشی بێ ئەوەی زات بکا بڕوانێتە کەشیش حکایەت دەست پێدەکات :

- شـەوێکیـان لەو کاتە کە لە حوجرەی خۆم نوێژم دەکرد لە درێژایی شـاری ڕۆم لە

ئاسۆ دا کە وەک قەترانی ڕەشبوو، تارماییەکی سوورم دیت وەک شەیتانی سوور لە نێو هەورەکان خۆی شارد بۆوە.
برای دینی ئانتی فوما ئیجازەی ڕۆیشتن وەر دەگرێ چونکە دەبێ بچێتەوە ماڵ و سەدەقە کۆ بکاتەوە. هیوا داریشە کە لانی کەم لە ماڵی کولامارتینی یەکان شتێکی بدەنێ. بە دۆن پاولۆ دەڵێ : خوا حافیز. ئەگەر لێرەش یەکترمان نە دیتەوە، لەو سەرانە یەکتر دەبینینەوە.
کەشیش دەپرسێ: « لەو سەرانە لە کوێ ؟ لە سەر چیا ؟ »
برای دینی دەڵێ : « مەبەستم دنیای دیکەیە .»
دۆن پاولۆ گاڵتەی بەم جۆرە قەرار و جێ ژوانانە دێت .
نیکۆلا چیکاوۆ وەک نوێنەری جێگای بڕوای وەرزێرانی ئیجارە داری پیتراسکا بۆ فوسا بانگ کراوە تا لە کۆ بوونەوەی ئەنجومەنی سەندیکای دەوڵەتی وەرزێراندا بەشدار بێت. دۆن پاولۆ کە لە گەڕانەوەی وی ئاگا دار بوو، بە پەلە دەچێتە لای و لە لیباسی کەشیشیدا خۆی لە ئەمانی تەواو دا دەبینێ کە بتوانێ لە گەڵ قلان وەرزێر بە ئازادی باسی زوڵم و ستەمی گشتی و پێویستیی ڕزگاری لە زوڵم و ستەم بکات.
ماڵی چیکاوۆ یەک لە بەرزترین خانوەکانی گوندییە و لە بناری گردێک هەڵکەوتوە کە گوندی پیتراسکای لێ دروست کراوە. کەشیش پاش سەر کەوتن لە پەیژەی بەرد بە تەقە تەق دەگاتە وێ. ئەم ژوورەی کە کەشیش لێی وە ژوور دەکەوێ، متبەقیشە و جـــێگای خـــەوی چوار منداڵیش. بە بێ شکڵی هەندسی ڕێکو پێک لە بەرد هەڵکەنراوە. لەو دەمە دا کە قەشە وەژوور دەکەوێ کابرای دێهاتی خەریکە لە گەڵ منداڵەکانی گەمە دەکات و بۆ خۆشی وان وەک بزن و گا دە هۆڕێنێ. ژنەکەی بە کەشیش دەڵێ :
– کابرا هەم گایە و هەم بزن، بەڵام وەک ئەوان شیر نادات. تاقە کورسییەکی کە پوشەکەی هاتۆتە دەر، بۆ کەشیشی دادەنێن. لە بان تەختی خەو لە پەنا خاچی عیسا وێنەی سەرۆکی دەوڵەت لە دیوار دراوە کە باسکی بۆ پێشەوە درێژ کردوە و وتار دەدا. وێنەیەکی گەورەی چیکاوۆ لە جلی سەر بازی پیادە نیزام دا بە پۆزێکی جەنگی لە دیواری پەنادا دەبینرێ. عەردی وێنەکە چەند تاق و فوارەی ڕەنگی تێدایە. ژنی چیکاوۆ گورج دەست بە ڕێک و پێک کردنی ژوورەکە دەکات. لێفەیەکی خاوێنتر بە سەر تەختەکە دادەدات شرە و برە لە قوژبنێک دادەنێ، چاکەتێکی خاوێن دەدا بە مێردەکەی و لە گەڵ کۆ کردنەوەی مشکی و خەڵوزی سووتاو لە

لایەکی ئاگردان دا، بە مێردەکەی دەڵێ: « داستـانی ئەو جارە باس بکە کە جەنابی فەرماندە دەستی لە گەڵ لێکدای.
چیکاوۆ بە دەنگی خۆ بە کەمگرتنی درۆ زنانە کە تایبەتی ئەم وەرزێڕانەیە کە دەبنە وردە مالیک، دەڵێ :«بەڵێ، ئەوە نیشانەی تواناییە.!»
ژن بە جیددی پێی دەڵێ : « میدالەکەشت بە ئاغای کەشیش نیشان بدە !»
هەر تک زەلام تەنیـا دەمـێننەوە. چیکاوۆ دەڵێ: بە ئەمـری دەوڵەت یازدە هەزار وەرزێڕی ئیجارە داری دەشتی فوچینو لە مەو بە دوا دەبنە ئەندامی « ئەنجومەنی خـاوەن مـڵکان» سـەرۆکی ئەیالەتیی ئەم ئەنجـومـەنە شـازادە« تۆرنۆلیـا » یە و ئەم کەسە کە ئەربابی یازدە هەزار رەعیەتی ئیجارە دارە، دیارە ئیمرۆ دەبێتە نوێنەری سـەندیکای وان. کـاتێکی ئیـجارە دارانی ناو براو لە گـەڵ « تۆرنۆلیـا » نا کـۆکی بەرژەوەندیان لێ پەیدا بێت، نوێنەری قانونی وان تۆرنۆلیا دەبێ.
پاشان چیکاوۆ دەڵێ :
– پەیف بێـژێکی کـە ئەم داهـێنانە سـەرنج ڕاکـێشـەی بـۆ ئێـمـە ڕوون دەکـردەوە، دەیویست بە زۆری تێمان بگەیێنێ کە دەوڵەت بەم کارە کە وەرزێڕانی ئیجارەداری بە خـاوەن مـڵک حـیسـاب کـردوە، شـانازی گـەورەیان بە نسـیب بوە. ئەوەشی لە قسـەکـانی خـۆی زیاد کرد کە لە نێوان ئەم دوو چینە دا کە یەک لە یەکێ لێـهاتوو ترن، ئیتر هەر گیز ناکۆکی بەرژەوەندی نایەتە پێش و لە مەو بە دوا لە بنە مـاڵاندا ئاشتی و دۆستایەتی زاڵ دەبێت.
دۆن پاولۆ دەپرسێ: « ئاخر لە تۆیان نە پرسی کە موافیقی یان نا ؟»
چیکاوۆ لە وەڵامد ادەڵێ :
– چما دە بوایە لێم بپرسن ؟ ئاشکرایە بێ ئەوەی لێمان بپرسن هەمیشە موافیقین. تەنانەت من لە کۆتایی کۆ بوونەوەی ئیمرۆ بە وتە وێژم گوت: چونکە من هـەمیشـە دڵنیام کە هەر مەسەلەیەکی لە ئەنجومەندا بێتە گۆڕێ مەنتقیە و لە سەر بـناخـەی خێر و چاکەیە و لە بەر ئەوەی کاری تایبـەتیم هـەیە ئیجازە دەخـوازم لە کۆبوونەوەی داهـاتوو دا بەشــداری نەکــەم. بەڵام ئـەو ڕێکـای نە داو لە مـنی پرسـی : تۆ بـە چی دەزانی کە لە کۆبوونەوەی داهاتوو دا باسی چ مەسەلەیەک دەکرێ. لە وەڵامدا گوتم « من بزانم ؟ من و زانین ؟ من کـە ئیجارە دارێکی فـەقیر زیاتر نیم » ئەو دەم کـابرا چاوێکـی لە دەور و بەری خـۆی داگـرت و لە منی پرسـی :« کـە وابوو چۆن دەتوانی هەر لە ئێستـاوە موافـیق بی ؟» من وەڵامم داوە : « دیارە کە مـوافیـقم. پێت وایە من

کێم ؟ هەر ئەوەم ماوە کە موافیق نە بم.!» لە گەڵ ئەوەش وتە وێژ باش تێگەیشت کە مەبەستم چیە و لە کن گشت باوەڕ پێکراوان شوتی وەبن هەنگڵی دام و بە دەنگی بەرز گوتی : « ئافەرین بە ڕاستی تۆ ئیتالیایەکی بە ویژدانی و هەر بۆیەش کەسانی وەک تۆ نابێ تەنانەت یەک کۆبوونەوەش غایب بن.» ئاخرەکەش وتە وێژ پێشنیاری کرد کە ڕیزە تێلگرافێکی پیرۆز بایی بۆ دەوڵەت، تێلگرافێک بۆ شازادە « تۆرنۆلیا» یەکیش بۆ ئوستاندار و چەند تێلگرافی دیکە بۆ کار بە دەستانی جۆر بە جۆر لێبدەین کە ناویانم لە بیر چۆتەوە. لە ئێمەی پرسی : « ئێوە موافیقن ئەو تێلگرافانە لێبدرێن ؟» وەڵام درایەوە: « ئەم فەرمایشە چیە. دیارە کە موافیقین. هەر ئەوەمان ماوە کە موافیق نە بین.» ئەو دەمەم کابرا لە سەر پەڕە کاغەزێک حیساباتێکی کرد و گوتی :

« بۆ موخاریجی ئەو تێلگرافانە دەبێ هەر یەکەی لیرەیەک و بیست» چنتزیمۆ» بدەن.» لە پڕ زۆر کەس بە بیانووی دەست شۆیی ویستیان ڕابکەن. بەڵام وتە وێژ ئەمری کرد دەرگا داخەن. ڕاستیت گەرەکە من چەند لیرەیەکم هەبوو داهاتمەوە لیرەکانم لە کەوشەکانمدا شاردەوە. بە کابرام گوت:« بە داخەوە من هیچ پارەم پێ نیە.» ئەمری کرد گیرفانەکانم بگەڕێن. بەڵام نەیزانی بڵێ کەوشەکانیشم بگەڕێن. لە گەڵ ئەو هەموو زۆر بڵێیی و فەرمان دانە ئاخرەکەی کڵاوم لە سەری نا.

دۆن پاوڵۆ دەپرسێ:

– ئێستا کەس لێرە نیە کە گوێ بداتە قسەکانمان. ئایا بە ڕاستی لە گەڵ ئەو قسانە موافیقی کە لەو کۆبوونەوانەدا دەگوترێن؟

چیکاوۆ گرژ دەبێ و دەنگ بەرز دەکات و دەڵێ :

– مەبەستت چیە کە وا لە سەر یەک وشەی « موافیق» دوو پات دەکەیەوە.؟ ئێمە باسی چدەکەین ؟ کاتێکی هەوا خۆشە و یا بە پێچەوانە باران دەبارێ داخوا دەتوانی لە کەسێک بپرسی: ئاغا تۆ موافیقی ؟ بارانە و دەبارێ وەسەلام. باران بارین واقعیەتێکە ڕوو دەدا. قسە نیە. واقعیەت پیاون و قسەش ژن. هەزار ژن کۆ بکەیەوە پیاوێکیان تێ نابێت.

دۆن پاوڵۆ خۆ شلوێ ناکات و دیسان دەپرسێ :

– بە بڕوای تۆ نابێ کارێک بکرێ لەم بار ودۆخە دژوارەی تێیدا دەژین، دەر باز بین ؟

چیکاوۆ ئاخرەکەی مەبەستی کەشیش تێگەیشتوە. تاوێک بیر دەکاتەوە و پاشان

دەپرسێ :

– ڕێگای دەرەوە گیراوە، چۆن دەتوانی خۆ دەر باز کەی ؟

دۆن پاولۆش لە مەبەستی ئەو تێدەگات و بە دوای کاری خۆیدا دەڕوا.

خانم مامۆستا ڕۆژنامەی دیواری « دەنگو باسی ڕۆم » ی بە دیواری کلیساوە نوساندوە. کەسێکی لە وانەیە گەنج بووبێت شتێکی لە ناو ونیشانی ڕۆژنامەکە زیاد کردوە و نووسیویەتی : « دەنگو باسی درۆی ڕۆم »

دۆن پاولۆ لە ماگاشیا دەپرسێ:

– ئایا کەسێک هەیە باوەڕ بە دەنگو باسی ڕۆژنامەی ڕۆم نەکات ؟ و بۆ چی ؟

ماگاشیا لە وەڵامدا دەڵێ :

– جگە لە هەموو شت ئەم ڕۆژنامەیە بێ پارەیە. جاری هەوەڵ کە ڕۆژنامە هات هیچمان نەمانویست قبوڵی بکەین، چونکە پێمان وا بوو دەبێ پارە بدەین. بەڵام خانم مامۆستا ئێمەی دڵنیا کرد کە بە پارە نیە. ئەو دەم ئێمە بیرمان لە وە کردەوە کە حەیف بۆ ئەو هەموو کاغەزە کە حەرامی دەکەن. بەڵام لە ڕاستیدا دەوڵەتی ئێستا لە فیکری خەرج دا نیە و مرۆڤ دەچێتە هەر شوێنێ دەبینێ کە کاغەزێکی زۆر بە خۆڕایی دەچێ. جگە لەوە هەر چی لەو ڕۆژنامەیەدا نووسراوە، تۆ خۆشت ئاغای کەشیش لە زمانی خانم مامۆستا بیستت. هەموو جار کە خانم مامۆستا ئەم دەنگو باسانە بۆ ئێمە دەخوێنێتەوە و دوو پاتیشی دەکاتەوە کە نابێ وشەکان بە مانای ڕاستی وەر بگرین، بەڵکوو دەبێ شتێکی گشتییان لێ هەڵکرێنین.

کەشیش دەپرسێ :« ئایا تا ئێستا ڕۆژنامەیەکی پێچەوانەی « دەنگو باسی ڕۆم» نە هاتۆتە ئێرە ؟ مەبەستم ڕۆژنامەی دژی دەوڵەتیە.

ماگاشیا لە وەڵامدا دەڵێ :

– دوور نیە !مرۆڤ ناتوانێ سەرنجی ئەو هەموو کوتە کاغەزانە بدات کە دەیدەنێ. بەر لەوە کاغەز شتێکی نایاب و بە نرخ بوو. پەڕە کاغەزێکیان بە حەز و تاسەوە لە کەشوی مێز دا ڕادەگرت. کاتێ دەیانویست باسی سەفەری ئەمریکا بکەن دەیانگوت:« ڕێک و پێک کردن و ئامادە کردنی کاغەزی پێویست.» بە بێ ئەو کاغەزە مرۆیان دە خستە زیندان. کاتێ ژن مارە کردن دەهاتە پێش دەیانگوت: « کاغەز ئامادەیە » کاغەزی وا هەبوو کە لە تەواوی ژیاندا جارێک زیاتر ساز نە دەکرا. ئەو کەسەی ناوی بۆ سەر بازی دەر دەکەوت دەبوایە بچێتە هەنگ و دەیانگوت: « کاغەزی گەیشتوە.» ئەگەر پێچەوانەی نێوەرۆکی کاغەز جوڵا باوە، ژاندارم بە

دوایدا دەهاتن. هەر چۆنێک بێ کاغەز شتێکی ڕێزدار و عەنتیکە بوو. لەو دەوراندا لە دێهاتی ئێمە، ئاغای کەشیش دوور لە ڕوی تۆ کەس زاتی نە دەکرد بە کاغەز خۆی خاوێن کاتەوە. هەموو بە بەرد و یا گەڵای دار خۆیان خاوێن دەکردەوە. بەڵام ئێمڕۆ تەواو بە پێچەوانە ئەوەندە کاغەزی چاپی و بە خۆڕایی و پڕ لە درۆ بەر چاو دەکەوێ کە مرۆڤ بێزی لێ هەڵدەستێ و دمیەوێ خۆیان پێ خاوێن کاتەوە.

دۆن پاولۆ بۆ ژوورەکــەی خــۆی دەگــەڕێتــەوە. لە بارەی وەزعی ژیانی وەرزێران وترسێکی کە بە سەر هەموو ژیانیاندا زاڵە دەکەوێتە فیکرەوە. دەکاتە ئەو فیکرە کە ئەو ماوەیەی کە هێشتا لە پیتراسکا دەبێ خەریکی تەواو کردنی موتاڵای مەسەلەی وەرزێڕی بێت. ئەو دەفتەرەی کە یاد داشتی سەر دەمی ئاوارەیی تێدا نووسیوە. لە جانتاکەی دێنێتە دەر. دوو بارە یاد داشتەکان دەخوێنێتەوە. لە لایەنی تیئۆری وروون نە بوونی وان سەر سام و داخدار دەبێ. تەواوی ئەو مەتڵەبانەی کە لە قەولی مامۆستایان و پیرەوانی مەکتەبی وان لە بارەی مەسەلەی دێهاتی نووسراوە، تەواوی ئەژمار و جەدوەلانەی کە تا ئێستا لە نێویاندا ژیاوە، هەمووی جگە لە ڕاوی سەر کاغەز شتێکی تر نە بوە. ئەم گوندەی کە لەم یاداشتانە دا باسی کراوە، بەلای ویەوە گوندێکی کاغەزییە کە چیا و گرد و باخات و شوانگەل و مەزراکانی هەموو لە کاغەزن. ئەو ڕووداوانەی کە لە وێدا باسکراون زۆربەیان کارەسات و شەڕ و سەر کەوتنی کاغەزین. گومڕایی و لاڕێییەکانی کە لەو یاد داشتانە دا دژیان خەبات کراوە، لاڕێیی و گومڕایی کاغەزین. دۆن پاولۆ لە بەرانبەر ئەم هەموو کاغەزە دا ئەم بێزارییە هەست پێدەکا کە ماکاشیا هەستی پێکرد بوو. جارێکی تر ترسی تەنیایی بە سەریدا زاڵ دەبێ. بیرەوەری ئەو ڕۆژانە ئازاری دەدا کە لە خەباتی دژی تاریکی بە سەریدا تێپەڕیبوو. بە جۆرێکی ئەو تۆ کە لە خۆی دەپرسێ:« نە کا منیش ترسابم؟» کریستینا لە هەناسەی خۆی دەترسێ و دەیەوێ خۆی لە دێرێک زیندانی بکا. برای دینی ئانتی فونا کە ڕەزەکانی پشتی گۆڕستانی گوندی خۆی دەترسێ و پەنای بۆ دێر برد. وەرزێڕەکان لە برسیەتی دەترسێن و ئارەزوی ئەوەیان هەیە ببنە وردە مالیک. بەلام ئەو، واتە دۆن پاولۆ، ئەگەر پەنا بۆ کردەوە بەرێ، داخوا بەو مانایە نیە کە لە بیر کردنەوە دەترسێ.؟ هەول دەدا کە ئەم گومان و دردۆنگییە لە خۆی دوور خاتەوە یا لانی کەم ڕاستەو خۆ لە گەڵی بەرەو ڕوو نەبێ. بە خۆی دەڵێ :« مانەوەی بەتاڵ و بێکار لێرە و هوندنەوەی فەلسەفە سەبارەت بە واقعیەتی کۆمەڵایەتی هیچ کارێ ناباتە پێش و تەنانەت نابێتە

هۆی ناسینی قوڵتری ئەم واقعیەتەش. بۆ ناسین و تێگەیشتنی واقعیەت دەبێ لە نێو واقعیەت دابی و لە بزووتنەوە و خەبات دا بەشداری بکەی.»

ئەم بەڵگە هێنانەوە نەک هەر دۆزینەوەیەکی شەخسی نیە، بەڵکوو دوو پاتە کردنەوەی فیکرێکی کۆنە کە بە شێوەیەکی دیکە خۆ دەر دەخات. لە گەڵ ئەوەش دۆن پاولۆ بە ڕاستی وا هەست دەکات کە خۆی ئەم فیکرەی دۆزیوەتەوە. کاریگەری بوونی گورجی فیکرێکی ئاوا کە لە پڕ زاتی وی ڕوون دەکاتەوە و پڕی دەکا لە شۆق و ورووژان، لە ڕاستیدا وەڵامدەری شتێکی زۆر قوڵتر و ڕیشە دار ترە لە خودی خۆی کە وەک هۆکاری ڕاستە قینەی گیر و گرفتی وجودی وی حیساب دەکرێ. بە بڕوای وی هەنگاوی شۆڕشگێڕانە هەمیشە وەڵامێک بوە بەو نیازە پێویستەی یارمەتی بە یەکتر کە لە سەرەتای لاویی لە گەڵ فێر کردەکانی دینی مەسیح پێی تەلقین کراوە. پەرە گرتنی هزری وی بناخەی لادان بەرەو سۆسیالیزمی گۆڕیوە بەڵام نەیتوانیوە جەوهەری ناخی ڕوحی ئەو بگۆڕێ. بەشی گرنگی ڕازی نە بوونی لەوە دایە کە ماوەی ئەو سێ مانگەی لە پیتراسکایە نەیتوانیوە خاڵێکی پاڵپشت لە نێو وەرزێران پەیدا بکات. هەوڵ و تەقەلای وی بۆ نیزیک بوونەوە لە وان، هێندێ ڕوو داوی بە دواوە بوون کە پێوەندییان بە یەکەوە نیە. درێژەی وتو وێژێکی کە دوێنێ دەستی پێکردوە، ئیتر بەیانی دەرەتانی نیە. پێوەندی نێوان وەرزێرەکانیش بە بۆچوونی وی ناقایم و لەرزۆکە. شت دروستکردن لە سەر بناخەی وان، هەر چی بێت، پایدار و خۆ ڕاگر نیە. سەر دانواندنی وەرزێران بۆ دیکتاتۆری لە ڕوانگەی وی شتێکی تەواو جیا و سەر بە خۆیە لە دەزگای بەر بڵاوی تەبلیغاتی دیکتاتۆری. ئەو ئێستا تێگەیشتوە کە دەست گەیشتن بە وەرزێران دژوارە و قسەش کاریان تێناکات و ئەوان تەنیا لە ئاست واقعیەت سەر دادەنوێنن. بەم پێیە پەنا بردن بۆ تەبلیغاتی دژ، وەک دۆن پاولۆ کاتی گەڕانەوە لە دەرەوە بڕوای پێبوو، بێفایدەیە. لە بەرانبەر واقعیات دا، تەنیا دەبێ بە واقعیات بەر بەرەکانی بکەی. لە بەرانبەر کردەوەی دیکتاتوریدا، نەک بە قسە، بەڵکوو دەبێ بە کردەوەی ئازادی خەبات بکەی. لە بەرانبەر پیاوانی دیکتاتۆریدا، نابێ کەسانی وا ڕاست کەیەوە کە بە زمانێکی تر بدوێن، بەڵکوو دەبێ پیاوی زیندو و تێکۆشەر دابنێی کە شێوەی کار و کردەوەیان فەرقی هەبێ. ئەوەی دەبێ بکرێ ئەوەیە کە وەرزێران بخەیە بەرانبەر دوو واقعیەت تا بەڵکوو ئەو دەم خۆیان بە بڕوای دۆن پاولۆ یەکیان هەڵبژێرن و بجووڵێن.

هەر وەها کە یاد داشتەکانی خۆی لە مەڕ وەرزێران بە دەستەوەیە، لە پەنجەرەوە

تەماشـای دەرێ دەکات. ڕۆژ( دیارە نەک ڕۆژی کاغـەزی) بـەڵکوو ڕۆژی بە ڕاستی لە ئاسـۆ ئاوا دەبـێ. لەو سـەری دیکە مـانگ( دیارە مانـگی واقعي) دێتـە دەرێ. لە سـەر جـادەی کـە دەکـاتە دۆڵ هەورێکی ڕاکـێـشـراو لە تەپ و تۆز دێتـە پێش. وەرزێکە شـوانەکان بە مێگەلەوە دەشت بە جێ دێڵن و بۆ کوێسـتان دەگەڕێنەوە. لەو هەوری تـەپ و تۆزە دا دەکـرێ مــەڕەکـــان ببــینـرێن و لـە پشـت ســـەری وانیـش دەنگـی تێنەگەیشتووی شوانان ببیسی.

دۆن پاوڵۆ یاد داشــتــەکـانـی خـۆی دەدڕێنـێ و لە پـەیژەکـان دێتـە خـوار، و دەیان سووتێنـێ و بە خاوەن ماڵ دەڵێ:

– من سبەی دەڕۆم.

ماتالنا بە سەر سوڕ مانەوە دەپرسێ:

– بۆ هـەمیشە ؟

کەشیش لە وەڵامدا دەڵێ:« ماوەتەوە کە دوکتۆر چیم پێ بڵێ.»

# ٧

دۆن پاسکال کولامارتینی دەبێ بچێتە« فوسا » بە خۆشییەوە کەشیش داوەت دەکا کە سواری گاری یەک ئەسپەی وی بێت. بەیانی ڕۆژێکی ڕوناک و هەوای خۆشە و بۆنی خۆشی گیا و گوڵی شەدار لە دۆڵەوە دێت، دۆن پاولۆ هەست دەکا حاڵی باشە، ماوەیک بوو هەوای وا خاوێنی نەدیبوو. لەو کاتە دا کە کولا مارتینی پیر خەریکە ماین بەرێتە بە رکاریە وڕێشمە و چاویلەکە وەسر حەیوان بخات، کریستینا دێتە سلاوی کەشیش و دەپرسێ:

– تۆ بە یەکجاری دەڕۆی؟ ئیتر ناگەڕێیەوە ___

کەشیش لە وەلامدا دەڵێ : « هیچ نازانم »

دۆن پاولۆ ئێستا قینی لە کریستینا نیشتۆتەوە. بەلام هێشتا گرێیەکی تایبەتی و یا جۆرە نارەحەتیەکی لە دڵدا هەر ماوە. بۆیە لە گەڵ خۆی فیکر دەکا: « ئەم کیژە باشتر بوو کەمتر لە گەڵ خوا خەریک بایە و پتر لە فیکری خەڵکی خوا دا بوایە.»

لە گەڵ ئەوە ئێستا کریستینا لە ناخدا بۆ ئەوە بێ تەفاوەتە، ئەو لە فیکری شتێکی دیکە دایە. گەڕانەوە بۆ خەباتی نهێنی بانگی دەکات.

کریستینا دەیەوێ شتێک لە وتەی خۆی زیاد بکا بەلام گاری دەکەوێتە ڕێ و کیژی جوان مات و کەمێکیش دڵ شکاو بە جێ دەمێنێ.

دۆن پاسکال دەڵێ :« ماینەکەی من ناوی« دیان » یە. پێش پازدە ساڵ بۆ ڕاو کڕیومە. چەندە سەر دەمێکی خۆش بوو کە هەر گیز ناگەڕێتەوە. شکڵ و قەوارەی گارییەکە بەو سەندڵیانەوە کە لە سەر دوو چەرخە قایم کراون ـ دوو تەگەری بچوکی پێش و دوانی گەورەی پاشەوە، بەو لغاوی ماین و باڵنجی گوڵدار کە ئەم دوو زەلامە لە سەری دانیشتوون و شێوەی لیباس دەبەر کردنی دوو موسافیرخانە، هەموویان هی سەر دەمێکی دیکەن، سەر دەمێکی کە مەحکوم بە فەوتان بوە.

کاتێ گاری لە بەرانبەر خانووی جندوکان تێدەپەڕێ، دۆن پاولۆ دەڵێ:

– وا دیارە ئەو دوو لاوەی لێرەدا بوون ڕۆیشتوون. دیارە ئەوان نەیاندەتوانی لێرە دا بژین.

پیرە مێرد لە وەلامدا دەڵێ : « من هۆکری ئەم مەسەلەیە نیم،»

دۆن پاولۆ ئیتر هیچ نالّێ. ئەم بێ هەستیەی باوک سەبارەت بە کوڕ ئەو نارەحەت ناکات. بەڵکوو شێوەی فیکری بنە ماڵەی خۆی وە بیر دێنێتەوە کە لە باب و باپیرەوە بگرە تا مامەکانی هەر چەند کشتیان خەڵکی باشبوون، بەلام هەموو جارێ کە پای شەرافەتی بنە ماڵە دەهاتە گۆڕێ توند و بێ بەزە دەبوون. ئەوانیش چینێکی تایبەتن کە مەحکوم بە فەوتانن. هەر چەند پیرە مێرد گوتوویەتی:« هۆگری ئەم مەسەلەیە نیم» بەلام لە ناخیدا توند هۆگریەتی. چونکە لە وتەکەی خۆی زیاد دەکا و دەڵێ ـ تۆ لەو باوەڕە دای کە ئەو دوو مەلعونە دەتوانن بە پێچەوانەی ویستی من پێکەوە ببنە هاو سەر.؟

کەشیش لە وەلامدا دەڵێ :« ئالبیرتۆ گەورە بوە. قانون ڕێگای دەدا »

دۆن پاسکال دەڵێ : « قانون بۆ شار نشینان دانراوە، لێرە باوک خاوەن دەسەلاتە.»

دۆن پاولۆ ئەم مەسەلەیە درێژە پێنادا. ئەم مەسەلەیە بۆ وی سەرنج ڕاکێش نیە. هەر ئەوە نیە کە بنە ماڵەی خاوەن مڵکان لە پەرش و بلاوبوون دان. باشتر. ئەوانیش مەحکوم بە فەوتانن. ئەوەی بیری دۆن پاولۆی بە خۆوە خەریک کردوە، بیری تێکۆشانی نهێنییە لە نێو وەرزێڕاندا. دەبێ پشت بە چ هۆکارێک ببەستێ؟ لە کوێ بیاندۆزێتەوە؟ چۆن پێوەندییان لە گەڵ دامەزرێنێ ؟

قەیران نەماوە. ئێستا دەبێ دەست بە کار بێت. لەو کاتەدا دۆن پاسکال ڕوونی دەکاتەوە کە بۆ چی هاو سەری ئالبێرتۆ و بیانکینا دەرەتانی نیە.؟ لە نێوان بنە ماڵەی کولامارتینی و « جیراسولە»دا قەڵشێکی قوڵ هەیە. کەس نازانێ ئەوانە لە ژێر چ برکەیەک شین بوون. هەر خۆت ئایا دەتوانی بە من بێژی کە ئەم « جیراسولە» لە کوێوە هاتوە ؟

دۆن پاولۆ لە بەر خۆیەوە بیر دەکاتەوە کە هەوەڵین هەنگاو دەبێ بە دوای وەرزێڕێکی پیر دا بگەڕێم کە پێشتر سەر بە « یەکێتیەکانی بەر بەرەکانی» بوە. ئەم یەکێتی یانە پێشتر لە دەور و بەری فوچینۆ بوون . دەوڵەت ئەم یەکێتی یانەی هەڵوەشاندۆتەوە بەلام دەبێ لە گوندەکانی لۆکوا، ئورتوکۆ و پشینا هێشتا چەند کەسی ئەمەگدار بەو یەکێتی یانە مابن. تەنیا چۆن دەبێ خۆیان بگەیێنی و بچیە کن کێ کە کەس شک و گومانت لێ نەکات؟

دۆن پاسکال لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ :

- سەر و کەللەی جیراسولەی پیر لە ولاتی ئێمە سەر دەمی تاعونی دوایی بۆ لیمۆ فرۆشتن دەر کەوت. بە پای پەتی لەم گوند بۆ ئەو گوند دەچوو قەرتاڵەی لیمۆ لە بان

سەری. کار و باری گرتي و پاش نـەماني نەخۆشي تاعون لە « فوسا » نیشتە جێ بوو. دیارە هەمـوو کـەس دەبێ بژین بەڵام ئەگەر ئێستا بنە ماڵەی « جیراسولە » پێیان وایە کە دەبێ لە گەڵ بنە ماڵەی کولامارتیني خزمایەتي بکەن. بۆیە دەبێ مەسەلەکە بە مودیری خەستەخانی شێتان ڕابگەیندرێ.

ئێستا وەرزێرێک بە دوای کاروانێکي کەراندا دەگاتێ کە خۆشي سواری کەرێکي چکۆڵە بوە. کەرەکە ئەوەندە وردە لاقي کابرا لە عەردی دەخشێن. کابرا تەماشای سێلاو گر دەکات وا نیشان دەدا کە ئاگای لە هاتني گاریە نیە.

دۆن پاسکال بە کەشیش دەڵێ:

– ئەو کابرایە خانوێکي گوندی لە من بە ئیجارە گرتوە. ئێستا سێ ساڵە کرێ خانوەکە نادات. هەر بۆیە کاتێ من دەبینێ ڕوو وەر دەگێڕێ.

دۆن پاوڵۆ لە بیری ئەوە دایە کە دەبێ لە هەوەڵەوە نەخشەیەک بکێشێ کە بتوابێ لە لیباسي درێوی کەشیشي بێتە دەر و پاشان لە گەڵ یەک دوو کەس لە ئەندامانی قەدیمی یەکێتي یەکاني پێشوو پێوەندی بگرێ. بێگومان سەبارەت بە درێژی ماوەی دیکتاتۆری ئەوان بە دڵسارد دەبینێ. هەر بۆیەش پێویستە ماوەیەک لە گەڵیان بێ و بڕوای وان بۆ لای خۆ ڕابکێشێ و چاوە ڕوانی ئەو دەمە لە بارە بێت کە بتوانێ پرسیاریان لێ بکات :

– پێتان وا نیە بۆ خەباتي دژی ئەم دیکتاتۆرەی کە وا هەموو وڵات دەخنکێنێ و برسیەتي دێنێ، دەبێ یەک بگرن ؟

ئەو دەم کارەکاني دیکە خۆیان چاک دەبن.

گاریە بە پەنا عارەبانەیەکدا دەڕوا، ئەویش بەرەو دەشت دەچێ و چەند تەلیسە گەنمي پێیە. وەرزێرێکي عارەبانەی لێدەخوڕێ لە پشتەوە دانیشتوە و هەوسارەکەی توند ڕادەکێشێ و جەستەی خۆی کردۆتە پارسەنگی قورسایی عارەبانە.

دۆن پاسکال لێي دەپرسێ: « بەر وبوو ئەم ساڵ باش بوە ؟»

کابرا دەڵێ :

– ئەوە هەموو حاسڵێکە بۆم ماوەتەوە. تا مەعموری ئیجرا نەهاتوە و نەیگرتوە، دەبێ بۆ ئەربابی بەرم.

ئێستا گاریە دۆڵی پیتراسکای بە جێهێشتوە. لە پرد دەپەڕێتەوە و بۆ لای « لاما » دەڕوا . تا دێ لە فۆچینۆ نیزیک دەبنەوە، خاکي ڕەنگ سوور بە خۆڵە مێشێکي ڕوون دەگۆڕێ. باقە گەنمي تازە دروا و پەڵەو ڕەنگی زەردیان خستۆتە سەر داوێني پارچە

زەویەک کە بـۆ لای گۆلی پێشـوو شۆڕ بۆتەوە. لە دوورەوە کیشـە کلۆشـی بەرز و خڕ دەبینـرێن کـە زەلام لە دەور و بەریان وەک مـێـرولـە دێن و دەچن. ئەو ژنانـەی دەچنە بازار قـەرتاڵەیان لە بان سـەریە و بەرازێکیـان بە هەوسارێکی درێژ بەستۆتەوە و بە دوای خـۆدا دەیکێشـن. ژنی دیکە وەک پەیکەری حـەزرەتی مـریەم لە کلیسـاکـان – بەلام مـریـەمی ڕەش و سـووتاوی قـەبە و ناقـۆلا – مندالّ بە ئامـێـزەوە نـان بۆ مێردەکانیـان دەبەن کە خەریکی گێرەی گەنمن. گەرمـا وردە وردە هەستی پێدەکرێ. هەورێک لە مـێش و مـەگـەس دەوری مـاینەکـەیان داوە. دەڵێی ئەو مـێشـانە چاویان باش کـار ناکـات، بۆیە هەر لە دەورەی کلکی مـاینەکە دەهاڵێن. لە پشـتی گوندی « لامـا » ڕەزیان چاندوە. مێـوی سـیس وباریک و خـوار و خێچ وەک مـار پێچ بە زەویدا ڕۆیشـتـون. لە نیـزیک مـاڵەکان چەند بنە ڕەزی دیکە هەن لقـەکانیـان بەرزترە و بە شکڵی تاق لقەکانیـان لێک بەستوە و هێشوە ترێی قۆرە هەر وەک مەمکی تازە خڕ بوو بە نێو لقەکاندا شۆڕ بوونەوە.

ئێستـا لە دوورەوە گـوندەکـانی کولار ملە و چرکیـوە و نایلی و دور ترک و پاترنو و سـان پلینو و دیسـان دوور تر ئاوتزانو دەبیـنرێن. دۆن پـاولۆ هەست دەکـا گـەنج بۆتەوە. دڵی لـە هـەستی ئازادیـیـەکی تازە و غیـرەتێکی و خۆشـیـیـەکی بێ پێشـینە لێدەدا . دەزانێ کە لە هیچ شتێ ناترسێ.

گـاریە لە « لاما » تێدەپەڕێ و بە کاوە خـۆ بۆ لای فوسـا شۆڕ دەبێتەوە. جادە پڕە لە قـوڵکە و بـەرد تێکـیـراو زۆر خـەرابـە . لە چیـمـەنێکدا هێندێ سـەر باز لە پێش خێوەتێک دانیشتوون و تفەنگەکانیان لە نێو لاقیان داناوە. کەرێکی چکۆڵە لە نێوە ڕاستی جادە بـە تیشکی ڕۆژ تواوەوە ڕاوەسـتـاوە. وا دیارە دەیەوێ تەواوی ئاگری دڵی شێر لە سەری خۆیدا کۆ بکاتەوە.

دۆن پاولۆ دەڵێ: آ ئەم حەیوانە بێگومان دەبێتە کەباب.

کـەری دیکە بە بارە ئاردەوە لە ئاشی فـوسـا دێنەوە. وەرزێرانی کـە بوخـچـەیان لە بنهەنگڵدایە بۆ لای ئـێزگـەی ڕێگای ئاسن دەچن. تەنانەت لەو گـەرمـای سـوتێنەر دا خەڵکێک کە ئامادەی حەرەکەتن هەر چی هـەیانە بە کۆڵیـان داداوە و دەیبەن، دەڵێی هەر گیـز ناگەڕێنەوە. وەرزێرانی مـوسافـیر هەمیشـە تا ڕادەیەک حـاڵەتی ڕاکردووی بە جێـمـاویان هەیە کە لە کوشـتـار گـا ڕادەکـەن. بێگـومـان ئینگلسـتـان دوورە بەلام بوومـە لەرزە لە بەین نەچوە وهیچ بەڵگەیەکیش بە دەسـتـەوە نیە کە هەر کـاتێ ڕوو نەدا .

کابرایەک بە ناوی دۆن جنزیو کە لە ئاشنایانی دۆن پاسکال و کار مەندی ئیدارەی مالیاتەکانی» فوسا «یە سواری گاریە دەبێ. ئەم کابرایە دەستبەجێ دوشمنایەتی خەڵکی دۆڵ نشین دێنێتە زمان و دەڵێ :

– لە ڕوانگەی وەرزێرانی دۆڵ نشین هەر کەس کراوات ببەستێ کارمەندی دەوڵەتە و هەموو کارمەندێکیش شەیتانە. ئێستا ماوەیەکە دەچمە هەر گوندێک کراوات نا بەستم و دەیخەمە گیرفانم. تازە بۆ ئەوەی بە هیچ جۆر وە کارمەندان نەچم بە ئانقەست پێڵاوی قوڕاو دەپێدەکەم. نیشانی حیزبی دەوڵەتی لە سینگم دەکەمەوە.

دۆن پاسکال دەڵێ :

– هەمووشی هەر خەتای وەرزێران نیە. شار بۆ چاری دەردەکانی گوند نشینان لە سەر یەک ئیدارە و تەمر دروست دەکا. هەر وچەیەک بەڵایەکی تایبەتی خۆی هەیە. پێش شەست ساڵ باخی رەز ژەنگی دێنا، پێش بیست ساڵ بەڵای « فیلوکسرا » هات و ئێستاش ئیدارە پەیدا بوون. هەر کە ئیدارەیەک دامەزرا، سەر و کەللەی بێگانانیش پەیدا دەبێ کە پۆز لێدەدەن و دەیانەوێ ئاغایی بە مە بفرۆشن. پاشماوەی بنە ماڵە قەدیمییەکان ئیمڕۆ وەک ورچەکانی ئەشکەوتەکانی «مۆنت مارسیانۆ» پەنایان بۆ چیاکان بردوە.

کەشیش لە « دۆن جنزیو» دەپرسێ:

– ئێستا ناوچەی فوچینۆ حەشیمەتی چەندە.؟

لە وەڵامدا دەڵێ : « سی هەزار کەسێک کە هەموویان لە بارمتە دان . پاشان بە باسکی لێک بڵاو گوندەکانی دەور و بەر نیشان دەدا و دەڵێ :

– هەر شتێکی کە ئێوە دەیبینن هەموو ماڵ و بەرد و دار و سندە کڵێک دە بارمتە دایە. ئێمە میللەتێکین لە بارمتە داین.

دۆن جنزیو بۆ ئەوەی هەراوی مەیدانی ئەو بارمتەیە نیشان بدات حکایەتێک دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

– وەرزێرێکی خەڵکی فوسا کە توشی نەخۆشی تایبەتی سپڵ ببوو هێنایانە دەرمانگا یەکی ڕۆم. دوکتۆری دەرمانگا مافی تشریحی سپڵی پاش مردن لەو وەرزێرە کری. کابرا پارەکەی وەر گرت، بەڵام نە مرد. ئێستاش لە فوسا دەژی بەڵام سپڵی لە بارمتە دایە. بەڵێ، ئەم خەبەر هێشتا زۆر بڵاونە ببۆوە کە کۆمەڵێکی زۆر لە وەرزێران بە تەمای ئەوە کە جێیەکی لەشی خۆیان بفرۆشن و لە بارمتەی دابنێن دەهاتنە کن دوکتۆری ناوچە.

لە دوورەوە دەنگی سرودی ئایینی دەبیسرێ. دەستەی زیارەتکەران لە کوێرە ڕێی چیا دێنە خوار و لە شەقامی کشتی کۆ دەبنەوە. لە چیمەنێکدا، پیرێژن لە ئاگردانی دروستکراو لە قوڕ و بەرد، خەریکن شوربا بۆ زیارەتکەران لێدەنێن.
سرودەکەیان بە گشتی لە چوار پێنج وشە پێکهاتوە. بەڵام چونکە سرود خوێنەکان لە بەر هاوار و قیژاندن دەنگیان گیراوە، سرودەکە بە یەک هەوا دوو پات دەکرێتەوە. سەت جار سرود تەواو دەبێ و دوو بارە دەست پێدەگرێتەوە.
« دۆن جنزیو» لێیان دەپرسێ:
- بۆ کوێ و دەچنە لای کام یەک لە پیرۆزەکان ؟
زیارەتکەران لە وەڵامدا دەڵێن:« بۆ کن سن دومینیک دوکوکولو »
دۆن پاسکال بۆ کەشیش ڕوون دەکاتەوە کە سن دۆمینیک پیرۆزێکە کە خەڵک لە مار پێوەدان دەپارێزێ.
هەر چەندە زیارەتکەران هەموو تۆزاوین و سەر و پۆڕێکی شێواوی شەیتانیان هەیە. دۆن پاسکال لە نێو ئەواندا کاسارولای جادو گەر دەناسێتەوە. گاری ڕادەگرێ و لە ژنی جادو گەر دەپرسێ:
- چ ڕوو داوێکی تازە پێشبینی دەکەی ؟
کاسارولا غەیب دەڵێ و دۆن پاسکال خەرافاتییە.
جادو گەر لە وەڵامدا دەڵێ : « شەر ساز دەبێ و پاشان تاعون دێت
دۆن پاسکال دەڵێ : « ئەوانە پێوەندیان بە دنیای منەوە نیە.
گای زەلام بە شاخی گەورە و بێ فایدە لە گیاکانی قەراخ خەندەکی پەنا جادە دەلەوەڕێن. دوو ئوتو بوسی شەق و لەق بە وێدا تێدەپەڕن. لە سەر بانی خانوەکان تەختەی ڕوبی تەماتە دەبینرێ کە بۆ وشک کردنی تەماتە لە بەر تاویان داناون.
منداڵێک جار و بار دێتە سەر بان و بە کەچکی دار ڕوبی ڕەنگ سور تێک وەر دەدا.
گاریە دەگاتە فوسا. دۆن پاسکال لە پێش موسافیرخانەی « تورنسول» کەشیش دادەبەزێنێ و دەکەوێتە ڕێ تا مەجبور نەبێ سڵاو لە « برمنیچە» بکات کە لە دەرگای موسافیر خانە ڕاوەستاوە. مودیری موسافیرخانە بە تاڵوکە دێتە پێشوازی کەشیش و بە خۆشی پێشوازی لێدەکات و بە بزەیەکەوە دەڵێ :
- بنە ماڵەی جیراسولە هەتا هەتایە مەمنونی محبەتەکانی تۆیە. یەکەم بۆ ئەوە کە بیانکینات لە مەرگ نەجات دا و پاشان بۆ ئەوەی بەختەوەری ویت دابین کرد.
کەشیش دەپرسێ :

- من بەختەوەری بیانکینام دابین کردوە ؟ بە شەرەفم خانم برەنیچە من دەستم لەو کارەدا نە بوە.

- کە وا بوو تۆ زەماوەندی وانت جێبەجێ نەکردوە؟ چما نازانی کە خزمایەتی لە گەڵ بنە ماڵەی کۆلامارتینی بۆ بنە ماڵەی جیراسولە چ بەختەوەرییەکی گەورەیە ؟ ئیمرۆ من تەواوی خزمەکانی تری بیانکینا بۆ خواردنی نیوەڕۆ داوەت دەکەم تا ئێوە بزانن کە کەسانی بنە ماڵەی جیراسولە لە ئاست شەخسی ئێوە چەندە هەقناسن.

دۆن پاوڵۆ مات دەبێ. لە دوو دڵی دایە لە وە کە برە نیچە لە ئیشتیبا بێنێتە دەر. بەڵام مودیری موسافیر خانە دوو بارە درێژەی پێدەدا:

- سروشتییە کە تۆ بێگومان لە ڕۆژی شاییدا دەبێ شاهیدی مارە کردن بی. هەر چەند لەو ڕۆژە دا بۆ شوێنی کەشیش نشینی خۆشت گەڕابییەوە. مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر ڕێگا بدەی خەرجی سەفەری ئەو ڕۆژەتان دەدەم. ڕاستی هیچ دەزانی کە دەمانەوێ ناوی منداڵەکەی چ دادەنێین؟

دۆن پاوڵۆ بە ترسەوە دە پرسێ : « کام منداڵ ؟»

برە نیچە ڕوونی دەکاتەوە:

- مەبەستم ئەو منداڵەیە کە لە دایک دەبێ. ئەگەر کوڕ بێ ناوی دەنێین پائولینۆ، ئەگەر کچیش بێ ناوی دەنێین پائولینا، ئەوە ڕای بیانکینایە.

کەشیش دەڵێ: « بیر و ڕایەکی سەیر و ئەنجام گرە» هەر چەند من بە شەرەفم سوێند دەخۆم کە من بێتاوانم. ئەوەی لێرەدا ئەنجامدانی دژوارە ،ڕاکێشانی موافەقەتی بنە ماڵەی کولامارتینی یە لە گەڵ ئەم پێک گەیشتنە.

برە نیچە بە سەیرەوە دەپرسێ: « چۆن ؟ بنە ماڵەی کولامارتینی موافەقەت ناکات

کەشیش دەڵێ : « دۆنپاسکال موخالیفە. لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بنە ماڵەی کولامارتینی خزمایەتی لە گەڵ بنە ماڵەی جیراسولەی بێ شەرمە و ناتوانێ ئەم ریسواییە قبوڵ بکات.

برە نیچە ڕەنگی دەگۆڕێ و بێدەنگ دەبێ، پاشان سەبارەت بە بنە ماڵەی کولامارتینی زار لێک دەکاتەوە و هەر چی بە زمانیدا دێت نایگێڕێتەوە و دەڵێ :

- چما ئەوانە خۆیان لە جێی کێ دادەنێن ؟ داخوا پێیان وایە کەس ئاگای لە کاری وان نیە ؟ ئێوە ئاغای کەشیش سەر بە کەشیش نشینێکی دیکەی شتی وا لێرە هەن کە تۆ ناتوانی لێیان ئاگا دار بی. بەڵام هەر لێرە لە هەر کەسێکی دەتانەوێ پرسیار بکەن تا بزانن سەبارەت بە بنە ماڵەی کولامارتینی چت پێدەڵێن.

دۆن پاولۆ دەڵێ : « ئەو مـەسـەلانە بۆ من سـەرنج ڕاکێش نین » دەیەوێ بچێـتە ئەو ژوورەی کە بۆیان دیاری کردوە. بەڵام برەنیچە دەست هەڵناگرێ و دەڵێ:

- دۆن پاسکال تەنیا سـەبارەت بە جیاز ژنێکی هێناوە کە دە ساڵ لە خـۆی گەورە ترە و ئەحـمـەقێکی تەواو بوە. ئیمڕۆش بنە مـاڵەی کولامـارتینی لە ڕێگای داهاتی کەمی جیازی ئەو ژنە ئەحمەقە دەژین کە لە گەڵ خۆی هێنا بوو. دۆن پاسکال هەر بۆیە نەیویستـوە خـوشکی شـوو بکات نە وەکو میراتی بابی لە گەڵ بەشـبکات. ئەو دەم ئەوانە چۆن ڕێگا بە خۆیان دەدەن کە فیز و ئیفادە بفرۆشن و خەڵکی تر بە کەم بزانن. لە کـاتێکا خـۆیان ئەوەندە بەد بـەخت و چارە ڕەشن ؟ لێـرە هەمـوو کـەس لە مێژووی بنەماڵەی کولا مارتینی ئاگادارە.

دۆن پاولۆ دەڵێ:

- هەر چی بێ بنە مـاڵەی کولا مـارتینی مـێـژوویکیـان هەیە بە خـەرابیش بێت. لە کاتێکا بە قەولی دۆن پاسکال کەس نازانێ جیراسولەکان لە بنکام پنچک سەریان هەڵداوە.

ئەو قسـانـە بەس بوو بۆ ئەوەی برەنیـچـە ئاگر بگرێ و زار بکاتـەوە و دەست بکا بە گێڕانەوەی مێژووی بنە ماڵەی جیراسولەکان. بێگومـان ئەگەر برە نیچە شەجەرە نامەی بنە مـاڵەی خۆی نا گەیێنێتە سەردەمی شەڕەکانی خاچ، تـەنیا لە بەر ئەوەیە کورت کردنەوە لە بـەر چاو دەگرێ. بەڵام هەر چۆنێک بێ پێ لەسـەر ئەوە دادەگرێ کە جیراسولەکانیش بۆ خۆیان مێژوویکیان هەیە.

- کێیە کە مێژوولکەیەکی نەبێ؟ هەر کەس بۆ خۆی مێژوولکەیەکی هەیە.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « فـیلسـوفێکی خـەڵکی « مـارسیکا » بە ناوی « بنە دێتو کـروچە دوپسکا سرولی» سابیتی کردوە کە هەمـوو شت مێژوە وهیچ شـتێک لە مـێژوو بە دەر نیە »

برە نیـچە درێژەی پێدەدا :« چما ئێمە لە هەوا پەیدا بووین.؟ چما ئێمە ئادەمیزاد نین ؟

دۆن پاولۆ پشـێ ڕاستی دەکا کە :

- جیراسولەکانیش لە پاشماوەکانی حەزرەتی ئادەمن. بەڵام لە کام لق و تایفە یان کـــەس نازانێ. بـەڵگە و پێـــشـــینە بزر بوون، بەڵام بێگومـــان باپیـــری هەوەڵی جـیراسـولەکـان حـەزرەتی ئادەمـە. تەنانـەت ناوی حـەزرەتی ئادەم کـە لە باخـێکدا هاتۆتە دنیا و ژیاوە - باخێکی کە بەهەشتی سەر زەوی بوە - دوور نیە کە ئادەم

جیراسوله بوو بێت.
برەنیچە دەڵێ : « تۆ بەڵگە بە چی ئەم قسانە دەکەی ؟»
دۆن پاولۆ وەڵام دەداتەوە و دەڵێ :
– من تەنیـاوای دادەنێم گریمانە یە و هیـچی دیکە. بەڵام دەبێ بزانین کـە بە قـەولی یەک لە فیلسوفەکان، گریمانە وەک چرای رێنوێنی زانستە. لە تەواوی بەڵگەکانی کە باسی حـەزرەتی ئادەم دەکەن لە هیچ کوێ باسـی ناوی بنە ماڵەی وی نەکراوە و لە هەموو شوێنێ بە ڕەمەکی بە ناوی چکۆڵەی « ئادەم » ناوی هاتوە.
برە نیچـە بە ئیـعـتراز دەڵێ :« دۆن پاسکالیش دەتوانێ ئیـدیعـا بکا کـە ناوی وی کولامارتینی بوە. مەبەستم ناوی حەزرەتی ئادەمە.
دۆن پاولۆ لە ڕوونکردنەوە دا دەڵێ:
– ئیدیعایەکی ئەو تۆ دەبێتە نیشـانەی بێ ئاقڵی. باوکی کولا مارتینی لە تێکەڵیی دوو بنە مـاڵە« کـولا » و « مـارتینی» پێکهـاتوە. بەڵام پێش حــەزرەتی ئادەم بنە ماڵەکانی کولا و مـارتینی هێشتا پێک نە هاتبوون. کە وا بوو ئێستا گریمانەی ئەوە کە کولامـارتینی ناوی بنە مـاڵەی ئادەم بـوو بێت، ڕەت دەکرێتەوە. بە پێـچەوانە بە تەواوی دەکرێ وای دابنێین کە ئەو ناوی « ئادەم جیراسولە» بوە. ئاشکرایە کە ئەوە گریمانەیە و هیچیتر.
ئەم گـریمانەیە ، برەنیـچـە زۆر ناڕەحـەت دەکا و دەڵێ:« من بیر و ڕای کـەشـیـشـی فوسایی لە برام دەپرسم.
دۆن پاولۆ هەول دەدا لەم بڕیارە پەشیوانی کاتەوە، دەڵێ:« بۆ برات زەحمەت دەدەی
برە نیچە دەڵێ:
– من بۆ ئەو کارانە سەرم دێشێ. ئێمە کە بە فیدا کـاری زۆر ئامادە بووین یەکێ لە کەسـانی بنە مـاڵەمـان بۆ خوێندن بنێرین بۆ ئەوە بوو کـە یەکی خـوێندەوار لە بنە مـاڵەماندا هەبێ. ئەگـەر لەم جـۆرە کارانەشـدا نە توانین پرسـی پێبکەین، فـایدەی دەرس خوێندنی وی چبوە ؟
پاش ئەوەی برە نیـچـە دۆن پاولۆ بـە جێدێڵێ، نامـەیەکی خـێرا بۆ دوکـتـۆر « نۆنزیو سـاکـا » دەنووسـێ و تکای لێـدەکـا چونکە پێـویسـتی بەو هـەیە وەک دۆست و وەک دوکتۆر بە خێرایی بێتە« فوسـادی مارسی».
لەم کاتەدا بێکارە کان کە کاتی خـواردنیان هاتوە دێنە پێش میوانخانەی تورنسل و لە سـەر کورسییەکان پاڵ دەکەون. ئەوانە پیاوە ئاقڵەکانن کە حەفتەیەکە ڕیشیان نە

تاشیوە، تەنیا کراس و سەر پێیی یان لە پێ دایە و دوگمەی یەخە و شالواریان دانەخستوە. جگە لە وان لاوانیش هەن کە کاری جۆر بە جۆریان هەیە. بەڵام هەموویان وەک سەر تاش دەچن. قژی سەریان چەور کردوە و دەلنگی شالواریان رێک و پێکە. لە نێو ئەم لاوانە دا زەلامێکی بە ساڵا چوو کە وا دێتە بەر چاو وەک لۆتی دێهاتی ماسکی شانۆ گەری لە دمو چاوی خۆی دابێ بە سمێڵی چەخماخی و ریشی حیز و کڵاوێکی گەورە و لێوار بەرز، خەریکی وتار دانە. ئەم کابرایە بە راحەتی لە سەر چوار کورسی پاڵی داوەتەوە و لاقی خستوونە سەر کورسییەکی دیکە و هەر تک باسکی لێک بڵاو کردوون. کیژێکی جوان بە پێش موسافیر خانە دا تێدەپڕێ. کابرا ڕاست دەبێتەوە و سڵاوێک لە کیژەکە دەکات و لە کاتێکا چاوەکانی دەتروسکێن و سمێڵی دەلەرزن وددانان لێک دەدا، وەک بەرازی دەریایی پشوو دەدا. کیژەکە سوور هەڵدەگەڕێ و ڕێگای خۆی درێژە پێدەدا. یەک لە لاوەکان دەڵێ:« روخساری ئەم کیژە زۆر دێهاتییە.»

بەڵام لە ڕاستیدا دیارە کە کیژی ڕێبوار بەو کوڵمەی سوور ومەمکی قوت و سمتی خڕی ساخ و سلامەتە.. تێپەڕ بوونی ئەم کیژە هەوەڵین ڕووداوی گرنگی بەیانی ئەم رۆژەیە. لە گۆشەی مەیدان هەتیوێکی شاگرد نانەوا ڕوو داوی دووەم خەبەر دەدا. ئەوەش هاتنی کیژەکانی سەرۆکی نیزکەی ڕێگای ئاسنە. لە پێش موسافیر خانەی تورنسل لاوان وەک ئەو سەر بازانەی کە بیانەوێ دابی ڕیزی نیزامی ئەنجام بدەن، بە ڕیز وێستاون. دوو کیژی گەنج، زێر، برۆ هەڵگرتوو، برۆ کەوانی، بە قژی بۆری کەمرەنگی زێوینی و بە چاوە زەق و بە شێوەی ڕەوتی ماین بەوێدا تێدەپەڕن. بەم چەشنە ڕوو داوی گرنگی بەیانی کۆتایی پێدێت و وتو وێژی پیاوان دەست پێدەکات. تاریفکەری جوانیی گوندی بە ڕەوانی دەست بە قسان دەکات و مەنتیقی خۆی لە سەر بناخەی پێک گرتنی بیفتەکی کاڵ و گوشتی گای کوڵاو شێدەکاتەوە.

دۆن پاولۆ لە برەنیچە دەپرسێ : « ئەو کابرایە کێیە ؟»

برە نیچە لە وەڵامدا دەڵێ :« ئەمە گەورەترین پارێزەری ئێمە، ئاغای « مارکۆ تولیوزابالیا » ناسراو بە زابالیۆنەیە.

ئەم ناوە لە گوێچکەی دۆن پاولۆ دا بێگانە نیە. بۆیە دەپرسێ:

– ئەو سەر دەمێک ڕێبەری سۆسیالیستە هەڵەشەکانی « ماکسیمالیست» ی ئەم ناوچەیە نەبووە.؟

– بۆ چی. خۆیەتی، بەڵام هەر چی بێت پیاوێکی زۆر باشە.

زابالیونە لە دەرگای موسافیر خانە چاوی بە کەشیش دەکەوێ و خۆی پێ دەناسێنێ:

– بەندە زابالیا پارێزەری داواکان. شانازی بە دیدارت دەکەم. ببورە ئێوە کەشیشی ناوچەن ؟

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « کام ناوچە ؟»

– ناوچەی ئوسقۆف نشین. .. ئەگەر ئەم پرسیارەم لە ئێوە کرد لە بەر ئەوە بوو دەمویست بزانم داخوا ئەوانەی کە بە بۆنەی چوني سەر بازی بۆ ژێر ئالا بانگ کراون کە بێن مەوعیزە بکەن، دیاری کراون یا نا و کامەشیان دێتە لای ئێمە.؟

دۆن پاولۆ وەلام دەداتەوە:

– ئەوان تا چەند ڕۆژی دیکە دیاری دەکرێن. بەلام من سەر بە کەشیش نشینێکی دیکەم. کەشیش نشینی « فراسکاتی »

دۆن پاولۆ لە وە کە خۆی بەم سەر و وەزعە لە بەرانبەر خەلکێکدا دەبینێ کە لە سەر دەمی منداڵییەوە سەبارەت بەو لە زمانی خاوەن ملکان لەعنەت و نەفرین و لە زمانی فەقیرانیش تاریف و وەسفی بیستوە، کەمێک هەست بە داخ و نارەحەتی دەکا.

زابالیونە لە بواری ڕەوانی و پارێزەری و قسە زانی بە ناو بانگ بوو. ڕۆژەکانی کۆبوونەوەی دادگا کە دەیانزانی زابالیونە قسان دەکات، دوکانەکانی کەوش فرۆشي و دار تاشی و لیباسی دروون، بە جارێ خالی دەبوون. تەواوی ئەو کەسانەی توانیبایان بۆ بیستنی قسەکانی وی دەچوون و چەپلەیان بۆ لێدەدا. نەتیجە گرتنەکانی وی ببوونە مەتەل و مەسەلە.

ئەو تاوانبارەی زابالیونە بەر گری لێدەکرد ئەوەندە بۆ پارێزەری خۆی گرنگی قایل بوو، ئەوەندە لە خەمی مەحکووم بوونیدا نەبوو. ئەو لە گەل تێپەڕ بوونی زەمان ببوە« ئورفە» ١ ی مێللی. پاش گۆڕانی ڕێژیم دەستەیەک سەر باز بوون بە مەعموری گرتني وی. بەلام ئەو لە بەر هەیوانی بالەخانەی خۆی بە وانی گوت : « ئەی هاو نیشتمانانی من، ئەی ئەو کەسانەی خوێنیان لە گەل خوێنی من یەکە، ئەی برایان...» سەر بازەکان پاش ئەوەی ماوەیەک گوێیان بۆ قسەکانی ڕاگرت، بێ

---

١ – ئورفە ( Orphee )گەورەترین موسیقا ژەنی سەر دەمی کەونارا کە بە بیستنی دەنگی وی دڕندەش بێهۆش دەبوون و لە بەر پێیانی دەکەوتن. لە شەوی بوکهێنانی مار بە ژنەکەیەوە دا و ئورفە چوە جەهەندەم تا بە ئاوازی خۆشی دلی دێوەکانی جەهەندەمی بێنێتە بەزەیی و ئەوانیش ژنەکەی بدەنەوە،

ئەوەی بێگرن گەڕانەوە. پاشان دەستەیەک ژاندارمە هاتن بۆ گرتنی. ئەم دەستەیە خافڵاندیان و گرتیان. زاریان بەست و بردیانە زیندان. لە ڕێگادا زابالیونە بە ئاماژە و بە حەرەکاتێکی کە دڵ بۆی دەبوو بە ئاو دەپاڕاوە کە ئازادی بکەن. چاوە گەورەکانی وەک چاوی گا دەسوڕاند. هێندێ جار لە عاسمان و هێندێ جار لە زەوی داوای یارمەتی دەکرد. لە زاری بەستراوی کەف دەڕژا. ژاندارمە ئەمریان پێکرا بوو تەماشای نەکەن. تەنانەت کاتی پرسیاریش پەڕۆیان لە زاری نەکردەوە. حوکمی لێکرا بوو لە وەڵامی پرسیاری پۆلیسدا تەنیا بە ئاماژە بەڵێ یا نا، وەڵام بداتەوە. بۆ ئەو کارەی هیچ پێویست بە گوتن نەبوو. چونکە بەس بوو کە بە ئاماژەی سەر وەڵام بداتەوە. بەڵام پاش چەند ڕۆژان بە دەستوری کار بەدەستانی بەرز ئازاد کرا. بە دوای ئەوە دا زابالیونە زەحمەتی زۆری کێشا تا وا بکا خەڵک وتار و قسەکانی ڕابردووی لە بیر بەرنەوە. ڕیشی بزنانەی خۆی کە لە ساڵەکانی خوێندنی زانکۆ دا بە شێوەی مازینی کورتی دەهێشتەوە، کردی بە ڕیشێکی درێژی تۆپی بە شێوەی بالبو. بۆ ئەوەی قیافەیەکی بە سام و شەڕانی بدا بە خۆی، سمێلی جارانی کە لە بەر تەمبەڵی و گوێ پێنەدانی ئاشتیخوازانە و ئازادیخوازانە شۆڕی کردبوونەوە، وەریگێڕان بۆ سەرەوە، ئەم گۆڕانکارییە لە خۆیدا، بەر چاوترین و لە ئەنجامدا دەردەدار ترین فیدا کاری بوو کەوتار دەر و قسە زانی پێشوو بە ناچاری ملی بۆ ڕاکێشا بوو.

بەڵام کێ دەتوانێ گشت فیداکارییە بچوکەکان و ڕۆژانەی دیکەی ، وەک چاو پۆشی لە هزر و بیر و باوەڕ و هەڵسەنگاندنی وشە گەڵ لە باسی دەوڵەت و مەجبور بوون بە پچڕاندنی پێوەندی لە گەڵ ئەو کەسانە کە لە بواری سیاسی گومانیان لە سەر بوو، بژمێرێ؟ بە هەق دەبێ قبوڵ بکەی کە زابالیونە تەواوی ئەم نیەت باشییە کە بۆ ئەم فیداکاریانە لەو چاوەڕوان دەکرا، لە خۆی نیشان دا. لە گەڵ ئەوەش هێشتا نەیتوانیوە ئابڕو و ئیعتیبار بێنێتە دەست و لە تەشکیلاتی تازە دا هەمیشە دوور ڕاگیراوە.

---

ئەو شتەی لەم سالانەی دواییدا زۆر ئازاری داوە ئەوە بوە کە مەجبور بە بێدەنگی بوە. ئەویش لە کاتێکدا کە دەرفەتی هەبوە ڕوحی حەشیمەت بهاروژێنێ و بیگەیێنێتە پلەی ڕووداوەکانی ڕۆژانە. بەم جۆرە هەڵکەوتێکی وا گەورەی لە کیس چوە و بۆتە دەردێکی مەزن.

دۆن پاوڵۆ دەست بەجێ دەکەوێتە ئەم فیکرە کە دەتوانێ گوێ نەداتێ و ژیرانە

هێندێ پرسیار لە پارێزەری داوایان بکات لەم بارەوە کە داخوا هێشتا لە دەشتی فۆچینۆ کەسانی سۆسیالیست پەیدا دەبن یا نا و پێی دەڵێ:
– ئەگەر لە ناوچەی کەشیش نشینی من خزمەتێکم بۆ تۆ لە دەست دێت، بڵێ تا بە گیان ئەنجامی بدەم.
کەمی مابوو زابالیونە کەشیش ماچ بکا. بە ئاهەنگێکی پاڕانەوە دەڵێ :« ئەو شانازیەم بدەیە کە نانی نیوەڕۆ لە ماڵی من بخۆی.»
دۆن پاولۆ لە پێشدا خۆ دەگرێ. بەڵام لە ئاخر دا قبوڵ دەکات. بۆ ماڵی زابالیونە لە پێشدا دەبێ بە بەشی کۆنی گوندیدا بڕوی کە تێکەڵاوێکە لە کوچە و کۆڵانی تەنگ و تاریک و وێران کە بە ناوی پیرۆزەکانی ناوچەیی ناو نراون و بە مەیدانی بچوک و بێدەنگ، دەورە دراو بە خانووی ئەوی کە بەردی سەر دەرانەیان لە گەڵ تێپەڕ بوونی زەمان ڕەش هەڵاتوون، تێپەڕی. لە پشتی پەنجەرەکان کە گوڵەکانی شەمدان و بادراویان بینەر دەخاتەوە یادی پەرژینەکانی پاراستن، کیژانی سەر بە بنەماڵە ڕەسەنەکان لە کەمین دانیشتوون و ئاخ هەڵدەکێشن. زابالیونە لە کاتێکدا کە چاو دەگێڕێ و ددانان نیشان دەدا بە حەرەکەتێی بەر چاو ناویان دێنێ و سڵاویان لێدەکات. پاش بەشی کۆنی ئاوایی، ئێستا بەشی تازە دروست کراو کە پاش بومە لەرزە بە شێوەی شارەکانی پارک دار دروست کراوە دەر دەکەوێ. کۆڵان و شەقامەکانی بە گوێرەی پێداویستی ناوچە زۆر بەرین وماڵە کان بە شکڵی ویلای کوێستانی بە پەنجەرەی سەوزی تازە ڕەنگ کراو دروست کراون. ناوی کوچە و شەقام و مەیدانەکان بە شانازی بە مێژووی تازە ناو دێر کراون. وەک دەڵێی ناسێنەری ڕوو داوی گرنگی مێژوویین. لە پێش خانوەکان،لە سەر حەوزەکانی فوارە. لە سەر دارەکان و لە ئەردەی باخەکان دروشمی قارەمانانە سەر بە حیزبی دەسەڵاتدار بە خەلوز و یا قەتران و یا گێچ و یا بە ڕەنگی جیاواز نووسراون. لە هێندێ شوێن لە دار و یا لە بەرد هەڵکەنراون و یا بە قەڵایی داڕێژراون. لە پێش ماڵی زابالیونە دەستەیەک وەستا و فەعلە بە نردوە نانێکەوە چەقۆ بەدەست لە سەر زەوی دانیشتوون و پێخۆری نانەکەیان بیباری سەوز و سوورە. دیوارێک لە دەوری ماڵەکە کێشراوە و بوتڵێکی شکاویان تێچەقاندوە. تێلی دڕویان بە دەوری باخچەکاندا کێشاوە، کابرایەک لە نێو باخچە لە سەر زیخ ئەژنۆی داداوە و دەورەی باخچەیەک پاک دەکاتەوە کە گوڵەکانی دیاردەی ئاڵای سێ ڕەنگی ئیتالیان.
زابالیونە دەڵێ :« من گوڵەکانم خۆش دەوێ. هێندێ شت هەن کە تەنیا گوڵ دەتوانن

دەریان بخەن.
ژنێکی بە ئەدەب، بەژن و باڵا بەرز و باریک کە ژنی زابالیونە یە بە قژی ڕەشی بادراو لە دەرگا دەر دەکەوێ. مێردەکەی پێی دەڵێ: « دەستی جەنابی کەشیش ماچ کە و بە تەنیا بە جێمان بێڵە.»
ژنی بە فیز دەستی کەشیش ماچ دەکا و دەڕواتە دەر. پاشان لە دالانی خانوو سێ کیژی گەنج بە لیباسی قاوەیی تاریک دێنە پێش. هەر سێکیان لاواز و ڕەنگ پەڕیون و وەک کرم وان. مرۆڤ دەخەنە بیری سێ تەمام کە لە سارداو دا شین بوو بن. ئەوانە کیژی زابالیونە ن.
باوک دوو پاتی دەکاتەوە: « دەستی جەنابی کەشیش ماچ بکەن و تەنیا بە جێمان بێڵن.»
کیژانی گەنج دەستی کەشیش ماچ دەکەن و بە نیشانەی ڕێز گرتن ئەژنۆ دە چەمێنن و دەڕۆنە دەرێ.
لە ژووری نانخواردن بوفەیەکی گەورە لە داری گوێز دانراوە کە پڕە لە میوەی جوان و گۆزەی شەراب و مورەبا. لە سەر داری بوفە کە ئەم نووسراوەی قارەمانی هەڵکەنراوە. (Dulce et decorum est propatnia mori) یانی چەندە شیرین و جێگای شانازییە مردن بۆ نیشتمان .
زابالیونە دەڵێ: « من بە هەڵکەوت ئەم بوفە یەم وەگیر خست بەڵام نووسراوەکە خۆم داومە هەڵیان کەندوە. دیارە جەنابت تێدەگەی کە ئینسان ناتوانی تەنیا بە نان بژی.
لە ڕاستیدا هێشتا لە سەر سفرە دانە نیشتوون کە « پاستا ئاچیوتا» دێنن (خواردنێکی وەک ماکارۆنی کە پێش خواردن دەیخۆن.)
زابالیونە بە دەنگی بەرز ئیشتیای لە ڕادە بە دەری خۆی بە ژنەکان ڕادەگەیێنێ کە لە مێبەق دانیشتوون. ڕوومەتی سوور هەڵدەگەڕێن، چاوەکانی لە خۆشیان دەدرەوشێن و جار و بار سمێڵە ئەستورەکانی بە سەری قامکان بادەدا. ڕاست وەک منداڵێکی گەورە و ئەوسن و کوڵمە سوور دەسرەی سفرە لە ملی گرێدەدا. بە ئاهەنگێکی گەرم و خالیسانە کە نیشانەی خاسیەتی ساکار و بێ عەیبی وەرزێرییە لە گەڵ کەشیش قسان دەکات و بە نێو چاوان تێکنانێکی کە لاوان بە کەم دەگرێ دەڵێ : « لاوەکانی ئیمڕۆ لە داب و ڕەسمی خواردن بێ ئاگان هەر بۆیەش خەراپن.»
کەشیش لێی زیاد دەکا: داب و نەریتی پێشینان وردە وردە دێ لە بەین دەچێ.

لە گەڵ ئەوەش زابالیونە لە نرخە مەعنەوییەکان خافڵ نیە و لە درێژەی قسەکە دەڵێ:
- من کیژەکانی خۆم هەموو یەکشەمۆیان دەنێرمە نوێژی مەسح. ئەگەر باوەڕ ناکەی دەتوانی لە دۆن چیراسولە ی کەشیشی فوسا بپرسە. بە ڕاستی ئەگەر ژن لغاوی مەزهەبی نەبایە چ دەبوو ؟
لەم ناوە دا ژنەکان لە ئاشپەزخانە خەریکن نان دەخۆن. دۆن پاولۆ کە دەبینێ زابالیونە بە چ ئیشتیا و تەمایەک لە پێشدا چەنگاڵ دە سپاگتی ڕادەکا و لێکی دەهاڵێنێ و دە زاری ڕادەکا سەری سوڕ دەمێنێ و لە دڵی خۆیدا دەڵێ:« کابرا دەخنکێ.» بەڵام بێگومان زاری زابالیونە، زاری پارێزەرێکی شارە.
کەشیش لە مەبەستی دیداری خۆی خافڵ نیە و قسە دەباتە سەر یەکێتییەکانی وەرزێری کە دەوڵەت هەڵیوەشاندونەوە و دەڵێ:
- بەر لە پێکهاتنی دەوڵەتی ئێستا من تەشکیلاتی وەرزێرانی کاتۆلیکم پێکهێنا بوو. پاشان تەشکیلاتی ئێمەیان هەڵوەشاندەوە. واتە وەزعی ئێمە و ئێوە وێکدەچێ. ئێستا لەم ناوچەیە وەزعی ڕوحی و فیکری سۆسیالیستەکانی ئەندامی سەندیکا چۆنە ؟
زابالیونە لە پڕ خۆ کۆ دەکاتەوە، قیافەیەکی جیددی بە خۆوە دەگرێ. دەست لە خواردن هەڵدەگرێ، لیوانەکەی پڕ دەکا، دەیخواتەوە، دانەکانی دەکۆڵێتەوە. جارێکی دیکەش لیوانەکە پڕ دەکاتەوە و پێی دادەکات.
دۆن پاولۆ بۆ ئەوەی میوانداری خۆی وەزمان بێنێ و هەر چی بە خەیاڵی دادێت لە بارەی وەزعی کەشیش نشینی فراسکاتی دەیهۆنێتەوە. ئاخرەکەی زابالیونە دێتە زمان و دەڵێ :
- واقعیەتی ڕەسمی ئەوەیە کە لە پێشدا بەڵشەویزم لێرە حکوومەتی دەکرد. دیارە ئایین و ئەخلاق و خاوەن مڵکی خسوسی لە ژێر پێ نرا بوو. پاشان « ئەلغ ئەلغ» ٢ سەری هەڵدا. ئایین و ئەخلاق و خاوەن مڵکیەتی گەڕانەوە شوێنی خۆیان.
دۆن پاولۆ بە هەوایەکی پڕ لە خسوسیەت دەڵێ :
- ئێستا ئێمە نە لە مەیدانی گشتین و نە لە سەر میمبەری کلیسا. بەڵکوو تەنیا

١ - مەبەست ئەلغ ئەلغ موسولینی پێشەوای فاشیستی ئیتالیایە. کە بۆ گاڵتە پاش گەلێک ناز ناو و نیشان ناویان لە « ئەلغ ئەلغ» دا کورت کردۆتەوە. نووسەر لەم کتێبە دا ناوی موسولێنی بە ئەلغ ئەلغ دێنێ.

خۆمانین. واقعیەتی رسمی هەموومان دەیزانین. بەڵام واقعیەتی غەیرە ڕەسمی کامەیە،؟

زابالیونە دەڵێ :

- واقعیەتی غەیرە ڕەسمیش ئەوەیە کە لێرە برسیەتی و نەزانی زاڵ بوو. هەقیرەکان وردە وردە لە یەکێتییەکانی وەرزێری دا کۆ دەبوونەوە.کە لە پڕ ئەلغ ئەلغ پەیدا بوو، یەکێتییەکانی تێکدا، بەڵام برسیەتی نەک هەر لە بەین نەبرد بەڵکوو لەو ماوەیە دا زیاتریش بوە.

کەشیش دەپرسێ : « ئەندامی پێشووی یەکێتییەکان ئێستا چدەکەن ؟» ئەمە خاڵێکە پتر لە هەموو شت بۆ کەشیش بۆتە گرێ.

زابالیونە وەڵام دەداتەوە:« بە ڕەسمی وەهایە کە هەموویان سەر لە نوێ هاتبنەوە دنیا. لە مەو دوا لە سایەی ئەلغ ئەلغ ژیانێکی تازەیان دەبێ. پیاوێک کە تەڕ و تازەی و شادی بە نیشتمان بەخشیوە.

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « بێگومان بە غەیرە ڕەسمی هەر سۆسیالیست ماونەوە.؟»

ئیدیعای وا پێوە نانە. وەرزێڕەکان بۆیە چوو بوونە نێو یەکێتییەکان کە تەختە ئەمنیەتێکیان هەبێ. سۆسیالیزم لە زەینی واندا ئەو تەختە ئەمنیەتە بوو. بۆ خەڵکێکی زۆریش لە وان، سۆسیالیزم بە مانای کار کردن و تەندور و سک تێر کردن بوو. بەڵێ، کار کردن و ئاسودە نوستن، بێ خەیال لە خەم خواردنی دوا ڕۆژ. لە ئاوەندی یەکێتیەکانی فوسا لە پەنا عەکسی مارکسی ڕیشدار، عەکسێکی عیسا مەسیحیش هەبوو کە کراسێکی سووری لە بەر دا بوو. ئێوارەی ڕۆژەکانی شەمۆ وەرزێڕەکان دە هاتنە یەکێتی و سرودی « ڕابن ئەی برایان ئەی هاوڕێیان »یان دەخوێندەوە. ڕۆژەکای یەکشەمۆ دەچوونە نوێژی مەسح و بۆ ئاوازی دوعا ئامین یان دەگوت. کاری دایمی سەرۆکێکی سۆسیالیست ئەوە بوو کە نامەی ڕاسپاردن بۆ ئەملاو لا بنووسێ. ئێستاش هەمان بەزمە بەم فەرقە کە ڕاسپاردەی نامەکان سەرۆکی حیزبی دەوڵەتی یا کەشیش دەینووسێ. ئێستا ئیتر ڕاسپاردەی نامەکانی من نرخیان نیە هەر لە بەر ئەوەش وەرزێڕەکان کاریان بە من نەماوە.

- ئەو دەمیش کەس سۆسیالیستی ڕاستە قینە نەبوو.

زابالیونە دەڵێ:

- تاقە سۆسیالیستی ڕاستە قینە من بووم. دیارە لە نێو وەرزێڕانی سەر بە یەکێتیەکان کەسانێک هەبوون کە لە وانیتر وریاتر بوون و بزوتنەوەی زیندوو

کردنەوەی موسولینی بە تایبەت کاری بەو تیپە بوو. ڕۆژی نۆزدەی ژانویەی ١٩٢٣ (نازانم بۆ چی ئەم تاریخە لە زەینمدا ماوەتەوە و نایەوێ لە مێشکم بچێتە دەر) دەستەیەک لە سەر بازانی چاک خواز لە « ریوی زوندولی» ماڵی وەرزێڕی سەرۆکی یەکێتیان داگیر کرد، دەست و لاقیان بەست و تەواوی دەستەی سەر بازان کە ٢٢ کەسبوون دەست درێژیان بۆ ژنەکەی کرد. ئەم کارە لە سەعات یازدەی شەو تا دووی بەیانی درێژەی کێشا. دیارە ئەوە ڕووداوێکی بە تەواوی ساکار بوو. ئەو دەم چەند کەس لە وەرزێڕان بۆ فەرانسە و یا ئەمریکا پەنایان برد. بەڵام خەڵکێکی زۆر کە نەختە ئەمنیەتێکیان لە ئەندامەتی یەکێتی وەرزێڕاندا دۆزیبۆوە، ئێستا لە یەکێتیەکانی پیشەیی (شیرکەتەکانی دەوڵەتی) دا دوزیانەوە. ئیمڕۆ ناوی رەسمی ئەوان ئیتر وەرزێڕ نیە، بەڵکوو خاوەن گوندە.

دۆن پاولۆ بە ژیری دەپرسێ :

- لە گەڵ ئەوەش هێشتا دەبێ خەڵکی موخالیف مابن. ئەگەر وەزع خەرابتر بوە بێگومان دەبێ چەند کەسێک هەبن کە هێشتا سەر دەمی یەکێتیەکانی کە لە وێدا کرێکاران لانی کەم دەیانتوانی لە مافی خۆیان بەر گری بکەن، لە بیر نە بردۆتەوە.

زابالیونە دان پێدا دەنێ کە :

- بەیتی خۆمان بێ، منیش سۆسیالیسمم پێخۆش بوو. هەر وەک ژنیشم خۆش دەوێن. من باشترین وتارەکانی تەمەنی خۆم لە بارە سۆسیالیسمەوە داوە. دیارە لە بەینی خۆمان دەر نەچێ، من بە غەیرە ڕەسمی ئەم مەسەلەیەت عەرز دەکەم. لەم باسە تێپەڕین دەبێ بڵێم کە هەر چی موسولێنی تێیدا سەر کەوتوە، بە ڕاستی نیشانەیەک بوە لە کەرەمی خودا.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « پێت وانیە کە پێویستە مرۆڤ هێندێ جار فیدا کاریش شارەزا بێت ؟ »

زابالیونە بە دەنگی بەرز دەڵێ :

- فیدا کاری ! چەندە وشەیەکی جوانە! فۆدس کسری شتێکە لە ئایینی مەسیحیەت کە من پێم باشە. ئەوەی مارکسیزمی خەراپ کردوە، هەمان لایەني مادیگەرییە.

دۆن پاولۆ نازانێ زابالیونە ئەم قسانە بە جیدی دەکات یا، نا

پارێزەر قسەکان درێژە پێدەدا:

- من باش دەزانم سۆسیالیستی ئەو تۆ هەن کە نان و کار و ئاسایشی خۆیان فیدا کردوە. بەڵام تەواوی ئەوانە لە بەرانبەر ئەوە دا کە من فیدام کردوە، هیچە. من

شـتێكى بەرزتر و بە نرخـتـرم فـيـدا كردوە، ئەوەش فـيكرە. فـيداكـارى مـەعنەوى يەكجـار لە فـيـدا كـارى مـادى بە نرخـتـرە. بەڵام كێ دەتوانـێ لە ڕاسـتـيـدا زياتر لە قەشەيەك نرخى فيداكارى مەعنەوى بزانێ.؟

دۆن پاولۆ لە ژێر لێوانەوە دەڵێ : تۆ قارەمانـى !

زاباليونە لە وەڵامدا دەڵێ:

- قارەمانێكى نە ناسراو. پاش دوازدە ساڵ ئيرادەتى پاک و خاليس بە موسولێنى، ئيمڕۆ هێشتا بە چاوى كەسێكى گومانلێكراو سەيرى من دەكەن. تازە بە هەزار زەحمەت توانيومە ببمە ئەندامى ئيفتخارى بێ جيرە و مواجبى ئەنجومەنى ئێستاى شـار. كـاريشم لـەو ئەنجـومـەنە دا ڕاسـتكردنەوەى نووسـينەكـانە. شـار دار كـە بە ڕەسـمى بـلـيـمـەتە و منيش بە غـەيرە ڕەسـمى ئەحـمـەقـێک زياتر نيم. منـى كردۆتە مەعمور كە فەرمان و نووسراوەكانى وى لە ڕوانگەى ڕێزمانەوە چاک بكەم. ئێستا كـە نووسـين نازانێ سـەرى بخـوا، نازانـێ قـسـانيش بكات. نـاتوانێ وتـار بدات. لەكاتێكا كاتێ وا دێتە پێش كە دەبێ ئەو قسە بكات.

نان خـوراوە. ئێسـتـا بۆ قـاوە خـواردنە و دەچنە سـاڵۆنى مـيـوانـدارى. پەردەى ڕەنگ ئابى يان بە پەنجەرانەوە هەڵاوەسيوە. قەفەسـەكانى ديوار پڕن لە كتێبى تۆز گرتوو. سێ عـەكسى لە قـاپگيراوى كـەورە بە لق و گەڵاى شـانازى ڕازاوەنەوە. يـەكيـان لە مـازينـى بە قيافـەيەكى گرژ، يەكيان لە گـاريبـاڵدى بە كـراسـى سـوور و يەكيـشـيـان لە موسولينى لە ديوار دراون.

عەكسى زەرد و كۆن لە سـەر مێز بەر چاو دەكەون. سـەندەڵى ڕەحـەتى لە حـەسير كە بە ڕەنگى سـەوز ڕەنگ كـراون بۆ سـوڕان و نوسـتنى دواى نانخـواردن لـە سـاڵۆن داندراون.

ڕاست لە كـاتـى قـاوە خـواردنـەوە دا، چەند كـەس لە مـيـوانانى ڕۆژانەى زابالـيـونە وەژوور دەكەون. ئەوانە بريتين لـە فەرماندەى گاردى شـار و « دۆن جنزيو» ئەندامى دارايى و « دۆن سنو فونتە»ى دەرمانفرۆش. فەرماندە ليباسـى نيزامى پڕ لە زەرق و بەرقى ژەنڕاڵەكانى پێش شەڕى لە بەر دايە.

دۆن پاولۆ دەپرسـێ: « چەند كەس لە ژێر فەرمانى تۆ دا هـەن ؟»

- ئێسـتا تەنيـا يەک نەفەر. ديارە ئاگادارى كە ئەم بەشە فەقيرە و زۆر بە كـاوە خۆ پەرە دەستێنێ.

دۆن سنو فونتـە زەلامێكى خۆش قيـافەيە. بە سـمێڵـەكانى وەک شـا هەمبرتى يەكەم،

و قژەکانی بە شێوەی ماسکاگنی، و خاڵێکیشی لە سەر گۆنەیە و دەڵێ :
- پایە بەرز، من بە غیرەتەوە دڵنیایت دەدەمێ کە هەموو یەکشەمۆیان ژنەکەم بۆ نوێژی مەسح دەنێرم. ئەگەر بڕوا ناکەی دەتوانی لە « جیراسولە »ی کەشیش بپرسی. بە بڕوای من مەزهەب بۆ ژنان وەک خوێ بۆ گوشتی بەراز وایە و تەڕ و تازەییان دەپارێزێ.
« دۆن جنزیو» ش قژەکانی خۆی بە سەلیقەیەکی تەواو ڕۆن و شانەی لێداوە و ئەویش ژنەکەی بۆ نوێژی مەسح دەنێرێ.
دۆن پاولۆ نەخشێکی کە ڕیش و سمێڵ و شێوەی ڕازاندنەوەی موی سەر لەجیا نیشاندانی چینی ڕوناکبیر و خوێندەوار لە گەڵ وەرزێڕ و خاوەن مڵک یاری دەکات بە سەر سوڕ مانەوە چاو لێدەکات. ئەوەش تێدەگا کە بۆ چی لە زاراوی ناوچەییدا چینەکان بە وشەی « ڕەگەز » دیاری دەکەن. بۆ نمونە: ڕەگەزی وەرزێڕان، ڕەگەزی پیشە وەران، ڕەگەزی خاوەن مڵکان. کوڕی وردە مالیک کە خوێندنی خۆی تەواو دەکا و پاشان بە ناچاری دەبێتە کارمەندی دەوڵەت و یا خزمەتکاری ناوچە، خێرا هەوڵ دەدا لە بیر خەڵکی بەرێتەوە کە لە ڕەگەزی وەرزێڕانە و مووی سەری بە شێوەی کار مەندان دەتاشێ. ئەو دەم ئەگەر شێوەی قسە کردن و چاو گێڕان و برۆ هەڵتەکاندن و لغاوە بزاوتن و سیغار کێشانیش لە شێوەی موی سەر چاک کردن زیاد بکەن، ئەو دەم پێویست ناکا زۆر بیر لەوە بکەینەوە کە مرۆڤ لە گەڵ پارێزەر و دەرمانفرۆش و یا کار مەندی دەوڵەت تەرەفە و خۆی لە سەکۆی شانۆدا دەبینێ.
زابالیونو دەپرسێ: « باشە ، ئاغایان خەبەر چیە ؟»
سنو قەنتە دەڵێ:
- ئەم خەبەرە لە نێو بارمتە دانەرانی گوند نشین بۆتە قاو کە بانک لە حاڵی نابوتی و داخستن دایە. من دۆن پاسکال کولامارتینی پیتراسکاییم چاو پێکەوت کە وەک شێتانی لێهاتبوو. فەقیرە هەر چی لە جیازی ژنی ئەحمەقی بۆی ما بۆوە لە بانگی دانا بوو هێشتا نەیدەزانی کە وەزعی بانگ لە قەیراندایە.
زابالیونە دەڵێ:
- پێشتر کاتێ بانک وەر شکست دەبوو کار دەگەیشتە دادگا. بەڵام ئیمڕۆ مەسەلەکان لە بنە ماڵەکاندا جێبەجێ دەکرێن. دیارە لە بنە ماڵەی ئەلخ ئەلخ دا.
فەرماندەی گاردی شار دەپرسێ:
- ئێوە تا ئێستا لە بارەی پیاوێک بە ناوی پیترۆ سپینا شتێکتان بیستوە.؟ هیچ

یەک لە ئامادە بوان تا ئێستا لەم بارەوە شتێکیان نەبیستوە. دۆن پاوڵۆ خەریکە لاپەڕەکانی ئاڵبومێکی عەکسی کارت پستاڵ هەڵدەداتەوە.
فەرماندە لە ڕوونکردنەوەی پرسیارەکەی دا دەڵێ:
- ئەو کابرایە کوڕێکە لە بنە ماڵەی سپینا خەڵکی« روکاردی ماسی» کابرایەکە شۆڕشگێڕ و نیوە شێت. وەک زانراوە پاش ئاوارەیی دوو بارە بۆ ئیتالیا گەڕاوەتەوە تا سەبارەت بە گیانی موسولینی هەنگاوی خەراب باوێژێ. سێ مانگە پۆلیس وەدوای کەوتە و تەنانەت هێندێ نیشانەی وی لە وڵات بینراون. چونکە وەک دەڵێن ویستوویەتی خەرمانەکان بسووتێنێ. ئیمڕۆ لە ڕۆمەوە خەبەرێک هەبوو کە گرتوویانە.
زابالیونە دەڵێ:« شێتێک کەمتر. ئەو لەو شێتانەیە کە نازانێ رێک و پێکی و فیدا کاری چیە.»
سنو فۆنتە دەپرسێ :
- گوتت سپینا، خەڵکی « روکادی مارسی»؟ من ئەو بنە ماڵە دەناسم ولە گەڵ باوکی ئەو کوڕەی کە باسی دەکەن هاو دەرس بووم. باوکی پیاوێکی زۆر باشبوو لە کارەساتی بومە لەرزە دا مرد. ئەوەش یەک لە بنە ماڵە قەدیمییەکانە کە ئاخری بۆتە شەڕ.
زابالیونە دەپرسێ: « لە کوێ زانیوتانە کە ئەو ویستوویەتی خەرمانان بسووتێنێ؟ بۆ لە کاتی دروێنەدا لەم دەور و بەرە دیتویانە؟
فەرماندە لە وەڵامدا دەڵێ:
- نا، نا، نە ئێستا و نە لەم ساڵانەی دوایی کەس لەم دەور و بەرە نەیدیوە، ئەو جگە لە شار قەت تبلیغاتی نەکردوە. بەڵام هەوەڵین جار لە وەرزی دروێنە دا دیتراوە کە بە خەتی سوور لە سە دیوارەکان نووسراوە: «بژی پیترۆ سپینا» ئەوە نیشانەی وەیە ڕەنگە بۆ وڵات گەڕابێتەوە.
کەشیش دەپرسێ :« پێت وایە هەر بۆیە گەڕابێتەوە کە لە دیواران شت بنووسێ ؟
فەرماندە لە وەڵامدا دەڵێ :« نەک ئەو بۆ خۆی، لایەنگرانی نووسیویانە.»
دۆن پاوڵۆ هەناسەیەکی سەر سوڕ مانە هەڵدەکێشێ و دەڵێ:
- سەیرە! لایەنگرانی وی ؟ کە وابوو وەرزێری ئەوتۆش هەن کە شۆڕشگێڕ بن.؟ تینوایەتی بۆ هەنگاو نان بۆتە هۆی ئەوە کە کەشیش نیحتیات لە بیر بەرێتەوە.
فەرماندە هەناسەیەک هەڵدەکێشێ و دەڵێ :

– جم و جولێکی گەورە لە نێو لاوەکاندا هەیە. لە پەردەی « یەکێتیەکانی پیشەیی» دا مرۆڤ هێندێ پەیف دەبیسێ، مووی لە لەشیدا ڕاست دەبنەوە.
سنو فونتـە دەڵێ :« بەرەی تازە پێگەیشـتوو، بەرەیەکی مـەترسیـداوە. بەرەیەکە لە گـەڵ حـیـسـاب سـەر و کـاری هەیە. ئەم بەرەی تازە بـە جـیـدی وەر گـرتوە کـە کئۆپراتیزم» یەکێتیەکانی پیشەیی» کۆتایی سەرمایەدارییە و خۆشی ویستیاری نابوتی سەرمایە دارییە.
زابالیونە دەڵێ :
– ڕیشەی واقیعی دەرد هەر لەوە دایە کە مرۆڤ هەموو مەتڵەبەکان بە جیدی وەر بگرێ.. نابێ هیچ ڕێژیمێک بە جیدی وەر بگری، چونکە ئەگەر بێجگە لە وە بێت دیار نیە ئاخری کار چۆن دەبێ. ئەگەر کەسی فەرانسەیی خەیاڵێی وای هەبایە کە بە گوێرەی بەیاننامەی مافی مرۆڤ بژی، ڕاست ڕێگای دەکەوتە زیندان. ئایا ئێوە ڕۆژنامەکانی ئیمڕۆتان خوێندۆتەوە؟ لە ڕووسیا دوو بارە سزای ئیعدام بۆ لاوان دانراوەتەوە. بۆ چی ؟ ڕەنگە لە بەر ئەوە بێ کــە ئەوان تـەشکیــلاتی ڕێژیمی سۆسیالیستیان جیدی گرتوە. پێویستە ئەم ئەسڵە بۆ هەمیشە بخەینە گوێچکەمان کە تەشکیلاتی بنە مای هەر وڵاتێک تەنیا پێوەندی بە پارێزەرانی دادگا و کەسانی بە ساڵا چووەوە هەیە کە مانای زەبت و فیداکاری دەزانن و لاوان بە تەواوی دەبێ لەمە بێ ئاگا بن.
فرماندەی کاردی شاری پشتی دەگرێ و دەڵێ :
: کاتێک من مـەعـموری ئاگاداری کـتـێبـخـانەی گـەڕەک بووم. من تێناگـەم چ پێویستییەک بە کتێبخانە هەبوو.؟ هەر کەس دەیەوێ کتێب بخوێنێتەوە با بۆ خۆی کتێب بکڕێ. لە گەڵ ئەوەش کتێبخانە هەمیشە ئاواڵە بوو، لە ڕۆمەوە کتێب دەهاتن. لاوان دەهاتنە کتێبخانە دەیانویست لیستی ئەو کتێبانە ببینن کە سەرۆکی دەوڵەت نووسیبووی و دەیانگوت: « ببینن ! لێرە بە ئاشکرا نووسراوە کە کلیسا و ڕێژیمی پاشایەتی و سەرمایە داری دەبێ لە بەین بچن.» من هەوڵم دا بۆیان ڕوون بکەمەوە کە ئەو کتێبانە بۆ گەوران نووسراوە نەک بۆ منداڵان و کەسانی لە تەمەنی ئێوە دا. باشتـرە ئەوان ڕۆمـان بخـوێننەوە. بەڵام فـایدەی چی دەرەتان نەبوو بیـر و ڕایان بگۆڕین. ئاخرەکەی ناچار بووم بە ئیجازەی کار بەدەستانی سەرەوە ئەم کتێبانە لە ڕیزی کتێبخانە وەدەر بنێم و ئەوان لە قەفەسەیکدا قفڵ بدەم و بیشارمەوە.
سنو فۆنتۆ دەڵێ :

– پاشان لە کوڕەکەم بیست کە هێندێ نوسراوە لەو کتێبانە هاتۆتە دەر و بە تایپ نووسراوەتەوە و دەست بە دەست لە نێو لاواندا دەگەڕێ. هێندێ لە لاوان لە ویلای « چوار فـەسڵ» لەو لای سـێـڵاو گـر پێکەوە دادەنیـشن تـا بیـانـخـوێننەوە و لێـیـان بکۆڵنەوە. کـوڕەکـەم دەڵێ :« بۆ عـەمـەلی کـردنی ئەم شـتـانەی لەو کـتـێبـانە دا نووسراوە، شۆڕشێکی دیکە ڕێدەکەوێ...»

دۆن پاولۆ دەپرسێ :« ئەم کەسانە لە وەرزێڕانی لاون ؟»

فەرماندە وەڵام دەداتەوە:

– نە خێر. تەنیا سێ چوار لاوی قوتابین. کار بەدەستـانی دەوڵەت لە هەموو شتیان ئاگادارن و لە کاتی پێویست دا پێشی ئەم منداڵ بازارییە دەگیرێ.

زابالیونە سەر ڕادەوەشێنێ و دەڵێ :

– دەردەکانی هەرە خەراپ ئەو کاتەن کـە بەرەی لاو ئەوەی لە کتێبدا دەیخوێنێتەوە بە جیدی وەر بگرێ.

دۆن پاولۆ لە دڵدا بیر دەکاتەوە: « منیش لە کـاتـی لاوێتی دا ئینجیل وکـتـێبـەکـانی باوکانی ڕوحـانیم بە جیـدی دەگرت. بەرهـەمی ئەوە یە کـە ئیسـتـا لە خـاکی وڵاتی خۆم، لە چەند کیلۆ میـتری ئەو گونـدەی لێی هـاتوومە دنیا، بە بێگانە دەژمێردرێم. جگە لەوە نەخۆشیشـم و وەک حەیوانی دڕندە ڕاوم دەنێن.»

کەشیش و دەرمانفرۆش پێکەوە لە ماڵی زابالیونە دێنە دەر. کەشیش دەپرسێ :

– تۆ باوکی « پێـترۆ سـپینا »ت لەو کاتە دا دەناسی کە خوێند کار بوو؟ یا ئەویش وەک کوڕەکەی شێت بوو؟

سنو فۆنتە دەڵێ:

– ئێمە لە ناپوڵ پێکەوە یەکـترمـان ناسی. ئێمەش وەک زۆر لە خوێندکـاران ئەو دەم کـۆمـاریـخـواز بووین. «جیـوسـیپ مـازینی»[١] خـودای ئێمـە بوو. ئالبێـرتومـاریۆ پێغەمبەری زیندووی ئەو. پاشان هەر تکمان بۆ «مارسیکا» گەڕاینەوە و نیزیکەی لە یەک کـات دا ژنمـان هێنا. پاش چەند سـاڵ ئەو هاتە دیدەنی من، بەڵام ئەوەندە گۆڕا بوو نە دەناسرایەوە. من قـەت قسەکانی وی لە بیر ناکەم کە دەیگوت:« سـەر

---

١ – مـــــــازینی( Giuseppe Mazzini)نیشـتـمـانپـەروەری ئیتـالیایی لە دایکبووی ( ١٨٠٥-١٨٧٢ ) و دامەزرێنەری ئەنجومەنی نهێنی « ئیتالیای لاو» کە ماوەیەک لە ئاوارەییدا ڕایبوارد بەڵام لە هەموو شوێنێ بۆ ئازادی مـــیللەتی ئیـتـــالیـــا لە کـــوتی ســـــــەرەڕۆیی خــــەباتی کــــــرد.

دەمی شیعر کۆتایی پێهاتوە و سەر دەمی پەخشان دەستی پێکردوە. شیعر خەونی گەنجیەتین و ژیانی واقیعی پەخشانە. هەر وچەیەک هەمان ئەزمونی وچەی خۆی وەر دەگرێ. کار بەدەستـانی دەوڵەتی سـەر کـۆنەم دەکـەن کە بۆ چی کـورەکـەم هاوڕێیـانی خـۆی هاندەدا و باسی شـۆرشی دووەم دەکـات. من لە وەڵامی واندا دەڵێم: ئەوە ویستی تەمەنیەتی کە تەمەنی خەونە. ئێستا ئەو لە سەر دەمی شێعر دا دەژی. بەڵام پاشـان ژن دێنێ و دەبێـتە کـارمـەندی دەوڵەت و ئەو دەم سـەر دەمی پەخشـان دەست پێدەکـات. چ بەد بەختیـەکی گەورەیە ئەگەر لە ژیاندا شـێـعر نە دەبوو. بەد بەختی گەورە تر ئەوەیە ئەگەر دوای شێعر تۆرەی ئەسر نە دەهات.

دۆن پاوڵۆ دەپرسێ: « چ دەبوو ئەگەر ئینسـانەکان لە ئاست ئامـانجەکـانی لاوەتی خۆیان بە ئەمەگ دەمانەوە.؟

دۆن سنو فۆنتە دەستەکانی بەرە و ئاسمـان هەڵدێنێ، دەڵێی دەیەوێ بڵێ:« ئەو دەم دنیا کۆتایی دەهات» و پاشان لە وتەی خۆی زیاد دەکا:

– سـەر دەمێک دێت کە نان و شەڕابی ماڵی باوک بە ئیشتیای لاوان نابێ. ئەوان خواردنی خۆیان لە جێگای تر دەدۆزنەوە.

تەنیا نان و شەڕابێک تێریان دەکا و تینوایەتیان دەشکێنێ کە لە موسافیر خانە و چوار رێیـان دەس دەکەوێ. بەڵام مرۆڤ ناتوانێ تەواوی تەمـەنی هەر لە موسـافیـر خانان تێپەڕێنێ.

کەشیش لە سـەر ئەو بڕوایە کەدۆن سنۆ فۆنتە خۆی تا ڕادەی « سیسرۆن ١ ی وڵات نیشـان دەدا. ئەو دوو بارە دەڵێ:

– لەوێ نانواخـانەیەکی تازەیە. خـوار تر بارەگـای تازەی« دوپـۆلاورۆ» یە٢. ئەوەش پۆستخـانەی تازە و ئەویشیـان تیاترۆی تـازە دروستکراوە. ئێمە شتی تەشریفـاتی زۆرمان هەنە بەڵام شتی پێویستیمان نیە.

هەرتک پیاو دەمێک دەچنە دەفتەری یەکێتیەکانی بازرگانی و دۆن سنۆ فۆنتە لە ڕوونکردنەوە دا دەڵێ:

---

٢ سیسرۆن (Cicerone□ ) وتە وێژی بە ناو بانگی رۆمی.

٢ - دوپـۆلاورۆ( Dopolavro ) مانای وشەیی پاش کارە، و مەبەست بنیاتی فاشیستی یە کە دەکرێ

وەرگـــــێـــــردرێ بە رێکخـــــراوی خـــــۆشی ســـــاغ و ســـــالم.

– پێشتر دوو تاجری گەورە، میوە و تەڕەکاری « مارسیکا»یان دەکڕی و دوو بارە بە پێتەختیان دەفرۆشتەوە. ئیستا تەرەفی سەودا نەگۆڕاوە واتەئەم دوو تاجرە بازرگانیی تایبەتی خۆیان درێژە پێدەدەن. تەنیا فەرقی ئەوەندەیە کە مەعاشی کارمەندی ئەو شیرکەتە و کورتی باریشی لە مەو دوا بە خەرجی دەوڵەت دەدرێ..——————————

لە سەر دیوارەکان دوو نووسراوەی مەڕ مەڕی دەبینرێن. لە سەر یەکیان نووسراوە:« یەکێتی پیشەیی پێشەنگی ڕوخانی سەرمایە دارییە!»

لە سەر یەکی دیکەیان نووسراوە:« هەر کەس موخالیفی یەکێتی پیشەییە دوشمی دەوڵەتە!»

دۆن سنۆ فۆنتە دەڵێ: « مەڕ مەڕ چەندە شتێکی جوانە.!

کەشیش لە دوورەوە پیرە مێردێک دەبینێ کە بە زەحمەت بە ڕێگا دا دەڕوا و دۆن پاسکال دەناسێتەوە، هەر بۆیە پاش خوا حافیزی لە گەڵ دەرمان فرۆش هەنگاو توند دەکا تا بگاتە پیرە مێرد. کۆلا مارتینی پیر لە پێشدا کەشیش ناناسێ، بەڵام پاشان خۆی لە ئامێزێ داوێ. پیرە مێرد هەموو گیانی دەلەرزێ و دوایە دێ بکەوێ. بە زەحمەت پشوو دەدا و نا توانێ دوو وشە بە دوای یەکدا بڵێ.

دۆن پاولۆ دەڵێ:« من ئاگام لە کەڕیان هەیە. غیرەتت هەبێ. پاش ئەوەی دەیباتە پەنا گارییەکە و لە بەستنی ماینەکە یارمەتی دەدا. بە کاوە خۆ دەیباتە نێو گاری و هەوسارەکەی دەداتە دەستی لەرزۆکی پیرە مێرد.

دۆن پاسکال بە چاوی بە ئەسرینەوە تەنیا دەتوانێ ئەوەندە بێژێ: « ئاخری کارە ! بە ڕاستی کۆتایی کارە !»

دۆن پاولۆ دەپرسێ : « کەسێک نیە کە بتوانێ تا « پیتراسکا» لەگەڵت بێ؟ دۆستێک نیە ببێتە هاو سەفەرت ؟ »

پیرە مێرد سەر ڕادەوشێنێ و دەڵێ : « هیچکەس، هیچکەس. گوتم کۆتایی کارە.»

دۆن پاولۆ دەگەڕێتەوە بۆ موسافیر خانە تا بەڵکوو لە دوکتۆر ساکاوە وەڵامی بۆ هاتبێ، بەڵام وەڵامێک نەهاتۆتەوە.

کەشیش لە بەر خۆی بیر دەکاتەوە.« لە وانەیە ئەمشە و یا سبەی بێخەبەر خۆی بێت !»

« برە نیچە»ش زانیویەتی کە بنە ماڵەی کولامارتینی لە بەر ئابوتی بانگ هیچیان نەماوە و سەر کەواتوانە دەڵێ :

– ئەوە سزای خودایە. دۆن پاسکال پیرێژنێکی ئەحمەقی هێنا تا پارەی زۆر بێ و مندالّی کەم. ئێستاش بە سزای خۆی گەیشتوە. پارەکەی لە کیس چوە، مندالّەکانیشی بە جێی دێلّن. بەلاّم ئەو پیرێژنە ئەحمەقەی بۆ ماوەتەوە.
کەشیش لە برە نیچە دەپرسێ: « تۆ کوری دەرمان فرۆش دەناسی.؟»
برە نیچە لە وەلاّمدا دەلّێ : « بەلّێ، مندالّێکی باشە. بەلاّم دەبێتە هۆی مالّ وێرانی بنە مالّەی .
ئێستا قەتاری رۆم گەیشتوە و ئەو موسافیرانەی لە نیزگەی رێگای ئاسن دێنە دەر، بە پێش موسافیر خانە دا تێدەپەرن. دوو ژاندارم خۆ دەگەیێننە لاوێک کە کیفێکی چەرمی بە دەستەوەیە و لێی دەپرسن:
– بۆ هاتوویە ئێرە ؟
لاو لە وەلاّمدا دەلّێ: « من میوە فرۆشم .»
جەوازی کاسبیت هەیە ؟
لاو لە کیفەکەیدا دەگەرێ و ئەو بەلّگەی ویستوویانە نیشانیان دەدات.
– کارتی یەکێتی پیشەییت هەیە ؟
ئەویشی هەیە
– مالّیاتت داوە؟
بە هەلّکەوت مالّیاتیشی داوە
ئەودەم یەک لە ژاندارمەکان دەلّێ:
– زۆر باشە. ئێستا کە هەموو شتت تەواوە، گرتنت بێفایدەیە. تا قەتاری دوایی دەگا لە فوسا دەمێنیەوە و پاشان.. بێ ئەوە ببزوی بۆ رۆم دەگەرێیەوە.
لاو بە منگە منگ دەلّێ :« ئاخر من هاتووم میوە بکرم .»
ئەو دوو ژاندارمە بە گوێرەی دوو نووسراوەی مەر مەر مەتلّەبیان دەگەیێنن. یەکیان دەلّێ :
– سەر دەمی ماملّەی سەرمایە داری تێپەر بوە.
ئەویتریان دەلّێ: « یێکێتی خۆی بۆ میوە کرین هەنگاو دەنێ.
لاو وا نیشان دەدا کە قانیع بوە. برە نیچە پێی دەلّێ :
– چاک لە چنگیان دەر باز بووی. ئەگە نەختێکی تر چەنەت لێدابا، دەکەوتیە زیندان. چ خەیالّێک لە سەری دابووی ؟ بۆ لە مالّی خۆت دانینیشی ؟
لاو سوپاسی قسەکانی برە نیچە دەکا و بۆ نیزگەی رێی ئاسن دەگەرێتەوە تا بە

قەتار بچێتەوە ڕۆم.
« بیـانکینا » لە هـاتنی دۆن پاوڵۆ ئاگـادار بوە و دێتـە چاو پێکەوتنـی. کەشـیش لێی دەپرسێ:
- ئێستا مزڵت لە کوێیە ؟
- لە خانوێکی کوێستانی بە ناوی ویلای چوار فەسڵ.
دۆن پاوڵۆ بە توندی هۆگری شتێکە بۆیە لە کیژی گەنج دەپرسێ:
- تۆ کوڕی دۆن سنۆ فۆنتەی دەرمانفرۆش دەناسی ؟
- پۆمپیۆ دەڵێی؟ ئەو یەک لە دۆستـانی ئالبێـرتۆ یە و زۆر جـار دێتـە ویلای چوار فەسڵ.
دۆن پاوڵۆ دەڵێ : « کە وا بوو بۆ ویلای چوار فەسڵ ڕێنوێنیم بکە.
بیانکینالاواز و باریک بوە، ئیتر وەک جـاران ڕو هەڵماڵاو نیـە و ئەو حاڵەتی بێـعاری و سـوکی کە لە پیـتراسکا هـەیبوو، نەیمـاوە و هێندێ قـورسـتـر دێتە بەر چاو، بەڵام دووریش نیە کە ئەم گۆڕانە ڕواڵەتی بێ.
کەشیش لێی دەپرسێ:
- ئێستا ئاقڵ بووی ؟
بیانکینا بە پێکەنینەوە وەڵام دەداتەوە :
- گورگ توکی دەوەرێنـێ بەڵام سرشتی دڕندەیی خـۆی لە دەست نـادات دیارە ئەوەم بۆ مەسـەل هێناوە ئەگینا قژەکانی من ئەوەندە پڕن کە دەتوانم زۆریان لێ بفرۆشم.
ویلای چوار فـەسڵ خـانوێکي کۆني ئەعیـانییـە کە چي پێوە نـەمـاوە و ئێسـتـا بۆتە خانوێکی وەرزێڕی، ئەم ویلایە پێشتر نشتە جێی هـاوینی بارۆنێک بوە کە لە شاری ڕۆم لە ژێر باری قەرز دا مردوە.
دیواری پـان و درێژی کـە بـە دەوری باخ دا کـێـشـراوە لە چەند جـێگا ڕوخـاوە. ئەردەکـانی دەروازەی باخ کـە هاتوونە دەر و بیـانکینا کـەشیش بـە تەنیـشت واندا دەباتە نێو باخ. گوڵ و گیای خۆ ڕست بە درێژایی خیابانی پڕ دار و گاری ڕۆ شین بوون. لە مـەیدانێکی تور دار کـە پێشـتـر بۆ تاوسـان دروست کـرا بوو، ئێـسـتـا مریشکانی تێدا ڕادەگرن. خانوێکی کلاو فەرەنگی بە شێوەی دەورانی « رنسانس» داپۆشراو بە پیچەک کە لە سـەرە تاوە عیبـادەتگای» ونوس» بوە ئێستا بۆتە کادێن.
ویلا لە دوو سـاختـمـان پێکهـاتوە کە یەکیـان لە ویتر بەرز تـرە. قاتی سـەرەوە لە بەر ئەوەی دڵۆپە دەکاء چۆڵ کراوە. قاتی خـوارەوە لایەکی تەویلەیە ئەسپ و کایان تێدا

ڕاگرتوە. لایەکەی دیکە مزلی ژیانی چەند وەرزێرێکە. لە بەینی هەیوانەکان چوار کونی خالّی بەر چاو دەکەون کە پێشتر هەر یەکەی پەیکەرێکیان لە چوار وەرز تێدا بوە. لە سەر دیوارەکانی قەڵشیو کە لە بەر شە داری و شۆڕەکاتی پڕە لە پەڵە و پیسایی ئەودروشمەی بە خەتی درشت و بە ڕەنگی سوور ئەوەی خوارەوە نوو سراوە:

« بژی یێکێتی پیشەیی بێ بوونی شازادە تۆرتولیا ! مردن بۆ بوروکراسی »

ئالبێرتۆ لە گەڵ لاوێک لە قەراخ حەوز لە سەر بەردێک دانیشتوە. بیانکینا دەڵێ:

– قەدیمیەکان لەو حەوزە دا ماسی قزڵ ئالایان پەروەردە دەکرد، بەلام ئێستا ئەسپ و گا ئاوی لێدەخۆنەوە. ئالبێرتۆ پومپیۆ کوڕی دەرمانفرۆش بە کەشیش دەناسێنێ. دۆن پاولۆ لە سەر لێوی حەوز لە پەنا لاوەکان دادەنیشێ و بێدەنگ دەبێ.

لە گۆشەیەکی ویلا، لە قاتی خواروو ژوورێک هەیە کە بۆ عەمباری کەل و پەلی وەرزشی ڕێکخراوی لاوانی دەوڵەتی کەلکی لێ وەر دەگرن. ئێستا هەر ئەو ژورەیە کە بۆتە مزڵی دانیشتنی ئالبێرتۆ و بیانکینا.

دوو لاوی دیکە لەو ژورە دێنە دەر و ئەوانیش لە قەراخ حەوز دادەنیشن. بێدەنگیەکی نەختێ نارەحەتکەر لە نێوان دانیشتوانی دەورەی حەوزدا بەردەوامە.

دۆن پاولۆ دەڵێ:

– چەندەم پێخۆشبوو توانیبام تەواوی شەو لە گەڵ ئێوە لە قەراخ ئەم حەوزە ئاوە دا بە بێدەنگی دانیشتبام.

پومپیۆ دەڵێ: « بیانکینا باسی ئێوەی بۆ من کردوە.»

دۆن پاولۆ دەڵێ: « جۆرە بێدەنگیەک هەیە کە لەوێدا ئەم پەردەی ئەستور و تاریکی کە ئێمەی لە نێو خۆ گرتوە و ئەم پەردەی خۆ نیشاندان و دەمار گرژی و وشەکەلی دەستکرد کە جیاوازی ساز دەکا و ئینسانەکان دەخاتە بەرانبەری یەک، دەست بە دڕان و پوچانەوە دەکات. بۆیە نابێ لە مجۆرە بێدەنگییە بترسێین. نابێ لە خۆ پاراستن لە تەشریفات وناسیاری و دووری لە شوێنە گشتیەکان ترس بخەیتە دڵەوە.

پۆمپیۆ دەڵێ : « ئێمە ناترسین »

دۆن پاولۆ دوو پاتی دەکاتەوە :

: بەڵێ، نابێ بترسی. ئێمە گەیشتووینە دەمێک کە ئەندامێکی ڕێکخراوی لاوانی

دەوڵەتی نابێ لە کەسێکی شۆڕشگێڕ و یا کەسێکی ڕۆناکبیر لە پەیڤین لە گەڵ وەرزێرێک ترسی هەبێ.
پۆمپیۆ دەپرسێ: « مەبەستت ئەوە کە تەواوی دابەشینی لە نێوان ئینساناندا هەیە، ساختەییە ؟»
دۆن پاولۆ لە وەڵامدا دەڵێ:
- بێگومان نا، بەڵام دابەشبوونی دەستکرد کە بە ئانقەست بۆ داپۆشینی دابەشبوونی بنچینەیی پێکهاتوە زۆرە. هێزی دابەشکراو هەنە کە دەبوایە یەک بگرن. هێزی دیکە هەنە کە دەستکرد یەکیان گرتوە ولە کاتێکا دەبوایە لێک جیا بن. زۆر لەو دابەشکردنانە هەر قسەنە، هەر وەک زۆر یێکێتیش هەر قسەن. لە هیچ کات و سەر دەمێکدا وەک سەر دەمی ئێمە وشەگەلیان لە ئامانجی ساکار و سرشتی خۆی کە پێوەند کردنی ئینسانانە بە یەکترەوە، لاڕێ نەکردوە. قسە کردن و فریو دان( زۆر جاریش خۆ فریو دان) ئیمڕۆ وەک یەک وان. بە ڕادەیەک کە من بخوازم لە گەڵ تۆ بدوێم، بخوازم قسەی برایانە و دۆستانە بکەم، بێ ئەوەی جگە لە تێگەیشتنی قسەی تۆ و تێگەیاندنی قسەی خۆم مەبەستێکی دیکەم هەبێ و بخوازم بۆ دەر بڕینی مەتڵەبی خۆم بە دوای وشە گەلدا بگەڕێم، ئەوەندە وشەکان هەڵە و کۆن و خەراب و دوفلیقانە بوون، بەڕاستی سەرم لێ دەشێوێ. لێرە دایە کە ڕەنگە بێدەنگی باشتر بێ و باشتر ئەوە خۆ بە بێدەنگی بسپێری.
ئیستا چوار کوڕی گەنج و کیژێک و کەشیش لە دەورەی حەوز بێدەنگ دانیشتوون. ئەوە هەوەڵین جارە دۆن پاولۆ هەلی بۆ هەڵدەکەوێ بە تەنیا لە گەڵ لاوان دانیشێ. فیکری ئەوەش ناڕەحەتی دەکات کە ڕەنگە هەلی وای لە کیس بچێ. لەو کاتە دا کە هەموویان بێدەنگن تەماشای یەک یەکیان دەکات و دیسان سەیریان دەکا. دەڵێی دەیەوێ قانعیان بکات کە بڕوا و تاقەتیان هەبێ. دەڵێی دەیەوێ بێژێ: خۆزیا دڵی ئێمە توانیبایان پێکەوە بدوێن.... بەڵام لاوەکان لەو پتر لە ئازار دان. چونکە هەوەڵین
جارە کە پیاوێکی ئاقڵ بۆ کۆڕی خۆیان ڕێگا دەدەن. ئەویش چ ئاقڵێک !
وەرزێرێک لە ڕێوە دەگاتێ و دەرگای تەویلە دەکاتەوە. گایەکان بە کاوەخۆ دێنە سەر حەوزەکە ئاو بخۆنەوە. حەیوانی لاوازن و تەنیا کاریان بێدەمگەن هەموویان ڕەش و سپی و شاخیان هەڵگەڕاوەتەوە. بە کاوە خۆ ئاو دەخۆنەوە و بە سیلەی چاو سەیری ئەو بوونەوەرانە دەکەن کە بە بێدەنگی لە دەوری حەوز دانیشتوون. دوو

بارە بۆ تـەویلە دەگـەڕێنەوە. وەرزێڕ دەرگـای تەویلە دادەخـات و ئەویش دێت لە پەنا حەوز دادەنیشێ.

پۆمپیۆ دەڵێ:

– پیاوێک بوو کـە وڵاتی لە نابوتـی نەجـات دا و ڕێگای زینـدوو کـردنەوەی نیـشـان دابوو. قسەکان ڕوون بوون و گومانی لە دڵدا دەسڕیەوە. ئەم پیاوە گەیشتە دەسەڵات و ئێـمە سـەرمـان سـوڕ مـا بوو کـە بۆ چی هەمـوو وتە و کـردەوەکانی لە گـەڵ یەک فەرقیان هەبوو. هەموو لە خۆمـان دەپرسی:« داخـوا دەبێ خەیانـەتی بە مە کرد بێ ؟» پێش چەند حـەوتوو کەسێک هاتە ئەم ناوچەیە و ڕاسـتی بۆ ئێـمە ڕوون کـردەوە. ئەو کەسەی ئێمە گومانی خەیانەتمان لێدە کرد،لە ڕاستـیدا گیراو ولە ڕۆم لە ژێر زەمـــینی بانکی بـازرگــانی بەند کــراوە. بەڵام بۆ ئەوەی لـە ڕێژە و لـە ئاهـەنگی تەشریفاتی نیشانی بدەن، یەکی وەک ویان لە جێی وی داناوە.

ئالبێرتۆ دەڵێ: ڕاستە ! کە وابوو ئێستا زانیمان چ بوە »

گالەوەڕێن دەڵێ: « مـەسـەلەکە تەواو ڕوونە. »

بیانکینا دەڵێ: « بە ڕاستی ئێمە بۆ ڕزگاری ئەو پیاوە دەبێ چبکەین ؟»

پۆمپیۆ دەڵێ :

– ئەوە کارێکی هاسان نیە. سەر سەخت ترین دوشمنانی وی ئێستـا حکوومەتیان گرتۆتە دەست، ئەوان بۆ فریو دانی لاوان ئێستـاش لە ناوی وی کەلک وەر دەگرن. بەڵام کردەوەیان ڕاست بە پێچەوانەی ئەو شتانەیە کە ڕایانگەیاند بوو.

بیانکینا بە پێداگرتن دەڵێ: « لە گەڵ ئەوەش دەبێ بۆ ڕزگاری وی کارێک بکەین.»

پۆمپیۆ دەڵێ: « شۆڕشێکی دووەم دەتوانێ ئەو نەجات بدا.»

گالەوەڕێن لە کەشیش دەپرسێ: « تۆ چیت بە ئاقڵیدا دێت ؟»

دۆن پاولۆ لە وەڵامدا دەڵێ :

من ناتوانم بە لێبـڕاوی بڵـێم کـە زەلامی جـێگای باسی ئێـوە بە ڕاسـتی لە بانک زیندانـی کـرابێ، دیارە هێندێ پێیـان وایە، لە لایەکی ترەوە قـسـە تەنیـا لە سـەر پیاوێک نیـە. ئەوەی جێی گومان نیە و هـەر کەس کەمێک چاوی کرا بێتەوە دەتوانێ بزانێ کە وڵات بە گشتی زیندانیی بانکە.

پۆمپیۆ لە پشتیوانی قسەکانی ویدا دەڵێ :

– بانک لە پشت پەردەی یێکێتی پیشـەیی دەسـەڵاتی مـوتڵـەقی خۆی بە سـەر گشت وڵات دا دەسەپێنێ.

بیانکینا دیسان بە جیدی دەڵێ : « کە وابوو دەبێ چبکەین ؟»
دۆن پاولۆ دەڵێ:
- منیش لە سەر ئەو باوەڕەم کە دەبێ بۆ شۆڕشی دووەم خۆ ئامادە بکرێ. دەبێ وڵاتەکەمان لە بەندی بانکی خۆمان رزگار بکەین. دیارە ئەوە کارێکە درێژ خایەن، دژوار و بە ترس و پڕ لە زەحمەت. بەڵام بە بێ ترس و دژواری ئەوەندە نرخی نابێ.
دۆن پاولۆ ئەم وشانە بە خوێن ساردی و بە بێ خۆ هەڵکێشان و فیشاڵ، ڕاست وەک مەبەستێکی تەواو سروشتی، بەڵام هەر لەو کاتەشدا وەها قایم و بە تین دەر دەبڕێ کە بیانکینا دەستە ملانی دەبێ و ماچی دەکات.
ئالبێرتۆ هاوار دەکات : « کێ بە خەیاڵی دادەهات کە بۆ شۆڕشی دووەم قەشەیەکمان لە گەڵ بێت ؟»
بیانکینا لە ڕاستکردنەوەی قسەکانی وی دا دەڵێ :« دۆن پاولۆ قەشە نیە بەڵکوو لە پیرۆزەکانە.»
پۆمپیۆ دەڵێ : « لە هەموو شۆڕشەکاندا کەشیشی وا هەبوون کە لە گەڵ میللەت هاو کاریان کردوە. »
ئەم نوکتەیە دەبێ بە واتای ڕاستە قینە ی وی تێبگەی، واتە بە جۆرێ کە کاتۆلیکەکانی خوارووی ئیتالیا لە بەر چاویانە. لە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕیدا نەخشی کەشیش تا ڕادەیەک وەک نەخشی ( قوتابیەکی سەدەقە) و یا قازی عەسکەرێک دەچێ.
وەرزێرێکی سەر بازە با کافر و زەندیقیش بێ، ئەگەر نەزانێ کە لە مەودایەکی کەمدا قازی عەسکەری لە پشتە هیچ ئامادەی هێرش دەبێ ؟ بوونی کەسێکی ڕوحانیش لە ڕیزی شۆڕش دا هەر بەم شێوەیە باش و پەسندە و قەوەتی دڵ دەدا بە ئەفراد. دیارە لە بەر ئەوە نیە کە خەڵک لە قیامەت دەترسێن،( چونکە کەسێکی باشوری لە هیچ شتێ ناترسێ) بەڵکوو لە بەر ئەوە - کێ چی دەزانێ - خەڵک ئەوەی بە تەلیسم و نوشتو دەزانن. جگە لە وە ئەگەر بە ڕاستی دەبێ دوای مەرگ لە پێشگای حاکمی عاسمانی ئامادە بی( ئەوە تەنیا گریمانە و بەڵام دەبێ هەموو ئیحتمالێکیش بە حیساب بێ) هەمیشە دەتوانی بە خودا بڵێ:« لێمان خۆشبە، بێشک خۆت بینیت کە لە نێو ئێمە دا قەشەش هەبوون..»
دۆن پاولۆ دەڵێ: « دەبێ بە ئێوە بڵێم کە من گرنگی زۆر نادەم بە لیباسی کەشیشی خۆم.»

پۆمپیۆ دەڵێ: « گرنگ ئەوەیە کە ئێوە هەر وا کەشیش بمێنیەوە.»
کەشیش بە پێکەنینەوە دەڵێ:« کە وابوو وا باشە ئیحتیات لە بەر چاو بگرین. »
یەک لە لاوان کــە تا ئەو دەم زمــانــی نەگــەڕا بوو دەیەوێ بزانێ تەکلیف چیــە و دەپرسێ:
- بەڵام ئێستا بە کردەوە چکارێک دەکرێ ؟
دۆن پاولۆ لە وەڵام دا دەڵێ:
- ئەگەر ڕێگا بدەن پێم باشترە کە لەم بارەوە لە پێشدا تەنیا لە گەڵ پۆمپیۆ قسە بکەم.
کەشیش و کوڕی دەرمانفرۆش دوور دەکەونەوە، لە حەساری باخی چوار فەسڵ دەچنە دەر، لە چۆمێک دەپەڕنەوە و ڕێگای باریکی نێوان سەوزیخانەی پڕ لە گوڵی محەمەدی دەگرنە پێش. ماوەیەک بێ ئەوەی قسان بکەن بە ڕێگادا دەڕۆن، پاشان دۆن پاولۆ دەڵێ :
- ئێمە سەر بە دوو بەرەی جیاوازین. وچەی من لە سەر دەمی شەڕ دا قاڵ بوە، و وچەی ئێوە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی دواییدا، ئەوش خۆی فەرقێکی گەورەیە. لە گەڵ ئەوەش ئێمە هەر دوکمان سەر بە جۆری ئینسانین و یا بە زاراوی باشور هەر تکمان ئادەمیزادین و لە یەک ڕەگەزین. بابەتی جیاوازی وچەی ئێمە ئەوەیە کە هەر لە سەرە تاوە ئەم ئوسوڵەی کە مامۆستایان و عاملێنەرەکان فێریان دەکەن، بە جیدی وەر دەگرن. ئەم ئەسڵانەن کە وەک بناخەی کۆمەڵگای مەوجود ڕاگەیەنراون. بەڵام کاتێ ئینسان ئەوانە بە جیدی وەر دەگرێ و لە گەڵ خودی کۆمەڵگای دەیقرسێنێ، تێدەگات کە ڕێکخراو و شێوەی کردەوەی کۆمەڵگا لە بناخەوە لە گەڵ ئەم ئەسڵانە جیاوازی هەیە و لە وان بێخەبەرە. بەم چەشنەیە کە مرۆڤ دەبێتە شۆڕشگێڕ. ئەم ئەسڵانە کە لە ڕوانگەی کۆمەڵگاوە جگە لە مەجاز شتێکی تر نین، بە پێچەوانە، بۆ ئێمە کە ئەوانمان بە خوێنی گەنجیەتی خۆمان پەروەردە کردوە، زۆر جیدی و واقیعی و پیرۆزن و تەقەڵی ژیانی دەرونی ئێمە پێک دێنن. ئێمە کاتێ دەبینین کە کۆمەڵگا لەم ئەسڵە بێشەرمانە کەلکی خەراب وەر دەگرێ و وەک پەردەیەک و ئامرازێک بۆ کوتان و گێژ کردنی میللەت بەکاری دێنن، تورە دەبین. ئاوایە کە مرۆڤ دەبێتە شۆڕشگێڕ.
لەم کاتە دا هەر تک پیاو دەبێ لە چۆمێکی دیکە بپەڕنەوە. ڕێگای باریک هەر وا بە پشت پەڵە زەویەک دا کە کڵۆشی گەنمی درواویان تێدا سووتاندوە، بە بن دار

بادامـاندا درێژەی هەیە. خـاڵ خـاڵ پنجـە توترک دەبـین. دۆن پـاولۆ و پۆمـپـیـۆ بۆ لێکردنەوەی توترک ڕادەوەستن. درکێک دە قامکی پۆمپیۆ ڕادەچێ. دۆن پاولۆ درێژە بە قسەکانی دەدا:

– ئێـمـە سـەر بە دوو وچەی جـیـاوازین و لە دوو نوخـتـەی جـیـاوازەوە حـەرەکـەت دەکەین. بەڵام هەر چۆنێک بێ، هەر چی پێیان گوتووین، توند گرتومانە هەر بۆیەش ئێستا هەر تکمان گەیشتووینە یەک نوختە. ئەسڵی گرنگ بۆ مە ئەوەیە کە دوو وچە، یا لانـی کـەم هۆکـارەکـانی هاو ڕیشـەیی کـە لەم دوو وچەیە دا هەن پێکەوە یەکگرتوویان بکەین.

بارێکە ڕێ دەگاتە جادەی ئەیالەتی کە پڕە لە کەر و گاریە و وەرزێڕان کە لە فوچینۆ دەگەڕێنەوە. پۆمیۆ دەڵێ:

– ئەوەتا کۆیلەکانی « تۆرنولیا » و یا باشـترە بڵێم شـازادەی ساختـەی ڕۆمی کە لە ڕاستیدا وەک زۆر لە ئاژاوەچیەکانی ڕۆمانەکانی بالزاکی لە « نورنی » لێهاتوە.

دۆن پاولۆ لێی زیاد دەکا و دەڵێ : « وەک ئاغای لاواڵ»

هەرتکیان پێدەکەنن. ئەو دەم دەزانن کە مەودایەکی زۆر لە فوسـا دوور کەوتوونەوە. دۆن پاولۆ مـاندوو بوە و پاڵی وەباسکی پۆمـپـیـۆ داوە. لە گـەڕانەوە دا جـادەی ئەیالەتی دەگـرنە بەر کـە سـەر ڕاسـتـترە، پۆمـپـیـۆ هـەنگاوان سـست دەکـا تا هاوڕێیـەکەی مـاندوو نەکات. ئەویش پێدەنگە. چونکە پێی خۆشـە کە لە گـەڵ ئەو پیاوە بە ڕێگا دا بڕوا و دەنگی هەناسـەی وی ببـیـسێ. بەڵام پرسـیـارێکی هەیە کە دەیەوێ خێرا وەڵامی بداتەوە، بۆیە دەپرسێ:

– ئێستـا دەبێ بە کردەوە لە کوێوە دەست پێبکرێ و هەوەڵین هەنگاوەکانی کە دەبێ باوێژرێن کامانەن.

ئێـسـتـا دۆن پاولۆ بە دەنگێکی سەبرۆکـە باسی مـەتڵـەبی کـردەوەیی بۆ دەکـات و چەند خـاڵێک لە بیر و بۆچۆنی خۆی لە گـەڵ وی دێنێتـە گـۆڕێ. بە پۆمـپـیـۆ دەڵێ: ڕەخنە بگرێ و لە بارەی ورد تریني بەشـەکان باس و دەمـیـەدەمەی لە گـەڵ بکا. دۆن پاولۆ ئامـاژە بۆ چەند بەند لە ئەزمـوونەکـانی فـەننی خـۆی دەکـا کـە لە سـەردەمی تێکۆشـانی نهێنی پێشوودا وەدەسـتی هێناون. بەڵام بە کـەمی، چونکە دەزانێ کە مەسـەلەی فـەننە نەک زانست، و فەنی واقیعیش لەو شـوێنە هەیە کە جەوهەری زاتی و توانای خـەیاڵی هـەبێ نەک بەرنامە و مـەشق. جگە لەوە ئەم تێکۆشانە هاو بەش لە گـەڵ بەرەی لاو بۆ وی ئەزمـوونێکی تەواو نوێیـە و ئەو دەیەوێ ئەم تـەجروبەیە بە بێ

بەستنەوە بە تەشریفات تەواو بکات، و هیچ شتێک بۆ ئەو لە وە بێزراو تر نیە کە خۆی لە نەخشی مامۆستا و ڕێنوێن بناسێنێ. بە تایبەت بەو لاوانە کە تەجروبەیان لە گەڵ ئەزمونی وی فەرقی زۆرە. و بێگومان پاش ئەوەی ئەوان شتە شاراوەکانی ناخی خۆیان تێگەیشتن و ئەوەی لە دڵیاندایە پێیان کوت، زۆر شتیان بۆ باس دەکات.

بەر لە گەڕانەوەیان بۆ فوسا دوو دۆست لێک جیا دەبنەوە تا کەس پێکەوەیان نەبینێ.

لە فوسا ئاوازی ناخۆشی فیلمی دەنگدار لە شەقامی سەرەکی دەنگ دەداتەوە کە پڕە لە لاوان. ئەم دەنگە بە دوای کەشیش دا تا نێو ژوورەکەی دەچێت.

دۆن پاوڵۆ دەچێتە نێو جێ، لە گەڵ ئەوەی هیلاک و ماندوە بەڵام شاد و کەیف خۆشە، لە بەر خۆیەوە دەڵێ:« بەردی هەوەڵێ دانراوە

# ٨

بەیانی ئەو ڕۆژە دۆن پاولۆ نامەیەکی لە دوکتۆر ساکاوە پێدەگات، لە وێدا دوکتۆر لە بەر هۆی پارێزگاری بۆ هاتن داوای لێبوردن دەکات. لە بارەی ئەوەی کە زیاتر لە هەموو شت ئێستا بیری دۆن پاولۆی بە خۆوە خەریک کردوە، دوکتۆر ساکا بە هیچ جۆر بۆ ئەو سودی نابێ. دۆن پاولۆ لە دڵدا دوو پاتی دەکاتەوە: «بەردی هەوەڵ دانراوە، ئێستا پێویستە بەردی دووەم بدۆزرێتەوە. بە زاهیر هیچ شتێکی نا ئاسایی ڕووی نەداوە و بەم حاڵە گفتگۆی ئەو دوو پیاوە لە گەڵ یەکتر لە ڕاستیدا کارێکی نا ئاساییە. دۆن پاولۆ لە بەر بیر کردنەوە لەم مەسەلەیە تەواوی شەو نە خەوتوە.

زەمینەی کارەساتە مەزنەکانی جیهان هەر بەم شێوەیە دامەزراون. هەر لە و کاتەشدا خەڵک بێ ئەوەی سەرنجی شتێک بدەن بە پەنایاندا تێدەپەڕن. ژاندارمەکان، فەرماندەکان، میرزایان، کەشیشە عیبادەت فرۆشەکان،« فیسی«زابالیونە و برە نیچە هەموویان بە پەنایاندا ڕادەبرن وهیچیان سەرنجی هیچ شتێ نادەن. لە گەڵ ئەوە دوو پیاو پێکەوە دواون و هەموو جورە مەسەلەیەکیش هەر ئاوا دەست پێدەکرێ. «دۆن جیراسولە» کەشیشی پیری فوسا کە خەتی ڕوومەتی ئێسکانی زۆر وە خەتی ڕوومەتی بیانکینا دەچێ، هاتوە تا دۆن پاولۆ بۆ سەردانی کلیسای خۆی داوەت بکا، بەڵام ئەویتر بە بیانووی ئەوەی کاتی نیە لە قبوڵکردنی داوەتەکەی داوای لێبوردن دەکات.

بەڵێ، دۆن پاولۆ پاش سووتاندنی نامەی دوکتۆر ساکا دەچێتە ئیزگەی ڕێگای ئاسن و بە مەبستی سەفەری ڕۆم سواری قەتار دەبێ. لە دڵی خۆیدا دەڵێ : « بەردی هەوەڵ دانراوە، ئێستا پێویستە بەردی دووەم بدۆزرێتەوە. دەبێ لە نێو کرێکاراندا پاڵپشتێک بدۆزرێتەوە و پاشان خەبات دەست پێبکرێ.»

لە نێو قەتار دا دۆن پاولۆ دەزانێ سەفەر بە لیباسی گۆڕاو چەندە ناخۆشە. خەڵکی نە ناسراو بەرەو ڕوو یا لە پەنات دانیشتوون و تەماشات دەکەن و یا دەیانەوێ بتدوێنن. دۆن پاولۆ فیکری کرد بۆوە کە دە توانێ لە ڕێڕەوی قەتار دا شوێنێ بۆ

خۆی بدۆزێتەوە و لێی دانیشێ کە ڕووی دەپەنجەرەی بێت. بەڵام لە هەوەڵین ئیزگەی قەتار کە ڕادەوەستێ کە چاوی بە قیافەی ئاشنای وەرزیران دەکەوێ لە سەر سەکۆی ئیزگە ڕێستاون، جێگایەک بۆ خۆی پەیدا دەکات وکڵاوەکەی تا سەر چاوان دێنێتە خوار وخۆی بە خوێندنەوەی کتێبی دوعاوە خەریک دەکات. بە شێوەی کەسێکی نیزیک بێ کتێبەکە لە ڕوومەتی خۆی نیزیک ڕادەگرێ. دەڵێی دەیویست کە وەک کەشیشێکی واقیعی کتێبی دوعا بە قەرائەت بخوێنێ بەڵام تێک دەچێ و دوعا و ویرد وسەر بردەی شەهیدان و پیرۆزانی تێکەڵ دەکا و پاش گەیشتن بە هەر ئیزگەیەک مەگەر بۆ زانینی وەزعی موسافیران، دەنا سەر لە سەر کتێب هەڵناگرێ. لە ئیزگەی ڕێگای ئاسنی ئەرمینی یەکی ڕۆم، عەبای کەشیش دەرفەتی پێدەدا لە بەر چاوی تیژ بینی پۆلیس تێپەڕێ بەڵام کاتێ بیر دەکاتەوە کە لە گەڵ ئاشنایانی پێشوو چۆن پێوەندی بگرێ، هەر ئەو لیباسە دەبێتە هۆی نارەحەتی و سەر گردانی وی. چوونی کن وان بە لیباسی کەشیشی نەک هەر گاڵتەیە، بەڵکوو مەترسیشی هەیە.

دۆن پاولۆ کۆتێک و کڵاوێکی شەو وکراواتێکی لە جانتای دا هەیە کە بۆ ئەوەی بیگۆڕێ بە کەسێکی ئاسایی پێویستە. بەڵام خۆ گۆڕین لە بەر چاوی خەڵک و یا لە میوانخانە و یا لە شوێنێکی ژێر چاوە دێری ناکرێ و لە وانەیە ئاگاداری بن. پاش ماوەیەک سوڕانەوە بە دەور و بەری ئیزگە دا دەگاتە گەڕەکی لاتران. لە مەیدانی گەورە، لە نێوان کلیسای سن ژان و کلیسای« سکالا سانتیا» دوکان و سەکۆی کە شوێنی سەر گەرمی خەڵکن، بە وێرانی دەبینرێن. هەر لە ئێستاوەکەل و پەلی سەر گەرمی ئەو دوکانانە کە دیمەنی ڕەنگی و شتی تری زەرق و بەرقی بوون، لایان بردوون. کرێکاران ئاڵو دارەکانی دێننە خوار وکەل و پەلی دیکەی وەک خێوەت و موقبا وئەسپی دارین و شێری بە قەستی لە کامیۆناندا دەخرێنە سەر یەک. پەیکەری لە گێچ بە چەشنی جۆر بە جۆر. لە گەڵ عەکسی خەیاڵی ڕەنگی لە پاپۆڕێکی گەورە و لە دەریایەکی بە شەپۆلدا مەلە دەکا و تەختە پێستی پڵنگێکی دڕندەی بنگاڵی لە نێوە تەپ و تۆز دا کەوتوە. دۆن پاولۆ بە نێوە ڕاستی ئەم بازاڕەی شام دا، ڕێگایەک بۆ خۆ پەیدا دەکا وپەنا بۆ سێبەری فێنکی کلیسای« سکالاسانتا» دەبات. چەند ژنی تەرکە دنیای پێست ڕەش لە سەر ئەژنۆیان لەپەیژەکانی نێوەڕاستی کلیسا سەر دەکەون. بە گوێرەی ڕوایەتێکی سەدەی نێوە

ڕاست ئەم پەیژەیە هەمان پەیژەی ماڵی« یونس پیلات»ە-١-کە لە ئورشەلیم بوە و لە ژێر ئەو پەیژانەدا هێندێ شت شـــاراونەوە کـــە « سنت هێلن-٢- ئەوانەی لە -جلجتا-کۆ کرد بوونەوە. لە وانە : هێندێ پارچە لە خاچی ڕاستە قینە، یەکێ لە گوڵمیخەکانی خاچ کە عیسایان پێ لە چوار میخە داوە. چەن دمنکیش لەو دڕکانە کە ڕۆژی گـاڵتە پێکردنی وەک تاج لە سـەری عیـسـایان نـابوو کـە ئەوە پـاشـای جولەکانە.

دۆن پاولۆ ڕادەوەستێ تا ژنەکانی تەرکە دنیا پاش سـەر کەوتنی دژوار لە کلیسا دێنە دەر. بەڵام لەم ڕێگایەدا سەبری ئەیوب پێویستە. چونکە تەرکە دنیاکان پاش سەر کەوتن لە هەر پەیژەیەک لە بەر ژانـی پشت خۆ دەچەمێنن و ئاخ و ناڵەی دەردە دار هەڵدەکێشن و دەورمیەکێش دوعایان دەکەن. ژمارەی پەیژەکان زۆرە و ئەژنۆی ئەم ژنە فەقیرانە دەبێ ژانێکی زۆر ی کرد بێت. چوون وباج دان بە حـاکمی ڕۆمی ئورشەلیم نابێ ئەو هەموو ژان و ئازارەی بوو بێت. دۆن پاولۆ لە بن نەخشێک کە لە مەڕ مەڕ هەڵکەنراوە و پیلات لە حالێکدا نیشان دەدا کە عیسا بە خەڵک دەناسێنێ، ڕادەوەستێ. لە سـەر پایەی نـەخشـەکە ئەم ڕستەیە بە زمـانی لاتینی هـەڵکەنراوە (Hocc ect hora vestra et Potesta Tenebrarum): (ئێستا سەر دەمی ئێوەیە، سەر دەمی تاریکییەکان )

کەمێک تاریکایی بۆ دۆن پاولۆ بەسـە تا بتوانێ کاری خۆی بکا. کـاتێ ژنەکان لە ئاخـرین پەیژەی ریازیاتیـان دەچنە سـەر و بە لایەکی دیکە دا دێنەوە خـوار، دۆن پاولۆ بە تاڵوکە لە پەیژەکـانی کلیسـای «سکالاسـانتا» سـەر دەکـەوێ، تاوێک لەو سەرە ڕادەوەستێ و پاشان لە کاتێکا لیباسی گۆڕیوە دێتە خوار.

لە کاتی چوونە ژووری کلیسا هێشتا دۆن پاولۆ سپادا بوو ئێستا کە لە وێ هاتۆتە دەر دوو بارە بۆتەوە پێـترۆ سپینا. هەر ئەوە خـۆی وە پێکەنینی دەخـات. لە گـەڵ ئەوەش کـاتێ لە شـەقـامـدا لە بەر هـەتاو بە ڕێگادا دەڕوا، هـەست دەکـات بـە بێ

---

١- یونس پیلات حاکمی ڕۆمی فەلەستینە دەڵێن سەرەڕای بڕوای بە بێتاوانی عیسا، ئەوی دا دەستی حاکمان و خۆی لە بەر پرسیەتی کاری وی دەر باز کرد.

٢- سنت هێلن دایکی کۆنستانتینی ئیمپراتوری ڕۆمی ڕۆژ هەڵاتە(٢٤٧-٣٢٧) دەڵێن خاچی ڕاستە قینەی عیسا ئەو دوزیویەتەوە

٣- جلجـتـا یا کـالور جیـایەکـە لە نیـزیکی ئورشـەلیم کـە عـیـسـایان لە وێ لە چوار مـیـخـە دا.

لیبـاسی کەشـیـشی لە عـەزاب دایە. لەو کـاتە دا ڕاست هـەستی ژنێکی هەیە کـە هەوەڵین جـار بـە لیـبـاسی اسکی هـاتۆتە دەر و پێی وایە تەواوی خـەڵک چاویان دە لاقی وی بڕیوە. ئـەم فـیکرە وای لێدەکـا کە هەنگاوان توند تر بکا و ڕابکات، چەند جـار تەمـاشـای شـاڵوارەکەی دەکـا تا بزانـێ دوگمـەکـانـی داخـسـتـوون یا نا. بەم چەشنـە بە پێش« پورتاسـان جـیـووانـێ» دا ڕادەبرێ و درێژایی شـەقـامـی« ڤیائاپیانۆڤا » دەبڕێ. پاشان بۆ لای ڕاست با دەداتەوە لەو گـەڕەکەش تێدەپەڕێ کە خانوەکانی دەورەی کلیسـایەکی تازە و چەند سینەمـایەکیـان داوە. ئەولا تر پارچە هەردێکی پان و بەرینی بێ ناو ونیشانە کە شوێنی سوڕانەوەی سـەگ و پشیلە و منداڵی لە مـەدرەسـە ڕاکـردوە. کەند و قـوڵکی هەردەکـە بۆ عـەمـباری کـەل و پەلی خـانوو بەرە و ئاسن و خـشت و کۆنە لولە و شـتی وا کـەلکی لێ وەر دەگیرێ. پێش چەند مـانگ هەر ئەو سـپـینـایە کـە کـەوتـبـوە بەر ڕاو ئانی پۆلیس تـوانیـبـووی لەم مـەیدانە لە خـانووی کابرایەک دا بە ناوی « مـاناجیـولامرا » کە پێشـتر وەرزێڕ بوە پەنایەک بدۆزێتەوە. ئەو پیاوە بە منداڵی واتە پێش ئەوەی چەند ساڵان لە ئاوارەییدا بەرێتە سـەر لە مـاڵی بابی سپینا نۆکەر بوە. دوای دوور کەوتنەوە لە نیشتـمـان لە شـاری بۆینس ئایرس لە گەڕەکی « لابوکا » لیـمـونادی فرۆشـتوە، پاشـان لە« سنت ئاندرە» لە نیزیک مـارسی لە کارخـانەیەکی خـشـتی کـرێکاری کـردوە و ئاخـرەکـەی ماوەیەکی زۆر لە کانگای « پوزولان» لە دەور و بەری شاری ڕۆم کاری کردوە.

جاری یەکەم کە سپینا دیتبووی لێی پرسی بوو:

– ئێستا لە چ ڕێگایەکەوە ژیان دەبەیە سەر.؟

لامـرا بێ ئەوەی بچـێـتـە نێـو وردە کـاری لە وەڵامـدا گـوتبـووی:« شـەرافـەتمـەندانـە ڕادەبوێرم.»

ئێسـتـا سـپـینا بە هـاسـانی ئەم خـانوە دارینـە کە سـەر بـانەکـەی شـیـراونی یە، دەیدۆزێتەوە. لامرا بە تاسە و خۆشی پێشوازی لێدەکات :

– باشە. ئەرباب، ئاخرەکەی هاتیەوە ئێرە !

سپینا ئادرەسی شوێنێکی دەداتێ و دەڵێ:

– بچـو بزانە ئەو کـەسـەی ناوی« رومـئـۆ» یە هێشـتـا لە وێ دەژی؟ بشـزانـە کـە ئەو پیاوە هێشتا کار دەکا یانا و لە کوێ کار دەکات. بەڵام نابێ سەرنجی کەس بۆ لای خۆت ڕابکێشی.

لامرا دەکـەوێتـە ڕێ. سـپینا دەچێتـە ژوور کـە وەک تـەندوری گەرم وایە و لە چاوە

ڕوانیدا خـەوی لێدەکـەوێ. لامرا زۆر درنـگ سـەر خـۆش و بێ کڵاو دەگـەڕێتەوە، بەڵام ئاگادارییەکی وردی وەر گرتوە. سپینا لـە ماوەی ئەو چەند دەقیقەیەدا دوو جێگای بۆ نوستن لە خانوەکەدا ئامادە کردوە. بەڵام لامرا کە لە ڕادە بەدەر ڕێز لە سپینا دەگرێ، ناچێتە ژووری خانوەکە ولە دەرەوە ڕادەکشێ و دەڵێ:

- خانووی من بچوکە. من چۆن دەتوانم لە پەنا ئەربابم بنووم.؟

سپینا لە وەڵامدا دەڵێ: « تۆ لێرە ئەربابی و من میوانی تۆم.

بەڵام لامرا سەر ڕادەوەشێنێ و دەڵێ:

- باوکت پیاوێکی باشبـوو. کاتێ تـوڕە دەبوو لێی دەدام. لە گـەڵ ئەوەش پیاوێکی باشبوو. جارێک لە جێژنـی پاک ڕانە کاریلەیەکی دا بە من ئەم شـەویش تامی ئەو گۆشتە کاریلەیە دوو بارە هاتەوە دەزارم.

سـپینا تێدەکـۆشێ: لە جۆلانەوەیەکدا بنوێ کە سـازیان کردوە و لامرا لە نیزیک دەرگا لە سەر هەرد ڕادەکشێ. جۆلانە پڕە لە ئەسپێ و ڕشک و کێچ بە ئیشتیاوە لە میوان وە خـۆ دەکەون کە گۆشتـی تەڕ و ناسکی هەیە. سپێنا لە نێو جـۆلانە دا ئەم دیوە و دەکا و بەڵام لە ترسی ئەوەی نەکا وە خانە خوێ بکەوێ، دەنگ ناکات.

لامرا هـەست پێدەکا و دەڵێ:

- لە وانەیە حـەبەشی ١ لە جـۆلانە دا هەبن. بەڵام ئەگـەر خۆتـی پێ ڕابنێی وازت لێ دێنن.

سپینا شەو باش دەڵێ.

تامی شـەڕاب بیرەوەری شیرینی ڕۆژەکانی ڕابردوو وە بیر لامرا دێنێتەوە و دەڵێ:

- باوکت جـارێک سـیـغـارێکی« تسکان» ی دامێ. وای چ سـیـغـارێک بوو.! ئێوارەی ڕۆژێکی شـەمـۆ بوو. من بەیانی زووی ڕۆژی یەک شـەمۆ لەو کاتە دا کـە ژنەکان لە نوێژی مـەسـحی گەورە دەگەڕانەوە لە مـەیدانی کلیسا کێشام. عەجەب سیغارێک بوو.!

سپینا خـەوی لێ دەکەوێ و لامرا هەر وا بیرەوەری ڕۆژە خۆشـەکانی تەمەنی درێژی درێژە پێدەدا.

---

١- ( حـەبەشـی)لاتاو و سـوکـایەتیـە بە حـەبەشـیـەکـان، ئیـتـالـی بە کـاری دێنن. وەک لە کـوردسـتـان بە ژاندارمەیان دەگوت( مشک)

لە بوینس ئایرس چۆمێکی بچوک هەیە بە ناوی« ریاشوەلو»، ئیتالیەکان لە دەور و بەری وێ دەژین کە بە زمانی ناوچە پێی دەڵێن« گریکنوس» یا «تانوس» کاتێک لە وێ ژنێکی پێست ڕەش و جوان و قەڵەو کە.......

ڕۆژی دوایی بەیانی لە هەوەڵین سەعاتی ڕۆژ دا سپینا دەچێتە دەور و بەری« پورتاسان جیووانی» و لە وێ چاوەڕوانی ڕومنو دەبێ. زۆری پێناچێ پەیدا دەبێ. بەڵام کرێکاری دیکەشی لە گەڵن. سپینا بێ ئەوەی خۆی بناسێنێ، لە مەودایەکی دیار دا وەدوای دەکەوێ.

لە هەموو لاوە دەستە دەستە کرێکار دەگەنێ. خۆشیەکی هەوا هەست پێدەکرێ کە سپینا گورج دەیناسێتەوە ئەوەشخۆشی بەرە بەیانی شاری ڕۆمە لە کاتێکدا کە جگە لە خەڵکی بە شەرەف کەس لە دەرێ نیە کە وەدوای کاری خۆیان دەکەون و کەم قسان دەکەن. لە « پور تاسانجیووانی» رومنو دەچێتە کوچەی « مورا ورەلین». پاشان لە «پورتامترووپیا »لە دەستە جیا دەبێتەوە و بە تەنیا ڕێگای کوچەی «ڤیاد لافراتلا» دەگرێتە پێش. سپینا بە دوایدا دەڕوا و ئێستا زات دەکا ئاوازێک بڵێ کە ڕومنو زۆر جار لە دورگەی « ئوستیکا» دەیخوێند – ئەو دەم هەر تکیان بۆ وێ دوور خرا بوونەوە – گۆرانیەکە ئاوا دەست پێدەکات : « هیچ کات گوڵی سووری بێ دروو نیە- هیچ کات ژنی بێ ئامێز و ماچ نیە »

ڕومنو ئاوڕ دەداتەوە بەڵام وا نیشان دەدا کە نایناسێ و ڕێگای خۆی درێژە پێدەدا تا کار گای جیرانی کە لە وێ وەستا کارە و کرێکار و فەعلەی دیکە چاوە ڕوانیی دەکەن. داخوا لە وانەیە لە نێو ئەوانە دا یەکێک پەیدا بێت کە خەڵکی « ئابوتزە» بێت و بتوانێ یارمەتی بە نەخشەکانی سپینا بکات.؟ سپینا لە بەر خۆی دوو پاتی دەکاتەوە« بەردی هەوەڵ دانراوە، ئێستا دەبێ بەردی دووەم پەیدا بکرێ» و لەو بەری دەرەتان دا دەبێ کەسێکی کرێکار بێت.»

لە کار گا دا، خانو بەرمیەکی کە خەریکە دروست بکرێ، تازە بەرز بۆتەوە. دیوارێکی بە قەد بەژنی پیاو دانراوە و بۆ درێژە پێدانی کار دەبێ دار بەست لێبدرێ. ڕومنو بە کرێکارەکان دەڵێ:

– کۆڵەکەی هەوەڵ دانراوە، ئێستا دەبێ کۆڵەکەی دووەم دابنرێ. ئەو دەم سپینا لەو دەستەیە وەنیزیک دەکەوێ و ڕومنو بە دەنگی بەرز دەڵێ: « تۆ بووی خاوەنی ئەو هەیوانەی کە دەبێ چاک بکرێ ؟»

سپینا دەڵێ : « بەڵێ، خۆمم. دەمویست بزانم بە چەندی بۆم تەواو دەبێ ؟»

هەر تک پیاو بە مەبەستی قسە کردن لە بارەی چاک کردنەوەی هەیوان لەوێ دوور دەکەونەوە و لە کاولێکدا کە قسڵیان تێدا عەمبار کردوە و عەمبارێکیش کە جێگای ئامراز و شرە وبڕەی کارە دادەنیشن.

سپینا لە گەڵ ئەوە کە نەخشەی هەیوانێک لە سەر هەرد دەکێشێ دەڵێ :

– لە نێو دەستەکانی دانیشتوی ڕۆم پێویستم بە پیاوێکی تەواو جێگای باوەر هەیە کە هەتا بکرێ کرێکار و خەڵکی « ئابروتزە» بێت و هێشتا لە گەڵ گوندی خۆی پێوەندی هەبێ. ئەو پیاوە دەبێ بچێتەوە گوندی خۆی و لە وێ پێوەندی لە گەڵ من بگرێ و هاو کاریم بکات. بە بێ یارمەتی کرێکارێک دەر فەتی ئەوەم نیە کە بناخەیەکی بتەو بۆ کاری خۆم دابڕێژم.

ڕومئو دەڵێ : تۆ زۆرت دەوێ .

سپینا دەڵێ: دەبێ بگەڕێی و بدۆزیەوە.

وەستا کار فیکرێک دەکاتەوە و پاشان بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵکەوت دەڵێ :

– دژ کردەوەی دەزگا بە تایبەت لە بەرانبەر خەڵکی گوندەکانی « ئاپولی» و «ئابروتزە» و « سارد » کە لە دەستەی ئێمە بوون، زۆر بێ بەزەیی بوو. نیزیکەی تەواوی ئەو پۆلیسانەی کە دێنە وێ خەڵکی دێهاتن و تۆ ناتوانێ بیهێنیە پێش چاوت کاتێ شۆرشگێرێک دەکەوێتە دەستیان و لە وەرزێرانی قەدیم بێ و منداڵی شار نەبێ، چی بە سەر دێنن. ئەگەر کەسێی شارەیی لایەنگری ئازادی بێ تاوانێکی گەورەیە، بەڵام ئەگەر وەرزێرێک ئازادیخواز بێ، کوفرێکی گەورەیە ئەو دەم قین و بێزاری تەواوی کار بەدەستان دژی وی هەڵدەچێ. کەسێکی وا هەمیشە« جولەکە کوژ»، دەکرێ. ئەگەر لە زیندانیش بە سلامەتی بێتە دەر، ئێسقانێکی ڕەق و تەقە کە هاو نیشتمانەکانیش لێی دەترسێن و لە بەری هەڵدێن.

سپینا دەپرسێ:

– کلوچی، چی بە سەر هاتوە ؟

– مانگێک لە مەو بەر کاتێ بەیاننامەی دژی شەڕی بڵاو دەکردەوە، دوو بارە گیرا، ئێستا لە زیندانی « ڕجینا کۆیلی» دایە. فەقیرە کوێر بوە.

– پوتزی چدەکات ؟

ڕومئو لە وەڵامدا دەڵێ:

– وەزعی وی ڕووناک نیە. هیچ کەس نازانێ کلوچی بۆ گیراوە و ئەو نە گیراوە. لە کاتێکا پۆلیس هەر تکیانی پێکەوە دیوە. دوور نیە کە ویستبیان ئابڕوی بەرن و لە

وانیدیکەی تاق خەنەوە. لە کوێ دکرێ ڕاستیەکەی تێبگەی؟ چەند مەسەلەی دیکەی وەک ئەو هەن و ئەو مەسەلانە زیاتر ئێمە نارەحەت دەکەن.

– لە نێو دەستە دا کەسێکی دیکەی خەڵکی « ئابروتزە» نیە ؟

– یەکی دیکەمان هەبوو بە ناوی « دیپرۆیا» کە تا پێش ژنهێنان باشبوو. بەڵام لە وەتا ژنی هێناوە ئیتر نایەوێ هیچ شتێ بزانێ. ئێستا سبەینان ڕۆژی یەک شەمۆ لە گەڵ ژنەکە دەچێتە نوێژی مەسح و ئێواران لە گەڵ ئەو ماشوقەی قژ زەردی دەچێتە پێشبڕکەی ئەسپ غاردان. کاتێ باسی ڕابردووی شۆڕشگێڕی دەکات، ئاسایی دەڵێ:« وەک ئەوەی لە خەوی پەرێشانی وەخەبەر هاتبم».لاوێکی خوێندکاریشمان هەبوو بە ناوی «لویجی موریکا» بەڵام وەها بێ شوێن بوە کە شوێنەواری دیار نیە. من چەند جار چەند کەسم بە شوێندا ناردوە چونکە لاوێکی باشبوو، بەڵام نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە.

– پچتی چدەکات ؟

– ئەو ئێستا لە بارەی گوڵ و بلبل شێعر دەڵێ. کاتێ ڕۆژنامەیەکی بە من نیشاندا کە شێعری وی تێدا چاپ کرا بوو بەڵام جگە لە باسی گوڵ و باڵندە شتێکی تری تێدا نەبوو. لە گەڵ ئەوە وا وێدەچێ پۆلیس دەستی لێ هەڵنەگرێ. چونکە ئامادە نەبوە هاوڕێیەکانی پێوە بکا.

– دەبێ بزانین دەتوانین لە نێو دەستەکاندا زەلامێکی دڵنیا و تێکۆشەر پەیدا بکەین. من پێویستم بە کەسێکی واهەیە.

ڕومئو پێشنیار دەکا:

– سبەی ئێوارێ کاتی تەواو بوونی کار وەرە ئێرە.

سپینا نایەوێ بچێتەوە ماڵێ و لە خانووی « لامرا» خۆ بشارێتەوە. بۆیە لە شەقامی « ڤیادلا ماویچا» و پاشان بە شەقامی « کلودیا» بۆ لای ناوەندی شار دەچێ تا جارێکی تر لە گەڵ شار دیدار تازە کاتەوە. بەڵام دڵێی شاری ڕۆم جوانی نەماوە. کرێکار لە شەقامەکان ڕۆیشتوون و ئێستا لە کوچە و کۆڵانەکانی شار جگە لە فەرمانبەرانی لیباس وەک یەک و کوڵکە قەشە و ژنی تەرکە دنیا کە خەریکی شت کرین، کەسیتر نابینرێت. بەڵام نیزیکەی سەعات یازدە کاتێکی سەر و کەللەی مفتە خوری گەورە و ئەفسەرانی پایە بەرز و کار بەدەستی بەرزی وەزارەتخانەکان و پایە بەرزانی کلیسا بە گۆرەوی بنەوشیەوە دەر دەکەون، لە پڕ قیافەی خەڵکی ڕۆم لە بەر چاوی مەترسیدار دەبێ. پاشان شەقامی « ڤیالا پیکانا» دەگرێتە بەر و دوو بارە بۆ

دەرەوەی شــار دەگــەڕێتــەوە. قــوتوێک تۆزی مــێش کــوژ بۆ کــوشــتــاری «حــەبەشــیــەکــانی» مــاڵی « لامــڕا ». دەکــڕێ. بەڵام زەحــمــەتەکــەی لەم ڕێگایە دا بێفایدەیە، چونکە « حەبەشیەکان» لە ڕۆژدا بڵاو دەبن و خۆ دەشارنەوە. تاکتیکی ئەوان پەلاماردانی شەوانە و شەڕی پارتیزانیە لە تاریکیدا.

« مـاناجیو لامڕا » تا نیوە شـەو لە دەرێ ماوەتەوە و باشـیـان لێداوە و نیـوە گیـان بە چاوێکی بەسـتـراو و دەسـتـێکی شکاو و لیبـاسـی دڕاو دەگەڕێتەوە. سـپـینا دەیەوێ بزانێ کێ و لە بەر چی ئەومیان بە سـەر هێناوە. بەڵام لامڕا بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە لە نێو قوتوێکدا لە شوشەی تەنتیور دەگەڕێ تا برینی دەستی ببرژێنێتەوە.

سپینا دەڵێ:« تۆ ئەوەی بۆ ژیان پێویستـە، نیتـە، بەڵام تەنتۆر یۆدت هەیە، کـە وابوو دەر دەکەوێ کە زۆر جار ئاوا لێت دەدەن.

لامـڕا دێتـە زمـان و دەڵێ: «حـەوتووی یەک دوو جـار بە گـوێـرەی وەرز کـوتەکی وا نوشی گیان دەکەم. بەڵام ئێستا لێدانم زۆر بوە، ئەمەیان ئاخر جارە.»

سـپینا پێـدادەگرێ تا بزانێ کێ و لە بەر چی ئاوا لـە خانە خوێی وی داوە. ؟ بەڵام لامڕا هەموو جار دەیەوێ مەسەلەکە بگۆڕێ. لە ئاخریدا دەڵێ :

– ئـیمشـەو لە وانەیە ئەو کابرایە درنگتر بێتە ئێرە، تۆش دەیناسی ئەو دەم دەزانی کێیە. ڕەنگە وەبیرت بێتـەوە. ئەندازیارێکی خـەڵکی وڵاتی ئێـمـەیە بە ناوی« ئاکیل سکارپا ». سـپـینا باش دێتـەوە بیـری. ئەندازیار سکارپا سـەر دەمێک کە سـپـینا هێشتا قوتابی مـەدرەسە بوو لە بەر ئەوەی لە ڕووداوێکی نا دیاری شـەڕی دنیا گر دا، قارەمانەتی لە خۆ نیشاندا بوو، شانازی ناز ناوی« پاڵەوانەتی ئەکیل گریزیا »( ئەکیل ڕاکـردوو)ی وەر گـرتبـوو. گـۆیا بێگومـان و بێ ئەمـلاولا و چۆن و بۆ چی، ئاغای ئەندازیار ڕۆژی دەستپێکی پاشە کشە لە « کاپورتو» لە سەعاتی نۆی بەیانی لە « پاڵمـانوا » لە نیزیک بەرەی شـەڕ بوە و لە سـەعـاتی دەی ئەو ڕۆژە لە شـاری ڕۆم دیتـوویانە، یانی نیـزیکەی شـەش سـەت کیلۆ مـیـتـری « پاڵمـانوا ». ئەو نـەیدەتوانی تەنانەت بە فڕۆکەش نەیدەتوانی بە سەعاتێک ئەو مەودایە ببڕێ. لە وە سەیر تر ئەم ئاغایە کە خۆی تەینا سەربازێکی پیادە بوە، وەک خۆی باسی کردوە ئەم مەودایەی بە پێیان بڕیوە. جگە لەو شاکارە ناو براو لە تەواوی تەمـەنیدا هـەمیشە کابرایەکی ئاسایی و شـەرمێون وترسـەنۆک بوە.

لامڕا درێژەی پێدەدا و دەڵێ:

– ئاغای ئەکیل لەو کاتەوە کە بێکار بوە ئەرکی پارێزگاری و پشتیوانی لەو ژن و

کیژه دنیا گەڕانەی بێگانەی گرتۆتە ئەستۆ کە بە ڕۆم دا تێدەپەڕن. کاری ئەوەیە بە دایمە لە دەور و بەری هێندێ میوانخانە و پانسیۆنەکان دا دەسووڕێتەوە و ژنەکانی تازە گەیشتوو هەڵدەنێ و دوایان دەکەوێ و کاتێکی یەکی بابەت بە حاڵی خۆی دیتەوە- کە دیارە هەمیشە لە تیپی قژ زەرد و ناسکەکانی باکوڕ- ئەو دەم من بانگ دەکات. کاتێکی ژنەکە دەگاتە شوێنێکی چۆڵ و کەس دیار نیە : بۆ نموونە لە سەعاتێکی دیاریکراو لە «کولیزە» - من دەبێ لێی نیزیک ببمەوە و خۆی تێهەڵقوتێنم تا نارەحەتی دەکەم و دەیترسێنم. ئەو دەم لاوێکی وێچووی جوان کە بە ڕواڵەت بە هەڵکەوت بە وێدا تێدەپەڕێ، بە هاواری ژنەکەوە دێت و یارمەتی پێدەکات. دیارە ئەو لاوە جگە لە ئاغای « ئاکیل» کەسیتر نیە. لاو بە گژ مندا دێت و شەڕێکی توند دەست پێدەکرێ و بە گوێرەی قەراری پێشوو هەمیشە ئەو سەر دەکەوێ و من دەبمە ڕاکردوو. پاشان سەر بۆ ژنەکە دادەنوێنێ، قۆڵی دە خاتە باسکی مادمازیل و دەیگەیێنێتەوە مزڵەکەی.

سپینا دەپرسێ: « ئێستا ئەوە شوغڵی تۆیە ؟»

- بەڵێ. کارێکی هاسانیش نیە. ئاغای ئەکیل من بە ناوی « جانەوەری دێهاتی» بانگ دەکات و بۆ ئەو کیژانەی کە لە مەترسی نەجاتی داوێ داستانی وەها بە ترس لە من باسدەکات کە دیارە ڕادەی ئەمەکناسی ئەوان لە ئاست نەجاتدەری خۆیان زیاد دەبێ.

سپینا دەڵێ: « بێگومان کارێکی پڕ داهاتە.»

« جانەوەر لە وەڵامدا دەڵێ:

- بەڵێ ئەگەر ئاغای ئەکیل زۆر وەسواسی نەبایە ڕەنگ بوو وابێت. ئەو چەند جاری هەوەڵێ کاتێ قوربانیەکانی خۆی دەگەیاندەوە بەر دەرگای هوتێلەکە، لە پڕ وای نیشان دەدا کە لەو شەڕەدا کیفی دراویان لێ دزیوە. ئەو دەم ژن یاکیژە تکای لێدەکرد لە پاداشی خزمەتەکەی هێندێ پارەی لێ قبوڵ بکات. بەڵام ئێستا بە ڕاستی و یا بۆ فریودانی من دەڵێ ئیتر لەم شێوەیە بێزار بوە و کاتێ پارە قبوڵ دەکا کە هیچی نەمابێ. ئەگەر وانەبێ تەنیا بۆ وەدەست هێنانی شانازی ئەم کارە دەکات.

- چ شانازییەک ؟

- شانازی ئەوە کە بۆ پاراستنی شەرافەتی ئابڕو و شەرافەتی ژنێکی بێگانە کە بە دڵپاکی هاتۆتە وڵاتی ئێمە و کەوتۆتە بەر پەلاماری« جانەوەری دێهاتی» خۆی

خستۆتە مەترسییەوە. ئەو بە من دەڵێ:« دەبێ بە بێگانان نیشان بدرێ کە لە وڵاتی ئێمە داب ونەریتی شوالیەکان»ی قەدیم هێشتا لە بەین نەچوە.
سپینا دەڵێ: « چما ئەم داو دانانە و ئەم نەجات دانە هەمووی شانۆ سازی نیە.»؟
لامرا لەم ئیرادە سەر دەر ناکا و دەڵێ:
- یانی تۆ پێت وایە برینەکانی لەشی منیش شانۆ سازییە؟ تۆ پێت وایە کە من فەقیرانە ئەم کوتەکانە نۆشی گیان دەکەم و دەست لە حەریف هەڵناهێنم؟ حەیف! خۆزیاڕوو داوەکە بە گوێرەی ئەو قەول و قەرارە تێپەڕیبایە کە پێکەوەمان دانابوو. چوونکە ئاغای ئەکیل وەک خۆی دەڵێ پیاوێکی هەستیار و بە غیرەتە. زۆر جار بە دەستی خۆی نابێ و لە جەنگەی شەڕ دا وەها لە کورە دەچێتە دەر کە بەڵێن و قەرارەکانی نێوانمان لە بیر دەکات و بە ڕاستی وە بەر مست و پێلاقانم دەدا و هەر لەو کاتەشدا چاوە ڕوانە کە من دەنگ نەکەم و دەست بەرز نەکەمەوە. دیارە شتی وا نابێ و من ناچار دەبم بەرگری لە خۆم بکەم و دەست بەیەخە دەبین.
سپینا دەڵێ: « ئەم بێگانانە هەر وا بە ساکاری فریو دەخۆن؟»
جانەوەر دەڵێ :
- بڕوا بکە ئەو بەد بەختانە وەک هەرمێ گەیشتوون تەنیا چاوە ڕوانی ئەوەن خۆیان دەمامێزمان باوێن. ڕەنگە ئەوە لە ژێر کار کردی هەتاوی ئیتالیا بێ کە ئەوانە دەگەیەنێ. تا ئێستا لە بارەی سێ کەسان وا هاتوتە پێش کە هەر کە لێیان ومنیزیک کەوتبم بێ ئەوەی ڕێگای خۆ تێهەڵقوتندنی ئاغای ئەکیل بن، خۆیان تەسلیمی « جانەوەری دێهاتی» کردوە. ئاخ ! چەندە ژنی جوان و تەڕ پۆش، چەندە ژێر کراسی نەرم و خاوێن ، چەندە لەش و لاری کە بۆنی عەتریان لێ دێت و دیار بوو کە قەت کاریان نەکردوە.! پاش ئەم سەر کەوتنە چاوە ڕوان نەکراوە خوێنی ئێرەیی ئاغای ئەکیل دێتە جۆش و قینی من لە دڵ دەگرێ و ئێستا دەیەوێ کە پێش ئەوەی لە ژنێک نیزیک ببمەوە کە ئەو نیشانی کردوە، سەر وچاوی خۆم پیس بکەم و بیچمێکی ناحەز و دزێو لە خۆم ساز بکەم.
ئێستا زەلامێک لە دوورەوە دەبینرێ کە دێتە پێش بە سەر خەندەک وقوڵک و هەردی کەند و قوڵدا بازد دەدات و سەگ و پشیلەی بەرەڵا لە بەری هەڵدێن. کابرا دەشەلێ و سەری پێچاوە.
« جانەوەر» لە کاتێکا پەیاخێکی گرێداری بە دەستەوەیە دەڵێ : « خۆیەتی »
لە دوورەوە دیارە کە ئەکیل ڕاکردوو قینێکی بە ترس دایگرتوە. هاوار دەکا:

– ئەی بەرازی پیس لە لانت وەرە دەرێ! لە تەویلەی بەرازت وەرە دەرێ.!
« جـانەوەر» پەیاخـەکـەی هـەڵدەسـوورێنـێ و دەڵێ:« بێـیــە پێش بەم پەیاخـە ورد و خاشت دەکەم.»
قارەمانی ڕاکردوو دوو بارە هاوار دەکات:
– ئەی خاینی قرێژ یالا، دڵ و غیرەتت نیشـان بدە! ئەی عەنتـەری پیس وەرە پێش بزانم چ پیاوێکی ؟!
« جانەوەر» دوو پاتی دەکاتەوە: « گوتم پێت بێیە پێش ورد و خاشت دەکەم .»
– ئێسـتـا دەرسـێکت دەدەمێ کـە تا ئاخـری ژیان لە بیـری نەکـەی. ئێسـتـا تێت دەگەیێنم کە نەجیبزادەی ڕەسـەن بە کێ دەڵێن. ئەی سـەگی گڕوێ نە کا خـەیاڵی ڕاکردنت هەبێ.
– مەیە پێش، دەنا پەشیمان دەبیەوە.
– بەر لەوەی دەسـتـەکانم بە کەلاکی تۆ پیس بکەم، باشـتـرە گیـانت بە شـەیتـان بسپێری.
– ئەگەر ئەو جار بێیە پێشتر، توشی گوناحێکی گەورە دەبم.
– ڕاکردنت بێفایدەیە، ئەی دزی دەغەڵ، بە خۆڕایی خۆت مەشارەوە.
هـەر تکیـان لە مـەودایەکدا لە بەرانبـەر یەکـتـر وێسـتـاون. مـەیدانداری خـوێناوی وهەڕشەی سامناکیان لە هەوا دەنگ دەداتەوە. تا سـپینا کە پێغەمبـەری ئاشتییە، دەبێتە بەڕیوانکەر. ماوەیەک پێدەچێ تا ئەکیل ڕاکردوو دەیناسێتەوە. سەری لە وە سـوڕ دەمـێنێ کـە مـرۆڤـێکی ئەوەندە باش لە کـونە بەرازێکی ئاوا دا لـە گـەڵ مەیمونێکی پیس دەژی.
سپینا دەڵێ: « پارەم نیە بچمە میوانخانە »
ئەکیل ڕاکردوو سپینا داوەت دەکا کە بچێتە ماڵی وی. « جانەوەر بە هیوای ئەوە کە هاو دەمی سـپـینا حـەریفەکـەی ئاقڵ دەکات کە قـەول و قـەراری مـابەینیـان بەرێتە سەر، لە گەڵ ئەم داوەتە دژایەتی ناکات.
ئەو مزڵەی کە ئێستـا سپینا دەیچێتێ، تاقە ژوورێکە لە قـاتی سێیـەمی خانو بەرێک لە شـەقـامی «ڤـیادی مـارسی» لە نیـزێک« پورتـاسـان لورنزو». ئـەم ژوورە بە چەکی شەڕی ڕازاوەتەوە و لە پەنا وان عەکسی جۆر بە جۆر ی ئارتیستی سینەما و« ئەلغ ئەلغ» لە دیوار دراون. ئەکیل ڕاکردوو هیـلاک و ماندوو ئەوەندەی خەو دێت خۆی بە سەر تەختی خەو دادەدا و دەڵێ:

– ئەوە نە بوە ژیان !
سپینا لێی دەپرسێ :
– لەمێژە کارت بۆتە پشتیوانی لە ژنانی بێگانە ؟
– دوو سـاڵە. لە سـەرە تاوە هـەر کـەسـێکی دەسـتم کـەوتبـا، لە لەهـسـتـانی و مەجارستانی و سویسی و بیرزیلی پێیان ڕازی بووم. بەڵام ئێستا تەنیا بەو ژنانە ڕازی دەبم کە نرخی پارەی وڵاتیان لە نرخی لیرەی ئێمە بەرز تر بێ. ئەم دەستەیە جگە لە ئیرلەندییەکان کە دێنە زیارەت لە هەموان شارستانیتر و هەستیار ترن.
ئەکیل ڕاکردوو ژمارەیەکی زۆر عەکس و نامەی ئەو ژنانە لە سندوقچەیەک دێنێتە دەر کە لە چنگ «جانەوەر» نەجاتی داون. سندوقچـەیەکی تر هەیە پڕە لە ئـاڵقـە و هەودا مووی یادگاری هەر لەو ژنانە بە ڕەنگی جیاوازی زەرد و سوور و قاوەیی کە بە هـەودایەکی ڕەنگ ئاسمانی لێک بەسترابوون.
ئەکیل دەڵێ:
– کاتێ پیر بووم لەم مـوانە باڵنجێک دروست دەکەم کە لە کاتی خەوی دوای نیوەڕۆ دەیخەمە ژێر سەرم.
سپینا پێشنیار دەکا کە : « بۆ عیلاجی ڕوماتیزم- یش دەتوانێ کەلکیان لێ وەر بگرێ. وا دیارە دەرمانی لەوە باشتر بۆ روماتیزم نەبێ.»
ئەکیل ڕاکردوو دەڵێ:
– ئەو « لامرا » یەی هاو وڵاتی تۆ، هەر ئەو دێهاتیە کەرەیە کە بوو. کابرا جگە لە پارە چیتر تێناگات. ئەو جوانی مـەلەکوتی دوو چاوی کاڵ هەست پێناکات کە بۆ ڕزگاری لە شەڕی دێوێکی پیس سوپاس دەکا.
زەنگی دەرگـا لێـدەدرێ و ژنێکی گـەنج و بۆن خـۆش کـە گـۆزەی مـورەبا و قـوتوی بیسکویت و چەند بوتڵ شـەڕاب و دەسته گوڵێکی سووری جوانی پێیە دێتە ژوور. ژنە هوڵەندییەکی سـوور و سـپی و قـەڵەوە کـە ئەکـیل ڕاکردوو بەیـانی ئەو ڕۆژە لە داوی « جـانەوەر نەجـاتـی دابوو، بۆ دەر خـسـتنی ئەمـەگناسـی خـۆی لە فـەرهـەنگی گیرفانی وشە دەبینێتەوە و دەڵێ:
– عالی ! دڵی پڕ مـحیبـەت، هەقناسی من بۆ تۆی خۆشە ویست، جوان، من، لە گەڵ تۆ، ئاخ !
بە یارمەتی بوتڵەکان گفتگۆیەکە ئاشکرا تر دەبێ.
سپینا بێ ئەوەی ئەو دوانە ئاگا دار بن دەچێتە حەمامی پەنا ژوورەکە. هێندێ کۆنە

لیباسی چڵکن و کتێبی ئەندازیاری لە قەفەسـەیەک دێنێتە دەر تا شەو لە وێدا خۆ مـات کا. زۆری پێناچێ دەنگی گومانلێکراو لە ژووری تەنیشت دەبیسرێ. دەنگی تەختی خـەوە کـە سـەر لـێ شێـواو بۆ ئەم لاو لا دەخـزێ دەتگوت بومـە لـەرزهـاتوە. سپینا هـەر چی دەکەوێتە دەستی دەیەوێ گوێچکەی خۆی پێ باخنێ تا ناڵە و نازی کیژی هوڵەندی و نەڕەی درندانەی ئەکیل ڕاگردوو نە بیسێ، ئەم کۆنسێرتە تەنیا لە مـاوەیەکی کـورت دا تەواو دەبێ و لە تەواوی شـــەو دا درێژەی دەبێ. لە کـازیوەی بەیانی داسپینا لە بەر هیلاکی خۆی پێ ڕاناگیرێ و خەوی لێدەکەوێ.
درنگ دەکاتە ئەو جێ ژوانە ی کە لە کەڵ« رومیۆ»ی دانا بوو. کارگا ماوەیەکە چۆل بوە. وەستا کار لە گەڵ پیاوێکی گەنج لە پشتی عەمباری کەل و پەل چاوە ڕوانی وی دەکەن.
ڕۆمیۆ دەڵێ ئەم پیاوە « ڕابیتە »
لاوەکە دەڵێ : « مانگێکە پارمیەک و پاسپۆرتێکی « چیکی» بۆ تۆ هاتوە.
- تۆ بە چی دەزانی پاسپۆرتی « چیکی» یە.
- من پاکەتەکەم کردەوە.
سپینا سەر کۆنەی دەکا و دەڵێ:« کارێکی خەرابت کردوە !»
کابرا دەڵێ:« ئێمـە دوێنـێ شـەو لە « سـان لۆرنزو» بەیاننامـەی دژی شــەڕمـان بڵاو کردەوە.»
- لەو بەیاننامـەیە دا چی نووسراوە ؟
- من هێشتا کاتی خوێندنەوەی ئەوم نە بوە.
- تۆش بڵاوت دەکردەوە ؟
- بەڵێ منیش، ئێستـا ئیتر ژمارەی مە زۆر نیە و هەموو دەبێ هەموو جۆرە کارێکی بکەین.
لە پڕ ڕۆمیۆ بە توڕەیی بە سەریدا دێ و دەڵێ :
- چۆن؟ تۆ کارت پێوەندی گرتنە یا مـەعموری تەبلیغات؟ مـەگـەر نـازانی کاتێکی ویستویانە بە دەستێکی دوو شوتی هەڵبگرن، کار خەراب بوە ؟
پیاوی لاو سەر دادەخا.
سپینا لێی دەپرسێ: « کارت چیە ؟»
- هەر کارێکی هەبوو بێ کردوومە. من کارێکی دیاریکراوم نیە.
وەستا کار دەڵێ :

– بەد بەختی هەر لە وە دایە! ئەگەر خەڵک لە کاری دیاریکراو دا یەکتر نەناسن، ناتوانن لە کاری نهێنیدا یەکتر بناسن. ئەم وەستایەی کە دیواری ساختومان دادەنێ لە پێشدا دار بەست لێدەدا. دارەکان لە هەردی دەکوتێ. پاشان ئەو دارانە بە دەستە دارێکی درێژ پێکەوە دەبەستێ و پاڵیان بە دیوارەوە دەدا. وەستا باش دەزانێ کە ئەو دارەی لە هەردی دەکوتێ، بە کاری دەستە داری لێک بەستنەوە نایە. ئەگەر وا نەبێ دار بەستەکە دەڕمێ. ئەم قایدە لە گشت کارەکاندا ڕاستە. لە بۆشکە سازیش هەر وایە و لە کارمبا و میکانیکیش هەر وایە. هەر کارێک قایدەی تایبەتی خۆی هەیە. کاری نا قانونیش قایدەی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر بێتوو ئەم قایدەیە نەزانن و یا چاوە دێری نەکەن، لە وانەیە بە نرخی چەند ساڵ زیندان و هێندێ جاریش بە قیمەتی گیان تەواو دەبێ. کە وابوو لەم ڕۆ بە دواوە تۆ ئیتر «ڕابیت» نی. بە دوای کاری خۆت دا برۆ و لەم دەور و بەرە نەتبینمەوە. ئەگەر توشی یەکتر بووین، وا نیشان مەدە یەکتر دەناسین.

پیاوی لاو بە ناڕەحەتی بە دوای کاری خۆیدا دەڕوا.

ڕۆمیۆ نیشانی چەند کەسی خەڵکی «ئابروتزی» دا بە سپینا کە لەو چەند ساڵەی دواییدا لە دەستەکان دوور کەوتوونەوە و لێی زیاد دەکا:

– تۆ چاکترین کەسێکی کە دەتوانی تێبکۆشی ئەوان بۆ بزووتنەوە بگێڕیەوە. مەترسی شەڕ وەزعێکی پێکهێناوە کە دەکرێ هێندێ کەسی خەو لێکەوتوو بۆ تێکۆشان بگێڕدرێنەوە.

سپینا دەڵێ: «کۆمەلانی خەڵک لە بارەی ئەم شەڕەی لە پێشە چۆن بیر دەکەنەوە؟»

– کۆمەلانی خەڵک هیچ بیر ناکەنەوە. ڕەفتاریان جۆرێکە هەر دەڵێی شەڕ پێوەندی بەوانەوە نیە. زمانی بەیاننامەیەک کە لە دەرەوەرا پێمان گەیشتوە و ئێمەش بڵاومان کردۆتەوە، لەم بارەوە کەم و کورتی هەیە. دەڵێی بەو مەبەستە نووسراوە کە هۆگری و سەرنجی خەڵک بە قازانجی شەڕ بهاروژێنێ. ئەگەر ئێمە تازە بتوانین بێکارەکان ڕازی بکەین کە لە حەبەشە شتێک بۆ دزین هەیە، زۆر لەو داخوازانە دەبنە سەر باز. ئێستا کە بۆ سەر بازی ناچن دڵنیا نین کە لەوێ شتێک بۆ دزی هەبێ. لە لایەکی تر زۆر لە شۆڕشگێڕانی پێشووش نیزیک بوونەوەی شەڕ بە تاسەوە وەر دەگرن چونکە پێیان وایە کە شەڕ دەبێتە هۆی ڕوخانی دەوڵەتی ئێستا و ئازادیمان پێ دەبەخشێ.

سپینا دەڵێ:

- مـانەوەی من لەو چەند مـانگەی دوایی لە نێـو وەرزێڕان دا ، قـانعی کـردووم کـە تەبلیـغاتی ڕوت تەواو بێ نەتیـجەیە. وەرزێڕەکان نەک لە بەر ئەوە دیکتاتوریان قـبوڵ کـردوە کـە بڕوایان بە تەبلیـغـاتی ڕەسـمی هەیە کـە بۆیان دەکـرێ. بەڵکوو لە بەر ئەوەیە دیکتاتۆری واقـعیەتێکە. ئـەگەر وەرزێڕ بکرێتە سـەر پشک لە نێوان واقعیـەتی دزێو و نزم و قسـەی جوان وفریو دەر، یەکـیان هـەڵبژێرن، واقـعیـەت هـەڵدەبژێرن. واقعیەت پیاوێن و قسە ژن. یەکێک لە وەرزێڕەکان بە منی گوت کە هەزار ژن بە قد پیاوێک نیـە. کە وابوو کـارێکی دەبێ بکرێ ئەوەیە کە تەبلیـغـات بۆ ئازادی لە گەڵ کردەوەی دلێرانە و پڕشنگدار کە ئازادی لە کردەوە دا نیـشـان بدات، تێک بخرێن. بە کورتي دەبێ دەورەیەکي تـایبـەتي تەبلیـغـاتي بە کردەوە لە ڕادەی تێگەیشـتني نە خوێندەواراندا بخرێتە ڕێ.

- بۆ نموونە چۆن ؟

- بۆ نموونـە بارەگـای فـەرمـانداری فـۆچینۆ لە «ئاوەتزانۆ» بتـەقـێنـین. دوو یا سێ ئیـدارەی مـاڵیـاتی بسـووتێنـین. پێـشی ئیـجرای دەست بە سـەر داگـرتنی مـاڵ و ساماني بنە ماڵە فەقیرەکان بگرین.

ڕۆمیـۆ دەڵێ : « لـەم بارەوە دوو بارە قـسـە دەکـەین. کـردەوەی توند و تـیـژی تەقـە کـەسی قـەت بـە دڵی من نەبوە و بە پێکەنینەوە لێی زیاد دەکـات: « ڕووناکـبیـرێک قدیلە بدەی هەمیشە دەبینی کە ئاژاوە دەچێت.»

بە گوێرەی ئەم نیشانانەی کە ڕۆمیۆ داویەتی، ڕۆژی دوایی سـپینا دەتوانێ خانووی یەکێ لە دۆسـتاني پێشـووی خۆی بە ناوی « ئولیـوا » بدۆزێتەوە. ئولیـوا وێلونیسـتە. سپینا بەر لە چەند سـاڵ ،، واتە لەو کاتەوە کە هەر تکیان لە دەسـتـەی خوێندکارانی سۆسـیالیست دا بوون و یەکتریان دەبینی، لێی بێخـەبەر بوە. تەنیا دەیزانی ئولیوا دەبێ چەند مـانگ زینداني بوو بێت و پاشـان تەواو دوور کـەوتۆتەوە. سپینا لە قـاتی چوارەمی خـانوێک لە شـەقـامی« پانیسـپرنا » لـە کوچەی« ویمینال» دەیدۆزێتـەوە. ژنێکی گـەنجی سکپـڕ دەیبـاتە ژووری ئولیـوا. ئولیـوا زۆر بـە سـاردی و بـە بێ نیشانداني خۆشی بە سـەر سوڕ مـانەوە وەری دەگرێ. ئولیوا پیاوێکە کورتە باڵا، پشت کـوڕ، لاواز، چاویلکەیی، کـراسـێکی ڕەشـی پیس حـاڵەتێکی خـەفـەتبـار و بێکارەی بـەو بەخشـیـوە. بە چوونە ژووری سـپـینا تەنانەت لە سـەر ئەو تـەختـەی پاڵیـشـی لێـداوەتەوە، خـۆی نە بـزاوتوە. سـیـغـار دەکـێشـێ و تفی زاری فـرێدەدا. تفەکەی لە پانایی ژورەکە بۆ لای تەشـتێک ڕێگا دادەگرێ کە لە قـوژبنی ژوورەکە

دانراوە، بەڵام زۆر جـار نـاگـاتـە ئامـانج چونکـە شـوێنەواری زەردی کـەم و زۆر لە هەموو شوێنێ. لە سەر ڕیشووی پەتو، لە سەر مێزی کار و لە دیوارەکان دەبینرێت.

سپینا دەڵێ:« دەمێکە یەکترمان نەدیوە. فیکرم نە دەکرد وات لێبێت.»

– ڕەنگە پێت وا بووبێت کە ئاخرەکەی دەبمە نۆکەری دەوڵەت.

**سپینا دەپرسێ: « بۆچما ڕێگا چارەی دیکە نیە ؟»**

– بۆ ئێـمـە قـەت ڕێگا چارەی دیکە نەبوە. دەبێ ببـیـە نۆکـەر و یا دەبێ بمری. هەر کەس بیـەوێ بێفەرەزانە رەفتـار بکا و مل بۆ هیچ نیزامێک ڕانە کێشێ جگە لە وەی کە لە ناخـیدا پەسندی دەکا، لە کـۆمـەڵدا بە دەر کراو دەناسـرێ و دەوڵەتیش وەک دوژمنێـک ڕاوی دەنێ. ئەو دەسـتـە خـوێند کـارانەی هەمـانبـوو، وەبیـرت دێ؟ ئەو کـەسـانەی نە کـەوتوونـە زیندان و یا لە بـرسان نـەمـردوون، توشی ڕۆژی خـەرابتـر بـوون، واتـە بـوونـە نـۆکـــــــەری دەوڵـەت. مـن پـاش ئـەوەی بـە تـاواتـی ئـەوەی لـە مـەیدانـی«پیـاتزاونزیـا» هاوارم کرد بوو« بژی ئازادی» دە مـانگ لە زیندان مـامـەوە، مـاوەیەک زسـتـانان لە نانواخـانەکان و هـاوینان لە سـەر پەیژەی کلیسـا دەنوستم و کۆتەکەم وە بن سەرم دەدا. نێـوە نێوە پۆلیس دەورەیان دەدام و دەیانپرسـی:« کێی و لێـرە چدەکـەی؟» بە چی دەژی « کـاتـێ لە جیـاتی ناسنـامـە کـە نەمـبوو شـەهادەی خوێندن و دیپلـۆمـەی موسـیـقـام نیشـان دەدان، وەهـا بە قـاقـا پێدەکـەنین کـە هـەر نەیبینی. تەنانەت هـەولم دا کە بچم لە گوندی خۆم لە ویلایەتی « سالرن» نیشتە جێ بم بـەڵام هـیـچکارێکم بـۆ پـەیدا نـەکرا. لـەو کـاتـەوە کـە ئـەسـپـانـیـاییـەکـان لە ویلایـەت ڕۆیشتوون، وەزعی دێهات قەت وا خەراب نەبوە.

سپینا دەڵێ :« دەبێ لە گۆشەگیری بێیە دەر، دەبێ لە گەڵ چینی کرێکار ببیە یەک، دەبێ کاری بەر بڵاوی تەبلیغاتی لە گەڵ هێندێ کردەوەی ئازایانە دەست پێبکرێ.

– چینی کرێکار فەوتاو و فاسید و بێ هەست و مۆری دەوڵەت وێکەوتو مـەحکووم بە برسـیــــەتی بـوە. تەنانـەت باری ئیـداری بوروکـراتیـزەیان داوە بە برسـیـــەتی. برسیـەتییـەکی رەسـمی هـەیە کـە مـاف دەدا بە ئینسـان کـە بچێ لە سـوپی دەوڵەتی کەلک وەر بگرێ و برسیەتیەکی غەیرە ڕەسمی هەیە کە ماف دەدا بە ئینسان بچێ خۆی بخاتە ڕوباری تیبە.

سپینا لە وەڵامدا دەڵێ :

– لە نێو ئەم خەڵکەی لە بەر یەک بڵاو کراو دا هێشتا ڕەگی زیندوو هەر هەن. ئێمە لە وەزعێکی فرە خـەرابدا دەژین. پیاوێکی وەک تۆ نابێ تـاق کەوێتەوە. فـیـدا کـاری

تاقە کەسە ئەنجامێکی نابێ، دەبێ هەوڵ بدەی کۆمەڵانی خەڵک وەخەبەر بێنی.
- بێگومـان وەزع خـەرابە. ئـەم دیکتـاتۆرییـە دێ ئێـمـە دەخنکێنێ و خـۆشی وەک جـەنازە ڕوت بۆتەوە. مـاوەیەکـە ئیـتـر لە شکڵی بزووتنەوە، یا بـزووتنەوەی کـۆنە پەرسـتـیش بێ هاتۆتە دەر بۆ ئەوەی تەنیا شکڵی ئیداری ( بوروکـراسـی) هەبێ. بەلام لە ئەسـڵـدا دژایەتی لە گـەڵ ئەم دیکتـاتۆرییـە ئەنجـامی چی دەبێت.؟ بە ( بوروکــراسـیــەکی) دیکە کــە بە نـاوی بیــر و باوەڕێکی دیکە و بە حــیــســابی بەرژەوەندێکی دیکە بە نۆرەی خـۆێ دەبێــتــە داواکـاری کــردەوەی دەســەلاتێکی سـەرەڕۆ. ئەگـەر ئەو « بوروکراسی» یە سـەر کـەوێ : و لەوانەشـە سـەر کـەوێ- ئەو دەم ئێمـە ڕاسـتـە و ڕاسـت لە سـەرەڕۆیەکەوە بۆ سـەرە ڕۆیەکي تر دەگـوێزرێینەوە. ئیمـە لەگەڵ شتێک دەبینە ئاشنا کە پێی دەڵێن شـۆرشی ئابووری و لـە سایەی وێوە هەر وەک ئێستـا کە ئیـمـڕۆ ڕێگای ئاسنی دەولـەتی و کەتە گـەنەی دەولـەتی وخـوێی دەولەتی و شەمچەی دەولەتیمان هەیە، ئەو دەمیش نانی دەولـەتی و کەوشـی دەولـەتی وکـراس و دەرپێی دەولـەتیـمـان دەبێت. داخـوا دەگـرێ ئەمـە بە پێشکەوتنی فـەننی بزانین ؟ دامنا کە بەڵێ . بەلام ئەم پێشکەوتنە فەننییە دەبێتە نوختـەی پاڵپشـتی مـەکتـەبێکی ڕەسـمي و ئیجباري و بناخـەي ئاینێکی سیاسی کە بۆ لە بەین بردنی بیر و ڕای موخالیفی خۆی و کەڵەکایی لە بیری تاکی لە هەمـوو ئامرازی هەبوو لە سینەماوە بگرە تا ترس و زۆرداری کەلک وەر دەگرێ.
لە جێگای پشکنینی بیـر و باوەڕ کە ئێستـا هـەیە، پشکنینی بیر و باوەڕی سـوور دێت. لە جیـاتی سانسـۆری ئێسـتـا، سـانسـۆری سـوور دادەمەزرێ. لە جیـاتی دوور خـراوەکانی ئێسـتـا، دوور خراوەی سـوورمـان دەبێ کە باشـترین قوربانیـەکـان ئەو شـۆرشگێرانەی موخالیفی دەزکا دەبن. و بەمجۆرە کە «بۆروکراسی» ئێستا لە ژێر ئالای ناوی نیشتـمـاندا بەرجەسـتـە بوە وموخـالیفانی خـۆی بە تاوانی ئەوەی خۆیان بە بێگانە فرۆشتوە لە بەین دەبات، « بۆروکـراسی» داهـاتوی ئێوەش بە نـاوی کـار و سـۆسـیـالیـزم ناو دەبرێ و هـەر کـەسـێکی بە مێشکی خـۆی بیر بکاتەوە بە نۆکەر و جیرە خۆری پیشەسازانی گەورە و خاوەن ملکانی زەوی ناو دەبا و نابوتیان دەکات.
سپینا بە سەریدا دەگوڕێنێ و دەڵێ:
- ئولیوا تۆ خـەریکی سەفسـەتە دەکـەی! تۆ لە ئێمـە بووی، ئێمـە دەناسی و دەزانی کە ئەمە ئارمانی ئێمە نیە.

ئولیوا دەڵێ:« قبوڵمـە کە ئەوە ئارمـانی ئێوە نیـە بەڵام ئەمـە چـارە نووسی ئێـوەیە، چارە نووسێکە ئێوە ناتوانن لە بەری ڕابکەن.
سـپینا لە وەڵامدا دەڵێ :« چارە نووس دروستکراوی زەعیفان و ئەو کەسـانەیە کە تەسلیم بوون،»
ئولیوا خۆ دەبزێوێ و دیارە دەیەوێ بلێ: درێژەی ئاخافتنە کە فایدەی نیـە و لە گەڵ ئەوەش لێی زیاد دەکا و دەڵێ:
- سـپینا، تۆ ئینسـانێکی بـە هۆشی، بەڵام بێکارە و بێ غیـرەتی و خۆت نازانی کە وای. چونکە ناتەوێ تێبگەی. تۆ لە واقعیەت دەترسی.!
سـپینا هەڵدەستێ کە بڕوا. لە نیزیک دەرگا ڕو دەکاتە ئولیـوا کە هەر وا لـە جێدا پاڵی داوەتەوە دەڵێ :
- لە ژیانی مندا شتێکی وا نیە کە ڕێگا بە تۆبدا جنێوم پێبدەی.
ئولیـوا لە وەڵامدا دەڵێ:« بڕۆ و مـەیـەوە! من لە گەڵ کەسـێکی نۆکـەری حـیزب بێ، قسەم نیە لە گەڵی بکەم.
سـپینا دەرگـای کـردۆتەوە و خـەریکە بڕوا بەڵام دوو بارە دەرگـا پـێـوە دەداتەوە و دەگەڕێتەوە لە سەر نیو تەختێک دادەنیشێ کە ئولیوا پاڵی لە سەر داوەتەوە و دەڵێ:
- من تا تێنەگەم کە تۆ چۆن گەیشتوویە ئەم چەشنە بیر کردنەوەیە. چ شـتێک تۆی ئەوەندە گۆڕیوە؟ زیندان، بێکاری یا برسیەتی؟
ئولیوا وەڵام دەداتـەوە :
- من لە ماوەی بێبەشـیەکانی خۆمدا زۆرم خوێندەوە و موتاڵام کرد تـا لانی کەم لە شوێنێک مزگێنی ڕزگاری بدۆزمـەوە، بەڵام نەم دیتەوە. واقـعیـەت منیان لە بەرانـبەر مـەسـەلەیەکدا ڕاگرتوە کـە مـاوەیەکە ئازارم دەدا و ئەویش ئەوەیە کە بۆچی تەواوی شۆڕشـەکان بە بێجیاوازی وەک بزووتنەوەی ڕزگاری خـوازی دەست پێکراون، بەڵام ئەنجـامـیـان بۆتە سـەرە ڕۆیی . بۆچی هـیچ شـۆڕشـێـک لەم چارە نووسـە بە ڕێزە نەجاتیان نەبوە ؟
سپینا لە وەڵامدا دەڵێ:
- هـەر چەند ئەم وتـەیەش ڕاست بێ دەبێ نەتیـجـەی پێـچـەوانەی بۆ چوونی تۆی لێ وەر بگری. دەبێ بڵـێی:« تەواوی ئەم شـۆڕشـانە خـەیانەتیـان کـردوە، بەڵام ئێـمـە دەمانەوێ شۆڕشێک بکەین کە خەیانەت نەکا!»
ئولیوا دەڵێ:

– ئارەزوو ! خـەو و خـەیاڵ ! ئێوە کـە هـێـشـتـا سـەر نەکـەوتوون و هـێـشـتـا وەک بزووتنـەوەیەکی نـهـێنی شـۆڕشگێـڕن هە رلە ئێسـتـاوە بوونەتە کۆنە پـەرست. ئەو گەرمی تازەی کە ئەو دەم ئێمەی دەستەی خوێندکارانی هێنا بوە جوڵە و وروژان، ئێستا بۆتە ئیدیۆلۆژیکی جێگرتوو و بۆتە ڕایەڵکەیەکی پێکەوە هۆنراوە ویا وەک داوی جاڵجاڵوکەی لێهاتوە. بەو دەلیلەی کە ئێوەش ڕێگای دەر باز بوونتان نیە. ئێوە هێشتا لە سەرەتای ئەم خوارە پێچەیە دان و چارە نووس یانی ئەوە. هەر بیرێکی نوێ بۆ ئەوەی بڵاو بێتەوە بە شێوەی هێندێ فۆرمۆڵ خۆ دەر دەخات و بۆ مانەوەی خۆی دەدرێتە دەست دەستەیەکی شێکەرەوە، دەستەیەک کە ئەندامەکانی بە وردی هەڵبژێراون و هێندێ جار مەعاشی ڕێکو پێکیش وەر دەگرن. هەر چۆنێک بێ ئەم دەستـەیە سـەر بە شـوێنی بەرزترن کـە مـەعـمـورە لە بارەی گـومـان و دڕدۆنگییەوە فتوا بدات و نە هێڵێ لەو خەتە لابدا کە مامۆستایان کێشاویانە. بەم چەشنە هەر بیرێکی تازە هەمیشە دەبێتە بیر و باوەڕێکی جێگرتوو و نە گۆڕ و کۆنە پەرست. کاتێ ئەم بیرە بوو بە ئایینی ڕەسمی دەوڵەت ئەو دەمەیە کە ئیتر ڕێگای دەرباز بوون نیە. دار تاشێک و وەرزێرێک لە وانەیە لە ڕێژیمێکی سەرە ڕۆ دا خۆیان لە کەڵ بار و دۆخ ڕێک بخەن، بخۆن و هەزمی بکەن، لە ئەمن و ئاسایش دا بەرهەم زیاد کەن و خەریکی کاری خۆیان بن. بەڵام بۆ ڕوناکبیرێک ڕێگای دەر باز بوون نیە. ئەو دەبێ تەسلیم بێ و بێتـە ژێر ئاڵای چینی دەسـەڵاتدار و یا تووشی برسیەتی و ڕیسوایی بێ و لە هەوەڵین دەرفەتی لە باریشدا دەکوژرێ.

سپینا بە حەرەکەتێکی تورە یەخەی کۆتی ئولیوا دەگرێ و بە سەریدا دەگوڕێنێ:

– بەڵام لە بەر چی ئەم وەزعە بە ناچاری دەبێ ببێتە چارە نووسی ئێمە.؟ بۆ دەبێ لێی دەر باز نەبین ـ چما ئێمە مریشکین کە لە کولانە دا حەپس بکرێین؟ بۆ چی دەبێ تەسلیمی چارە نووسێکی لە گۆڕان نەهاتوو بین و نە توانین دژ کردەوەیەک نیشان بدەین؟ بۆ چی هەر لە ئێستاوە ڕێژیمێک مەحکووم بکەین کە هێشتا پێک نە هاتوە و دەمانەوێ بیکەینە نموونەی ئینسان دروستی.؟

ئولیوا فەرمان دەدا کە : « هەرا هەرایە مەکە. لە ماڵی مندا زۆر بڵێیی ناکرێ. تۆ باش تێگەیشتووی من چیم پێگوتوی. تەنیا وا نیشان دەدەی کە تێنەگەیشتووی، چونکە لە ئەنجامی وی دەترسی.»

سپینا دەڵێ: « من لە هیچ شتێ ناترسێم.

– برۆ، من تۆ دەناسم. ئەو کاتەی پێکەوە لە دەستـە دابووین من زۆر ئاگاداری تۆ

بووم. هەر لەو کاتەوە تێگەیشتبووم کە تۆ لە ترسان بویە شۆڕشگێڕ. هەر ئەوەی کە بە تۆبزی بڕوات بە پێشکەوتن هەیە، بە تۆبزی خۆشبینی، بە زۆری بە خۆتی تەلقین دەکەی کە بڕوات بە ئازادی مرۆڤ هەیە لە بەر ئەوە کە پێچەوانەی ئەوە تۆ دەخاتە ترسەوە.

سـپینا تاوێک بە شـێواوی دادەنیشێ. پاشـان هەسـت دەکا دەبێ سـەر پشکێکی بچوک بدا بە ئولیوا، بۆیە دەڵێ:

– ڕاسـتـە من بە تۆبزی بڕوام بە ئازادی مـرۆڤ هەیە. بە تۆبزی بە سـەر خـۆمی دادەبڕم کـە لانی کـەم بڕوام بە دەرەتـانی ئازادی مـرۆڤ و دەرەتـانی پێـشـکـەوتن هەبێ. تۆ هەقتە، چونکە ئەگەر بڕوایەکی وام نەبایە ژیان دەبوو بە هۆی ترسی من.

ئولیوا دەڵێ: «من بڕوام بە پێشکەوتن نیە و بەمجۆرە ژیان نابێتە هۆی ترسی من.

– چێکردوە وا تەسلیم بووی ؟

– من تەسلیم نەبووم تەنیـا دەڵێم لە ژیان ناترسـم، هەر وەک لە مـردنیش ناترسم. لە بەرانبەر ژیانێکدا کە سـەر بە قانونە پیسـەکان بێ، تاقە چارەیەک کە بۆ ئازادی سـروشـتیی مرۆڤ بمێنێتـەوە، نە بوونی ژیانە، واتە لە بەینبردنی ژیانی خـۆت، واتە مەرگی ئازیز.

ئەو دەم سپینا دەڵێ: «تێگەیشتم.»

سپینا تێگەیشتوە و هەر بۆیەش تووشی خەمێکی گەورە دەبێ. لە مەو بە دوا هەموو باس و وتو ێژێک بێفایدە دەبێ. دیارە کە سپینا لەو بەری ئاوە و ئولیوا لەمبەرە.

ئولیوا بە سرتە بە سپینا دەڵێ:

– ژیان دەتوانێ ئـیـختـیاری ئینسانی هەبێ، ئینسـانیش دەتوانێ ئـیـختـیاری مـەرگی هەبێ، واتە ئـیـختـیاری مەرگی خـۆت و بە کـەمێک غیرەتیشـەوە ئیختـیاری مـەرگی سەرەڕۆیان.

ئەو ژنە گەنجـەی دەرگای لە سپینا کرد بۆوە دێتە ژوورێ تا شـتێک هەڵگرێ. ئولیوا ڕادەوەستێ تا دەچێتەوە دەر و پاشان دەڵێ :

– بابم ئارەقـخـۆر بوو لە چل سـاڵیدا مرد. چەند حەوتوو پێش مردنی شـەوێک منی بـانگ کرد و مێژووی ژیانی خۆی بۆ گێڕامەوە. واتە مـێژووی شکانی. لە سـەرەتاوە مـردنی باوکی، واتـە باپیری منی باسکرد. باوکی پێی گـوتبـوو: « من بـە فـەقـیـری و ناکـام دەمـرم بەڵام هیـوام بە تۆیە ڕەنگە تۆ بتـوانی ئەوەی ژیان نەیداوە بـە من، تۆ لێی بستێنی.» بابی منیش کاتێ هەستی کرد کـە ئەجەلی هاتوە بە منی گوت جگە

لە دوو پاتە کردنەوەی قسەی باوکم، چیترم نیە.: منیش ئەی کوڕی خۆشە ویستم ئێستا وا فەقیر و ناکام دەمرم. هیوام بە تۆیە ئەوەی ژیان نەیداوە بە من ئاواتمە تۆ بتوانی لێی بستێنی.» کە وابوو ئارەزووەکانیش وەک قەرزەکان لە وچەیەک بۆ وچەیەکی تر دەگوێزرێنەوە. من ئێستا تەمەنم سی و پێنج ساڵە و دەبینم لە هەمان نوختە ڕاوەستاوم کە باب و باپیرم لێی بوون. منیش ئینسانێکی تێشکاوم و خێزانیشم لە سەر زانە. تەنیا ئەو ئەحمەقیەم ماوە کە بڕوام هەبێ کوڕەکەم دەتوانێ ئەوەی ژیان نەیداوە بە من ئەو لێی بستێنێ. من دەزانم ئەویش ناتوانێ لە بەر ئەم چارە نووسە سەپاوە ڕابکات. ئەویش لە برسان دەمرێ یا لەو خەرابتر دەبێتە نۆکەری دەوڵەت.

سپینا هەڵدەستێ کە بڕوا و دەڵێ :« تازە لە وانە نیە بێمەوە ئێرە .»

ئۆلیوا دەڵێ : « ئیتر زەحمەت مەکێشە .»

لە شەقامی« ڤیاپانیسپرنا »پەنجا کەسێک لە لاوان کە کڵاوی شەویان لە سەرە هەرایەکیان ساز کردوە. ئەو لاوانە ئاڵایەکی گەورەی سێ ڕەنگ و نووسراوەیەکی باڵا بەرز لە گەڵ خۆیان دەگێڕن و ئەوەی لێ نووسراوە.:« بژی شەڕ! » چەند پاسەوانێک لە گەڵیان دەڕۆن. لاوەکان دەقیژێنن و ڕوو بە حەشیمەت دروشم دەدەن و هەوایەکی تازە دەڵێن کە شێعرەکەی ئاوایە :

« ئێمە بە ڕیشی نەجاشی ماهوت پاک کەرەوە دروست دەکەین تا چەکمەکانی پێشەوای خۆمانی پێ بریقەدار بکەین» لە بەر دەرگای دوکانەکان خەڵک بە سەیر تەماشایان دەکەن بێ ئەوەی هیچ بڵێن. لە شەقامی« سی پێنتی نی» سپینا توشی دەستەیەکی دیکەی قوتابیان دەبێ کە ئاڵایەک و نووسراوەیەکی وەک هەوەڵیان پێیە و دەیگێڕن، ئەوانیش بە ئاوازی خۆیان چەکمەی پێشەوا بریقە دار دەکەن و لە گەڵ ئەوانیش پاسەوان دەڕۆن. لە نێو ئەم حەشیمەتی گرفتار و لە نێو تەواوی ئەو کەسانەی کە ڕاست بۆ سەر کار دەچن و یا بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە، سپینا هەنگاوی شل و شەویقی بێکاران بەدی دەکات، هەنگاوی ئەو کەسانەي کە مەقسەدێکیان نیە و تەنیا وەدوای قوتابیان کەوتوون.

لە نیزیک« کولیزە »سپینا بۆ تەماشای پێشاهەنگانی قوتابیان ڕادەوەستێ کە بە تۆپ و شەست تیر مەشقی گوللە هاویشتن دەکەن، لاوانی پازدە تا هەژدە ساڵ کە شێوەی کاری پارچە کانی چەک و سوار کردنیان فێر دەکەن و فێر دەبن کە چۆن لە کاتی حەرەکەت و بزوتندا ئامادەی تەقەیان بکەن. لاوی لە ڕادە بەدەر ژیر و بە

هۆشن و حەرەکەتی جۆر بە جۆر بە چالاکی تەواو ئەنجام دەدەن.
سپینا دەچێتە جێ ژوانێک کە لە گەڵ رۆمیۆ لە گەرەکی « تیبورتین» لە شەقامی« ڤیادگلی ارنیچی» لە پەنا پردی «ئاکوامارچیا» و هێڵی رێگای ئاسن قەراری داناوە. ژەنگی ریلەکانی ئاسن رەنگی داوەتە پشت کوچەکانیش و بۆنی خەڵوز و دووکەڵی قەتارەکان دەچێتە ژووری خانوەکانەوە. رەستوران وەک چۆل وایە. ژاندارمێک لە قوژبنێک دانیشتوە و سپاکێتی بە نیشتیایەکی وەها دەخوا دەڵێی جەرگ و دڵی کۆمونیستە دەیخوا. برەی مشاریان لە سەر هەرد رۆ کردوە تا بەڵغەم وتف هەڵمژێ. تاقە عەکسێکی لە دیوار هەڵاوەسراوە، عەکسی پاپۆرێکی گەورەی ئوقیانوس برە کە لە تەواوی کابینەکانیدا چرا دایسێ وبە شەوێکی مانگە شەو سنگی ئوقیانوس دەشکێنێ و دەڕوا. تۆزی درنگتر دەستەیەک فەعلە و کرێکار دەگەنێ. ئەوان داوای نیو لیتر شەراب دەکەن، دەیخۆنەوە و لە سەر خۆ کە ژاندارم ئاگای لێ نەبێ تەماشای پاپۆری ئوقیانوس بڕ دەکەن و لە سەر خۆ بە کاڵتە بە قەستی سەفەری ئەمریکا سواری پاپۆر دەبن. پاشان پارە شەرابە کە دەدەن ولە پاپۆر دێنە خوار و تف لە زەوی دەکەن و بە گرژی دەچنەوە ماڵ. رۆمیۆ زۆر درنگتر دێت، چارەکێک شەراب دەخواتەوە و بێ ئەوەی لە سپینا نیزیک بێتەوە دەگەرێتەوە. سپینا بە دوای ویدا لە رەستوران دەر دەکەوێ و لە مەودایەکی کورت دا کە شوێنی بزر نەکا بە دوایدا دەڕوا. رۆمیۆ لە سەر هەر پێچیک کوچە دەگۆرێ و دیارە لە بەر ئەوەیە بزانێ پۆلیس بە دوایدا هەیە یا نا. لە کوچەی «رانۆشیا» هەنگاو سەبر دەکا تا سپینا بیگاتێ. لە وێ بە سپینا دەڵێ:
- لاوەکەی رابیت گیراوە. بێگومان بە توندی ئەشکنجە دەکرێ تا وەزمانی بێنن. لەم جۆرە شوێنانە دا هەمیشە دەبێ چاوەروانی وەزعێکی خەرابتر بی. کە وابوو پێویستە ئاگامان لە خۆ بێت. چونکە لەوانەیە ئێمەش دەگیر کەوین. ئەوە پارەیەکە بەر لە مانگێک لە دەرەوە را بۆ تۆ هاتوە. ئەوەش پاسپۆرتی چیکی. ئێمە تا چەند حەوتو لە دیتنی یەکتر دەبێ خۆ بپارێزین.
سپینا دەڵێ: « من ئەوەندە کاتی زیادم نیە کە بە فیرۆی بدەم. ئێستا شەش مانگە بۆ ئیتالیا گەراومەوە و هێشتا هیچم نە کردوە، ئیتر چاوە روانی بەسە.»
رۆمیۆ دەڵێ :
- رێکخراوێکی غەیرە قانونی راست وەک دەزگایەکی جۆلاییە کە دایمە دەهۆنێتەوە و خەراب دەبێ، دزگایەک کە خوێن و خۆ راگری گەرەکە. زۆر جار رێکخراوی

دهستـهكـان له ڕۆم دا به دهسـتی پۆلیس تێكدراوه و دوو باره سـاز كـراوهتهوه. چ پێوهندییـهكـان بێ دواكـهوتن دهبێ دوو باره دامـهزرێنهوه! چهند دۆسـتم دیتن كـه كـهوتونه زیندان، چهند كـهس كـه سـهریان تێدا چو و شـوێنهوارێكیـان وهدهست نههات. چهند كـهسی كـه دهبێ وهلا بنرێن چونكه گـومـانلێكراون، له گـهڵ ئهوهش دهبێ خۆ ڕاگری.

سپینا دهڵێ : « خهراپت نه گوت. من ڕادهوهستم.»

ههر تك پیاو دهستی یهكتر دهكوشن و ههر یهكهیان به لایهكدا دهڕوا.

ئێستا سـپینا كه پاسسپۆرتی بێگانهی ههیه دهتوانێ بچێتـه هوتێل. بهلام هاوڕێی لاوی كه گیراوه لهم پاسپۆرته ئاگاداره. كه وابوو تا به تهواوی ڕوون نهبێتـهوه كه لاوهكه له بهرانبهر ئهشكنجـهی پۆلیس دا چهنده خۆی ڕاگرتوه، نابێ لهو پاسپۆرته كهلك وهر گرێ. سـپینا له دهڵی خـۆیدا دهڵێ :« ئهو كـوڕێكی ئازا دێته بهر چاو، له گهڵ ئهوهش دهبێ لهم جۆره شوێنانه دا چاوه ڕوانی وهزعێكی خهراپتر بین.

له گهڕانـهوه دا بۆ مزڵهكـهی خۆی له شـهقامی « دی مارسی» ئاغای ئهكیل ڕاكردوو دهبینێتهوه كه له گهڵ ڕۆیشتنی كیژه هـوڵهندییهكه هیلاك و ماندوو كهوتوه، كچهتیو عهكسێكی گهورهی خۆی له گهڵ چهند داوه قژی سـهری به یادگار بۆ بهجێـهێشـتوه و له پشـتی عـهكسـهكهی به نووسین بهڵێنی پێداوه كـه لانی كـهم حـهتووی دوو جـار نامهی بۆ بنووسێ. بهلام هیچ كام له وانه بۆ سوكنایی دڵی قارهمانی ڕاكردوو بهس نیه.

سپینا دهڵێ : « له نێـو شـار به قازانجی شـهڕ خۆ پێشـاندان سـاز بوه و تۆ لێره بۆ كچهتیوێكی كه تا دوێنێ نهت ناسیوه تازیهت داگرتوه.»

ئهم قسهیه قهبرغهی پاڵهوانی ڕاكردوو دهگرێ و له وهلامدا دهڵێ:

- من تـۆم له مـاڵی خـۆم ڕاكـرت لـه بهر ئهوهی هـاو وڵاتـی و دهزانم له بنه مـاڵێكی ڕهسهنی. بهلام تكات لێدهكهم دهست ده كاری نامـوسـی و هـهسـتیاری من وهر مـهده چونكه لهم بارهوه سهرت له هیچ دهر ناچێ. بهلام له بارهی شهڕ، دهبێ پێت بڵێم كه تهنیا قوتابی مهدرهسه و دێهاتی باوهڕ بهو مهسهلهیه دهكهن.

- یانی تۆ باوهڕ ناكهی كه دهبێته شـهڕ ؟

- بۆ چی، بهلام شهڕێكی واناكه تۆبیری لێدهكـهیهوه.به بوونی ئهو دهوڵهتهی ههمانه جێگای نیگهرانی نیه.

سپینا تێی ناگا و ئهكیل ڕاكردوو بۆی ڕوون دهكاتهوه:

- دەوڵەت هەر کارێکی دەیکا بۆ ڕاکێشانی تووریستانە. پارکەکانی شار و ساختومانی تازە و جادەکانی ئوتو بان و قەتارەکانی خێرا ئاژۆ، هەمووی بۆ پێخۆشبوونی بێگانانە. ئیتر نابێ تف بۆ هەرد فڕێبدرێ، نابێ میز بە دیوار دا بکرێ، نابێ لاق لە سەر نیوتەختەکانی شەقام دابنرێ، نابێ قامک دە لوت وەر بدرێ. ئەو هەموو فیداکارییە یان بۆ چی بە سەر ئێمە دا سەپاندوە؟ تەنیا بۆ ڕاکێشانی بێگانان. لە گەڵ ئەوەش ماوەیەکە بێگانە کەم دێن و هوتێلەکان مێشان دەفڕێنن. بەم حاڵە بۆ ڕاکێشانی بێگانان تەنیا یەک ڕێگا ماوەتەوە، ئەویش ڕاگەیاندنی شەڕە.

سپینا دەپرسێ: « چۆن ئەم فیکرەت بۆ هاتوە ؟

- لە تەواوی گوندەکانی ڕۆخی مەدیترانە، لە « ڕیویەڕا » بگرە تا « کلابر » دەوڵەت خەریکی ژماردنی ویلا و ئەپارتمانانە. من هۆی ئەم کارەم لە ئەندازیارێکی دۆستی خۆم پرسی، ئەو لە وەڵامدا گوتی: ئەوە هەنگاوێکی ئیحتیاتییە بۆ کاتێ کە کریمان نێوانمان لە گەڵ ئینگلستان تێک بچێ. بەم چەشنە مەسەلەکە ڕوونە. توریست کەم دێنە ئێرە و پلاژەکانی ئەمە چۆلن دەوڵەتی ئێمە لە گەڵ میللەتی دەوڵەمەند و شەریف وساکاری ئینگلیز شەڕ ڕادەگەیەنێ. ئەو دەم ئینگلیزەکان مەجبور دەبن لە ڕۆخەکانی وڵاتی ئێمە دابەزن و باشترین پلاژەکان داگیر بکەن. ئەو دەم بازاری میوانخانەکان و بەستەنی ساز و کارت پوستاڵ فرۆشان وە برەو دەکەوێ. دەوڵەتی ئێمە بە یارمەتی کۆمەڵی نەتەوەکان هەول دەدا شەڕ بخایەنێ بە جۆرێک کە میوانەکانمان پتر بمێننەوە. کاتێ کە حەوسەلەیان بە سەر چوو، ویستیان بۆ وڵاتی خۆیان بگەڕێنەوە ئەو دەم دەستمان ڕوو دەکەین و سورەت حیسابیان لە پێش دادەنێین.

- تۆ باوەڕ دەکەی کە ئینگلیزەکان پارە بدەن ؟

- بێگومان. سروشتی ئاغایانەیان هەر گیز قبوڵناکات کە بە بێ دانی پارەی میوانخانە بچنە دەرێ. ئەوە تەنیا بەڵگەیە کە ئێمە دەمانەوێ لە گەڵ ئینگلستانی کۆنە دۆستی خۆمان شەڕ بکەین نەک لە گەڵ دەوڵەتێکی دیکە، بۆ نمونە ڕووسیا. ڕووسەکانیش بێگومان دێن و تەنانەت تەنانەت دوو ئەوەندەی ئینگلیسەکانیش دێن، بەلام ئاخرەکەی نەک هەر پارە نادەن بەڵکوو داوای پارەش دەکەن. بە پێچەوانەی ئەوان مامڵە لە گەڵ ئینگلیسان تەواو دڵنیایە.

سپینا لە ڕاستیدا نازانێ ئەکیل ڕاکردوو گاڵتە دەکا یا ، نا .بۆیە دەڵێ:

- هەر چۆنێک بێ میللەتی ئیتالیا میللەتێکی کاسە لێس و سوالّکەر نیە. بەڵکوو میللەتێکە تێکۆشەر و کارگەر. شەڕ دەبێتە کارەساتێکی بە ترس و دەردە دارە کە ببینی ئەم میللەتە چۆن بە زۆری بۆ لای کارەسات ڕادەکێشرێ.
ئەکیل ڕاکردوو دەپرسێ :
- ئەگا تۆ دژی دەوڵەتی ئێستا بی ؟
سپینا وەڵامی نا داتەوە. ئەویدی دوو بارە دەڵێ :
- نا. تۆ تەنیا کەسێکی گوندیی و پێت وایە کە ئەم شەڕە کوژراو و بریندار دەبێ بەڵام بیری ئەوە ناکەی کە لە سەر دەمی ئێمە دا کەس نایەوێ سەر و پەراسووی تێک بشکێنن. کێشە لە گەڵ ئینگلستان لە وانەیە بە پێشبڕکەیەکی فوتباڵ لێرە لە ڕۆم، بە بوونی دوو دەوڵەت، لە نێوان تیمی « ئارسناک» لەندەن و تیمی « ونتوس» لە شاری تورن کۆتایی پێدێت. ئەو دەم وەرە و بزانە چ هەرایەک لە توریستی بێگانان ساز دەبێ. ئاگا دار بە کە ئەگەر ئینگلیسەکان ئامادە بن بەڵێن بدەن پێمان بدۆڕێنن چ شانازییەکی گەورە نسیبی وڵاتی ئێمە دەبێ!
سپینا دەڵێ : « شتی وانابێ. ئینگلیزەکان پێیان باشترە ماڵت و میسر بە جێ بێڵن بەڵام لە فوتباڵ نە دۆڕێنن.»
ئەکیل ڕاکردوو دەڵێ: « کە وابوو پێشبرکە کە زۆر گەرم و وروژێنەر دەبێ.»
سپینا بە بیاتووی ئەوەی کە هیلاک بوە و خەوی دێت هاو پەیڤینەکە ڕادەگرێ. لە ڕاستیدا ئێستا کە پێوەندی لە گەڵ ڕۆمیش پچڕاوە ئەو پێویستی بە بیر کردنەوە هەیە لەم مەسەلەیەدا کە دەبێ چبکات. بە بێ وەر گرتنی هیچ ئەتیجەیەک و بێ ئەوەی کەسێکی دۆزیبێتەوە تا لە دۆزینەوەی باشترین کەسانی یەکێتییەکانی هەڵوەشاوەی وەرزێری بە دەستی ڕێژیمە خاوەن دەسەڵات لە گوندەکانی « مارسیکا » یارمەتی بکات. کەسێکی بتوانێ لە کاری غەیرە قانونی دا ببێتە هاوکاری و لە کاتێکا ئەو بگیرێ، جێگای ئەو بگرێتەوە. ناتوانێ بۆ « فوسا » بچێ. تەنانەت سپینا ئێستا ئامادەیە واز لەو فیکرە بێنێ کە ئەو کەسە هەر دەبێ کرێکار بێ بە مەرجی ئەوە کە جێگای باوەڕ بێت. ڕۆمیۆ لە بارەی خوێند کارێک بە ناوی لویجی موریکا قسەی کردەو و گوتبووی کە ئەو زۆر ژیر و ئازایە و خەڵکی» ڕوکادی مارسی» یە و ماوەیەکە بێ سەر وشوێنە. بەڵام چۆن و لە کوێ دەدۆزرێتەوە.؟ تازە گریمان دیتیەوە چۆن خۆی پێ بناسێنێ و ڕاستی ناو ونیشانی خۆی پێ بسەلمێنێ.؟ سپینا جارێکی دیکەش هەست دەکات کە هەردی ژێر قاچی خاڵی

دەبێ. خەباتی بێ ئامان لە گەڵ تاریکایی دەست پێدەکرێت.
تەواوی کاتی ڕۆژی دوایی سپینا «جانەوەر» دەکاتە مەعموور تا لە سەر هەستی تەواو لە ئادرێسی جۆر بە جۆر شوێنی مۆریکا بدۆزێتەوە. بەڵام نەتیجەی دەست ناکەوێ. لە دەفتەری سەر ژمێری شار داری دا لە پێش ناوی مۆریکا دا نووسراوە کە نیزیکەی ساڵێکە لە ڕۆم ڕۆیشتوە. کە وابوو درێژە پێدانی لێگەڕانی بێفایدەیە.
سپینا لە گەڕەکی «تراست ورە» لە شەقامی «مورو سینی» دەچێتە دیدەنی خێزانی «کلوچی» واتە هەمان کرێکار کە پێش مانگێک گیراوە و بە قسەی ڕۆمیۆ لە زینداندا کوێر بوە. ژنەکە سپینا باش دەناسێ و لە وەش دەترسێ کە لە ماڵێ میوانداری بکات. ئێستا خەسووی لە گەڵ ئەو دەژی. ئەو پیرێژنێکی خەڵکی «ئابرۆتزی» یە کە زانیوەتی کوڕەکەی گیراوە و بوکەکەی بە تەنیایە لە گوندەوە هاتۆتە لای و هەر تک پێکەوە دەژین. بوک خەڵکی میلانە، هەم کرێکارە و هەمیش کیژی کرێکارێکە. خەسووی دێهاتیەکی نە خوێندەوارە و خێرا دەکرێ تێبگەی کە چەندە پێکەوە فەرقیان هەیە.
ژنی گەنج بە سپینا دەڵێ: «تۆ بۆ مانگانەی من هاتووی ؟»
– کام مانگانە ؟
– دەستەکان ئەو یارمەتیە کەمەی بە زیندانیە سیاسیەکان دەکەن لە منیان بڕیوە. بە منیان گوت لە بارەی کاری تۆ دەبێ کۆ بوونەوە هەبێ.
– بۆ چی ؟ تۆ چت کردوە ؟
ژن سوور هەڵدەگەڕێ و دەڵێ: «چونکە ئێستا دەچمە نوێژی مەسح»
سپینا دەڵێ: «ئەوە نابێتە دەلیل کە مانگانەی تۆ ببڕن. بێگومان ناشێ بیبڕن. بەڵام تۆ بۆ چی دەچیە نوێژی مەسح؟
ژن تاوێک بە دوو دڵی بە دوای وشەگەلێکدا دەگەڕێ کە قسەکانی پێ دەست پێبکات. ئاخرەکەی دەڵێ:
– مێردەکەم لە زیندانداییە و من مافی ئەوەم نیە بچمە بیبینم. ئەو تەنیایە و کوێر بوە. ڕۆژەکانی هەوەڵێ لە هەر دەرگایەکم دا قایدەی نەبوو. هیچ ناکرێ. دایکی وی کە من هەر نەمدەناسی لە گوندەوە هاتوە. ئێمە تەواوی ڕۆژ پێکەوەین. من ناهومێدم، بەڵام ئەو ئارام و لە سەر خۆیە. لە بەیانیەوە تا ئێوارێ دەردی دڵ دەکا و دەیبینم هە لێوەکانی دەبزوون و دوعا بۆ کوڕەکەی دەکات. من لە بنە ماڵەی خۆماندا قەت نەمدیبوو کەس دوعا بخوێنێ. لە ڕوانگەی منەوە دوعا خوێندن

هەمیشە کارێکی هیچ و ئەحمەقانە بوە. بەڵام ئەو پیرێژنە دێت و دەست بە دوعا خوێندن دەکات بۆ کوڕەکەی و دەیەوێ لەم ڕێگایەوە یارمەتی بە کوڕەکەی بکات. لێوەکانی دەبزوون و جار و باریش ڕوو لە من دەکات و بزەیەکی دێتێ و چاوەکانی پڕ لە ئەسرین دەبن. من لە پەنای دادەنیشم و هیچ ناکەم. لە ئاخردا دەبینم ئەو لە دەروونەدا کار دەکات و یا هەوڵ دەدا کارێک بۆ کوڕەکەی بکا. من دەبینم کە ئەو کوڕەکەی دەپارێزێ و یا هەولدەدا کە بیپارێزێ. بەڵام من کە خێزانی ئەوم هیچ کارێکی بۆ ناکەم و وەڵام ناوە. شەوێکیان ئاخری خۆم پێ ڕانەگیرا و داوام لێکرد کە فێری دوعا خوێندنم بکات. ئەویش فێری کردم و ئێستا هەر تکمان پێکەوە دوعا دەکەین و هەولدەدەین یارمەتی بکەین. ڕەنگە تۆش گاڵتەمان پێبکەی.

سپینا دەڵێ :« تا ئێستا لە بارەی خوێندکارێکی« ئابروتزی» بە ناوی « لویجی موریکا» شتێکت بیستوە.؟

ژن لە وەڵامدا دەڵێ :

– نیزیکەی ساڵێکە ون بوە. دۆستێکی نیزیکی کڵاو درووی من بە ناوی « ئانیناپچی» کە پێشتر پێوەندی لە گەڵ هەبوە، دەزانێ ئەو لە کوێیە.

سپینا ئادرێسی کڵاو درووەکە وەر دەگرێ. ژنی « کلوچی» لێی زیاد دەکا و دەڵێ :

– لەو کاتەوە کە موریکا بزر بوە ئانینا زۆر تاق کەوتۆتەوە و بە تەنیا دەژی. خۆی لە دەستەش دوور ڕاگرتوە. بەڵام من لە بارەی تۆوە قسەی لە گەڵ دەکەم. ئەو لە قاتی چوارەم لە ژێر شیروانی خانووی هەیە و پەنجەرەی دەروانێتە ئەو کۆڵانە کە ئادرێسەکەم داوە بە تۆ. ئەگەر گوڵدانێکت لە پێش پەنجەرە چاو پێکەوت، بزانە ئەو چاوە ڕوانتە.

ماڵی کڵاو درۆو لە شەقامی« ڤیاد لالو نگارتا» لە هەمان گەڕەکی« تراست وەرە» یە. سپینا سێ چوار جار بە پێش خانووەکەدا هاتوو چۆ دەکات و سەیری پەنجەرەی قاتی سەروو دەکات، بەڵکوو گوڵدان ببینێ. بەڵام پێش پەنجەرە بە تاڵە. ئاخرەکەی سەبری نامێنێ و بە بێ چاو پێکەوتنی نیشانەکە سەر دەکەوێ. لە دەرگای ژوورێکی پەرش و بڵاوی ژێر شیروانی کە هەم ژووری نوستن و هەم کار گای کڵاو دروونە، دەبینێ کە ئانینا بە سەر ماشێنی دروونەدا خوار بۆتەوە، دەڵێ:

– بێگومان خێزانی « کلوچی» لە گەڵ تۆ سەبارەت بەمن دواوە. من هاتووم جێ و شوێنی موریکام پێ بڵێی.

کیژی گەنج بە سەر سوڕ مان و بە گرژی سەیری ئەو پیاوە موزاحیمە دەکا. ئەو

هێشتا زۆر گەنجە. سەر وچاوێکی بارێک، ناسک و جوان و چاوێکی جوانی هەیە کە لە تورە بوونیشدا هەر جوان دەنوێنن. سپینا بە نارەحەتی و ئازارە وە لە نیزیک دەرگا ڕادەوەستێ تا کیژی لاو کورسییەکی بۆ دادەنێ. سپینا نیزیکتر دەبێتەوە. کیژەکە بە بزەیەکی ژاراوی و وروژانێکی چاوە ڕوان نەکراو کە ناتوانێ بیشارێتەوە دوو بارە تەماشای دەکا و دەڵێ :

- هیچ دەزانی تۆ زۆر لەو کەسە دەکەی کە لێی دەگەڕێی. تەنانەت شێوەی هاتنیشتان هەر لەو دەکات. جگە لەوە ئەو لە گوندی« ڕوکادی مارسی » هاتۆتە دنیاوە کە پێم وانیە زۆر لە گوندی تۆ دوور بێ.

سپینا لە وەڵامدا دەڵێ:« بەڵێ دە کیلۆ میتر لێک دوورن. ئێستا ئەو لە کوێیە ؟

ئانینا دەڵێ :

- ئەو زۆر جار باسی تۆی دەکرد. زۆر داخی وەی دەخوارد کە لە نیزیکەوە تۆ ناناسێ. بەڵام تەشکیلاتی دەستەکان ئەوەندە لق و شانەی بڵاویان هەبوو کە ناسینی یەکتر دژوار بوو.

- چەند وەختە تۆ ئیتر ئەوت نەدیوە ؟

- بەم زوانە دەبێتە ساڵێک. لەو کاتەوە زۆر کەس هاتوون لێی گەڕاون.

- ڕەنگە کەوتبێتە زیندان ؟

کیژی گەنج بە دڵنیاییەوە دەڵێ :« نا، ساڵی ڕابردوو گیرا و چەند مانگێک کەوتە زیندان بەڵام کاتێ هاتە دەر بە منی گوت کە دەیەوێ خۆی بکوژێ و بەڵام نە چێتەوە زیندان.

لە پەیژەکانەوە دەنگی لاقان دێت. کچۆڵەیەک دێتە ژوور و کراسێکی ژنانەی بۆ پینە کردن هێناوە، دایدەنێ و دەڕوا.

سپینا دەپرسێ: « لە مێژە موریکا دەناسی ؟ »

لافاوی بیرەوەرییەکان شەرم لە بەین دەبات و کیژی لاو لە کاتێکا سوور هەڵگەڕاوە دەڵێ :

- نیزیکەی پێش سێ ساڵ لە دەستەیەکدا چاومان بە یەکتر کەوت، دەستبەجێ هۆگری یەکتر بووین. لە ڕاستیدا ئەمە ئەڤین نەبوو، شێتی بوو. من ئەو دەم هێشتا لە گەڵ ماڵەوە دەژیام. دایکم هەمیشە بۆڵە بۆڵی بوو، هەقیشی بوو، چوونکە من هەموویانم فەرامۆش کرد بوون و تەنیا خەریکی وی بووم. باسی ئەم وەزعە دژوارە. ئەو لە یەک کات دا بۆ من هەم کوڕ وهەم براو وهەم باب و هەم مێردم و هەم فاسقم

بوو. ئەو دەم هەر گیز بە خەیالم دا نە دەهات کە بتوانم بێ ئەو بژیم. ئەویش منی زۆر خۆش دەویست.
کیژی گەنج کەمێک دوور دەکەوێتەوە و سەر وەر دەگێرێ تا ئەسرینەکانی بسڕێتەوە. کاتێ دوو بارە دێتەوە سەر ماشێنی دروون، چاوەکانی سوور هەڵگەڕاون.
سپینا دەڵێ : « نەمدەویست مەتڵەبی خەفەتباری کە لە بیرت برد بوونەوە، وە بیرت بێنمەوە.»
کیژەکە دەڵێ: « ئەوانە مەتڵەبی لە بیر کراو نین. بیرێکی کە دەرد هێنەرە، هەر گیز لە بەر چاو بزر نابێت. بیری وی بە سەر تەواوی ژیانی مندا زاڵە.
سپینا دەڵێ:
– ئێمەی شۆرشگێڕ بێ هێز و کەمین. دنیای سودی شەخسی و ترس و قین دژی ئێمە سەفیان بەستوە. ئێمە بۆ ئەوەی بتوانین بەر بەرەکانی بکەین و لە پێ نەکەوین، دەبێ هێزی خۆمان کۆ بکەینەوە و خۆمان بە ئامرازی جۆر بە جۆر پەرداخ بکەین. بەڵام لە جیاتی ئەو کارە باشترین هێزی خۆمان بۆ مەسەلەکانی ئەحمەقانە و هەستیاری بە فیڕۆ دەدەین.
کیژی گەنج دەڵێ:
دۆستایەتی ئێمە هیچی لە هۆگریمان بە کاری دەستە کەم نەکرد بۆوە. بە پێچەوانە ئێمە لە وانی هەرە تێکۆشەر بووین. ئێمە ڕێپێوان و شەو نشینی تایبەتی و کتێب خوێندنەوەمان پێک دەهێنان. ڕۆمانی کۆمەڵایەتیمان پەیدا دەکرد و دەمانخوێندەوە و باسمان لە سەر دەکرد. ئێمە تەنانەت لە هاو سەری و منداڵ بوون و پێکهێنانی بنەماڵە وازمان هێنا بوو تا زیاتر بە کاری دەستە ڕابگەین.
سپینا دەڵێ :« ئێستا دەتوانم پاشماوەی مەتڵەب تێبگەم. ئەڤین کە لە بەینچوو، هۆگریی دەستەش لە گەڵ ئەو دەڕوا.
کیژی لاو لە فیکری خۆیدا نوقم بوە. قسەکانی سپینا نابیسێ. کاری درومان وەلا دەنێ و دەزوویێکی کە لە هەردی کەوتوە لە کلۆڵەیەکی دەهاڵێنێ و قوچەکەکان دەخاتە قوتوێکی بچوک و پاشان تاوێک لە دوو دڵیدا دەمێنێتەوە و لە ئاخریدا دەڵێ
– هەوەڵجارە کە من ئەو چیرۆکە دەگێڕمەوە. بەڵام تۆ خەڵکی گوندی وی ، لەو دەکەی و ڕەنگە هەر وەک ویش بیر بکەیەوە و هەر هەمان عەیبی ویشت هەبن. کە وابوو دەتوانم بەد بەختیەکانی خۆمانت بۆ باس بکەم: پارەکە کاتێ گرتیان زۆریان

لێدا. بەڵام ئەو لێدانە بە قەدرایی سوکایەتی پێکردن و تف لێکردن کاری تێنەکرد. کاتێ لە زیندان هاتە دەر هیلاک و بێهێز ببوو. من لە سەرە تاوە پێم وابوو لە بەر کزی و لاوازی لەشی وا بێحاڵە. بەڵام حەوتوو تێدەپەڕین و ئەو هەر وا لەوە دەترسا کە جارێکی دیکش بیگرنەوە و لە دڵە ڕاوکە دابوو. پەیتا پەیتا بە منی دەگوت: « پێم باشترە خۆم بکوژم و دوو بارە نەکەومەوە زیندان». پۆلیس پێی گوتبوو کە پێوەندی لە گەڵ دۆستــانی پێشـووی بپـچـڕێنێ و هاتوو چۆی لای منیش نەکات. چوونکە منیش لە ڕوانگەی سـیـاسـیـیـەوە لە شک دابووم. پاش ئەوە کاتێ دەهاتە لای من هەمیشە نیگەران بوو. بە بیستنی دەنگی ترومبیل ڕەنگی بە ڕوانەوە نە دەما. ئیتر نەمـدەزانـی کـەنگێ دەتوانین یەکـتـر بـبـینین. ئەو منـی هـەر وا خـۆش دەویست و دەیویست زۆر جار لە گەڵ من بێت. ئەگەر دوو ڕۆژ منی نە دەبینی ئێرەیی ئازاری دەدا. ئەگەر لای منیش دەبوو خۆی لە مەترسیدا دەبینـی و لەو دەمانە دا لێم بێزار بوو. گـوێ پێنەدانی پێشـووی نەمـا بوو، هەر چاو پێکەوتنێک دەبوو بە ئازارێکی توند. دەیگوت: « پۆلیس هەمـوو چرکـەیەک دەتوانێ خـافـڵگیرمـان بـکات.» لە باری لەش ساخییەوە، نە خۆشی جۆر بە جۆر ئازاریان دەدا. دڵی خەرابی کار دەکرد. گەدەی تەواو نەبوو. مووی سەری دەهات وردە وردە سپی دەبوو. پۆلیسێک زۆر جار بە هیوای خافڵگیر کردنی وی لە مـاڵی مە، دەهاتە ئێرە. کابرایەک بوو خـەڵکی« ئاپۆلیا» کە مووی سور بوو و لە کاتی وا دا دەهات کە چاوە ڕوان نە دەکرا و زۆر جاران شەو کە نوستبووم پەیدا دەبوو. ئەو لە ڕاستیدا زیاتر بە دوای منەوە بوو تا بە دوای موریکاوە. زۆر جـاران دەهات و ناچار دەبووم بە زۆری بەر گری لە خـۆم بکەم. ئاخرەکەی بۆ ئەوە لە ئەمنیەت و ئەماندا بم، تکام لە کیژی ئامۆژام کرد کە شـــەوانە بێ لە لام بنوێ. ڕۆژی جــێـــژنی نویلی ســاڵی پار من و مـــوریکا لـە ڕەستورانێکی ئەو بەری «پورتاسان پائولو» نانمان خوارد بوو. موریکا بە هەڵکەوت زۆر ئارام و بەکـەیف و وەک ڕۆژەکـانی ڕابردوو دڵ ئاسـودە بـوو. مـاوەیەک بـوو بە تەنیا پێکەوە نە ببووین بۆیە تکام لێکرد بچینە ماڵەکەی من و دوای نیوە ڕۆ پێکەوە بین. لە سـەر ڕێگا هێندێ گوڵ و میوە و شیرینی و بوتڵێک شەڕابی «مـارسـالا» مان کڕی. موریکا یارمەتی منیدا تا گوڵەکانم خستە گوڵدان و لە پڕ لە دەرگایاندا. پرسیم کێیە؟ وەڵامی داوە پۆلیس! موریکا بۆ وەی نەکەوێ لە سەر کورسی دانیشت و ئامـاژەی کـرد دەرگا نەکەمـەوە. بەڵام لـێدانی دەرگا توند تر دە بـوو. دۆسـتی من دەیناڵاند کە ئیتر ناچمەوە زیندان ئامادەم لەو پەنجەرەوە خۆم فڕێدەم و نە چمەوە

زیندان. دەرگا لە ژێر زەبری لێدانی پۆلیس دەهات لە ڕێسمە دەچوو. ئەم هەیوانەی کە دەیبینی ڕێگای بۆ دەرگایەکی بچوک هەیە لەوێوە بە سانایی دەکرێ بۆ سەر بان بخزی. بە موریکام گوت پەنا بۆ سەر بان بەرێ. کاتێ موریکا لە بەر چاوان ونبوو، دەرگام کـردەوە. دوو پۆلیس هاتنە ژوور یەکـیـان هەمـان کـابرای قـژ سـووری « ئاپۆلیـایی» وئەویتریش گـەنجێک بوو نەمـدەناسی. ئەوان دەیانزانی دۆسـتی من لە مـاڵی منە. کاتێ هـاتبووین بۆ مـاڵ، ئێمـەیان دیبوو. ژێر تەخت و شکافـان گەڕان. کـابرای مـوو سـوور گـوتـی :« ئەگـەر لەو ژوورە نەبێ بێگومـان لە سـەر بانە.» من ڕێگای سەر بانم گرت و هاوارم کرد نابێ ئەو بگرن و کارتان بەو نەبێ. پۆلیسەکان ویستیان لە سەر ڕێگام لابدەن. من بە شەق و مست بەر بەرەکانیم دەکرد، دەستم دەگـەستن و هـەمـوو جـارێ دەمگوت نابێ ئەو بگرن» کـابرای قـژ سـور گـوتـی:« بە مەرجێک » گوتم : « مـەرجی چی »؟ من بۆ ڕزگاری دۆستم لە زیندان ئامادە بووم گیـانی خـۆشم فـیدا بکەم. پۆلیـسـەکانی شـتـێکی بەرزتریان لە من دەویست. بە هەرتکیان منیان گرت و ڕووتیان کردمەوە و خستیانمە سەر تەخت. نازانم چەندە لە وێ مـانەوە، تەنیا لە بیرمـە کە زۆر درنگ گوێم لە دەنگی دۆستەکەم بوو دەیگوت: « ڕۆیشتن؟» پاشان هاتەوە ژوور و پرسی چدەکەی ؟ نوستووی ؟ بۆ لای پەنجەرە چوو تا بزانێ کوچە لە ژێر چاوەدێری دایە یان چۆلە. دوایە گوتی کەس لە خوارێ نیـە. بیـسکویتێکی لە سـەر مـێز هەڵگرت و بـۆ لای دەرگا چوو کـوێچکەی هەڵخـست تا بزانێ کەس لە سـەر ڕێگای پەیژەکـان هەیە. پاشـان بۆ لای من گـەڕایەوە و پرسـی: « چدەکـەی، نوسـتووی؟» من مـەلافـەم دەخـۆ وەر گرتبوو. لە سـەری هەڵدامـەوە دیتی ڕووتم وشوێنەواری دەست درێژی ئەو دوو زەلامە لە سەر جێ دیارە. نێو چاوانی بە نیشـانەی بێزاری تێکنا وگـوتی « جندە » تفێکی لە تەختـەکەی کـرد و هـەرچی بۆ جـێـژنی نویل کـڕیبـومـان بە هەردی دادا ومـاشـێنی درۆونی وەر گـێـڕا ویوتڵـە شـەڕابەکەی بە ئاوێنەی دیواری دادا ورد و خـاشی کـرد و دەر کەوت. من لە جـێی خۆم نەبزووتم و زمانم نەگەڕا. ئەوەی دەبوایە بکرێ کرا بوو.

کـیژ قسـەکـانی بڕی. دەنگی قـاچی زەلامـێک دەبیـسرا کە لە پەیژەکان دێتە سـەر. سپینا ڕاست دەبێتەوە ودەڵێ: « ئەگەر دیسان ئەو پۆلیسـە قژسورە بوو، تۆ بچۆ سـەر بان تا من لە پەنجەرەوە فڕێیدەمە خـوارێ. بەڵام ئەوەی هـات شاگردی یەک لە دوکانەکانی مۆدە بوو کە کاری ماڵێی ڕادەسپارد. بەستەیەک دادەنێ و دەڕوا.

کـیژەکە دەڵێ: پۆلیـسی مـوو سـوور ئیـتر قـەت بۆولایانە نەهـاتەوە. هـاو کـارەکـەشـی

دیار نیـە. چەند جـار وامـدەزانی کـە لە کـوچـە دەیانبـینم بـەلام ئەوان لەم گـەڕەکـە ڕۆیشتوون.
سپینا دەپرسێ:« تۆ پێت وایە ئێستا موریکا دە بێ لە کوێ بێت ؟»
ژن لە وەلامدا دەڵێ: « بێگومان چۆتەوە ماڵی خۆیان لە « روکادی مارسی »
– تۆ قەت فیکری ئەوەت نە کردۆتەوە کە قسەی لە گەڵ بکەی ؟
– ئەوەی دەبوو ببێت، ببوو.
– من خۆم دەچم قسەی لە گەڵ دەکەم.
سپینا بۆ پەناگای خۆی لە شـەقامـی « ڤیـادی مـارسي» دەگـەڕێتـەوە. لە وێ ئەکیل ڕاکردوو بە ئامێزی ئاواڵەوە پێشوازی لێدەکات و بە خۆشیەوە پێی دەڵێ:
–خـوا تۆی گەیـاند. گوێ بگرە: نیمرۆ لە جیاتـی یەکێی دوو ژنی بێگانەم لە چنگ « جانەوەری دێهاتی» نەجات داوە. کە لە شەقامی« پالاتن» دەگەڕان. دایک و کچێکن.
سپینا دەپرسێ: خەڵکی کوێن ؟
ئەکیل ڕاکرتوو لە وەلامدا دەڵێ:
– نازانم، ئەوەنـدەیە هـەر تکیـان قـژ زەردن و زۆریش تـەلایی. بێگومـان ئەڵمـانین یا نیروێژی. گوتیـان لە کوێێنهاکەوە هـاتوون. لام وایە کوێێنهاک لەو سـەرەوە بێت. لە ڕادە بە دەر لە ئاست من هەقناسی ڕادەگـەیێـنن. هـەر ئێـســـتـا دێنە ئێـرە و تۆ دەیانبینی، من پێویستم بە یارمەتی تۆ هەیە.
سپینا لێی تێناگات. ئەکیل ڕاکردوو لە ڕوونکردنەوە دا دەڵێ :
– من کاری کیژە کە جێ بە جێ دەکەم. تۆش حیسابی دایکی......
– دایکەکە تەمەنی چەندە؟
– – تەمـەن گرنگ نیـە، ئەسڵی تەجروبـەیە. جگە لەوە دایک زۆر تەڕ و تازەیە. خۆت دەبینـی. لەو شـوێنانـە خـەڵک جگە لە ڕۆنی جـەرگی مـاسـی« مـورینا » شـتـێکی تر ناخۆن. خۆت دەزانی کە شۆرباوی مامری پیر چەندە بە تامە.!
ئەکیل ڕاکردوو بە درێژی شێوەی لێنانی مریشکی پیر باسدەکات. لە کاتێکا سپینا لە فیکری کاری خۆی دایە کە داخوا زوو بۆ دێهاتی « ئابروتزە» بگەڕێتەوە وموریکا بدۆزێتـەوە و لە گەڵ ڕۆمیۆ پێوەندی بدات یا بە پێچەوانە دوو بارە ڕۆمیۆ ببینێ و دوو بارە لە شاری ڕۆم بە دوای کرێکاری جێگای بروا دا بگەڕێ؟
ئەو دوو ژنی بێگانەی کـوێێنهـاکی بە دەســتـی پڕ لە دیاری دەگـەنێ. پیـرێژن بە ڕاسـتی ئاگاداری زیندو و گەڕۆکە بۆ تەبلیغاتی ڕۆنـی جەرگی مـاسی مورینا . کیژ

هێشتا قژەکانی لە پاشە سەر بەر دابوونەوە و بێگومان پازدە ساڵ زیاتر نەبوو.
پیرێژن دەڵێ: تەنیا سەبارەت بە هۆگری لە گەڵ مەسەلەکانی کەونارا ناسی هاتۆتە ڕۆم.
ئەکیل ڕاکردوو دەڵێ: « ئەو دۆستەی من کە وا لێرەیە، مامۆستایەکی بەرزی کەونارا ناسییە.
پیرێژن دەڵێ: گەڕانی کوێستانانیشی پێخۆشە.
ئەکیل ڕاکردوو دەڵێ: « ئەو دۆستەی من کە لێرەیە چیا گەڕێکی بە دەسەڵاتە.
بەڵام کیژەکە دەڵێ: « گوڵی خۆش دەوێ، خوێندنی زمانی لاتینی پێخۆشە و دەیەوێ چەند شێعری لە «وێرژیل» لە بەر بێ
- گوڵ و شێعری وێرژیل جێگای هۆگری منن. بە ڕاستی ئەگەر گوڵ و شێعری وێرژیل نە بایە، ژیان مەعنای نەبوو.
گفتگۆ لەم بوارە درێژەی دەبێ. لە پڕ دایک داوای لێبوردن دەکا کە لە بیری چوە زوو تر بڵێ کە لە سەر ڕێگا چۆتە کەلانتەری و لە گەریانی موزاحەمەتی « جانەوەری دێهاتی» خەبەری داوە و ئادرێسی نەجات دەری خۆشی بە پۆلیس گوتوە تا ئەگەر کار بە دەستانی ئینتیزامی بێن و پاداشی بدەنێ. پاشان لێی زیاد دەکا:
- ئێستا پۆلیس دێتە ئێرە تا ئاگاداری زیاتر لە بارەی« جانەوەری دێهاتی» وەدەست بێنێ.
سپینا جانتا و کڵاو هەڵدەگرێ و بۆ لای دەرگا دەچێ. لە کاتی ڕۆیشتن دا دەڵێ:
- دەچم سیغارێک بکڕم و پاش دەمێک بۆ ولایەت دەگەڕێمەوە. لە « ڤیادی مارسی» لە شەقامی « ڤیادگلی ئەرنیچی» با دەداتەوە و ڕاست دەڕوا. لە « پۆرتاسان لورنزو» هەست دەکات کە یەکێک ناسیویەتی و وەدوای کەوتوە. ڕۆیشتن درێژە پێدەدا و هیوادارە بتوانێ لە هەوەڵین دەرفەت دا خۆ بگەیێنێتە تراموایەک. لە « پیازاڵتیبور تینو»ئاماژە بە تاکسییەک دەکا و کەسێک لە پشتەوە ئەم ئاوازە دەخوێنێ:
« گوڵی سوور قەت بێ دڕک نابێ و ژن قەت بێ ماچ و ئامێز نابێ.»
تاکسی بەتاڵە. سپیناو ڕۆمیۆ سوار دەبن، ڕۆمیۆ دەڵێ: بڕۆ بۆ « پرتۆ ناچیۆ» پێش ئەوەی بگەنە ڕێگای ئاسن. تاکسی ڕادەگرێ و پاش دابەزینی موسافیرەکان تاکسی دەڕوا. ڕۆمیۆ لە سپینا دەپرسێ:
- خەبەری تەقینەوەی گەڕەکی« پانیسپرنا»ت بیستوە.؟

سپینا ئاگای لە هیچ نیە.
خانو بەرەی ئولیوا تێک ڕوخاوە. ئولیوا و ژنەکەی و کرێگرتەکەی لە ژێر وێرانە دا دفن بوون، بە ڕۆژنامەکان گوتراوە باسی نەکەن چوونکە لە گەڵ خۆ ئامادە کردن بۆ شەڕ نایەتەوە و دوور نیە ئەم کارە زیان بە یێکێتی بیر و ڕای بە ڕواڵەت میللی بگەیێنێ. بەڵام تەقینەوە لە نێوە ڕاستی شار ڕوویداوە و دەستبەجێ خەبەرەکە لە هەموو شوێنی شار بڵاو بۆتەوە. وا دێتە بەر چاو کە ئولیوا پێشەکی قەستە سەرێکی گەورەی ئامادە کرد بوو تا کلیسای« سنت ماری دزانژ» لە ئاهەنگێکدا کە بڕیار بوو ئەندامانی دەوڵەت لە وێدا کۆ ببنەوە بیتەقێنێ. کرێکارێکی ئاگر کوژاندنەوە کە لە خۆمانە و لە لابردنی خۆڵۆ وێرانیەکە بەشدار بوە گوتوویە لە نێو کاغەزەکانی ئولیوا نەخشەیەکی گەورەی کلیسا لە گەڵ یاد داشتی فەننی دۆزراوەتەوە.
سپینا دەڵێ :« پێش دوو ڕۆژ چوو بومە لای و منیش هەستم کرد کە ئەو خەریکی ئامادە کردنی خەرابکارییەکی گەورەیە.
ڕۆمیۆ دەڵێ:
– ئەگەر دەرکەوانی خانو بەرە کاتی چوونە ژوور چاوی بە تۆ کەوتبێ بێگومان تۆی وەبیر دێتەوە. تۆ قیافەیەکت هەیە کە بەم زوانە لە بیر ناچیەوە. ئەمەش بەڵگەیەکە بۆئەوەی کە تۆ دەبێ بڕۆی.
هەرتک زەلام لە پەرژین دەپەڕنەوە ودەچنە خرێک کە کانگای « خۆڵە مێشی پوزولان» ی لێیە. کاتێ دوو بارە دێنەوە شەقامی « ڤیاتیبورتینا» پیترۆ سپینا جارێکی دیکەش دەبێتەوە« دۆن پاولۆ سپادا»
دۆن پاولۆ یەکسەر بۆ لای ئیزگەی ڕێگای ئاسن دەچێ تا سواری قەتاری« ئابروتزە» بێت. لە پێش ئیزگەی قەتار حەشیمەت زۆرە و دەستەی سەر باز و پاسەوان و ژاندارم ڕژاونەتە وێندەرێ.
دۆن پاولۆ لە ڕاست و چەپی خۆی دەپرسێ:« چباسە» ؟ کەسێک وەڵام دەداتەوە :
– سبەی ئامادەیی گشتییە. سبەی دەبێتە شەڕ.
هەر وا سبەی ؟ ماوەیەک بوو باسی شەڕ دەکرا بەڵام چونکە هەر قسە بوو شەڕ ببوە شتێکی سەیر ولە کران نەهاتوو . بەم حاڵە هەر ئەو شتەی لە کران نەهاتوو، وا دەبێتە واقعیەت. ئێستا شەڕ لە پشتی پەردەی شانۆ چاوە ڕوانە و تەنیا ڕۆژێک دەبێ سەبر کەی تا دێتە سەر شانۆ.

## ٩

دۆن پاولۆ پاش ئەوەی شـەو لە « ئاوەتزانو» سەر دەکاتەوە بە هـەوەڵین قەتار بە رە و « فوسا » دەکەوێتە ڕێ. قەتار پڕە لەو لاوانە کە بۆ ژێر ئاڵا بانگ کراون. دوو پیاو کە نیشانی حیزبی دەوڵەتی یان لە جێ دوگمـەی لیباسی خۆ دروە یاسی ڕاگەیاندنی شەڕ بەم زوانە دەکرێ. موسافیرەکان بێدەنگن و گوێ دەدەنێ. یەک لەم دوو پیاوانە دەڵێن:

– بەو داهـێنانـە تازەی کـە لەشکری ئێــمـە هەیەتی شــەڕ لە چەند ڕۆژێکدا تەواو دەبێ.« تیشکی مـەرگ» دوشـمن دەکاتە خـەلوز. پاشـان خـۆ هـەڵدەمـسـێنێ و فوو لە بەری دەستی دەکا کە نیشانی بدا دوژمن ئاوا پەرت و بڵاو دەبێ.

کابرای دیکە دەڵێ:« ئیمڕۆ ئامـادە کراوەکانی« ئاوەتزانو» لە لایەن کە شیـشـەوە پیرۆز دەکرێن.« تیشکی مەرگ» ڕێگا بۆ تەبلیغاتچیەکانی پاپ دەکاتەوە.

لە نێو ئەم لاوانە دا کە بۆ سەر بازی بانگ کراون، وەرزێرێکی پیریش سەفەر دەکا، تارێکی دەستی پێیە. کـوڕەکـەی سـەری وەشـانی بابی کـردوە و خـەوی لێکەوتوە. موسافیرەکانی دەور و بەری بە کابرای پیر دەڵێن: « هەوایەکمان بۆ لێبدە » پیرە مێرد بە ئامـاژەی سـەر وەڵامی نا دەداتەوە. چونکە دەیەوێ تـەواوی قسـەی ئەم دوو کەسـەی کە لە بارەی شـەڕ و چەکی « تیشکی مـەرگ» گوێ بداتێ. ئەو دوو کابرای چەکدار هەر تک فانوسقەی پڕ لە فیشەکیان لە خۆ بەستبوە و بۆ ڕاوی هەوێردە بۆ فۆچینۆ دەچن. یەک لە وان دەڵێ : « ئەمسال هەوێردەکان درنگتر هاتوونەوە، بەڵام لە ساڵان قەڵەو ترن.»

ئەویتر بە پێکەنینەوە وەڵام دەداتەوە:

– شـتـێکی کـە بەدەڵی هـەبێ بۆ گلەیی نابێ. پێکەنینەکـەشـی بۆ ئەوەیە پێی وایە قـسـێکی بە تامی کـردوە. دەورو بەریشی پاش تاوێک پێـدەکـەنن تا بـیـچـمی ئەحمەقانە و کەرانەیان لە خۆ نیشان نەدابێ.

لە سەر ڕێگا لە هەموو نیزگەکان ئامادە کراوی تازە سوار دەبن و هەمووشیان بۆنی پەینی تەویلەیان لێدێت. ئەوانەی لە سەر کورسی قەتار جێگایان نەبوە لە سەر هەرد ڕاکشاون. لە نێو ئەواندا تەنانەت بەننا و میکانیک و پیشە سازیش دەبینرێن لە گەڵ وەرزێران تێکەڵ بوون و لێک هەڵا واردنیان دژوارە. هەژاری هەمووی وەک یەک لێکردوون. هەموویان قیافەی سواڵکەری گەنجیان هەیە. گشتیان لە بەر برسیەتی و قات و قڕی پشتاو پشت، ئەندامیان چکۆڵەیە و لە بەر زەحمەت و کوێرەوەری چەماونەوە و تێک شکاون. بێکاری، ئارەقخواردنەوە و نە خۆشی بەر بڵاو ئەوانی پیس و بێ قەوارە کردوە، هێندێ لەوان لەتکە نانی هەرزن لە هەنبانەی خۆیان دێننە دەر و دەیخۆن. پیرە مێردی تار ژەن گۆزە شەڕابێکی پێیە و پێیاندا دەگێڕێ. شەڕاب بە قوڵتە قوڵت بە گەرووی وشک دا دەچێتە خوار. دەور و بەری پیرە مێرد دیسان داوای لێدەکەن هەوایەکیان بۆ لێبدا. بەڵام ئەمجارەش بە ئاماژەی سەر وەڵامی نا دەداتەوە.

دۆن پاولۆ لە گۆشەیەک خۆی مات کردوە. کراسی مەخمەر و ناحەزی و کڵاو و عەبای کۆن و پینە کراو و ڕەنگ پێوە نەماوی دیمەنی پێش نوێژە فەقیرەکانی گوندی پێ بەخشیوە. بەڵام لە چاوە ڕوون و داگیرساوەکانی بروسکی توند و تازە دەدرەوشێ، بروسکەیەک کە بانگی دەکا بۆ قبوڵکردنی دژواری و زەحمەتی دوا ڕۆژ و ئیرادەی پتەو بۆ تێک شکاندنی وشەی سەر چاوە گرتوو لە ترس و لەرزی ڕێژیمی توند و تیژی دەسەڵاتدار.

ئەو دانیشتوانی جیاوازی گوندی کەم و زۆر بە نیشانە دەناسێتەوە، ئەوانەی لە دەشتێ دەژین و ئەوانەی لە دۆڵەکان نیشتە جێن، ئەوانەی خەڵکی چیاکانن و ئەوانەی لە زنجیرە چیاکانی ئالپ دێنە خوار. ئەو فەقیرانەی کە تاقەت و توانای ڕەنج کێشانیان لە ڕادە بەدەرە و ڕاهاتوون کە جیا لە یەکتر لە نەزانی و بێ بڕواییدا بژین و لە ئاست یەکتر قین و نەفرەتی بێهودەیان هەبێ. ڕاهاتوون یەک یەک فریو بخۆن. تاک تاک تاڵان بکرێن، تاک تاک لێیان بدرێ و سووکایەتیان پێبکرێ.

ئێستاش کە حکوومەتی« بوروکراسی»گەیوەتە سەر دەرانەی نابوتی دەیەوێ بەختی خۆی بەو کەسانە لە قوماری خوێناوی شەڕ دا تاقی بکاتەوە. بۆ ئەم کارە دەبێ ئەوان بانگ بکات. دەبێ ئەوان لە قاوغی تاقکەوتوویی بێنێتە دەر و لێکیان کۆ بکاتەوە و پەرداخ و چەکداریان بکا. هەموو دەزانن کە سواڵکەر و برسی چۆن

ئامادە دەکرێن. بەڵام کەس نازانێ ئاکامی بە کوێ دەگات.
دۆن پاولۆ هەمـوو جارێ کە خـەیال دەکا لە نێو خێڵی مـوسافـیراندا کـابرایەکی خـەڵکی « ئورتا » نیشـتـە جێی خۆی ناسـیـوەتەوە، کـتـێبی دوعـا لەپێش چاوانی رادەگرێ و کڵاوی تا سەر چاوان دێنێتە خوار. لە کتێبی دوعاش نیگای لە سەر ئەم وشانە قەتیس دەبێ:( Venit hora mea ) « دەوری من پێگەیشتوە » تەماشای دەو ر وبەری خۆی دەکا و بزەی دێتێ و دوو پاتی دەکاتەوە :
« لە وانەیە ئەی کۆیلەکان دەوری ئێمەش گەیشتبێ! »
ویلایەتی ئەو کە ئێستا قەتاری رێگای ئاسنی پێدا تێدەپەڕێ ئیتر ئەو« مارسیکا » ی قەدیم نیە بەڵکوو ویلایەتێکی تازە و بێگانەیە، ویلایەتی تەبلیغاتە. لە ئیزگەکانی رێگای ئاسن، لە دارەکانی تێلگراف، لە سەر دیوارەکان، لە سەر بەشێکی جادەکان لە درێژایی پەرژینی باخەکان، لە سەر ساختومانی مەدرەسە و سەر بازخانەکان لە هەموو شوێنێ دروشمەکانی حیزبی دەوڵەتی بە قازانجی شەڕ نووسراوە و دوو پات کراوەتەوە. لەم دیمەنە دەستکرد و خەیاڵی و رواڵەت چاک کە لە بەرانبەر دیمەتی واقیعی دا راگیراوە ئەوەی لە ژیانی فەقیرانەی رۆژانە دا بەر چاو دەکەوێ، زیاتر لە هەموو کات ترس و تەسلیم و سەر دانواندنە. گوندی« فوسا »ش بە تەواوی وەها گۆڕاوە کە لە ژێر ئەو هەموو رازاندنەوەی لە ئاگاو رەنگ و نووسراوە و ساز کردنی مێتنگ و لە ژێر ئەو هەموو دروشم و ئاڵا و نووسراوی باسی شەڕ و ئاڵا کە لە سەر هەموو دیواران بە گوڵی سپی و بە گێچ و بە خەڵوز رەنگ دەدەنەوە، ناناسرێتەوە. میوانخانەی «تورنسل» بۆ تە ناوەندی سەر باز گیری و کۆبوونەوەی سەر گەورەکانی ناوچە، « برەنیچە» سەیر بە گەرمی وەخۆ کەوتوە. لە گەڵ ئەوەش کاتی ئەوەی هەر هەیە کە بە خێر هاتنی دۆن پاولۆ بکا و دەستی ماچ بکات.
– چەند بەختە وەرییە کە تۆش لەم رۆژە پڕ لە شانازیە دا هاتوویەوە ئێرە
لە ساڵۆنی نانخواردن و لە سەر رێگا و پەیژەکان، پیاوان و لاوان لە هاتوو چۆ دان. دەستەیەک لەو کەسانەی بە نیشانی حیزبی دەوڵەتی رازاوتەوە و لە بەر هەڵە وەڕی دەنگیان گیراوە لە دەوری مێزێک کۆبوونەوە و لە بارەی ئەو خۆ پێشاندانەی کە بڕیارە دوای نیوە ڕۆ ساز بکرێ، گفتگۆ دەکەن. باس لە سەر ئەوەیە کە بە راوێژ و هەنگاوی توند دانیشتوانی فوسا و دەور و بەر وا لێبکەن کە بە مەیلی خۆیان لە خۆ پێشاندانەدا بەشداری بکەن.
یەک لە نێویاندا دەپرسێ: » داخوا پێویست دەکا چەند کامیۆن بۆ پیتراسکا

بنێرین.؟
– بەڵێ بۆ پیتراسکاش کامیۆن و ژاندارم بنێرین تا خەڵک بزانن کە خۆیان دەبێ بێن.
لە دەوری مێزێکی دیکە کۆمەڵێک زەلامی ورگ زل و قەڵەو لە ژێر مودیریەتی فەننی « زابالیونە»ی پارێزەر خەریکی ساز کردنی میوانداری شەوە. ناکۆکیان لە نێو دا پەیدا بوە. لە ئاخریدا زابالیونە دەیکاتە مەسەلەیەکی پێوەندیدار بە ئابڕووی شەخسی و هاوار دەکات:
– بە شەرافەتی خێزانم و بە پاکی کیژەکانم سوێند دەخۆم کە ئەگەر شەرابی سپی لە پێش شەرابی سوور دا بگێڕن، لە میوانی دەچمە دەر.
ئەندامانی دیکەی کۆمەڵ کە تەواو تورە بوون بە قیزە قیز دەڵێن: « ئەم هەڵە وەڕییە چیە ؟»
بەڵام زابالیونە کە دەستەکانی بە شکڵی خاچ بە سینگیەوە ناوە، لە سەر قسەی خۆی دەوەستێ و ڕادەگەیەنێ کە« ئوسوڵ ئوسوڵە!»
لە قاتی یەکەم لە ژووری خەوی برەنیچە دا ئەندامانی کومیسیۆنی کۆ کردنەوەی سەربازانی داو تەڵەب کۆ بوونەوە. ئەوانەی بۆ دانیشتن کورسی یان وەگیر نەکەوتوە، لە سەر تەختی خەوی مودیری میوانخانە دانیشتوون ویا ڕاکشاون. لە سەر باڵنج و لێفە و دۆشەکی بە سەلیقەیەکی تایبەتی وشەی « خەوێکی خۆش» گوڵدۆزی کراوە. لە بان تەختی خەو عەکسێکی ڕەنگیی مەلائیکەی نۆبەدار لە چوار چێوەیەکدا خۆ دەنوێنێ کە کۆترێک دەلاوێنێتەوە. لە نێو ئاواییدا ئامادە بوانی برسی و سواڵکەران ڕەگەڵ ئامادە بوانی نابوتەکان کەوتوە. مودیرانی بانکی فوسا کە چاوە ڕوانن بە تاوانی نابوتی بکەونە ژێر پرسیار و ڕاو نان داوایان کردوە بۆ ئەفریقایان بنێرن. ئەم پێشدەستیە سیاسیەی وان بۆ تە سەر مەشقی خەڵکێکی زۆر. خەرازی فرۆشێک کە دوکانی لە مەیدانی شار داری بەرانبەر موسافیرخانەی تورنسل بوو، نا چار بیبوو دوکانەکەی لە نابوتی دابخات. بەیانی ئەو ڕۆژە دوو بارە دەرگای دوکانەکەی بکاتەوە و « جلزومینای خێزانی لە وێ دابنێ و ئاگاداریەکیش بەم نێومرۆکەوە لە دەرگای دوکانەکەی بدات:« بەم بۆنەوە بە هەموو قەرز خوازەکان ڕادەگەیەنرێ کە خاوەنی ئەم دوکانە وەک سەر باز داو تەڵەبی خزمەتی سەربازی بوە.» دیارە هیچ دەسەڵاتێک ناتوانێ شتوومەکی قارەمانێک دەست بە سەر داگرێ.
بەر پرسی ناوی داو تەڵەبان پاش خوێندنەوەی ناوی داوتەڵەبان هاوار دەکات:«

ئەوە شەڕی گرەوگانانانە»
ئەم تاریفە بە جوانی پەسند دەگرێ و بۆ ئەوانەی تازە هاتوون دوو پات دەکرێتەوە.
« دۆن سنو فنتــە» بە دوای کـوڕەکـەیدا دەگـەڕێ بەلاّم نایدۆزێتــەوە. هەقی هـەیە نیگەران بێ و بلّێ:« کوڕی خەلّک وا دەچن و کوڕی من ناچێ» ئاخر ئەو خۆشی سفتـەی لە سەرن و وادەیان نیـزیک بۆتەوە. داخوا ئەوە ئینسافە بە هۆی خەتای کوڕەکە ی مەجبور بێت پارەی سفتەکان بدات ؟
دەگاتە هەر کەسێک بە نیگەرانیەوە دەپرسێ :
- ئێوە پۆمپیۆ تان نەدیوە؟ دەگرێ پێم بێژن ئەو لە کوێ خۆی شاردۆتەوە.؟ ئەگەر بیـدۆزمـەوە و ئامـادە نەبێ بە دلّخـواز بیـێتـە داوتەلّەبی سـەر بازی، سوێند بە حەقیقەتی خودا گوللەیەکی لە مێشکی دەدەم.
دۆن پاولۆش پێویستی بە دیتنی پۆمپیۆ هەیە تا پێکەوە بڕیار بدەن دەبێ چبکەن تا شـەڕی دژی وەرزێرانی حـەبەشـە بە خـێرایی بیکەنە شـەڕی نێـو خـۆ بۆ ئازادی. بێئەوەی هیچ بـە باوکی بێژێ دەچێتـە ڤیلای چوار فەسلّ. ڤیلا چۆل و بێدەنگە. لە پەنا حـەوز چاوی بە « بیـانکینا» دەکەوێ کە تـەنیـایە و هـەر وا بە نـارە نار یاری بە وەرەقـان دەکات. کیژی لاو بە شادی و پێکەنین خـو دەئامـێزی کەشیش داوێ. دۆن پاولۆ دەپرسێ:« پۆمپیۆ لە کوێیە ؟»
- ئەو ئێستا لە ڕۆمە. نامەیکی بانگکردنی بۆ هاتبوو.
- لە لایەن کێوە ؟
بیانکینا نازانێ و دەلّێ : « ڕەنگە بۆ شۆرشـی دووەم بێت.»
- ئالبێرتۆ لە کوێیە ؟
- لە پیتراسکا لای دایک و بابیەتی. ئەو چونکە ئێرەی بە پۆمپیۆ دەبرد، منی بەرەلاّ کرد.
- کالەوەرێن لە کوێیە ؟
- ئەو لەم ڕۆژانە دا خانم بارون بە فایتوون دەباتە گەڕانێ.
ئەو دەم بیـانکینا داسـتانی بارونی ڤـیلای چوار فەسلّ دەگێڕێتەوە کە وە داسـتانی ڕەمـەکی دەچێ کە لە گۆڤـارە عەکسـدارەکـان وەر گیـرا بێ. قـارەمـانی داسـتـان لە تەمـەنی شازدە ساڵیدا پاش هاتنە دەر لە عیبـادەتگا شوو بە بـارۆنێکی پیر و قـەرز دار و نەخـۆشی جـۆر بەجـۆر دەکـات. جـەنابی بارون لە شـەڕەێکی تەن بە تەندا« دوئێل» بە دەمانچە دەکوژرێ. خانم بـارون کە هێشـتا گەنج و جوان بوو، ڕۆژگارێک

لە شـاردا بە کەیف و خـۆشی ڕادەبوێرێ، بەڵام ئێستـا زەمانە دژوار بوە و لە بەر ئەوەی نیتر ناتوانێ ئەو دەم و دەزگای پێشوو ڕابگرێ، لە گەڵ فاسقێکی پیر کە سەرهەنگی سوارە نیزامی« پیمونتی» یە، پەنای بۆ ئێرە هێناوە. دەڵێن سەر هەنگ لە شەڕی کریمە دا بەشدار بوە و ئێستـا جۆرێک بە دەورەی خـانم دادێت دەڵێی ئاگای لە ماینی سەر باز خانەیە. گـا لەوەڕێن لە قـاتی یەکەم ژوورێکی بۆ سـاز کردوون کە تەختخەوێکی گەورە ومیچێکی داری هەیە و تاجێکیشی لە سەرە. بەڵام چونکە چەند ساڵە سـواغ نەکراوە، ژوورەکـە ئەوەندە دڵۆپان دەکا مـیچی سەر تەختەکە جوانیی تێدا نەماوە و لە کاتی باراندا خانم بارون و جەناب سەرهەنگ لانی کەم ئەو کاتەی پێکەوە ڕاکشاون دڵۆپەیان وێناکەوێ.

دۆن پاوڵۆ دەپرسێ: « بێ خەویش دەکێشن .؟»

بیانکینا دەڵێ :

جـەناب سـەرهەنگ هەر شـەوە گـەمـەیەک سـاز دەکـا مـەیدانی شـەڕی ڕووس و وەسـمـانی وەبیـر دێنێتـەوە وەک لە مـەدرەسـە بـۆیان باسکردووین. دیارە ئەم حەرەکەتانە کار لە من ناکەن، بەڵام گا لەوەڕێن لە ئاستیان بێ تاقەتە.

دۆن پاوڵۆ دەڵێ:« لەم قوڕیاتە واز بێنین. ئێستـا تۆ تکات لێدەکەم چاکەیەکم لە گەڵ بکەی.

بیـانکیناسـەر دادەنوێنێ و لە وەڵام دا دەڵێ :( Ecce ancilla domini ) مـن کەنیزی تۆم چت گەرەکە لە گەڵ من بیکە .

دۆن پاوڵۆ پێی دەڵێ بچێتە« روکادی مارسی» و کابرایەک بە ناوی« لویجی موریکا» بدۆزێتـەوە. پێی بڵێ یەکێ لە ئاشنـایانت لە ڕۆمـەوە هاتوە و دەیەوێ چاوی پێت بکەوێ. داخوا ئیجازە هەیە بێتە لات یا نا. دیارە ئەگەر پێش داگرێ، نابێ هیچی دیکەی پێ بڵێی.

بیانکینا ڕێگای« روکا» دەگرێتە بەر. دۆن پاوڵۆش بۆ موسـافیر خانەی تورنسل دەگەڕێتەوە.

کـەم کـەم کـاتی وەی دێت تـا ڕادیۆ بەیاننامـەی ڕاگـەیاندنی شـەڕ بڵاو کـاتەوە. حەشیمەتی کە کۆڵانەکانیان پڕ کردوە، زیاد دەکەن. کار بە دەستـانی دەوڵەتی لە لای ڕاستـەوە دێن و وەرزێڕەکـان لە لای چەپەوە. لە لای ڕاست مـوتۆر سکلێت و ترومـبـیل و لوری پڕ لە سـەر باز و پاسـەوان و ژاندارم و نیـزامی و بەر پرسـانی حیزبی دەوڵەتی و ئەندامانی یێکێتیەکانی پیشەیی دەگەنێ. لە لای چەپەوە کەر و

گایەکان و دوچەرخەکان و ئوتوبوسی هەڵگری وەرزێران. دوو دەستە موزیک لە کۆڵاندا ئەوەندە هەوای مارش لێدەدەن کە کۆتایی نیە و هەر یەک هەوایە و مرۆڤ هیلاک دەکات و دڵی تێک دەچێ. زۆربەی موزیک چیەکان ئەو کاسبکارانەن کە لیباسی یەک شکڵی ڕامکەری حەیوانات و دەرکەوانی میوانخانەکانیان دەبەر دایە و تیتۆڵی سەیریان بە لیباسی خۆیانەوە هەڵاوەسیوە و دوگمەی تەنەکەیان تا خوارەوە لە سینگیان دروە. لە پێش دوکانی سەر تاشێک تابلۆیەکی گەورەیان هەڵاوەسیوە وعەکسی ژنانی حەبەشەیان بە مەمکی گەورە و داچلەکاو لە سەر کێشاوە. لاوان لە پێش تابلۆ بە چاوی دڕاو سەیریان دەکەن و پێدەکەنن.
لەم کاتە دا وەرزێر و وردە مالیک و خەڵوز فرۆش و شوان لە لای چەپەوە زیاد دەکەن. لە لای ڕاستەش نوێنەرانی حیزبی دەوڵەتی لە ڕێوە دەگەنێ. لە ئاخری مەیدان لە نێو سەندەلیەکانی حیزب و کورسی شار داری دەزگایەکی بلیند کۆ دانراوە کە چەند ئاڵا لە سەری دەلەرێنەوە. ئەو دەنگەی کە دەبێ شەڕ ڕابگەیەنێ لەم دەزگایەوە دێتە دەر. لە ژێر ئەم شتە بچوکە جادوییە کە چارە نووسی وڵاتی پێوە گرێدراوە، هەزارانی ڕوو لە زیادی کۆ بوونەوە. ژنان وەک ئەو دەمەی لە کلیسا و یا لە بازاڕن هەڵتروشکاون. پیاوەکانیش لە سەر خورجێنی خۆیان و یا لە سەر کورتانی کەرەکانیان دادەنیشن. هەموو دەزانن بۆ چی لێرە کۆ بوونەوە و هەموو پێکەوە تەماشای ئەم شتە بچوکە میکانیکیە دەکەن کە قەرارە فەرمانی شەڕی لێ بێتە دەر. بەڵام هەموویان لە بەر ئەوەی خۆیان لەو کۆبوونەوەیە دا دەبینن، خەمبار ومات و لە شک و گومان دان. مەیدان وکۆڵانەکانی دراوسێ هەر ئێستا پڕە لە حەشیمەت و بەمحاڵەش لافاوی تازە گەیشتوان هەر وا بێدەنگ درێژەی هەیە.
نامادمیی گشتی برسی و سواڵکەران گەیوەتە گوندەکانیش. کرێکارانی شەلی کانگای بەرد، کوێری کورمخانەکان، وەرزێرانی لاواز وچەماو، باخەوانی گردەکانی بە دەستی سووری بە قسڵ وگوگرد، چیا نوشینەکانی قاچ خوار بە هۆی کار و دروێنەوە، لە ڕێگاوە دەگەنێ. هەر کەسی کە دیتوویە دراوسییەکەی دێت، ئەویش ڕەگەڵ کەوتوە. ئەگەر شەڕ بەد بەختی دێنێ، بەشی هەموو کەسە. چونکە بە سەر هەمواندا دابەش دەکرێ، نیوە بەد بەختییە، بەڵام ئەگەر بەخت و ئیقباڵی بە دواوە بێت، دەبێ هەول بدرێ بەشێکی پێ ببرێ. بە گوێرەی ئەم مەنتیقە گشتیان ڕادەبن، شێلانی ترێ و خاوێنکردنەوەی کویەکان و کشت و کاڵیان لەو لا دا ناوە و بۆ ناوەندی ناوچە ڕایانکردوە. دانیشتوانی پیتراسکاش لە لایەکەوە دەگەنێ، هەموان

دادەبەزێن و لە تەنیشت میوانخانەی تورنسل جێگایان دەدەنێ. خانمی مامۆستا بۆ هەموان ڕوون دەکاتەوە و دوو پاتی دەکاتەوە کە دەبێ چۆن ڕەفتار بکەن، چۆن هورا بکێشن، کەنگێ گۆرانی بڵێن. بەڵام دەنگی لە نێو هەرا و چەقەی خەڵکدا دەنگی کپ دەبێ، ئاخرەکەی شاتاپ خۆی پێ ڕاناگیرێ و بە سەر خانم مامۆستادا دەگوڕێنێ و دەڵێ: « وازمان لێ بێنە، ئێمە منداڵ نین، ئاخر من لە ئەمریکا بووم.»

دۆن پاولۆ لە گەڵ ماگاشیا و « جرامتا »ی پیر قسە دەکا و لێیان دەپرسێ : پاش ڕۆیشتنی وی لە گوندی چ ڕوویداوە؟ ماگاشیا باسی مردنی دۆن پاسکال کولامارتینی دەکات:

– ئەو ڕۆژەی کە ئەو لە گەڵ تۆ هاتە فوسا، شەو گەڕاوە ماڵێ. بەڵام مەیتەکەی وەر گەڕا بوو. ماینەکە «دیانا» مەیتەکەی لە کالیسکەدا هێنا بۆوە بەر دەرگای ماڵ. کاتی کەڕانەوە لە دۆڵی سەر ڕێگا زۆر کەس لە وەرزێڕان دیتوویانە و سڵاویان لێکردوە، بەڵام کەس نەیزانیبوو کە زیندوو نیە. لە ڕاستیدا لەشی بە سەر سەندەڵیدا کەمێک چەماوەتەوە وەک خەوی لێکەوتبێ سەری کەوتۆتە سەر سینگی. بەڵام هەوساری ماینەکەی هە بە دەستەوە دەبێ.

جرامتا دەڵێ :« ئەوەش بنەماڵەیەکی قەدیمی دیکە. لە ئاخریدا بانک ماڵ وێرانی کرد.»

ماگاشیا دوو بارە دەست پێدەکاتەوە:

– ماستر ئانجلۆش لاقێکی شکاوە. شەوێکیان لە ماڵی «چیکاوو»ی خوشکی دێتە دەر و دەکەوێ. لە پێشدا وا دەزانێ کە لاقی وەر گەڕاوە، بەڵام کاتێ ژانی ناشکێ دەیهێننە فوسا لای دوکتۆر، ئەو دەزانێ کە لاقی شکاوە و تازە بۆ عیلاجی درنگە. ئێستا دەشەلێ.

وەرزێڕەکانی پیتراسکا لە بێدەنگی تەواو دا چاوەڕوانی دەستپێکی ئاهەنگن. ژنەکان بە پەلە ترن. «جزیرا» پێشنیار دەکا بەر لەوەی ماشێن دەست بە قسان بکات، بچنە کلیسا.« فیلومنا ساپونە» و «انینا ستراودونە» موخالەفەت دەکەن تا جێیان نەگیرێتەوە. بەڵام چونکە ئەوانیتر بۆ لای کلیسا دەچن، ئەوانیش وەدوایان دەکەون. لەو دەمەدا پیاوان گۆزە شەرابێک دەگێڕن و هەموویان بێ ئەوەی گۆزە لە لێویان بدەن. لێی دەخۆنەوە.

« جاچینتۆ کامپۆ باسۆ» لە کاتێکا ئاماژە بۆ ئەم شتە جادوییە دەکات لە دۆن پاولۆ دەپرسێ:

– ئەدی ئەو كابرایە كەنگێ دێت ؟
كەشیش لە وەلامدا دەڵێ: من چو زانم، ڕەنگە تاوێكی دیكە.
ئەم خـەبەرە زار بە زار دەگـەڕێ و خـەڵک دوو پاتی دەكـەنەوە: « ڕەنگە تـاوێكی دیكە بێت.»
« كاسـارولا » ژنی جادوگەر هێشتا لە سـەر گاری ماگاشیایـە. ژنەكان كە لە كلیسا دەگـەڕێنەوە هـەول دەدەن لە گـاری بیـهـێننە خـوار و دەڵێن: « وەرە لـە كن ئێـمـە دانیشە.»
جادوگـەر وەلامیـان ناداتەوە و هـەر وا لە عـاسـمـان ڕامـاوە. جـار و بار غـەیبگویی شومی خۆی سەبروكە دوو پات دەكاتەوە:
– لە حەوا ئەستێرەیەكی كلكداری زەرد هەیە. شەڕ دەبێ و پاشان تاعون دێت.
ژنەكانی دیكە ئەستێرەی كلكداری ڕەنگ زەرد نابینن. لە گەڵ ئەوە نیشانەی خاچ دەكێشن.
« جزیرا » دەپرسێ: « لە پێش كام یەک لە پیرۆزەكان دوعا بكەین ؟»
ژنی جـادو گـەر لە وەلامـدا دەڵێ : « دوعـا بە كـار نایە. خـودا بـە سـەر وشكی و ئاوەكـان و عـاسـمـاندا حكوومـەت دەكـا بەلام ئەسـتـێرەی كلكداری زەرد ڕەنگ لەو دیوی عاسمانەوە دێت.
شاتاپ گۆزەی شەڕاب بۆ ژنی جادوو گەر دەبات كە بخواتەوە. ئەو دەخواتەوە و تف لە هەردی دەكات. دوو بارە چاو لە عاسمـان دەكا. ماگاشیا سـواری گاری دەبێت و بە سرتە بە ژنەكە دەڵێ:
– ڕاستیم پێ بێژە، بە ڕاستی هیچ دەبینی .؟
– لە وەلامـدا دەڵێ : « ئـەسـتـێـرەیـەكی كلكداری ڕەنگ زەرد هەیە، دەبێـتـە شـەڕ و پاشان تاعون( وەبا ) دێت.
كیژانی جحێل بـە قەرتاڵەی پڕ لە تیـتۆڵی سێ ڕەنگ بە نێو حـەشیمـەتی نیگەران و ترساو دا دەگەڕێن. دۆن پاولۆ هـەر سێ كـیژی زابالیونە دەناسێتەوە كە تیتۆڵیان لە سینگی داوە و بۆ لای وی دێن. هـەر سێک ئارەقـەیان كردوە و پشـویان سـوارە و بە زەحمەت دەناسرێنەوە. بە كەشیش دەڵێن : « ئاخ ! پایە بەرز، چ ڕۆژێكی خۆش و چ ڕۆژێكە لە بیر ناچێتەوە. !»
پاڵێوەنانی تازە گەیشتوان كە دەیانەوێ جێگا بۆ خۆیان بكەنەوە تا ڕادیۆكە ببینن، حـەشیـمـەتەكە دەبزێوێ وكیـژەكان لێک جیـا دەكاتـەوە. ئێسـتـا لە لای چەپەوە ئەم

وەرزێڕانە دەبینرێن کە لە دێهاتی دوورەوە هـاتوون. شـوانەکان بە پاتۆڵی کورت لە کەوڵی بزن وکـەوشی دار و ئەڵقە لـە گوێ. « دۆن کنچـتـینۆڕاکو» دە لیـباسـی یەک شکڵی ئەفسەری ئەرتەشدا لە لای ڕاست دەکەوێ.

دۆن پاولۆ دەچێتـەوە ژوورەکەی خۆی تا لە مـەترسی ناسینەوەی هـاوڕێی قـەدیمی دەبیرستـانی لە ئەمـاندا بێ. دەچێتـە قاتی دووەمی موسـافـیرخـانە و لە پشـتی پەنجەرە خۆی مات دەکا و تەماشای خـەڵک و بەڕێوە بردنی ڕێ و ڕەسـمی ئاهەنگ دەکات. لە نەکـاو یەکی لە ڕۆژەکانی سەر دەمی منداڵی وەبیر دێنێتەوە. ئەو ڕۆژەش ڕاست وەک ئیـمـڕۆ لە پشـتی پەنجـەرەی مـاڵی خـۆیانەوە ڕاوەسـتـا بـوو لە نەکـاو دەسـتـەیەکـی گـەورە لە زیارەتکـەرانی شـڕ و شـڕۆڵ کـۆلانیـان پڕ کـرد بوو. ئەوان دوعای حـەزرەتی مریەمیان دەخـوێند. ئەو زیارەتکەرانە لە ڕێگای دوورەوە دەهـاتن و بۆ ڕێگای دوور دەچوون. زۆربەیان پای پەتی و لە ئارەق وقـوڕ ولیـتـە دا نوقم بوون. ترس و نـەفـرەتێکی لە دیتنی ئەو دیمەنە چو بوە دڵی منـدالانـەی وە بیـر دێتـــەوە. ئێستـاش لە سـەر قاتی دووەم خـەڵکێک دەبینێ کە لە دەورەی ئەم ئامـرازە جادوییـە کۆ بوونەوە و هەر وەک خـێڵی زیارەتکەران فەقیر و هیلاک و پەرێشـانن. لە پەناکای خـۆیەوە دەتوانێ دوو سـێ بورجی کلیـسـاش ببـینێ کـە لە سـەرووی بانی مـاڵی دراوسێکان وەک کۆتر خانێکی پڕ لە کۆتر و پڕ لە منداڵی بەرەڵان.

لە سـەعـاتێکی دیاریکراو دا زەنگوڵەی کلیـسـا دوورەکـان وەدەنگ دێت. ئەندامـانی حیزبی دەوڵەتی دڕ بە حـەشیمـەت دەدەن و ئالا و نیشـانەکانی نیشـتمان لە دەور و بەری ئامـرازی جـادویی دادەنێن. ئالا سـێ ڕەنگ و لافـیـتـەی ڕەش و لـە دوایەش عەکسی پێشـەوای گەورە کە لیچی خوارەوەی لە ڕادە بە دەر ئەستور دیاری دەکات.

هاواری وەحشیـانەی « ئایا، ئایا » کە هیچ مـاناو تێگەیەکی نیە لە ئەندامـانی حیزبی دەوڵەتی بەرز دەبێتەوە، لـە کاتێکا حەشیمـەت بێدەنگە. ئێستـا لە خوارەوەی دەستی ئەم ئامرازە جادوییە جێگایەکی بەتاڵ بۆ « دایکانی قارەمـان» ئامادە دەکەن. ئەوانە پیرێژنی فـەقیرن کە زیاتر لە پازدە ساڵ ڕەش پۆشن و میداڵیان بە سـینگیەوەیە. لە پاداش دا مـــانگانـەیەکی کـــەم وەر دەگـرن و ناچارن هەمـوو جـارێ کـــە دەزگـای تەبلیـغـاتی دیکتـاتۆری پێـویسـتی بە وان هەبوو، خـۆیان بخـەنە بەر دەسـتی فـەرمـاندەی ژاندارمــەری. لە پەنا «دایکان» قـەشـەی فـێـڵـبـاز و زەلامی گـەورە و سـامـداری عـیـبـادەتگایان کـە لە نێوانیـاندا ڕاهـیـبێکی سـوور و سـپی و شـاد وەک منداڵی شیرە خۆرەی ناز پەروەر لە گەڵ دۆن جیراسولە قسان دەکات، کۆ دەبنەوە.

لە تەنیشت کورسی شارداری چەند کەس لە خاوەن ملکان بە ڕیشی بزنی و بڕۆی ئەستوور کە هەموویان لیباسی مەخمەری ڕاویان لە بەر دایە، بە ڕیز ڕاوەستاون. مەعموران یا بە واتایەکی دیکە ئەندامانی حیزبی دەوڵەتی نێوە ڕاستی مەیدانیان گرتوە. لە نێویاندا تاقە ژنێک دەبینرێ ئەویش « دونائەوانجلینا » یە کە مێردی دار تاشی لە پەنا ڕاوەستاوە. ئەو مێردەکەی ناچار کردوە کە ببێتە سەر بازی داو تەڵەب. برە نیچە دەڵێ:

– ئەو نەک هەر بۆ قبوڵکردنی کوڕی بیژوی باوکێکی پەیدا کردوە، بەڵکوو باوکێک کە قارەمانیشە، ئەویش چ قارەمانێک .

دۆن سنو فۆنتە دەڵێ :

– دونا ئەوانجلینا بە سەر پشکی « بوکی زەمانی شەڕ » هاتۆتە دنیاوە. کاتێ بتوانێ لیباسی تازە بکاتە بەر ومیدالێک بە سینگیەوە هەڵاوسێ، ئەو دەم – تەنیا ئەو دەم – هەست بە بەختەوەری دەکات.

دۆن پاولۆ لە ناو ئەو حەشیمەتە زۆرە دا بە زەحمەت دەتوانێ چەند کەسێک لە وەر زێڕانی ڕەسەن بناسێتەوە کە وەزعێکی بە ئازار و هەراسانیان هەیە و دەڵێی شەرمەسارن لە وەی کە سەیری دەور و بەری خۆیان بکەن. خاوێنی لیباسیان بیر خەرەوەی ئەو ڕەگەزە ڕەسەنە دێهاتیە کە سەر دەمێک لە کوێستانەکانی « ئابروتزە» باڵا سەر بوون. ئەو پیاوانەی کە کلیساین بەڵام کەر پیرۆز نین لە ڕەفتار و ئاخافتنیاندا خەسیسی بە کار دێنن و بە گوێرەی ڕاهاتنیان هەمیشە بە مەسەلەی جیدی و بە کاری شەڕافەتمەندانە وە خەریک دەبن. لەو کەسانەی کە لە گۆشە و کەناران دەبینرێن و هەر دەڵێی پاشماوەی بەرەیەکی لە بەر یەک هەڵوەشاون.

دەنگی زەنگوڵەکان هەر وا لە حەوادا بڵاوە. هەتیوە بەرەڵاکانی مەعموری زەنگوڵە لێدان تەنافەکان دەکێشن. بۆ ئەوەی لێدانی زەنگوڵەکان ڕابگیرێن و پێشی دەنگی بڵند گۆ نەگرن کە دەمێکی تر دەست پێدەکات، ئاماژە بە هەتیوەکان دەکەن کە دەست ڕابگرن. بەڵام ئەوان یا تێناگەن و یا لە خۆ دەگۆڕن لانی کەم دە زەنگوڵە لەو بەری بەرزیدا دەنگی خۆیان بە شار دا بڵاو دەکەنەوە و گوێچکەی خەڵک کەڕ دەکەن. سەرباز وەسەر دەکەون و هەتیوە بەرەڵاکان مەجبور دەکەن واز لە لێدان بێنن. بەڵام هێشتا نەهاتوونە خوار دەنگی زەنگوڵە لە بورجەکانی تر بەرز بۆتەوە. هەتیوی بەرەڵای دیکە بۆ ئەوەی لە کار دوا نەکەون، دەست بە لێدان دەکەن.

هەوەڵین گـرمـەی ئەم دەزگـا جـادوییـە بە نە بیـسـراوی ڕادەبرێ. بـەڵام دەسـتـەی تفەنگدار و نیزامی و ئەندامـانی حـیـزبی دەوڵەتی دەست دەکـەن بە هوڕا و هـەرا و هـەڵپـەڕین و نـاوی پێـشـەوای مـەزن« دۆچە، دۆچـە» بە زمـان دادێنن. هـاوارێک بە شـێوەی پاڕانەوە لە سـەر خـۆ بڵاو دەبێتـەوە کە ژن و منداڵ دەیڵـێنەوە و پاشـان حەشیمەت لە ئەوانی هەرە دوور تاتەماشا چیەکانی پشتی پەنجەرەکان گشتیان بە ئاهەنگێکی خـــەفـــەتبـــارانە وەک دوعـــا دوو پاتی دەکـــەنەوە: « دۆچە ، دۆچە ، دۆچە!دۆچە ! ( بە زمانی ئیتالیایی ناز ناوی موسولینی بووە.)

ئەم ناوە کـە هیچ کـەس ناوێرێ نە بۆ تاریف و نە بۆ زەم بە سـەر زمـانی دابێنێ- چونکە گوتنی بەد بەختی دێنێ - ئێستا لە نێو خەڵک و لە کن عەکسە بە ترسە کانی وی و لە بەرانبەر ئاڵا و نیشانەکانی میللی وەک زیکری ڕێ و ڕەسمی ئایینی لە سەر زمانانە و پەیتا پەیتا دوو پات دەکرێتەوە: دۆچە ! دۆچە ! دۆچە

ئەوانەی لە نیزیک دەزگای ڕادیۆ وێستاون، ئامـاژە بە حـەشیمـەت دەکەن،: بێدەنگ بن و گوێ بدەنە وتارێک کە لە ڕۆم بڵاو دەبێتەوە. بـەڵام خـەڵکێکی کە لە کۆڵانەکانی تەنیشت مـەیدان کۆ بوونەوە هـەر وەها بە دوو پاتە کردنەوەی ناوی پێشەوای مەزن، موغی گەورە، جادوگـەرێکی کە دوا ڕۆژ و ژیانی هەژارانی لە بەر دەستی دایە درێژە دەدەن. هەرا و هوریای حـەشیـمـەت نا هێڵـێ کە دۆن پاوڵۆ وتارەکە ببیسێ. ئەو لە قوژبنێکی موسـافیرخـانە، وەرزێڕەکانی پیتراسکا دەناسێتەوە. ژنەکان لە عەردی دانیشتوون و پیاوەکانیش لە دەوری گاریـەی ماگاشیا کۆ بوونەوە و هـەموویان بە ژن و مێرەوە بۆ ئەوەی لە خەڵکی دوا نەکەون دۆچە ؛ دۆچە ، دوو پات دەکەنەوە.

پیرێژنی جـادوگەر کە لە سەر گاریە وێستاوە و بە سەر حـەشیمەت دا زاڵە، هەر وا لە عـاسـمـان ڕامـاوە. جـار جـار لێوان دەبزێوێ و هـە مـوو جـارێش بیـچـمی ڕەش و بۆری حکایەت لە خـەمێکی نهێنی دەکات. ئەو دەم هـاواری ئـەو کەسـانەی لە دەور و بەری وێستاون نا هومێدتر دەبن و دەبێتە هـەرایەکی ناخۆش و نەهرەتەی بێ جێ. « دۆچە ! دۆچە ! دۆچە ! » حـەشیـمـەت بە خڕی، تەنـانەت ئەو کەسـانەی لە ڕادیۆش نیزیکن ، تەنانەت نیزامی و چەکـدار و نوێنەرانی دەزگای دەوڵەتیش هـاوار دەکەن چونکە ئێـتـر دڵنیـان کـە ناتوانن یـەک وشـەش لەم وتارە وەر بگرن کـە لە ڕۆم بڵاو دەبێتـەوە. هـاواری « دۆچە ! دۆچە ! » پەیتا پەیتا وەک پاڕانەوە ی دەستـەیەکی تۆبە کـار دەچێ کە لە قـودرەتی ئەزەلی و باڵا سـەری مرۆڤ داوای لێ خۆشـبوون دەکەن ئەو وشـە گەلی قوڵمبە کە لە مـەو دوا لە هـەمـوو مانای ئاسـایی و ئاقڵانە خـاڵییە

هەر وەک دوعـای دەرکـردنـی جندۆکـان دێنە سـەر زمـانـان و لـە حـەوا دا لە گـەڵ ئاهەنگی مـەزهـەبی زەنگوڵەکان تێکەڵ دەبن. دۆن پاولۆ لە پشت پەنجـەرەی خۆی لە جێ وشک بۆوە و بە نیگەرانـی و خەفەتەوە سەیریان دەکات. ئێستا ترسێک وەبیر دێنێتـەوە کە ڕۆژێکیـان لە سـەر دەمی گەنجیـەتی داکاتێ تەمـەشـاگەری ئەزمـوونی هیـپنۆتیـزمـتکی بە کـۆمـەڵ بوە بە سـەریدا هـاتوە، ترسـێک وە بیـر دێنێتـەوە کـە هەمیشـە لە بەرانبەر هێزەکانی زاتـی دەشتەکی و غەیرە ئەقڵانـی شاراوە لە وجودی کـەسـان و لە کـۆمـەڵ بە سـەریـدا هـاتوە. چۆن دەکـرێ لە گـەڵ ئـەو هەزارانـەی کـە کەوتوونەتە ژێر کار کردی جادوگەرێکی« هیپنوتیزۆر» بە بەڵگە و دەلیل قسە بکات.
ئەوانەی لە نیـزیک دەزگـان ئامـاژە دەکـەن کـە وتار کۆتـایی هـاتوە. زابالیـونە هـاوار دەکات: « شـەڕ ڕاگەیەنراوە!» و وا نیشان دەدا کە دەیەوێ قسـان بکات بەڵام دەنگی هەور ئاسـای وی لـە نێو هەرا و هوریای حـەشیـمـەت دا کـە هـەر وا داوای ڕزگاری ولێبوردن دەکەن، بزر دەبێ.
دەزگـای جادویی بێدەنگ دەبێ.هیچ کەس تەنانەت سێ وشـەش لە وە تێنەگەیشتوە کەدەزگا بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام چمانیـاز بە تێگەیشتن هەیە ؟ تێگەیشتن بە کاری چی دێت.؟ کـێیـە لە خـەمی تێگەیشتندا بێت ؟ لە ڕاسـتیدا هـیچ کـەس لە فـیکری تێگەیشـتندا نیە. تۆ ڕەنگە بتـەوێ لە مەتڵەبی کەسـێک تێبگەی کە بخوازی تۆ قـانع بکات. بە لام تەبلیـغات کاری بە قانع کـردن و سابیت کـردن نە داوە. تەبلیـغات وەک مەسـەلەکانی ئاشکرا و مسۆگەر بـەس لە سەر نەکراو بڵاو دەبێتەوە. خـەڵکی فـەقیر و لێقەوماوی کوچە و کۆڵانان لە وڵاتی تەبلیـغات دا خـۆیان وەک ئەو ماسیانـە هەست پێدەکەن کە لە تۆڕ کەوتبن. بوونی تۆڕ واقـعیـەتە و تاقە واقـعیەتێکە کە حیسابی لە سـەر دەکـرێ. بەڵام ئـەوە کـە تەبلیـغـات بە هـەقـە یان نا؟ ئـەو مـەسـەلەیە بۆ ڕووناکبیرانی بێکارە جێگای باسـە. بەڵام بۆ « وەرزێڕانـی» فەقیر بەر لە هـەموو شت هەر ئەو شتەیە کە هەیـە و شتێکی تر نیە. بۆ کەسێکی لە پشتی پەنجەرەوە تەماشا دەکا و پاسپۆرتێکی بێگانەی لە گیرفاندایە ،تەبلیغات تەنیا واقعیـەتێکی شکڵی و ساختەی زەینییە. واقـعیـەتێکی کە هـەموو ئیعتباری خـۆی لە هیپنۆتیـزم وەر بگرێ کە بە سەر هەزاراندا خۆ دەسەپێنێ. بەڵام ئـەو فەقیرانەی لە پشت پەنجـەرە نین و، بەڵکوو لـە کـۆڵانانن. لـە کـۆڵانـدا، شـتـەکـان بـە جـۆرێکـی تـر دەبینرێن. کـاتێ ئەوەی تەنیشـتت هـاوار دەکا مرۆڤ ناچارە هـاوار بکات، کاتێ ئەوەی تەنیشتت بۆ سڵاو کردن بە شێوەی ڕۆمیـان دەست هـەڵدێنێ، گریمان بۆ ڕەگەڵ کەوتنی کۆمەڵیش بێ،

تۆ ناچار دەبی دەست هـەڵێنی. ئەگەر پەنا دەسـتت بیر بکاتەوە کە دەتوانێ گیانی سلامەت لە مەعرەکە دەر باز بکا، هەر کەس وەدوای دەکوێ کە گیانی خۆی دەر باز بکات. لە نێـو تۆڕی تەبلیـغـات دا هەر کــەســە بۆ نـەخـتێ ئەمنیـەت هەول دەدا ڕاسپاردەیەک وەر بگرێ و پشت و پەنایەک پەیدا بکات و تەنیا هـەر ئەوەش گرنگە. بەڵام تێگەیشـتنی ئەوەی کـە تەبلیـغـات دەڵێ چی، هـەرچی دەیەوێ بیـڵێ لە پلەی دووهەم دایە. دۆن پاولۆ لە بەر خۆ بیـر دەکـاتەوە:« کە وابوو ڕەتکردنەوەی ئەوەش کە تەبلیغات دەیڵێ، بێفایدەیە و باسکردی بێ سودە.» دۆن پـاولۆ هەست دەکات کە هیـلاکـە. ئاخـر تەک و تەنیـا چبکات ؟ ئێـسـتـا کە باس و بەڵگە هێنانەوە لە گـەڵ کـۆمـەڵی فـەقـیـر و دامـاوان دەرەتانی نیـە، چبکات ؟ چونکە بـەڵگە هێنـانەوە مەسـەلەیەکی لاوەکییـە، ئەسڵ ئـەوەیە کە دەبێ بژی- چاک یا خـەراب گرنـگ نیە، ئەسڵ ژیانە - کە وابوو دەبێ هەنگاو باوێژی. بەلام لە کوێ و چۆن و لە گەڵ کێ؟

دۆن پاولۆ ئەم مـاوەیە حـیـسـاب دەکـا کـە بۆ گـەیشـتـنی بیـانکینا بە « روکـا» و دۆزینەوەی موریکا و قانع کردنی و گەڕانەوە بۆ فوسـاپێویستـە. ئەگەر ئەم وەلامـە قانعکەر بێ، خۆشی خێرا دەچێتە ڕوکا و لە ڕێگادا لیباسی کـەشیشی دادەکەنێ و لە بارەی کـارێکی کە دەتوانێ بگرێ لە گەڵ لاو قـسـان دەکات. لەم بەینە دا ڕەنگە پۆمپیۆ ش لە ڕۆم گەڕا بێتەوە و لە گەڵ کالەوەڕێن قسـەی کرد بێ. ڕەنگە ئەو دەم بیر لەوە بکـەنەوە کە ئالبێرتـۆش لە پیتراسکا ببـینن. بەم چەشنە ئێـسـتـا هـەموو هومـێدی دۆن پاولۆ بـەم لاوانەیە و لە بەر خـۆیەوە بیر دەکـاتەوە: « کـۆمـەڵ تەنیـا بە کردەوەی واقعی وەخـەبەر دێت.»

ژنی جادو گەر هەر وا لە سـەر گاریەی ماگاشا دوو پاتی دەکاتەوە:« لە پێشدا شـەڕ دەبێت و پاشان تاعون دێت »

دۆن پاولۆ دەڵێ: :

شــەڕ خـۆی مـیللەت بە قـوڕ دا دەبات و ئەگـەر شـەڕ بەس نەبوو ئەو دەم تاعـون یارمەتی دەکات.

لە نەکاو دەنگی مـۆتۆڕان و هـەرا و هوریای خـەڵک دەبرێ. ترومـبیل و مـۆتۆڕی کـار بەدەســتـان بە نێـو حـەشـیـمـەت دا ڕێگای خـۆیان دەکـەنەوە وبۆ ناوەندی ناوچە دەگـەڕێنەوە. دۆن پاولۆ کاتێ دەبینێ کە« کنچتینۆ ڕاگۆ»ش لە گەڵ ئەوان ڕۆیشت، لە پەناگـای خۆ دێتـە دەر و دێتە کـوچە. زابالیونـە بە ئامێـرێکی ئاواڵە پێشـوازی لێدەکا و بە فیز و لوت بەرزی دەپرسێ:

- کیـژەکانی منت چاو پێکەوت کـە تیـتـۆڵیـان بڵاو دەکـردنەوە؟ ئەوینی نیـشـتـمـان ئەوانی تەواو گەرمداهێنا بوو.
دۆن پاولۆ دەڵێ :« وەک مەلائیکە جوان ببوون.»
ئەم تەعاروفە لە خۆشیان دەبێتە هۆی گەشانەوەی ڕوخساری زابالیونە و دۆن پاولۆ لە قسەکانی زیاد دەکا و دەڵێ: « من لە بارەی تۆوە لە گەڵ ئوسقوف قسەم کرد و هیوادارم قسـەکانی بۆ حاڵی تۆ فـایدەیان هـەبێ.» زابالیـونە لە خـۆشـیـان دەیەوێ کەشیش ماچ بکات و دەڵێ :
- دۆسـتی زۆر خۆشـە ویست، من پێشـتـر لە بـارەی تۆوە هێندێ شتم بیستبوو کە تەنیا دەکرێ لە بارەی پیرۆزەکـان ببیسرێ، بەڵام نـەمـدەزانی کە لە کلیـسـاش دا پیرۆزی ئاوا میهرەبان و خێر هەنە.!
وەکیل باسک دەخاتە باسکی کەشـیش و بە و کـۆڵانانە دا کە بـە ئاڵای سێ ڕەنگ ڕازاونەوە، دەیبـاتەوە مـاڵی خـۆی. ژنی زابالیـونە بە ڕەنگی پەڕیو ولەشـی لەرزۆک دەرگایان لێدەکاتەوە. زابالیونە دەڵێ:
- دەستی پایە بەرز ڕاموسە و تەنیا بە جێمان بێڵە.
ژن دەچەمـێتـەوە ، دەسـتی کـەشـیش ڕادەمـوسێ، بەڵام پـێش ئەوەی دەر کـەوێ بە مێردەکەی دەڵێ:
- منداڵەکان هێشتا نە هاتوونەوە.
کابرا گرژ دەبێ و دەڵێ:« خێرا قەرەواشە کە بنێرە بە دوایاندا .»
زابالیونە لە ژووری نانخواردن شەراب بۆ کەشیش تێدەکا و دەپرسێ::
- بۆ چی خودا ویسـتوویەتی من سزا بدات؟ بۆچی لە جیاتی کوڕ کیژی داوە بەمن؟ ئەگەر کوڕم هەبان ئێستا لە ئەفریقا دەبوون. چونکە کوڕم نیە چەند کەسم لە و کـەسـانە بە سـەر بـاز ناسـاندوە کە لە دادگـا دا بووم بە پارێزەریان کـە زۆر بەیان قبوڵ ناکرێن. بەڵام هەر چۆنێک بێ خۆم نیشان داوە.
کەشیش چاوێکی لێدەکات، دەڵێی دەیەوێ پێی بڵێ کە لە نێو دۆستان باشترە لە جیاتی وشەگەلی ڕەسمی بە زمـانی خۆمـانە قسـان بکەین. هەر وەها لە زاری دەر دەپەڕێ کە:
- ئەم شەڕە دەبێتە بەڵا و موسیبەت.
وەکیل لە وەڵام دا دەڵێ: « لە خەراپترین گریمانە دا، دیسان لە وانەیە لەم شـەڕە دا ئێمە شتێکمان پێدەبڕێ. وڵاتی ئێمـە دوای هەر شـەڕێک و بە تایبەت دوای هەر

تێشکانێک گەورە تر بوە.

تێشکانەکانی کۆستوتزا١ و نۆ وارە٢ و لیسا٣ و ئەدوا٤ و کاپورتوە کە ئیتالیای گەورەی پێکهێناوە. ئەگەر ئەمجارەش شەڕ بدۆڕێنین بێگومان بۆ دڵدانەوەی ئێمە شتێکمان دەدەنێ، بەڵام ئەگەر سەر کەوین.. خودا ئێمە لە شەڕی ئینگلستان بپارێزێ.بەینی خۆمان بێ، من ئەم قسانە تایبەتی بۆ تۆ دەڵێم.

کەشیش دەڵێ:« پاش بڵاو بوونەوەی وتار لە ڕادیۆ من هەستم کرد کە ئێوە ویستت وتار بدەی.»

وەکیل لە وەڵام دا دەڵێ:

- بەڵێ، لە بەر نامە دا هەبوو کە من وتار بدەم بەڵام ورووژان و گەرمی حەشیمەت ڕێگای نەدا. لە لایەکی تر من مەعمور بووم وتار دەری ڕەسمی بە حەشیمەت بناسێنم و ئەو کەسێک بوو بە ناوی کنچتینوراکو کە دەبوایە« زیندوو کردنەوەی سوننەتی کەونارای ڕۆم لە نێو کۆمەلانی وەرزێری» قسان بکات ئەو وتاری خۆی دا بەمن بیخوێنمەوە و بە هەق ڕێنوسی ئەو ڕێنوسی قوتابی پۆلی نێوەنجی بوو.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « کە وابوو حەشیمەت شتێکی گرنگی لە دەست نەداوە. ئاخر ئەگەر« وەرزێرەکان» ڕازی بن کە ئەوان بۆ شەڕ ئامادە بکەن ئەم کارە بە هیچ جۆر بە مانای ڕێز گرتن لە سوننەتەکانی کەونارایی ڕۆم نیە.

قینی ئەوەی کە وەک وتە وێژی ڕەسمی نە ناسێنراوە، هێشتا لە ناخی وەکیلدا هەر ماوە. بەوە دڵخۆشە کە کەسێکی دۆزیوەتەوە گرێی دڵی لا بکاتەوە. لە سەر قسەکانی دەڕوا و دەڵێ:

---

١ـ کوستوتزا شارۆچکەیەکە لە ئیتالیا لە نیزیکی «ورونە» کە ئوتریشیەکان لە وێ پیەمونیەکان لە ١٨٤٨ و ئیتالیاکاتیان لە ١٨٦٦ تێک شکاند.

٢ ـ نووارە یەکێ لە شارەکانی کشت و کاڵی و پیشە سازی ئیتالیایە کە لەوێ شارل ئالبێرت پاشای ساردنی لە ١٨٤٨ لە بەر ئەتریشیەکان شکا.

٣ ـ لیسا دورگەیەکە لە ڕۆخەکانی یوگوسلاویا کە ئیمرۆ بە « ویس» ناسراوە و لە وێ ساڵی ١٨٦٦ ئیتالیاییەکان لە شەڕی دەریایی لە بەر ئوتریشیان شکان.

٤– ئەدۆوا پێتەختی قەدیمی حەبەشە کە ئیتالییەکان لە ١٨٩٦ لە وێ لە حەبەشیەکان شکان و پاشان لە ١٩٣٥ لەوێ تۆڵەیان کردەوە.

٥ ـ کۆپۆرێتۆ گوندێکە لە یوگوسلاوی کە ئیتالیاییەکان لە ئوکتوبر ١٩١٧ لە وێ لە بەرانبەر ئوتریشی و ئەڵمانیەکان شکان.

– بەیـتـی خـۆمـان بـێ دۆسـتـانـە و بە زمـانـی غـەیرە ڕەسـمـی عـەرزت دەکـەم کـە ئەم سوننەتەی کەونارای ڕۆم گاڵتە جاڕی ڕاستییە. لە ناوچەکانی ئێمە ولە تەواوی خوارووی ئیتالیا کە دەبوایە ئەم سوننەتە کەونارایەی ڕۆم توانا و ئیعتیبارێکی زیاتری هەبێ، شوێنە واریشی نە ماوە. تاقە سوننەتی کەونارای مە، یادگارێکە لە «بۆڕ بۆڕەکان» و سپانیۆلیەکان لە سەر زەمینەی ئەفسانەکانی مەسیحیەت. مرۆڤ کاتێ لە گەڵ پیرە مێردەکانی ناوچەی ئێمە قسان دەکات، جگە لە باسی کارەسات و موسیبەتی وەک قاتی و تاعون و کوشتاری خەڵک و یا باسی موجیزەی پیرۆزەکان، شتێکی تر نا بیسێ. بەڵام لە سەر دەمی دەسەڵاتی ڕۆمیش دا لێرە شوێنەواری شارستانەتی ڕۆم نە بوە. مەزهەب و زمان و ئەلف و بێ و داب و نەریتی و ڕەگەزی نەتەوە جیاوازەکان کە لەم ناوچەیە دا نیشتە جێ بوون. لە گەڵ دانیشتوانی لاسیوم ١ جیاوازی تەواوی هەبوە. تاقە ڕووداوێکی ئەو سەر دەمە کە شوێنەواری لە سەر داب و نەریتی خەڵک بە جێ هێشتوە، ئەم شەڕە کە لە نێوان دانیشتوانی جۆر بە جۆری ئیتالیا لە ژێر ڕێبەرایەتی قەومی مارس ٢ لە گەڵ ڕۆم ساز بوە و ئیمڕۆ هێشتا بیرەوەری ئەو شەڕە گەلێک بەد بەختی و مە ترسیدار وە بیر دەخاتەوە: لە ژێر تەئسیری سەر کەوتنی ڕۆم لەو شەڕە دا، ژنەکان مشکیان بوو. پەیکەرەکان خوێنیان لە بەر چوو. داری میوە بەریان نەهێنا. دیارە کەس ناتوانێ بێژێ ئەوانە بیرەوەری خۆشن.

زابالیونە جلەوی قسەکانی داوە بە دەستی بیرەوەری وتارە سۆسیالیستییەکانی پێشووی و دەترسێ لە سنووری خۆی تێپەڕێ. بەڵام دۆن پاولۆ دڵخۆشی دەداتەوە و دەڵێ:

– ئەوە کە من زاتمکردلە بارەی تۆوە لە گەڵ قەشەی پایە بەرز بدوێم و تۆی پێ بسپێرم تەنیا لە بەر ئەوەیە کە من شێوەی ڕاست و دوور لە دەمار گرژی لە قسەکانت دا پەسند دەکەم. ئێستا تۆ پێت وانیە کە لە نێو وەرزێراندا کەسانی دژی شەڕ هەبن.؟ زابالیونە دەڵێ:

---

١ ـ لاسیوم ناوچەیەکی ئیتالیایە کە شاری ڕۆم لە وێ هەڵکەوتوە.

٢٧ مارسی دانیشتوانی قەدیمی ناوچەی « سامنیوم» بوون لە ڕۆژ هەڵاتی لاسیوم کە دوو سەدە پێش زایین شەڕی دوور و درێژیان لە گەڵ ڕۆم کردوە.

- بێـچـارە « وەرزێران »! نـانیـان نـیـە بخـۆن ئەو دەم تۆ چاوەڕوانـی کـە خـەریکی سیاسەت بن؟ سیاسەت کەشخەیەکە تایبەتی ئەو کەسانە کە دەستیان بە زاریان ڕادەگات. لە گەڵ ئەوەش لە نێو لاوەکاندا هەن کە جێگای بڕوا نین..
شتێک زیاتر لە هەر مەسەلەیەک دڵی زابالیونەی بە خۆوە خەریک کردوە. ئەویش ئەوە کەلانتەری ناوچە بۆ ژێر ئالا بانگ کراوە و ئێستا جێگای خاڵییە. بۆیە دەڵێ :
- کـەسـێک دەبێ لە جێـی وی بێت کـە بزانێ قـسـان بکـە و ببـێـتـە هۆی شـانـازی ویلایەت. نازانم تێمگەیشتی یان نا؟
دۆن پاولۆ فیکر لە موریکا و پۆمپیۆ و گالەوەڕێن دەکاتەوە و لە فیکری ئەوەش دایە کـە ڕەنگە بیـانکینا لە ڕوکـادی مـارسی گـەڕا بێـتـەوە. بۆیە بە پەلە ئیـجـازەی مەرەخەستی لە وەکیل دەخوازێ و ڕاست بۆ ڤیلای چوار فەسڵ دەچێ.
پاش تێـپـەر بوون لە دیواری باخـی دەبینێ کـە وا کـیـژێک لە پشـتی قـەفـەسـەی تاوسـەکان لە سـەر کا نـوسـتـوە. لە سـەر پەنجـان بە سـەبر لێی نـیـزیک دەبێتـەوە دەزانێ ئەوە بیانکینا نیە بەڵکوو یەک لە کیژەکانی زابالیونە یە لە گەڵ سەر بازێک هاتۆتە وێندەرێ. دۆن پاولۆ بە تـاقـیـکردنەوە هەست دەکـات کـە لـە دەور و بەری عیـبـادەتگـای زوهرە دوو کـیـژی دیکەی زابالیـونەش لە گـەڵ دوو سـەر بازی دیکە دەبینێ و بۆ ئەوەی تێبگات کـە ئەم دوو کـیـژەش بـیـانکـینـا نـین بەڵکوو دوو کـیـژەی زابالیونەن لە گەڵ دوو سـەر بازی دیکە، پێویست ناکا لێیان وەنیزۆک کـەوێ. بەڵام ڤیلای چوار فەسڵ بە تاڵە. بیانکینا و گالەوەڕێن دیار نین. لەو حەساره گەورەیە دا پەرەسلێرکە بە ڕاست و چەپدا دەفڕن و ئەوانیش خۆ ئامادە دەکەن بچنە ئەفریقا و زستان لە وێ تێپەڕێنن.
دۆن پاولۆ ناهومێد و دڵسارد بۆ موسـافـیـر خانەی تەرنسـل دەگەڕێتـەوە. زابالیـونە گوتوویەتـی کـە « لاوان جـێگای بڕوا نـین» هـەر ئەوەخـۆی ئەو هـیـوادار دەکـا، لە گـەڵ ئەوەش نابێ زور کات بە فیرۆ بدا. لە کـۆڵانەکـانی فوسـا بە تایبـەت لە دەور و بەری ڕەستورانەکان هێشتیا حەشیمەت زۆرە. « برە نیچە»لە پێش موسـافیرخانەی خۆی بەرازێکی برژاوی تەندوری بۆ فرۆشتن داناوە. بەرازی بە شـیـشـەوە کردوە، لە سـەر مێز درێژ کراوە. لە تەندور دا کردوویەتە کەباب و خوێ و ئیسیوت و جاترە و گیای تایبـەتی پێـوەر کراوە. حـەشـیـمـەت لە دەورەی مـێز کۆ بوونەوە، بەڵام کـەمن ئەوانەی کە گـۆشـتی کـەباب بـکـڕن، جگە لە نـیـزامـیـەکان کـە تازە جـیـرەی سـەر بازیان وەر گرتـوە. ئەم وەرزێڕانەی لیباسی سەر بازیان لە بەر دانیـە بە حەسرەتەوە تەماشای

دەکـەن و ددانی تیـژیان کـە وەک ددانی گـورگی برسی دەچێ، نیـشـانی دەدەن. دەرمجە دارێکی ئەرتەشی پلە گۆشتێکی برژاو ی لە سەر نانێکی سپی داناوە و بە چەقۆیەکی چەند دم خەریکی برینی گۆشتە. لە پێش کورسی شار داری دوکانێکی بچـوکی دار کـراوەتەوە و لە نێـو ویدا بە دوور بینی زەرە دار، دیمـەنی رەنگی حەبەشە نیشان دەدەن. کەسێکی بخوازێ بچێ دەبێ دوو شایی هەقی چوونە ژورێ بدات. دۆن پاولۆ دوو شـایی خۆی دەدا و وەک خـەڵکی دیکە لە سـەفدا ڕادەوەستێ. بە پێش چاوی خـەڵکدا کـونێکی زەرە بین تێکراو ڕادەبرێ و هەمـوو جـارێ چاو بە کونەکـەوە دەنووسـێنێ دەورەیەک عـەکسـی ژنانی حـەبەشـەیی بە لاقی توکناوی و مەمکی کەیف بزوێن دەبینێ. ئاخری هەموان عەکسی شاژنی حەبەشەیە.
تەماشـای ئەو دیمەنانە لە سـەر یەک لایەنی جوانی و نیشـتمـان پەروەرانەیان هەیە پتر لەوە درێژەی دەبێ کە دۆن پاولۆی گرفتـار لە سـەفدا خـوازیاریەتی. بە تایبـەت ئەوانەی لە پێشەوەن لە حاست هەر عەکسێکدا ماوەیەکی زۆر ڕادەوەستن و تەماشا دەکەن. تکا لە هاوڕێکانی دەکات کە نەختێ خۆشتر تێپەڕن. بەڵام ئەم خـواهیشـتە دەبێـتـە هۆی ئیـراد و لاتاوی خـەڵک. لە ئاخـریدا کـاتێ لە تەمـاشـای ئەم کـۆمـەڵە هونەرییە تەواو دەبێ، تاقەت ناهێنێ بێ ئامانج هیلاک و تورە دەکەوێتە ڕێ و کەمی دەمێنێ توشی کـارێکی ئەحـمـەقانە بێت. بۆ نموونە لـە نێوە ڕاسـتی مـەیدان هاوار بکات: « نابوت بێ شـەڕ »
دووبارە بۆ ڤیـلای چوار فەسڵ دەگەڕێتەوە. هەمـوو جارێ لە نێو گیا و لـە سـەر لۆدە کایەکان لیباسی کیژەکانی زابالیونە دەبینێ و بەڵام بیانکینا و گالەوەڕێن دیار نین.
ئێستا بۆتە شـەو. سـەر گەورەکـانی ناوچە بۆ بەشداری لە میواندارییەکی ڕەسـمی لە میوانخـانەی «برەنیچە» دا کۆ دەبنەوە. بەڵام وەرزێڕانی فوسـایی و پیشە سـاز و وردە بۆرژوازی بانگ نەکراون. ئەوانەی لە دێهاتیشـەوە درنگ هاتوون لە مەیخـانەی « خـۆش ئەخـلاق» لە نیـزیک سـیـلاو گـر کـۆبوونەوە. خـاوەنی مـەیخـانـە بۆ ئەوەی دەزگـای خۆی برەنگێنێ، چەند نیو تەختی لە دەرەوە ڕیز کردوون و شـەڕابی ناوچە بە نرخی هـەرزانتر دەفرۆشێ. کوپە شەرابێکیان لە بن دارە گوێزێکی پیر ولە قەراخ جۆگـەلە داناوە. شەڕابفرۆش نیو بوتڵەکان لەو کوپەیە پڕ دەکات و خزمەتکاری ژن بۆ شەڕابخۆرانیان دەبەن.
دۆن پاولۆ لە نێو شەڕابخۆران دەستەیەکی خـەڵکی پیتراسکای دیوەتەوە و لە گەڵ« پاسکاندرە» و ماگـاشـیـا و شـاتاپ و هیـتـر کە زۆربەیان سـەر خـۆشن دەسـتی بە

قسان کردوه. « بادیا » له پشت پنجه گوێنیەک له کاتێکا مێش دەوریان داوه له پەنا گاریەکه خەوی لێکەوتوه. دۆن پاولۆ دەیەوێ هەر چۆنێک بێ تێبگا که ئەم وەرزێرانه له بارەی شەڕەوه چۆن بیر دەکەنەوه. بەڵام جگه له قسەی هیچ و پوچ چیتر نابیسێ. « پاسکاندره » دەڵێ : دەگێرێ بەو زوانه دوو باره دەر بەدەری دەست پێبکرێ» و گرنگیش هەر ئەومیه.» کامپۆ باسۆ له وتەکەی زیاد دەکا و بێگومان بەو زوانه ئەسپ و ئێسترەکان به سۆخره دەگرن.آ بەڵام ئەو کەسەی له کەرێک زیاتری نیه نا بێ نیگەران بێت » شاتاپ دەیەوێ بزانێ که چەکی» تیشکی مەرگ» ئەو بەرهەمەش له بەین دەبا که هێشتا شین نەبوه یان نا. ئەوانیتر گوێ دەدەنێ و دەخۆنەوه وبێدەنگ و جوڵه و ماتن. ئەم میللەته که وا فەقیر و بەد بەخت و دەشتەکییه و چەند سەدەیه جگه له« ئێل کرین مشینۆ»! کتێبێکی دیکەیان نەخوێندۆتەوه و هەموو حیکمەتی ویش چەند مەسەله و مەتەڵۆکه که پشتاو پشتهاتۆته خوار ئێستا به واتای واقعی وشه چۆته نێو تەبلیغات و نوقم بوه.

ماگاشیا به کەشیش دەڵێ:

– ئاغای کەشیش، تۆباشتر بوو شەڕابێکت پێدا کرد بایه ونەو شتانەت له ئێمه نه پرسیبا که سەری لێ دەر ناکەین. له پیتراسکا گاڵتەیەک یا نوکتەیەک ساڵانی درێژ دەمێنێتەوه و له باوکەوه دەگاته کوڕ و هەمیشەش به یەک جۆر دوو پات دەبێتەوه. بەڵام لێره مرۆڤ له ڕۆژێکدا ئەوەنده شت دەبیسێ که سەری سوڕ دەمێنێ. . .

دۆن پاولۆ له کوێره ڕێی قەراخ سێلاو کر چاوی به زابالیونه دەکەوێ. وەکیل کەشیش بۆیەتایەک دەباو به ڕەنگیپەڕیو و دەنگێکی وەک ناڵین لێی دەپرسێ:

– تۆ کیژەکانی منت نه دیوه ؟

هێندێ له شەڕابخۆران که وەکیلیان ناسیوەتەوه، دەورەی دەدەن و له کاتێکا سەر خۆش و به لادا دێن، شەڕابی بۆ دێنن و هاوار دەکەن: « وتار بده ئاغا وتار، ئێمه وتارمان گەرەکه »

حەشیمەت هەر وەک له وانه بوو به کوێرەی مەیل و ویستی موسیقا زەن و ئاواز و هەوا، داوای سەمای «فۆکستروت» بکا، ئێستا داوای وتار دەکات. له زابالیونه حاشا و له حەشیمەت پێداگرتن، ئاخرەکەی له بەر ئەوەی له نێو ئەوانەی دەوریان داوه وەکیل چەند کەس له کار بەدەستانی دەوڵەتی دەبینێ و دەیانناسێ، ناچار مل ڕادەکێشێ. کیژەکانی له بیر دەباتەوه و وەبیری دێتەوه که پۆستی کەلانتەری ناوچه بەر پرسی نیه و چۆله. چەند کەس له لاوان به زەحمەت بۆ لای مێزی پەنا

کوپەی شـەراب پاڵی پێـوە دەنێن. زابالیونـە دەسـتێک بە سـمێڵـی دادێنێ وبۆ لای سەرەوە بایاندەدا و قژەکانی ڕێکو پێک دەکا. ڕوخسـاری گۆڕانێکی بـە سـەر دادێت و چاوەکانی دەتروسکێن، دەسـتـەکانی بەرەو عاسمـان بەرز دەکاتەوە و پاشـان بە دەنگی بەرز و نەوی ئاوا دەست پێدەکات :

- ها ئەی ڕۆڵەی ڕۆمی ئەبەدی، تۆ ئەی میللەتی من !

بەمجۆرە مـوسـیـقـا دەست پێدەکا، مـوسـیـقـایەکـی خۆش. وتار دەر لە گەڵ ئەم چارە ڕەشانەی سـەر خۆش لە نەشـەی شـەڕاب جـۆرێ قسـان دەکات وەک بڵـێی لە گەڵ ئەنجـومـەنی پاشـا و ئیمپراتورانی دوور خـراوە بەرەو ڕووە. هەڵمی سـەر خـۆشی بیرەوەری شـەوکەت و جـەلالی کەونارایی لە خۆدا دەتوێنێتـەوە و درێژە بە قسـەکانی دەدا :

- بە من بڵـێن کێ شـارسـتـانیـەت و کلتـوری بۆ دەریای مـەدیتـەرانـە و بۆ تەواوی ئەفریقا کە لە کۆنەوە ناسیبووی، بە دیاری بردوە ؟

دەنگەکان وەڵام دەدە نەوە : « ئێمە »

- بەڵام حەیف کە بەرهەمی ئەو کارەی ئێمە، خـەڵکی دیکە بردوویەتی. دوو بارە تکا دەکـەم پێم بڵـێن کێ شـارسـتـانیـەت و کلتـوری بۆ هەمـوو ئوروپا و بۆ ڕۆخـەکـانی تەماوی ئینگلستـان بردوە و دەیان شاری دروست کردوە. شوێنێ کە ئینسانەکـانی سەحرایی لە گەڵ بەراز و گا کێوی وەک چوار پێیان لە وێدا دەلەوەڕان.

دەنگەکان وەڵام دەدەنەوە « ئێمە !»

- بەڵام ئیدیکە چێژیان لێ وەر گرتوە. دیسـان تکا دەکـەم پێم بڵـێن کـێ ئەمریکای دۆزیوەتەوە ؟

ئەمجارە تێکڕا ڕادەبن و بە یەک دەنگ وەڵام دەدەنەوە: « ئێمە ! ئێمە ! ئێمە !»

- بەڵام حـەیف و داخ کە قـازانجی بۆ خـەڵکی دیکە بوە. دیسـان تکا دەکەم پێم بێژن کێ کارەبا و تێلگراف و بێسیم و زۆر شتی تری داهێنا کە بناخەی ژیانی تازەن.

دەنگەکان وەڵام دەدەنەوە : « ئێمە !»

- بەڵام فـایـدەی بۆ خـەڵکی دیکە بـوە. ئاخـرەکـەشی پێم بێژن کێ بۆ گـشت وڵاتانی دنیا ڕۆیشتوە تا کانگاکەل بدۆزێتەو، پردان دروست بکا، زەلکاوان وشک بکات ؟

ئەمجارەش هەموو ڕادەبن و بە یەکدەنگ هـاوار دەکەن : « ئێمە ! ئێمە ! ئێمە !»

- بەڵێ من بە جـارێک ڕیشـەی هـەژاری و چارە ڕەشی ئێوەم نیشـان دا. بەڵام پاش چەند سـەدە زوڵم و دامـاوی ئێسـتـا کەڕەمی خـوا پیـاوێکی بۆ وڵاتی ئێمە ناردوە کە

پێی سپێراوە ئەوەی هی ئێمە بوە و لێیان دزیوین بۆمان بستێنێتەوە.
چەند دەنگێک هاوار دەکەن:
- بۆ پێشەوە بۆ لەندەن! بۆ لەندەن !
دەنگی دیکە هاوار دەکەن : « بۆ نیویورک ! بۆ ئەمریکا ! بەرەو کالیفۆرنیا !
پیرە مێردێک هاوار دەکات :« بەرەو سانوپۆلۆ، بەرەو تونیدا پۆلیستا ، بەرەو ئاوە نیدا ئاندیکا« شاری برازیل وئارژانتین »
لە پەنا دۆن پاولۆ شـاتـاپ گـەرم دادێ و هـەر چەندە لە بەر سـەر خـۆشی خـۆی پێراناگیرێ، بەڵام پێدادەگرێ کە بچێتە سەر نیو تەخت و پاشان دەنگی خەڵک دەدا ؛ بێدەنگ بن. دوایە دەنەرێنێ و دەڵێ:
- بەرەو نیویورک بۆ شەقامی ٤٢ بۆ شەقامی ٤٢
دەورو بەری دەپرسن : « بۆ لە وێ چباسە ؟
شاتاپ هاوار دەکا « خۆتان دەزانن لە وێ چباسە ! بەرەو شەقامی ٤٢
دوو بارە بێدەنگی بەر قەرار دەبێ و زابالیونە تارمایی ڕازداری « تیشکی مەرگ» دەکات کە داهێنانی هەرە تازەی بڵیمەتانەی ئیتالیایە و چەکێکی لێبڕاوە بۆ زیندوو کردنەوەی گەورەیی ئیمپراتوری ڕۆم و دەڵێ :
- ئەم تیشکە ئامرازی مۆتۆڕ ڕادەگرێ. قەتارەکان لە وشکی و پاپۆڕەکان لە دەریا دا ڕادەگرێ، پێوەندی لە گەڵ ئەم تیشکە دڵی مرۆڤ لە لێدان دەخات. تەگەری دوو چەرخە دەتەقێنێ، مەمکی ژنان وشک دەکا، سەعاتان لە کار دەخات. پەڵەورەکان لە حەوا بەر دەبنەوە. زەنگوڵەی کلیساکان دەکەونە خوارەوە. سەر بازانی دوژمن دەبنە پەیکەرێک لە خوێ. ئیتر هیچ هێزێک نیە ئێمە لە پێشکەوتن بگێڕێتەوە.
ئەو پیاوە خوداییەش ئیمڕۆ ئەوەی بە دنیا ڕاگەیاندوە. بەڵێ کاتی پاک کردنی حیسابان هاتوە.
ئێستا حەشیمەت هاوار دەکا:« بەرەو نیو یورک شەقامی ٤٢ !»
حەشیمەت بۆ دەورەی مێزی زابالیونە هێرش دەبەن تا وای لێبکەن قسەکانی درێژە پێبدات. بەڵام ئەو لەو کاتە دا لە دوورەوە چاوی بە کیژەکانی دەکەوێ کە لە کوێرە ڕێی قەراخ سێڵاو گر باسکیان خستۆتە باسکی سەر بازان و دەڕۆن
وەکیل بە گورجی لە سەر مێز دێتە خوار و بە مست وپاڵپەستە بە نێو حەشیمەت دا ڕێگا دەکاتەوە و بە دوای کیژەکانی دەکەوێ.
لەم کاتە دا موسیقا لە پڕ بێدەنگ دەبێ و هەر کەسە بە کەیفی خۆی شتەکە لێک

دەداتەوە.
شاتاپ بە دەور و بەری خۆی دەڵێ :
- لە نیو یورک لە شەقامی « مالیری» کابرایەکی ڕەزیل هەیە بە ناوی« مستەر چار لز لیتل بل- یخی- زوخالی» لەو بڕوایە دام هەوەڵین پەند بەو بدرێ. دیارە هەموو دەتوانن کەسێکی دیکەش پێشنیار بکەن. دەبێ ئەو کابرایە بە دیل بگیرێ و پاشان مەجبور بکرێ بە پێش تەواوی سەر بازانی هەنگێکی تەواو دا بڕوا و هەر سەر بازێکیش کە پۆتینی بزمار داری دەپێدا بێ، شەقێکی لێبدا! ئەگەر زمانێکی بۆ سکاڵا گەڕا، پێی بگوترێ: « شات ئاپ» دیارە خۆی دەزانێ شاتاپ یانی چی !
کامپۆ باسۆ دەیکێشێتە کەنارێک و لێی دەپرسێ :
- لە شەقامی ٤٢ چباسە ؟
شاتاپ دەڵێ :« ئەوێ شوێنی ڕابواردنە. دەوڵەمەندەکان بۆ ڕابواردن دەچنە وێ. لە وێ ژنان دەبینی کە لە بەر بۆنی عەتر مرۆڤ سەر خۆش دەبێ .» ئەو دەم خۆشی چاو دەنوقێنێ و بۆن دەکا، هەر دەڵێی لە دوورەوە بۆنی وانی کردوە. بەڵام لە پڕ بێدەنگ دەبێ، چونکە کوڕەکەی دەگاتە وێندەرێ. کوڕەکەی لیباسی سەر بازی لە بەر دایە، لیباسێکە لە بەریدا دەگری :
قۆڵەکانی تا مەچەک هەڵگەڕاونەوە، دەلینگی شاڵواری بە زەحمەت دەگاتە بەر ئەژنوی. باوکی پێی دەڵێ شەڕاب بخواتەوە. کوڕ پێیدادەکا و دەخواتەوە.
باوکی دەڵێ:« دیسان بخۆوە. خۆش بە حاڵت کە گەنجی.» پاشان پێی دەڵێ:
- کوڕم! ئێستا چت پێدەڵێم لە بیری مەکە. ئەگەر دەوڵەت بڕیاری دا سەر باز بە « تیشکی مەرگ» بۆ نیو یورک بنێرێ، لە ڕیزی سەر بازان وەرە دەر و داو تەڵەب بە و بە دەوڵەت بڵێ: کە باوکت لەوێ بوە. تۆ حیسابی زۆرت لەوێ هەنە و دەبێ پاکیان بکەی.. کە وابوو کاتێکی لەوێ لە مەیدانی تۆپخانە دابەزی بە دەستی ڕاستە دا با بدەوە و بپرسە شەقامی « مالری» لە کوێیە.؟ لە وێ دوکانی کابرایەک بدۆزەوە بە ناوی « مستر ساموئیل سمسار» ئەو جولەکەیەکی لهستانی یە کە بە زمانی « ناڵولی» قسە دەکات. پیرە مێردێکی چکۆڵەیە، سەری لە هەموو شت دەر دەچێ. دەزانێ لە کوێ دەتوانی باش بخۆی و بخۆیەوە و پولدارەکان لە کوێن. شار گەورەیە ئەگەر ناتەوێ بزر بی هەوڵ بدە ئەو بدۆزیەوە.
کوڕ قاقا پێدەکەنێ و بە هەقناسی تەماشای باوکی دەکا و بە سەر بەڵێی بۆ دەڵێ.
باب دوو بارە دەڵێ :

– بخـۆوه و گویّ بگره. من ئیـتـر پیـر بووم و شـتـی زۆرم گـەرەک نیـه. بەڵام ئەگـەر دەتەویّ دڵم خـۆش کـەی، سیّ چوار جـوت کـەوشی « گـاڵ» ی پەنجـه پانم به ددیاری بۆبێنه. سامـۆئیل دەزانیّ دەبیّ لە کوێیان بکڕیّ. لە بیرت بیّ کەوشی پەنجه باریکم بۆ نەهێنی، چونکه قاچم مێخەکەی هەیە.

له پشت مێزی جیرانیان بەرد تاشێکی خـەڵکی « برگام» دانیشـتوه که هێشتـا لیباسی وڵاتی خۆی ، واتـه کڵاوی کەوڵی شـەو، کۆتێکی مـەخمـەری له بەر دایە. ئەو ساڵی بومه لەرزه بۆ کاری ساز کردنەوەی خانو بەره هاتۆته « مارسیکا» و له فوسا ژنی هێناوه و ئیتر نه گەڕاوەتەوه.

ئێستا قسه له کارێکی گەورەی ئاوەدانی دەکات که له سویس ئیتالیەکان به ڕێوەی دەبەن. دەڵێ:

– من هـەموو تەمەنی لاویم له چارده ساڵی به دواوه له گەڵ باوکم لەو وڵاته ژیاوم. له هەموو سویس تونێلێک نیه که به دەستی کرێکارانی ئیتالیایی لێ نەدرا بێت. باوکم کـاتـی لێـدانـی تونێلی«لوتشـــبـرگ» له گـەڵ بیـست و چوار کـرێکاری دیکه له ژێر ڕوخـانـدا مـرد. پاش وی من بۆ لێـدانی تونێلەکـانی« تریمبـاخ» و «کـرانشـه» و « ئالورب» کارم کـردوه. له « تریمباخ» خـانوی کـرێکارانی ئیـتـالیـایی له دار دروست کراوه و گوندێکی تازەی لیّ ساز بوه که ئێمه ناومان نابوو« ترابولسی، تریپولی»

کامیۆ باسۆ دەپرسیّ: « بۆ چی ترابلس ؟ خۆ ئێوه عەرەب نه بوون ؟»

« برگامی» دەڵیّ :

– هەر وا ئیـتـر ! ئـەم خـەڵکەی سـویس ئینسـانی زۆر باشـن و پارەی چاک دەدەن. بەڵام تەواوی ئەم کارانەی خانو بەره ئەنجامی بۆ وان بوو نەک بۆ ئێمه. له گەڵکوو کـارەکــه تەواو دەبوو، خـــێـرا دەبوایه بڕۆین. زۆر جــار هەڵدەکـەوت کــه هـەبوون کەسـانێک کـاتی ڕۆیشتن باسکی له دەست دابوو. بەد بەختی وەها لەو فەقیرانه دەگەڕا، که مێش به دوای کەری پیردا . له « کریمسل» له نیزیک« بێرب» لەو کاته دا کـه خـەریکی هـەڵکەندنی بناخـەی سـاختـومانێکی کارخـانەی کارەبا بوون، له پڕ بەردێک له بەر تەقینی مین بەریه حەوا و به سەر فەقیرێکی هاو وڵاتی ئێمه دا کەوت که دوو سەت مـیتر دوور بیّ خەیاڵ نانی دەخوارد. بەردەکه وه پشتی کەوت وهەر له جێ کوژرا، ڕاست وەک ئەنگێوەیەکی دەست ڕاست به گوللەیەک دوژمنی کوشتبیّ.

ئێستا دەستەیەکی سەر خۆش له دەورەی کوپەی شەراب کۆ بوونەوه و سەر و گوێی گۆرانیەکی قەدیمی ئاوارەکان» دەشکێنن:-

– سێ ڕۆژی تەواو لە لوتکەی هەڵم دا – دەڕۆن و دەڕۆن تا دەگەنە ئەمریکا .
لە پشتی مێزێکی دوور تر پیرە پیاوێک کە مۆبل و سەندەڵیان چاک دەکاتەوە، بیرە وەری سەر دەمی مانەوەی خۆی لە « سان پاولۆ» ی بیرزیل بۆ دەور و بەری خۆی باس دەکات :
– لە « سان پاولۆ» گەڕەکێک بوو کە بیرزیلیەکان پێیان دەگوت : « ئاباچێو پیکس» و ئێمەی ئیتالیاکان لە وێ لە گەڵ ڕەشەکان تێکەڵ بووین. ڕۆژانە بۆ بژێو کورسی و سەندەڵیمان چاک دەکردنەوە. شەوانەش بۆ بەر گری لە خۆمان چەقۆمان دروست دەکردن. لە وێ چوونی کـۆڵان بێ چەقـۆ وەک بێ تفەنگ بچیـە شـەڕ وابوو. باوکم دەیگوت : باشترە مرۆڤ خەریکی کار و ژیانی خۆی بێ. بەڵام هەر چۆنێ بێ چەقۆ وەشاندن لە چەقۆ وێکەتن باشترە. لاوانی بیرزیلی کە دەیانویست کێچەڵێک بە ئێمە بکەن، شەوانە دەهاتنە گەڕەکي « ئاباچێو پیکس» و ئێمەش هەمیشە دڵ و ڕیخۆڵەمان دەخستنە نێو دەستیان و بە ڕێمان دەکردنەوە. هەر شتێکی لە دەور و بەری « سان پاولی» دروست کراوە، ئیتالیەکان دروستیان کردوە. بەڵام بەشی زۆریان لە « ئاباچێو پیکس» و لە گەڕەکی « پراز» لە گەڵ تورک و پورتوقالی و ئەسپانیەکان ماونەوە. ئەگەر بە ڕاستی ڕۆژی حیساب پاک کردن بێت، پارچەیەکی گەورەی بیرزیل بە ئێمە دەگات. من کە ئێستا لە گەڵ ئێوە دەدوێم دەتوانم داوا بکەم کە ئەو وڵاتە باش دەناسم.
دۆن پاولۆ فرە بە پەرۆشە کە دەبینێ وەرزێران ئاوا خوێن ساردی ئاسایی و خۆراگری کەونارایی خۆیان لە دەست داوە وسەر خۆشی تەبلیغات بوون.
دەبێتە هەرا و سەر باز بە بێ ئەوەی پارەی مەیخانە بدەن وەدەر دەکەون و دەڕۆن. ژنانی خزمەتکار هاوار دەکەن، خاوەنی مەیخانە بە چەقۆ هەڕەشەیان لێ دەکات. سەر باز لە دوورەوە بانگ دەکەن و دەڵێن: « برۆ پارەکەت لە دەوڵەت بستێنە.»
لە دەور و بەری کویە ئێستا کە چۆل بوە، دە کەس لە وەرزێران گۆرانی موهاجیران درێژە پێدەدەن. چەند کەسیان دەچنە سەر کوپەی شەراب وەک ئەو کەسانەی کە خۆیان بە لێواری پاپۆری نێو دەریای بە شەپۆلەوە هەلواسیبێ، سینگیان بە لێوی کوپەی شەرابەوە ناوە و بە خەیاڵی ڕۆیشتن بە سەر بانایی دەریا دا ئاوا گۆرانی دەڵێن :

سێ ڕۆژی تەواو لە پاپۆڕی هەڵم دا
دەڕۆن و دەڕۆن تا دەگەنە ئەمریکا

نە کیایان وە گیر دەکەوێ نە کا
لە سەر هەردی ڕەق نوستن
هەر وەک حەیوانات لێی دەکەون.....

دەنگی سـەر خـۆشـانە و گـوێ ئازار دەر دەنگی داوەتەوە. کـێـشی دەنگەکـان ئەوەندەی پشـو دێت دەکـێشـرێ و لە گەڵ ژێستی گرژ و هەوا گۆڕین هاو ڕێیە و لایەنی بەرەوڕووی ئەم حەرەکاتە و ئەدایانە وەک ئەو موسـافیرانەن کە خەریکن بە قەستی سەفەر سواری پاپۆڕ دەبن.

ماکاشیا « باد پا »ی فەقیر وە خەبەر دێنێ کە لە پشێ پنجە گوێنی خەوی لێکەوتوە. دەیهێنێ و گاری لێ قایم دەکات. خەڵکی پیتراسکا دەیانەوێ بڕۆن چونکە زۆر درنگ بوە. دۆن پاوڵۆش ڕا دەبێ و هەر چەند لە بەر هیلاکی خۆی پێ ڕاناگیرێ، جارێکی دیکەش بۆ دیتنی بیانکینا و گالەوەڕێن دەچێتەوە ڤیلای چوار فەسڵ. لە پردێ دەپەڕێتەوە و دەچێتە نێو کـۆڵانی ڕەزەکـان. دەنگی گـۆرانی موهاجیران بە تاریکیش بە دوایدا دێت :

بەڵام ئەمریکا زۆر جوان و بەر فراوانە
دەوراندەوری چیا و ڕوبارە،
بەڵام سەنعەتی ئێمە ئیتالیەکان
لە هەموو شوێنێ دێهات و شاری پێکهێناوە.!

لە نیزیک دیواری ڤیلای چوار فەسڵ، کەشیش توشی گالەوەڕێن دەبێ و پێی دەڵێ :

- من پێویستە لە گەڵ تۆ بدوێم،

کابرا دەڵێ : « ئاغای کەشیش، منیش لە گەڵ تۆ ئاخافتنم هەیە.

هەرتکیان لە تاریکیدا کوچە باخی ڤیلا دەگرنە پێش و لە پێش ڤیلا لە پەنا حەوزی بەرد دادەنیشن. کەشیش دەست پێدەکا:

- شەڕ دەست پێکراوە. شەڕی بانکە کە بە یارمەتی وەرزێرانی ئیتالیایی دژی وەرزێرانی حەبەشە بە ڕێوە دەچێ. من تەواوی ڕۆژ بە دوای تۆ دا دەگەڕام تا قسەت لە گەڵ بکەم و بزانین دژی ئەم شێتییە دەتوانین کام هەنگاوی خێرا بنێین.

گالەوەڕێن دەڵێ : « من تەواوی ڕۆژ لە گەڵ خانم بارون بوم. ئاغای کەشیش تا شێت نە بووم لە وانەیە تۆ بتوانی دەفریام کەوی.

کەشیش دەپرسێ : « چ دەردێکت هەیە ؟»

بەڵام گالەوەڕێن وەڵام ناداتەوە. کەشیش دوو بارە دەیڵێتەوە :

– ئیمڕۆ شەڕ دەست پێکراوە شەڕی بانک.....
گالەوەرێن دەڵێ: « من و خـانم بارۆن لە تەمـەنێک داین. ئەو دەمانە کـە منداڵبووین زۆر جار لە پەنا ئەم حەوزە، لە کوچەی باغ، لە نیزیک قەفەسەی تاوسان و لە دەور و بەری « عیبادەتخانەی زوهرە» پێکەوە یاریمان دەکرد. تا ڕۆژێک دایک و بابی لە دێر دا حەپسیان کرد. » دۆن پاولۆ قسەکانی دەبڕێ و دەڵێ :
– لە سەر بردەی وی ئاگا دارم .
– کـە وابوو ئاغـای کـەشیش تۆ دەزانی کـە مێردی وی لە شـەڕێکی تەن بـە تەندا کوژراوە. ئەوە ڕاست سزای خودایی بوو. ئەو دەم خانم بارون لە جیاتی ئەوەی بێتە ئێـرە، ویستی لە شـار بڕی و چ بێژم و چیکرد. دیارە پێت وانەبێ کـە ئینسـانێکی خەراپە، نا، تەنیا زەعیفە.
کەشیش دەپرسێ: تۆ لە کوێ دەزانی ؟
– خانم بارون خۆی هەمیشە بۆ منی دەنووسی.
– یانی ئەو سەر بردەی ژیانی خۆی بۆ تۆ دەنووسی ؟
گالەوەرێن دەڵێ :« بـەڵێ، نا ڕاستەو خۆ. ئێستـا ئیتر بۆتە ئیماندار و ترسی مردن هەڵیگرتوە. ئەو دەمیش ڕۆژەکانی شـەمۆ بۆ وەزمـانهـاتنی گوناحـانی دەچوو. ئەو کەسـەی ئیقـراری وی دەبیسـت دەبێ پیـاوێکی تۆسن و دڵڕەق بوو بێت. چونکە بۆ هەر گوناحێکی گەورە مەجبوری دەکرد بۆ شوشتنەوەی گوناحەکە دوعای (Ave Maria) بخوێنێ و بە زمـانیش لە سەر هەرد نیشـانەی خـاچ بکێشێ. ئەم جۆرە شوشتنە لای ئێمـەش هەیە. بەڵام ئەگەر قەشـەیەک غیرەتی ئەوەی هەبێ سـزایەکی ئاوا بـە ســەر خـانمێکی بارون دا بسـەپێنێ، دەبێ قـبـوڵ کـەی کـە ئەو پـەڕی بێ بەزەییە. سەبارەت بـە خوێندنی دوعای(Ave Maria) پیاو هـەق بڵێ هەمیشە ئەو دوعایەی دەخوێند. بەڵام کێشانی خـاچ لە سەر هـەرد بە زمان کارێکە خانم بارون هەمیشە منی کردۆتە مەعمور ئەنجامی بدەم. دیارە مەبەستم شکایەت نیە، چونکە لە بەر ئەوەی ئەم کارە بۆ خاتری ئەو بوە، هەمیشـە بە دڵ ئەنجامم داوە. ئەو دەم لە هەر شـــوێنێ بوایە لە ڕۆم یا لە « سن مـۆریتس » یا « مـۆنتی کــارلۆ» کــارت پوستاڵێکی بۆ من دەنووسی و ژمارەی خاچەکانی کە دەبوایە بە زمان لە سەر هەرد بیانکێشم، دیاری دەکردن. تا ئەو کـاتەی بارون زیندو بوو ژمـارەی خـاچەکان لە حەوتو دا لە چەند خاچ تێنەدەپەڕی. بەڵام پاش ئەو زیادیان کرد و دەگەنە بیست و سی. دیارە ئاغـای کەشیش دەزانن خانمێکی بـەو نازەنینیـە و سی گوناحی گـەورە

لە حەوتو دا! لەم دواییە دا لە حەوتو دا لە سەر بیست و یەک ڕاوەستاوە. ناکرێ بڵێی کەمە، ڕۆژێ دەبێتە سێ .!
دۆن پاولۆ پشت ئەستوری دەکا کە ڕۆژێ سێ زۆرە و تۆ هەر وا بە زمان خاچت کێشاون.؟
گالەوەرێن بە منگە منگ دەڵێ :
– ئەوە تەنیا هۆی پێوەندی نێوان من و ئەو بوو کە مابۆوە. ئەگەر من ڕەتم کردبایەوە یەکی تری دەکردە مەعموری ئەم کارە ئەو دەم بە جارێک لێی بێخەبەر دەبووم. پاشان گالەوەرێن کەشیش دەباتە تەویلە. فانۆس هەڵدەگرێ و لە دیواری تەویلە لە پانتایی چەند میتری چوار گۆشە ژمارەیەکی زۆر خاچی بچوک نیشان دەدا کە بە خەڵوز کێشراون. بۆ کەشیشی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ: بۆ ئەوەی بە هەڵە نەچم و لە بیرم نە چێت، هەمیشە ژمارەی ئەو خاچانە کە بە زمان دەیانکێشم بە خەڵوز لە دیوار دەیانکێشم، دیارە زیاتر لە بەر ئەوەی لە بیرم نەچێ. زۆر جاران کە سەیری دیوارم کردوە گریاوم. ئەو خاچە بچوک و ڕەشانەی کە بە ڕیز لە دیوار کێشراون، گوڕستانی ئەو سەربازانە وە بیر دۆن پاولۆ دێنێتەوە کە لە شەڕ دا کوژراون و لە دەور و بەری« کوریتز» چاوی پێیان کەوتوە بەڵام ئەمجارە لە جیاتی خاچی گۆڕستان، خاچی گوناحە گەورەکانی خانم بارون دەبینێ.
هەرتکیان دەگەڕێنەوە و لە پەنا حەوز دادەنیشن. گالەوەرێن دەڵێ :
– چەند ڕۆژە خانم بارون هاتۆتە ئێرە، بۆ من بزانە جێژنێکی چەند گەورە بوە. ئەو پێی گوتم:« بۆیە گەڕاومەوە ئیتر پارەم نیە لە شار بژیم» من لە وەڵامدا گوتم:« خانمی من !هەتا نۆکەرت زیندوە خەمی هیچت نەبێ» ڕۆژی دوایی فاسقەکەی کە خەڵکی « پیە مونە» و سەرهەنگی سوارە نیزامە گەیشتێ.
« بیانکینا » دەڵێ: لە فیز و پۆزی ئەو کابرایە وا دیارە کە لە شەڕی کریمە دا بەشدار بوە » بەڵام من لێی نەترسام و هەر شەوی هەوەڵێ بانگم کردە پەنایەک و بە گوێچکەمدا خوێند:« ئەگەر ناتەوێ مەیتەکەت لە ڤیلای چوار فەسڵ بنێژرێ بە هەوەڵین قەتار بگەڕێوە بۆ کریمەت.» بەڵام خانم بارون پشتی فاسقەکەی گرت. لەو دەمەوە ژیانم لێ تاڵ بوە. شەوانە خەوم لێناکەوێ و دەتوانم بڵێم هەر ڕۆژ نابێتەوە.
ئەوەی لەم نێوەدا مسۆگەرە ئەوەیە کە وەزع هەمیشە هەر وانابێ. پێرێ کاتی ڕۆژ ئاوا خانم بارون هاتە لام و داوای لێکردم کە وەک ڕابردوو بیست و یەک خاچ بە زمان لە سەر زەوی بکێشم. لە وەڵامدا گوتم :« نا، نا، بۆ ئەو گوناحانەی تۆ لە گەڵ

ئەو کابرایە دەیکەی، من ئامادە نیم سزابدەم.»
خانمبارۆن بە سەر سوڕ مانەوە تێک ڕاما و چاوی پڕ بوون لە ئاو و پرسی :« یانی چی ؟من خۆم سزایان بدەم ؟» لە ئاخر دا بەڵێنم دا کە خاچەکان بکێشم، بەڵام بۆ ئاخرێن جار. ئێستا کاتێ کە شەو دادێت ئەم دوانە دەچنە سەرێ بۆ ژووری خۆیان. من هەست دەکەم سەرم دەسوڕێ، ڕاست وەک شێتانم لێهاتوە. تاوێک هەدادانم نیە.ناتوانم بیر لە هچیتر بکەمەوە، کە وابوو ئەگەر تۆ بتەوێ لە بارەی شتێکی دیکە لە گەڵ من بدوێی، بێفایدەیە و تەواو بێفایدەیە.
دۆن پاولۆ لێی دەپرسێ :« دەزانی پۆمپیۆ کەی لە ڕۆم دەگەڕێتەوە.؟»
– نە خێر نازانم .
– من بیانکینام ناردۆتە « روکا» دەزانی گەڕاوەتەوە یان نا ؟
– نا ، هێشتا نە گەڕاوەتەوە.
پاشان گالەوەرێن بە چاوی بە ئەسرینەوە دەڵێ :
– ئاغای کەشیش تۆ لەو ڕوانگەوە کە کەشیشی دەبێ لە گەڵ خانم بارون قسە بکەی،
– بە داخەوە ئیمڕۆ شەڕ دەست پێکراوە. من ناتوانم بیر لە هیچ شتێکیتر بکەمەوە.
کۆڵانەکانی فوسا چۆلن و چرایان نیە. ئاڵا و تابلۆ و نە نووسراوەکانیان دیارە و نە ڕەنگیان. هەر وەک شوێنەواری لە کارنەواڵ بە جێماو شاری نوستوویان داپۆشیوە. دۆن پاولۆ لە کاتێکا بە لادا دێت لە پێش موسافیر خانەی تورنسل ڕادەوەستێ. چونکە لە سالۆنی نانخواردن دەنگی هەرا و گۆرانی دێت، ئەم دەنگ و هەرایە دەبێ ئاخرین ڕەنگدانەوەی میوانانی لوت بەرزی ئاوچە بێ کە ویستوویانە دەستپێکی شەڕ لە گەڵ حەبەشە جێژن بگرن. بۆ ئەوەی ناچار نەبێت بە نێو سالۆنی نانخواردندا تێپەڕێ و لە گەڵ ئەو کەسانەی لێیان بێزارە توشی قسان نەبێت، دۆن پاولۆ دەوری ساختومانە کە دەدا و لە ئاخری حەساری چۆل کە پڕە لە سەوەتەی بەتاڵ و دار و چیلکەی سووتاندن، دەرگای چوونێ متبەق دەبینێتەوە.
ئێستا دۆن پاولۆ یەکێ لە ڕۆژەکانی سەر دەمی منداڵی وەبیر دێتەوە کە ئەو دەم شاگردی پۆلی دووەمی سەرەتایی بوە. لە مەدرەسە ڕابوونێکی بە کۆمەڵ دژی مامۆستایەک بە ناوی « دۆن وینچنتزۆ لیمونە» سەر هەڵدەدا . مامۆستا لە منداڵێکی داوە و باسکی شکاندوە. ئەو دەم دۆن پاولۆ لە تەمدنی ٨-٧ ساڵیدا بوە. گورج کڵۆ خەڵوزێکی هەڵگرتوە و چۆتە مەدرەسە. لە سەر ڕێگای خۆی هەر دیوارێکی سپی و

خاوێنێ دیتوه ئەم دروشمه تۆڵه خوازانەی لێ نووسیوه:« مردن بۆ وینچنترۆ» ە نابوت بێ زوڵم » له مت‌بەقی موسافیر خانه دەنگی هەوڕ شوشتنێ دەگاته دەرەوەی حەسارێ. دۆن پاولۆ ناوێرێ بچێتەژوور. ئەو دەم شاقەلی عەباکەی پڕ دەکا له خەڵوز و به نێو کۆڵانه تاریکەکاندا دەست به گەڕان دەکات. کۆلانی ئێزگەی ڕێگای ئاسن چۆله و ئیزگەش خۆی له بێدەنگی دایه. سواڵکەرێک له ساڵۆنی چاوه ڕوانیدا خەوتوه. سەگێکیش له پەنای وەر کەوتوه. ئاخرین قەتار دەبێ ڕۆیشتبێ. دۆن پاولۆ له سەر باجەی بلیتفرۆشی به خەتی درشت دەنووسێ:« نابوت بێ شەڕ! بژی ئازادی !»

پاشان له مەیدانی ڕێگای ڕێی ئاسن تێدەپەڕێ و دەچێته شاری کۆن. به کۆڵانی تەنگ و خواره پێچه دا خۆ دەکەیێنێته پێش کلیسای « سان کیۆ سپ» بەڵام دیوارەکانی کلیسا قەڵشیون و لوس نین. باش لێیان نانووسرێ. به پێچەوانه پەیژەکانی پانی کلیسا که دەگەنه دەرگای گەوره، ڕاست و لوس و خاوێنن. هەر دەڵێی بۆ ئەم کاره دروست کراون. دۆن پاولۆ له پەیژەی یەکەم دەنووسێ: « نابوت بێ شۆرباوی دەوڵەتی» له پەیژەی دووەم دەنووسێ :« پایدار بێ شۆرباوی ماڵێ » له هی سێیەم دەنووسێ :« مردن بۆ پاپ لایەنگری شەڕ.»

کاتێ له نووسین دەبێتەوه له وێ دوور دەکەوێ و له ڕێگادا دوو جار ئاوڕ دەداتەوه تا نووسراوەکانی خۆی که به خەتی کتێبی نوسیونی و له بن کلیسا باش دیارن تەماشا بکات. له بادانەوەی کۆڵاندا کەمی دەمێنێ ده سەر خۆشێکی بەرەڵا هەڵبنگوێ که له بەر سەر خۆشیان به لادادێت و گۆرانی موهاجیران دەچڕێ. سەر خۆش له گەڵ تێهەڵەنگوتنی کەشیش دەپۆشەکێ. پاشان به پێکەنینێکی بەرز و ئەحمەقانه وەدوای کەشیش دەکەوێ و به ناره نار دەڵێ :

– جیگر ، جیگر ، جیگر جونی . ڕاوەسته بتبینم ....

بۆ ئەوەی لەم جۆره نەفرەتیانه دەر باز بێ، هەنگاوان توند دەکات. بەڵام سەر خۆش دەست بەر دار نیه. قەشه سەبر دەکا تا له بن چرایەک بیگاتێ و ئامادەیه دوو زللەی باشی تێسرەوێنێ. پاشان سەر خۆش هەست به هەڵەی خۆی دەکا به جولەیەکی کاڵتەیی به بۆڵه بۆڵ دەڵێ :

– چ هەڵەیەک ، خەریک بوو تووشی کوفرێکی گەوره بم.

دۆن پاولۆ دەگاته پێش ئیدارەی باج و ماڵیات که ئالای دەوڵەتی له سەر هەڵواسراوه و لوله ئاسنی ئەستوریان له پشت پەنجەرەکان داناوه. له پەنا دەرگا به

خـەتی ترشت دەنووسێ:« نابوت بێ شـەڕ و بارمـتـەی ئینسـانان ، بژی ئازادی !» لە کۆلانـی تەنیشـتی دەنگی سەر خۆشان دێت. دۆن پاولۆ بۆ خۆ پاراستن دەگەڕێتەوە میوانخانە و بە دەرگای ئاشپەزخانە دا کە چۆلە و کەسی لێ نیە، دچێتە ژوور.
پۆمـپـیـۆ لە ژوورەکەی وی لـە سـەر کـورسـی دانیـشـتـوە و چاوە ڕوانیـەتی. کـوڕی دەرمانفرۆش دەڵێ :
- من ئیمشەو لە ڕۆمەوە بە ئاخرین قەتار گەیشتم. کە زانیم تۆ لێرەی هاتم بتبینم. لێرە چاوە ڕوانت بووم لە گەڵ تۆ قسـەم هەنە. دۆن پاولۆ دەڵێ : ئیمڕۆ تەواوی ڕۆژ لە تۆ گەڕاوم و چاوە ڕوانت بووم. پاشان لە قسەکانی زیاد دەکا و دەڵێ :
- شـەڕی تـازە دەست پێکراوە. شـەڕی بانک لە گەڵ فـەقـیـران. ئێـمـە دەتوانین چی بکەین.؟
پۆمپیۆ ڕەنگی بە ڕوانەوە نامێنێ و لە وەلامدا دەڵێ :
- وا نیـە ، تۆ بە هـەڵە چووی. ئەم شـــەڕە بۆ مـیللەتی ئێـمــەیە و بە قـازانجی شارستانیەتە.
- تۆ چۆن باوەڕ بە شتی وا دەکەی ؟
پۆمـپـیـۆ سـەفـەری خۆی بۆ ڕۆم بۆ باسـدەکـات: لە گەڵ یەکێک لە دۆسـتـەکـانی کە ئەویش لایەنگری شۆڕشی دووهەم چەند سەعات بە دەورەی بانکێکدا سوڕاونەوە کە پێیان وابوە پێشەوای ڕاستە قینەی شۆڕش لەوێدا حەپسە. گوێچکەیان بە دیوارەوە ناوە و لە لایەکیش وریا بون تا بزانن لە سەعاتی کاتی خواردندا، خواردنێکی وەک خواردنی زیندانیان بۆ ئەو بانکە دەبەن یان نا.
ئاخـرەکـەی بە زەحـمـەتێکی زۆر لە گـەڵ دوو پـۆلیـسی چەکـدار کـە لە پێش بانک کێشکیـان کێشاوە کـەوتوونـە گـفـتگۆ بەلام هیچ بەڵگەیان دەسـت نە کـەوتوە. چەند شەو لە ماڵی ئاشنایەک لە گەڵ دەولەمەندان دانیشتوون. سەیر ئەوە بوو کە پۆمپیۆ لە بازرگانێکی گەورە و لە بانکدارێکی بیستبوو کە ئەوان گوتوویانە گومـانیـان لە وەدا هەیە کە شەڕی تازە لە گەڵ ئەفـریقـا بە قازانج بێت و ئـەوەیان بە هـەنگاوێکی مەترسیدار و پڕ خەرج زانیوە. ئەو دەم ئەو دوو دۆستە پرسیبوویان :« کە وابوو ئەم شـەڕە بۆ چی سـاز بوە ؟» وەلامەکـان نا ڕوون و دوو سـەرە بوون. هـیـچیـان غیـرەتی ئەوەیان نەبوە ناوی ئەو بەرن. داخوا دەکرا بە ڕاستی هێندە لە زیندانیەک بترسێن ؟ داخـوا قبـوڵ دەکرا کـەوێنەیەکیـان لە جێی ئەو داناوە ئامرازی بـێ ئیرادەی بەر دەستی بانک نەبێ؟ کە وا بوو بۆ شەڕ دەکا ؟ ڕازی ئەم نوکتەیە دەبوایە لە مەیدانی

« پیاتزا ڤێنێزیا » بۆیان ڕوون بێتەوە.
پۆمپیۆ پاشان دەڵێ :
– ڕایانگەیاند بوو کە ئیمڕۆ سەعاتی چواری دوای نیوە ڕۆ سەرۆکی دەوڵەت وتار دەدا. من و هاڤاڵەکەم چووینە ڤێندەرێ و ڕاست لە بەرانبەر هەیوانی« کۆشکی ڤنیز » ڕاوەستاین. ناچار ماوەیەکی زۆر چاوە ڕوان بووین تا لە مەیدانی کۆشک دەر کەوت و دەنگی بە سەر حەشیمەت دا بڵاوبۆوە. گومانمان لە وەدا نەما کە خۆی بوو، وێنە نەبوو.
دۆن پاولۆ دەیەوێ شتێک بڵێ، بەڵام دوو دڵە لە وە کە لە بەرانبەر بڕوایەکی ئاوا پتەو و ساکارانە بەڵگە بێنێتەوە. دەستی ڕاستی لە گیرفانی عەباکەیدا دەشێرێتەوە چونکە هێشتا بە خەڵوز ڕەشە!.
پۆمپیۆ دەڵێ :
– شەڕێکی ئیمڕۆ دەست پێکراوە، ئەو زەویە پان و بەرینانەی کە ئێستا بەیار وچۆڵ ماونەتەوە دەیخاتە ژێر دەسەڵاتی بێکارانی ئێمە. ئەو ڕۆژەی کە ئابووری ئێمە لە ژێر باری قورسی خۆ نیشاندانی لە ڕادە بەدەری کرێکار ئازاد بێ، ئەو دەم و تەنیا ئەو کاتە کە خەباتی کاریگەر لە گەڵ بانک و مۆنۆپۆلە تایبەتیەکان دەرمتانی بۆ پێک دێت. شۆڕشی دووەم تەنیا وە دوا دەکەوێ و ئێستا گرنگ ئەوەیە کە ئێمە لەم شەڕە دا سەر کەوێن.
پۆمپیۆ دەست دەخاتە گیرفانی و کوتە کاغەزێک دەر دێنێ وبە کەشیشی نیشان دەدا و دەڵێ :
– من هەر ئیمڕۆ ناوی خۆم لە ئارتەشدا نووسیوە.
ئەو دەم دۆن پاولۆ دەڵێ : « کە وابوو ئێمە پێکەوە ئاخافتنمان نیە. لە کاتێکا کە خۆی ڕا دەبێ، دەرگای چوونە دەریش بە لاوەکە نیشان دەدا. بەڵام پۆمپیۆ پاش چەند چرکەیەک دردۆنگی هێشتا دەیەوێ داوای شتێکی لێبکات :
– بەڵێنم پێبدە هیچ لەو کارانە ئەنجام نەدەی کە پێکەوە لە نێو خۆماندا بڕیارمان لە سەر دابوون.
دۆن پاولۆ لە دوو دڵی دایە. نایەوێ درۆ بکات. بەڵام دەبێ بیری ئەو مەترسیەش بکاتەوە کە لە وانەیە وەک قەشەیەکی دژی دەوڵەت بە کار بەدەستانی دەزگای بناسێنن. ئەگەر بگیرێ و ناو ونیشانی ڕاستە قینەی ئاشکرا بێ فیکری گرتنی کەمتر لە فیکری ئابڕو چونی ترسی وەبەر دەنێ. بە تایبەت فیکری ئابڕو چونی لە

فوسا و لە پیتراسکا لە بەر چاوی ئەو کەسانە کە تا ئێستا ئەویان بە کەشیش ناسیوە. جگە لەوە تازە بە تەنیایی چی پێدەکرێ.؟

پۆمپیۆ بە پێداگرتنەوە دەڵێ : « بەڵێنم پێبدە .»

– بەڵێنت پێدەدەم

پاشان دۆن پاولۆ لێی زیاد دەکا و دەڵێ :

– سەفەر بە خێر! هیوادارم بە سلامەتی لە شەڕ بگەڕێیەوە. ئەو دەم لە مبارەوە دیسان گفتگۆ دەکەین.

پۆمپیۆ بە گەرمی کەشیش لە ئامێز دەگرێ و بەڵێنی پێدەدا کە لە ئەفریقا وە نامەی بۆ دەنووسێ و پاشان دەڕوا.

لە پەیژەکانەوە دەنگی پێکەنینی ئەو کەسانە دەبیسێ کە هێشتا لە سالۆنی نانخواردنی میوانخانە ئاهەنگی جێژن درێژە پێدەدەن. دۆن پاولۆ دەستە خەلوزاویەکی دەشواتەوە. دەست شۆیی بۆنی میزی لێدێت. دۆن پاولۆ لە ئاوێنە دا کە لە بەر گومێش خالْخالْ بوە، خۆی پیر تر و رەنگ پەڕیوتر دەبینێ. لیباسی رەشی هێناویەتە سەر شکلی یاریکەرێکی خەمناکی سیرک. قسەکانی « ئولیوا » ی وەبیر دێتەوە کە پێی دەگوت:« تۆ ئەحمەقی، تۆ بۆیە شۆرشگێری چونکە لە واقعیەت دەترسی » وشکە کۆخەیەک دەیگرێ و لە پڕ شلەیەکی گەرم وشیرین دێتە نێو زاری. کەفێکی سووک و رەنگ سور دەکەوێتە سەر لێوانی. لە سەر تەختەکە درێژ دەبێ. دەکەوێتە یادی نووسراوەکانی کتێبی دوعای (Venit hora mea) داخوا سەعاتی من گەیوەتێ ؟

هێشتا بە لیباسەوە لە سەر تەخت ڕاکشاوە و خەوی لێنا کەوێ. لە پڕ دەنگی قاچ دەبیسێ. کەسێک سەبر سەبر لە دەرگای ژوورەکە نیزیک دەبێتەوە و ڕادەوەستێ و گوێ هەڵدەخات. کەشیش دەڵێ: « وەرە ژوور.» بیانکینا وە ژوور دەکەوێ :

– من لە پشت پەنجەرەوە ڕوناکاییم بینی و هاتمە سەر.

کیژی لاو سوور و سپیاوێکی توندی کردوە و بۆنی ئالکۆلی لێدێت. دەڵێ :

– لە ڕوگا بە شانازی شەڕ جێژنێکی بچوک بەر پا کرا بوو. دیارە لاوەکان زۆریان دەویست کە من شانازیان بدەمێ. بەلام ئاخ لە چنگ ئەو موریکایەی تۆ چەندە ئەحمەقە. پاش ئەوەی ماوەیەک بە دوایدا گەڕام، ئاخرەکەی لە باخێک دۆزیمەوە خەریک بوو کەلەمی دەچاند. من پێمگوت: « یەکێک لە دۆستانی ڕۆمی تۆ منی ناردۆتە لای تۆ کە پێت بڵێم زۆری پێخۆشە قسەت لە گەڵ بکات و ئەگەر بتەوێ

ئامادەیە بێتە ئێرە.» ئەو سوپاسێکی منی نەکرد، تەنانەت پیاڵە ئاوێکیشی نەدامێ و لە وەڵامدا گوتی : « نایەوێ هیچ کەس ببینێ.»
دۆن پاولۆ بە زەحمەت هەناسەی هەڵدەکێشا و دەترسا دیسان کۆخە بیگرێ.
بیانکینا دەپرسێ:« بۆ چی قسان ناکەی؟ چقەوماوە تا ئێستا هێشتا نە نوستووی؟ خەمت هەیە ؟
کەشیش بە ئاماژەی سوکی سەر وەڵامی ئەرێ دەداتەوە.
- بۆ چی؟ خەمی چیت هەیە ؟ قەرزداری یا ئاشق بووی؟
دۆن پاولۆ بزەی دێتێ .
- ئێستا لە هەموو شت تێگەیشتم. تۆ ئەڤینداری ژنێکی تەرکە دنیای. من لە سەر بردەی قەشەیەکدا خوێندمەوە کە هەمیشە خەمبار بوو. چونکە ئاشقی ئیماندارێک ببوو. بەڵام ئەوەندەش بزانە ژن لە دنیا دا زۆرە.
کۆخە دوو بارە نەخۆش تەکان دەدا و سەری بە سەر شانیدا دەکەوێ. لە لا لێوی خوێنێکی باریک بە سەر چەنەکەیدا دێتە خوار. بیانکینا دەبینێ ڕەنگی بە ڕوانەوە نە ماوە. دەیەوێ بچێ کەسێک بۆ یارمەتی بانک بکات. بەڵام ئەو دەستی دەگرێ و بزەیەکی دێتێ و بە هەناسە بڕکە دەڵێ :
- مە ترسە ، هیچم نیە.
بیانکینا بە پەلە دەسرەیەکی بە ئاوی سارد تەڕ دەکا و بە سەر و سنگیدا دێنێ. شاڵگەردنی خۆی بە دەوری چراکە دا دێنێ تا شۆقی کەمتر بێ. دەچێتە ئاشپەز خانە و لیوانێک ئاوی خوێ دێنێ، چەند قومی دەداتێ. پاشان دەچێتە ژوورێکی پەنای کە چۆڵە، دوو باڵنج دێنێ و لە ژێر سەری نەخۆشی دەنێ و سەری تۆزێ بەرز دەکاتەوە. پاشان لە سەر خۆ و بە لێزانی بێ ئەوەی بیبزێوێ لیباسەکەی لە بەر دادەکەنێ. لێفە و شەمەدی لە ژێر دێنێتە دەر و نەخۆشی تێوەر دەپێچێ. پەنجەرە دەکاتەوە تا هەوای فێنک بێتە ژوور. ئاخرەکەی بە دەستی نەرم و ناز کەرانە لێو و چەنەگەی دەشواتەوە. جار جار دەسرە تەڕەکانی سەر سینگ و نێو چاواتی دەگۆڕێ و هەموو جارێ قژەکانی ناز دەکا و بە سەبروکە بە گوێچکەی دەڵێ:
-خۆشە ویستی دڵم. گیانەکەم، هیچ نیە، دەبینی هیچ نابێ.
بیانکینا بە نەخۆش دەڵێ: نابێ قسان بکا. پەڕە کاغەز و میدادێکی دەداتێ و دەڵێ:« چت گەرەکە ئەشێ بینووسی.»
دۆن پاولۆ لە سەر کاغەز دەنووسێ:« سبەی بەیانی لە ئاکوافرە تەلەفون بۆ دوکتۆر»

نۆنزیو ساکا» بکە.
کـیـژەکـە پێی دەڵێ: « ئێـسـتـا کـاتـی خـەوە. بنوو» خـۆشـی لە سـەر هـەرد لە پەنا تەختەکەی درێژ دەبێ. بەڵام هیچیان خەویان لێ ناکەوێ. کاتێک نەخۆش دەپرسێ :
– تۆش دەستپێکی شەڕت چێژن گرت. ؟
– بەڵێ منیش .
– بۆ چی ؟
– منیش چاوم لە خەڵک کرد .
بەیانی نیانکینا هەموو شت بۆ پووری دەگێڕێتەوە و دەچێتە پۆستخانە تا تەلەفون بۆ دوکتۆر ساکا بکات.
دوکتۆر ساکا نیزیکەی نیوەڕۆ دەگاتێ. دۆن پاوڵۆ بە دیتنی دوکتۆری ئاشنای شاد دەبێ. بەڵام دوکتـۆر نـاڕەحـەت دەبێ. بە پەلە و بە ڕەمـەکی تەمـاشـای دەکا و کـاتێ بیانکینا بە جێیان دێڵێ بە کەشیش دەڵێ:
– ئێستا تێگەیشتووی گەڕانەوەت بۆ ئیتالیا کارێکی نەحمەقانە بوە.؟ هەر چۆنێک بێ کاتێ کەسێک ویستی بە هەر قیمەتێک بێ نەخشی قارەمانێک یاری بکا، نابێ ئەم کارە بە خەرجی خەڵکی دیکە بکات.
دۆن پاوڵۆ لە وەڵامدا دەڵێ :
– تۆ مەجبور نە بووی بێیە ئێرە. ئینسان بە بێ دوکتۆریش دەتوانێ بمرێ.
دوکتۆر دەڵێ :
– تا ئەو کاتەی تۆ لەو لیباسە گۆڕاوە دای، منیش لە پێوە بوون دام. پۆلیس زۆر بە هاسانی دەتوانێ بزانێ کە دۆن پاولۆ بە گارییەک لە ئاکوافرەدا هاتۆتە فوسا و ئەم گارییە لە ئاکوافرەدا من بە کرێم گرتوە.
دۆن پاولۆ دەڵێ :« من تۆم مەجبور نە کرد بوو کە کارێکی وا بکەی..»
دوکتۆر دانی پێدا دەنێ کە :
– من بە دوای وروژانی هەستێکی ئەحمەقانە کەوتم. ئێستا تۆ دەبێ بە خێرایی ئەو مەترسیە لە سەر من لابەری. سەبارەت بە خۆشت لام وایە تێگەیشتبی کە لە کاتی ئێستا دا نا توانی لە ئیتالیا هیچ بکەی. برۆ لە ئاسایشگایەک لە دەرەوەی وڵات ئاگات لە سلامەتی خۆت بێ تا دەرفەتێکی لە بار تر پەیدا دەبێ.
سپینا لە وەڵامدا دەڵێ :
– من ناچار دەبێ ئەوە بڵێم کە یارمەتی تۆم بۆیە قبوڵ کرد کە پێم وابوو نابێ تۆ لە

گـەڵ هاو دەرسـانی قـەدیمی پەست و پیـسی خـۆم وەک یەک دابنێم. بەڵام ئێـستـا دەبینم کە « سەگی زەرد برای چەقەڵە و ڕەنگە لە چەقەڵیش کەمتر .» شەڕ هەمیشە دەرەتانێکی زۆر بۆ برەوی شـوغڵی دوکتـۆران دێنێتە پێش و دوکتۆرێکی وەک تۆ کە ئوسـقـۆف پشـتیـوانی لێدەکـات لە سـەر دەمی شـەڕ دا باش دەتوانێ یاری خـۆی ببەستێ. ڕەنگە هەر لە بەر ئەوەیە کە ناتەوێ خۆت بخەیە مەترسییەوە.
هاتنە ژووری بیانکینا دەبێتە کۆسپی ئەوە کە وەڵام بداتەوە. دۆن پاولۆ پێی دەڵێ:
- تۆ دەتوانی بڕۆی! منیش کە توانیم هەستمەوە سەر پێ، دەڕۆم.
دوکتۆر دەڕوا و بیانکینا بۆ نەخۆش تاریف دەکا کە لە بەر هێندێ دروشمـەکانی دژی شـەڕ کە کـاتی شـەو بە خـەڵوز لە سـەر دیوار و سـاخـتومـانە گشـتیـیەکـان نووسراوە هەرایەکی گەورە لە شـار سـاز بوە. بیانکینا لە کاتی ڕێکو وپێک کردنی ژوورەکـە پەڵەی گـەورە و ڕەشی سـەر خـاولەکـە دەبینێ. وە وەی دەچوو خـەڵوز فرۆشێک دەستەکانی خۆی پێ خاوێن کرد بێتەوە.
لە نەخۆش دەپرسێ:« ئەو ڕەشاییە چیە ؟ » بەڵام لە جیاتی وەی چاوەڕوانی وەڵام بێ، بە پەلە خاولیەکە دەشواتەوە. پاشان لە کاتێکا لە دۆن پاولۆ نیزیک دەبێتەوە و بە سەر کۆنەوە دەڵێ:
- هیچ دەزانی تۆ منداڵێکی بە ڕاستی؟ منداڵێکی ئازا و بێ گـوێ. لە گـەڵ ئەوە لە سەر کۆنەی نەخۆش پەشیمـان دەبێتەوە و لێی زیاد دەکا و دەڵێ « بەڵام منداڵێکی خۆشە ویستی. »
دۆن پاولۆ دەڵێ: « بیـانکینا! حـەیف و سـەت حـەیف کـە لەم دنیـایەدا لە پەنا ئەم بەرازە حیسابگەرانە کە پیاون، ژنیش هەن.»
بیانکینا دەچێتە فیکرەوە و پاشان دەڵێ:
- ڕەنگە ئەم وتەی تۆ لە بەر خۆ پەرستی ڕووت بێ. لە ڕاستیدا ئەگەر ژن نەبان کێ منداڵی وەسەر دنیا دەنا.
نە خۆش ئیراد دەگرێ ودەڵێ :
تەنانەت ئەگەر قەرار بێ زانست بۆ منداڵ دروست کردن ڕێگای دیکەش بدۆزێتەوە
- بەڵێ تـەنانەت لەو کـاتەشـدا - لە پەنا ئەم پیـاوانەی هۆگری بەرژەوەندی مـادی، حەیفە ژنیش هەبن.
کیژی لاو بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێ:
- بەڵام ئاخر شـێتی خۆشـەویستم، گرنگ منداڵ دروست کردن نیە. لە وانەیە بە

هەڵە و بە پێچەوانەی ویست و ئیرادەی خـۆ منداڵ دروست بکەن، گرنگ شیـر دان بە منداڵە.
دۆن پاوڵۆ قەت فیکری لەوە نە کرد بۆوە و ئێستا ئەوەی پێخۆشبوو. لەو کاتە دا کە کیژی لاو خـەریکی شـوشـتنی ژوورەکەیە کەشـیش تەماشـای دەکا. سـینگی وەک قـەرتاڵەیەکی پڕ لە مـیوە دەچێ. پێش چەند مانگ لیمۆی کاڵ لەو قـەرتاڵەیە دا بوو، بەڵام ئێستا بوونەتە ترنجی گەیشتوو و چەندە ترنجی نازەنین.!

## ١٠

دۆن پاولۆ تووشـی بێحـاڵیـیـەکی ئەوەندە توند بوە کە تاقـەتی ئەوەی نەمـاوە بیـر لە سـەر نە کـەوتنی تا ئێسـتـای خۆی بکاتەوە. بیـری خـەفـەتبـاری کـە جـار و بارلە مێشکی ویدا دە جوڵێنەوە. هەر وەک مێشی موزاحیم بە دەست لە خۆ دەر بکەن، دەریان دەکات. ئیتر نازانی چبکات، و نە کەسسیش دەناسێ کە بتوانێ پاڵی وێبدا و بتوانێ لە نێو وەزێراندا بمێنێتەوە و کارێکی کەلاڵەی بۆ دارشتـوە لە گەڵ وان دەستی پێبکات. زەوی لە ژێر قاچی خاڵی بوە. ئێستا ئیتر جگە لە ڕۆیشتن کارێکی دیکەی نیـە،بەلام بۆ ڕۆیشـتنیش بە تالوکە نیـە. کاتێ دەڕوا کـە بتوانێ بە ڕێگادا بڕوا. تاقە شتێکی تورەی کردوە ئاوێنەی دەست شۆییە. بۆ ئەوەی ڕوخساری خۆی لە ئاوێنەدا نەبینێ لە نیـزیک بوونەوە ئاوێنـە خـۆ دەپارێزێ. خـۆی بـە کـابرایـەکی چلمن و کاڵتـە دەبینێ ئێسـتـا دەزانێ ئەو تەنتورە ی کە بۆ گـۆڕینی دم و چاوی دە خۆی هەڵسوە وئەو دەبەر کردنەی لیباسی کەشیـشی هەمـووی لە سـەر یەک تەنیـا کـارێکی ئەحـمـەقـانە و بـێ دەلیل بوە. بەلام هـەوڵ دەدا کـە بیـر لەوە نەکـاتەوە. بە بیانکینا دەڵێ:

– لە گەڵکو توانای بزووتنم بێتەوە بەر، بۆ دەرەوە دەڕۆم. ئیتر لە وانە نیە بتوانم لەم وڵاتەدا بژیم. من ماندو و هیلاک و تێشکاوم.

کـیـژی لاو دەڵـێ :« کـارێکیش بۆ من پەیدا کـە. منـیش نازانم لێـرە چبکەم. زۆری پێناچێ پوورم دەرم دەکا. جگە لە وە سەفەریشم پێخۆشە.

فیکری توشبوونی بیـانکینـا لە دەرەوە دۆن پاولۆ دەخـاتە پێکەنین و دەڵێ: « ئەگـەر بێیە دەرەوە شتی وات بۆ باس دەکەم پێکەنین بتگرێ.

– هـەر ئێستـا ناتوانی بۆم باسـبکەی؟ مـەسەلەی « کـاری ئیمڕۆ مـەخـە سبـەینێ» ی پێی دەڵێ. بەلام دۆن پاولۆ ڕازی نابێ.

برەتیـچـە بە گـوێرەی دەسـتـوری دوکتـۆر بە کەشـیش ڕادەگات و خـزمـەتی دەکا.

دوکتـۆر پاش وەدەر کـەوتن لە ژووری نەخـۆش توشی مـودیری مـوسافـیر خانە بوە،

وەڵامێکی ڕەمەکی بە سڵاوی ئەو داوتەوە و بە پەلە لە میوانخانە چوو بوە دەرێ تا یەکسەر بچێتە ئێزگەی ڕێگای ئاسن. لە گەڵ ئەوەش دوای تاوێک گەڕاوەتەوە و لە گەڵ داوای لێبووردن لە تاڵوکەی خۆی، نوسخەیەکی بۆ چەند دەرمانان بۆ دەرمانفرۆش نووسیوە و بەرنامەیەی تایبەتی خواردنی بۆ نەخۆش دیاری کردوە و بە تایبەت سپاردوویە کە ئەوەندی بکرێ هۆی ئاسایش و ئارامی فیکری بۆ پێک بێنن.

بیانکینا ئەنجامدانی خاڵی دوایی بەرنامە( سەر گەرمی و ئاسایشی فیکری) بە حەزێکی تایبەتی وەستۆی خۆ دەگرێ. دیارە کیژێکی لاوی وەک ئەو لە گەڵ نەخۆشیکی ئاوا بۆ هەڵبژاردنی هۆی سەر گەرمی کەمێک توشی زەحمەت دەبێ. لە ڕاستیدا دەبێ واز لە هێندێ یاری و سەر گەرمیی ئەوتۆ بێنێ کە دەبنە هۆی دڵخۆشی دۆن پاوڵۆ و بەلام بۆ سلامەتی وی زیانیان دەبێ. لە گەڵ ئەوەش کیژەکە دەستە وستان نیە. ئەو لە بیرەوەری دەبیرستانی خۆی سەر گەرمی بێ زەرە دەبینێتەوە، بۆ نموونە بەری پێی دۆن پاوڵۆ دەخورێنێ، یا مێشان ڕاو دەکا. لە دەبیرستان بە تایبەت لە سەعاتی دەرسدا ڕاوە مێش بوو، لێهاتوویش لە وە دا بوو کە لە کاتی فڕیندا مێش بکوژی و بێ ئەوەی مامۆستاش بزانێ بیگرێ. ئەو دەم ئەو مێشانەی دەگیران دەرزیان دە پشتێ ڕادەکردن و بە ڕیز لە سەر تەخت دایان دەنان و کێ بەر کێ یان پێدەکردن. بیانکینا لەم یارییەدا ناوی دەر کرد بوو. بەلام ئێستا ئەو مێشانەی دەیانگرێ زۆربەیان لەت و پەت دەکا و بە کەشیش دەڵێ:

ئیتر لێهاتووی جارانم نەماوە. لە مەدرەسەی خوشکانی دێر مرۆڤ فێری زۆر شت دەبێ. پاشان کاتێ لە ژیاندا پێوستی پێدەبێ، دەبینێ لە بیری چۆتەوە.

کێ بەر کێی دوو مێشان لە سەر تەختی دۆن پاوڵۆ بەڕێوە دەچێ و بەرگی کتێبی دوعای وی دەبێتە مەیدانی کێ بەر کێ. هێندێ لە مێشەکان دەست بە جێ دەکەونە ڕێ، هێندێ خوار دەڕۆن و لە مەیدان لادەدەن. بەلام تەمبەڵەکان پاش چەند هەنگاو دەکەون. بیانکینا دەڵێ: « ئەوانەی کە نایانەوێ وەپێش کەون، بێگومان ژنن و بە ئانقەست وە دوا دەکەون تا شانازی سەر کەوتن بدەن بە مێردەکانیان. ئەوان دەبنە قوربانی هەمیشەیی هەستیاریی خۆیان.

سەرەڕای جیاوازییەکی کەم دۆن پاوڵۆ هەست دەکات کێ بەر کێی غارە مێش ئەگەر لە نیزیکەوە بێت بە قەدرایی کێ بەر کێی غارە ئەسپ و ترومبیل کەیف و شادی هەیە.

سەرەڕای ئیحتیاتی بیانکینا ڕەنگدانەوەی خۆشی و نیگەرانی کە بە هۆی نووسینی دروشـمی دژی شـەڕ لە ئاوایی بڵاو بۆتەوە، دەگـاتە گـوێچکەی نەخـۆشـیش. « بره نیچە» باس دەکات کە:« ئەوەندە پۆلیس هاتوونەتە فوسا تا ئێستـا کەس ئەوەندە پۆلیسەی لێرە نە دیوە. هەر دەڵێی ئێرە بۆتە ناوەندی خەراپکاران.
بیانکینا بێدەنگ دەبێ.
«جلزو مینا» ژنی ئەو خەرازی فرۆشەی کە لە جیاتی مێردەکەی دوکـان بەڕێوە دەبات لە بەر دەرگای دوکان ڕاوەستـاوە و تەماشـای حەشیمەت دەکا و دەپرسێ: « خەبەری تازەتان هەیە ؟ بێگومان کار کاری بێگانەیە.»
« بره نیچە » سکاڵا دەکا و دەڵێ:
– جێـژنی ئەوەندە جـوان و هەمـوو ڕازی! کە وابوو کێ دەسـتی داوەتە ئەم کـارە دزێوە کە ئەو مەتڵەبە ئەحمەقانە لە دیوار بنووسێ.؟
–دۆن سنو فۆنتە لە وەڵامدا دەڵێ : « پیاوی حەسود هەمیشە لە کەلێن و قوژبناندا هەن. بێگومان ئەوە کاری کەسێکە کە خۆی نەیتوانیوە لە خزمەتی سەر بازی قبوڵ بکرێ یا نەیتوانیوە کوڕەکەی بنێرێ. ئەودەم بۆ داخی دڵی ڕێگای لە وە باشتری نە دۆزیوەتەوە.
زابالیونە دەڵێ:
– جێژنی ئەوەندە جوان، جێژنێکی بەو یەکێتی بیر و ڕا! ئەویش لە شەوی ئەم ڕۆژە دا کە دەبێ کەلانتەر بگۆڕدرێ!
دەرمانفرۆش دەڵێ : « ناشتنی مردوو بەبێ گاڵتە و بووکی بێ گریان قەت نەبوە،
ژنی خەرازی فرۆش هەناسە هەلدەکێشێ و دەڵێ:
– داعبای شەو هەمیشە شوومە، بە خۆشییەوە قانون هەیە!
برەنیچە دەڵێ :
– لە نێو وەرزێراندا ئاگرێکی ژێر خۆڵە مێش هەیە. ئەم ئاگرە بە ڕۆژ دیار نیە، بەڵام بە شەو پریشک داوێ.
دەرمانفرۆش لە وەڵامدا دەڵێ:
– « وەرزێران ؟» قـەت شـتی وا نیـە. وەرزێران خـوێندن و نووسـین نازانن. ئەم نووسـراوانەی دژی شـەڕ بە پیتی کتێبی نووسـراون، هەر پێوەندی بە وەرزێرانەوە نیە.
زابالیونە دەڵێ :– هێندێ لاو هەن ئاقڵیان نەماوە. دیارە مەبەستم کەسێکی دیاری

کراو نیە.
بەلآم دۆن سنو فۆنتە باش تێدەگا کە مەبەستی کێیە و  بە جوانی لە پێشی دادەنێ:
خـاتر جـەم بە کـە کـوڕی من داو تەڵەبی خـزمـەت بوە. شـەرافـەتی داو تەڵەبی لە سەرووی هەمـوو شتێکە. جگە لەوە ئەگەر بە ڕاستی بیانەوێ سەر و بنی ئەمکارە بدۆزنەوە، کوڕی من قەت سۆسیالیست نەبوە.
زابالیونە لە کاتێکا لە بەر تووڕەیی زەرد هەڵگەڕاوە لە وەلآمدا دەڵێ :
– ئەم پینـەیە بە منەوە نانووسێ. هەمـوو دنیا دەزانێ مـاوەیەکـە من بیـر و باوەڕی خۆم فیـدا کردوە. کێیە کە لە سـەرەتاوە سۆسـیالیـست نەبووبێت. موسـولینیش ڕۆژێک سۆسیالیست بوە.
ژنی خەرازی فرۆش دەڵێ:
– بۆ گێڕانەوەی نەزم و ئەمنیـەت هەموو کەس ئامادەیە هەر چی هەیەتی بێدا. یەک پارە دەدا، یەک گـیانی، یەک بیـر و باوەڕی، یەک کوڕەکـانی ویەکـیش کـیژەکـانی.
زابالیونە تەواوی ئەم قسـانە بە مانـای خەراپ وەر دەگرێ و لە کـاتێکا لە تووڕەییـان داگیر ساوە لە ژنی خەرازی دەپرسێ :
– کیژەکانی من ؟ تۆ چکارت بە کچەکانی من داو ؟
ژنی فـەقـیر لەم پرسـیارە هیچ تێناگـا و لە کـاتێکا قـسـەی بێ سـەر و بـەر دەکا بە ناڵینەوە دەڵێ :
– مـێردەکـەم خـەریکە بڕوا. دوکـان لە ژێر باری قـەرزدا پـشتی چەمـاوە. خـوشـکم نەخـۆشی سیلی هەیە. کـاسبی مـە کـەوتۆتە ژێر بارمـتە. بـەمـحـاڵە داخـوا بۆیە دەبێ من کارم بە کاری خەڵکی دیکە دابێت؟
بەلآم زابالیونـە ئارام ناگرێ و هـاوار دەکا : « جـوابم بدەوە! تۆ چکارت بە کچـەکانی من داوە؟»
ژنی خەرازی دەترسێ و بە منگە منگ دەڵێ :
:– بەڵێ، باشـترە ئاشکراتر قسـان بکەین.ڕەنگە پێت وابێ کە مێردی من داوتەڵەب نە بوە ؟لە ئێوە دەپرسم، داوای کردوە یا، نا ؟
کـارمـەندی ئیـدارەی باج دەڵێ : « ئەگـەر نە توانن نـووسـەری دروشـمـەکـانی دیوار بدۆزنەوە، هەمـــوو خـــەڵکی ئـاوایی سـزا دەدرێ. ئەو دەم لە جـیـاتـی کـەلآنتـەرێک کومیسـەرێکی پۆلیس لە شـارەوانی دەکەنە مەعموری ئێرە.»
زابالیونـە ڕەنگی دەگـۆڕێ و دەڵێ : « چۆن ؟ چتـگوت ؟ سـوێند بە شـەرافـەتم ئەگـەر

ئەو ناکەسەی دروشمی لە دیواران نووسیوە بکەوێتە بەر دەستم بەو دەستانەی خۆم پچڕ پچڕی دەکەم.
وشەکانی « مەرگ لە شۆرباوی دەوڵەتی» کە لە سەر پەیژەکانی کلیسا نووسرا بوون، وەها« دۆنا ئادالیزا کولانتومی» نارەحەت کردوە کە ئەوەی سوکایەتی بە خۆی دەزانێ. بابی هەول دەدا تا لە دابەشکردنی شۆرباوی دەوڵەتی پەشیوانی کاتەوە و پێی دەڵێ : « بە ڕاستی نرخی ئەوەی نیە کە خۆت بۆ کابرایەکی نا کەس و هەق نەناس فیدا بکەی. هەڕەشە بکە کە دەتوێ واز بێنی.
کیژەکە ئیراد دەگرێ و دەڵێ:« ئەگەر من واز بێنم،ئەدی لە کوێ بێنم بخۆم ؟
بابی دەڵێ: نەمگوت واز بێنە، گوتم هەرەشەیان لێبکە
بیانکینا لە دۆن پاولۆ دەپرسێ :
: من نازانم ئەو هەموو پرسیار و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە نووسینی بێنرخی بە خەڵوز نووسراوی سەر دیواران بۆ چیە ؟
دۆن پاولۆ خۆشی سەری سوڕ ماوە و هەول دەدا مەسەلەکە ئاوا پینە بکات :
– وڵاتی تەبلیغات لە سەر بناخەی یەکێتی وشە ڕاوەستاوە. ئەوەندە بەسە یەکێک بڵێ نا، تا جادوو بەتاڵ بێت، ئەو دەمە کە نەزم دەکەوێتە مەترسی و دەنگی موخالیف خەفە دەکرێ.
بیانکینا دەپرسێ :« هەر چەند ئەو دەنگە لە پیاوێکی فەقیر و نەخۆشیش بێت ؟
– بەڵێ ؛ هەر چەندە ئەو دەنگ ەلە پیاوێکی ئاشتیخواز بێت و تەنیا بە شێوەی تایبەتی خۆی بیر بکاتەوە و جگە لە وەش زیانی بۆ مێرولەش نەبێت .
ـــ تەنانەت لەم حالەش دا ؟ ئەم فیکرە کیژی لاو توشی خەم و خەفەت دەکا. بەڵام دەبێتە هۆی دڵگەرمی پیاوەکە. جۆرێک لە دڵساردی پێشووی خۆی شەرمەندەیە و دەڵێ :
– لە وڵاتی تەبلیغات دا، پیاوێک هەر کەسێکی بێ ە هەر چەندەش فەقیر وداماو بێ، کە بە مێشکی خۆی بیری کردەوە، نەزمی گشتی دەخاتە مەترسییەوە. بە خەروار کاغەز چاپکراوە، دروشمەکانی ڕێژیمی دەسەڵاتدار بڵاو دەکەنەوە، هەزاران بڵیند گۆ و سەدان هەزار بەیاننامە و لا پەڕی تەبلیغاتی کە بە خۆڕایی بڵاو دەکرێنەوە، دەستە دەستە وتار دەر و پەند بێژ لە مەیدانە گشتییە کاندا و لە چوار چرایان وتار دەدەن، هەزاران قەشە کە لە بان مینبەرەکانیانەوە هەمان دروشمان دوو پات دەکەنەوە بە ڕادەیەک کە هەموو سەریان سوڕ دەمێنێ. لەم ناوە دا ئەوەندە بەسە کە

کابرایەکی بێدەسەڵات، بونەوەرێکی تەنیا و بێ هێز، بڵێ نا و بە گوێیی تەفەری پەنا دەستیشی بڵێ نا و یا بە شەو لە دیوار بنووسێ: نا! نا تا نەزمی گشتی بکەوێتە مەترسییەوە.

کیژی لاو ترسی لێ دەنیشێ. بەڵام پیاوەکە دێتەوە سەر خۆ. کیژ دەپرسێ :

– ئەدی ئەگەر ئەو پیاوە گیرا و بیکوژن چێ ؟

– کوشتنی مرۆڤێکی کە دەڵێ نا، کارێکی مەترسیدارە. چونکە دوور نیە کە مەیتەکەشی بە سەر سەختی و بە سەیروکە دوو پاتی کاتەوە و بڵێ نا!نا ! ئەو دەم چۆن دەتوانن مەیتەکە بێدەنگ بکەن ؟

برەنیچە دێتە ژوور و ڕادەگەیەنێ کە :

– پۆمپیۆ دەزانێ کێ ئەو دروشمانەی نووسیوە و هەر ئێستا دەچێتە « ئاوەتزانو» تا تاوانبار بە کار بەدەستانی دەوڵەت بناسێنێ.

کەشیش دەپرسێ : « تۆ لە کوێ دەزانی ؟»

– خۆی بە ژنی خەرازی گوتوە.

بیانکینا دەسماڵێک هەڵدەگرێ و بۆلای ئێزگەی ڕێگای ئاسن دەچێ. پووری بانگی دەکات و دەڵێ:

– دەست دەکارێک وەر مەدە کە پێوەندی بە تۆوە نیە . ئاخری ڕۆژێک ئێمە ماڵ وێران دەکەی !

بەڵام بیانکینا دوور کەوتبۆوە.

دۆن پاولۆ لە تەخت دێتە خوار تە چەمەدانی کۆ بکاتەوە و ڕابکات. چەند ڕۆژێکە ئیتر تای نایەتێ و کۆخەکەشی سوک بوە. بەڵام ئەوەندە لاوازە کە بە زەحمەت خۆ لە سەر پێ ڕادەگرێ. بۆ کوێ بچێ ؟

لە بەر خۆیەوە بیر دەکاتەوە: « تەنیا یەک ڕێگای ئاسن هەیە و ئەگەر بە قەتار بڕۆم زۆر بە هاسانی دەگیرێم. ڕوو بکەمە چیا و چەند ڕۆژ لە چۆلی بژیم، بەم بێ هێزییە دەرەتانم لێ بڕاوە.»

چەمەدانی دەکاتەوە و لە ڕۆیشتن پەشیمان دەبێتەوە. کاتێ هەموو لایەنە لێکی دەداتەوە دەبینێ گیرانی لە « فوسا » « ئورتا » گوندی کە لێی لە دایک بوە هەر وا لە چەند کیلۆ میترییە. دۆن بنەدیتوش هەر لەو چەند کیلۆ مێترییە. لە هەر گوندێکی داوسێ یەک لە دۆستانی قەدیمی دەبیرستان دەژی. لە وانەیە« کنچتینۆ ڕاگۆ» خۆی لە گەڵ ئەو مەعمورانە دا بێ کە بۆ گرتنی دێن. هەڤاڵی گرتنی بە هاسانی لە

تەواوی مــارسـیکا دەنگ دەداتـەوە و دەگـاتە گـوێی وەرزێڕەکـان. لە شـەوی درێژی زسـتـاندا لە پەنا ئاگـر دانی کوژاوە، فـەقـیـرە برسـیـەکـان لە یەکـتـر دەپرسن: بە ڕاستی ئێستا ئەو لاوەی هاو ولاتی ئێمە پیترۆ سپینا دەبێ خەریکی چکارێک بێ.؟ بیر لە چی بکاتەوە ؟ داخـوا بە زیندوویی لە زیندان دێتـە دەر .؟ بێگومـان کەسـانی واش دەبن کە بلێن: خۆزیا ئەو ئێستا لە نێو ئێمە بوایە!.....

نێوانی « فوسـا » و « ئاوەتزانو» بە قەتار لە سەعاتە ڕێیەک زیاتـر نیە. بەلام بیانکینا و پۆمـپـیۆ تا درنگی شـەوی ڕابردوو بۆ مـالێ نا گـەڕێنەوە. بیـانکیـنا بۆ پووری و بۆ کەشیش دەگێڕێتەوە کە:

- ئێـمــە پێکەوە شــەڕابمان خــواردەوە و نانمان خــوارد و کــاتێ دەمــانویـست بەگەڕێینەوە بـە پێش سینەمـایەکدا تێپـەڕین و چوویـنـە ژوورێ. پووری پێی دەلێ: « تۆ دەبیـە هۆی مـالوێرانی و ڕیسـوایـی بنە مـالەی « جـیـراسـولە». چاوم ڕوون، تۆ ئێستا ئیتر دەچیە سینەماش.؟

کەشـیش دەپرسێ: « بۆ تۆ نەتگوت کە لە گـەل پۆمـپـیۆ بە کـێشـە هاتی. چـما ئەو دەیدەویست بچێتە« ئاوەتزانو» تا کەسێک پێوە کات ؟

بیانکینا نا ڕەحەتە لە وەی کە لە کن پووری ڕوونی بکاتەوە. دەلێ:« پۆمپیۆ هەمیشە خۆی وەک «ڕۆبسـپێر» بە سام و هەیبـەت نیشـان بدا. بەلام کـاتێ لە گەل ژن بەرەو ڕوو دەبێ، زیاتر وە « دانتون» دەچێ.

بێگومــان برەنیــچــە شـــانازی بەوە دەکــا کــە برازاکــەی ئەومندە خـوێندەوار و تێگەیشتوە. بەلام خۆشی دەیویست بزانێ خەبەر چیە، بۆیە دەپرسێ :

- باشە، ئاخرەکەی کێ پێوە کرا.؟ داخوا تاوانبار بەو زوانە دەگیرێ.؟

- لە نیزکەی ڕێگای ئاسنی فـوسا، کـاتێ دەمانویست سـواری قەتار بین پـۆمپیۆ بە منی گـوت : بە ڕاسـتـی و بێگومـان دەزانێ کێ ئەو دروشـمـانەی نووسـیوە. لە نـێو قـەتار دا لەمبـارەوە باسـێکی توندمـان هەبوو، تەنانـەت دەست بە یەخـەش بووین. لە ئیـزکـەی ڕێگای ئاسنی « ئاوەتزانو» کـاتێ کـە دادەبـەزین پۆلیس چاوە ڕوان بوو. بەلام پۆمپیۆ بیر و ڕای گۆڕی.

- ئاخرەکەی کێ پێوە کرا ؟

بیانکینا لە وەلامدا دەلێ :

- کـابرایـەک کـە بە دوو چەرخــە لە ڕێگای « ئورتا » وە هاتوە، پۆمــپـیـۆ گــوتی ئەو کـابرایەی دیوە بەلام ناتوانێ دوو بـارە بیناسـێـتـەوە. منیش قـسـەکـانی ویم پشت

ئەستور کر دو گوتم منیش ئەو شەوە بەو دوو چاوانە کابرایەکی دوو چەرخە سوارم دیتوە کە لە ڕێگای « ئورتا » وە دەهات.

برمنیچە بـە دەنگی بەرز دەڵێ :« لە ئورتا؟ « جلزامینا » هەقی بوو دەیگوت ئەو کارە کاری بێگانانە .

برە نیچە ڕادەکاتە کن ژنی خەرازی و پێی دەڵێ : « ئێمە هەقمان بوو کە دەمان گوت کابرا بێگانە بوە. کابرایەکی خەڵکی ئورتا ویستوویەتی فوسا وێران بکات.»

ئەم هـەڤاڵـە لە هـەمـوو شـوێنێ بڵاو دەبێتـەوە و دیارە ئەوانەی لەو شـەوە دا دوو چەرخە سواریان دیوە. زیاد دەبن. بەلام چونکە لەو کەسانە نە بوە بێتە بازار کەس نەیناسـیـوە. ئەو لە ڕاسـتـیـدا نەناسـراو بووە. کێ چوزانێ لە وانەیە هـەر ئەو نەناسـراوی ئاسـایی ١ بوو بێت. کـاتێ نیگەرانـی دۆن پاوڵۆ کەم دەبێتـەوە هەست دەکات حـاڵی باشترە و تـەنانەت خۆی شاد و بەکەیف و چالاک دەبینێ. ئیشتیای خـەبات و ئاژاوە نانەوەی زیندوو دەبێتـەوە. دێتـە سـەر ئەو فیکرە کە بچێ لە ڕۆم نیشتە جێ بێت و لە وێوە جار و بار بە مەبەستێکی دیاریکراو سەفەرێکی شەوانە بۆ « مـارسیکا » بکات. عەمبارێکی دار کە مـڵکی مـامەکانی بوو لە پشتی ئیدارەی پۆستی« ئورتا » دەبێ هێشتـا مـابێ. بۆ دەست پێکردنی کـار دەتوانێ ئەو عـەمبارە ئاگر تێبـەردا . لە دەور و بـەری ئیزگـەی ڕێگای ئاسنی « ئاوتزانو» کـارخـانەیەکی بەرهەم هـێنەری کـەل و پەلی شـیـمـایی هەیە و ئێـسـتـا بۆ بە شـارسـتـانیکردنی حـەبەشـە، گـازی کـیـمـیـایی بەر هەم دێنێ. ئەم گـازە ناسـووتێ. دوور نیـە نە خـوێندەواران تێبگەن و بە دوای مندا بێن. لە کـاتێکا دۆن پـاوڵۆ بیـر لەم نەخـشـە جـیـاوازانـە دەکاتەوە. دۆن جـیـراسـولەی قـەشـەی فـوسـا دێت و بۆ چاو پێکەوتنی کلیـسـای ناوچەی کـەشـیش نشـینی خـۆی داوەتی دەکـات. ئەو ئـەم داوەتە قـبـوڵ دەکـات. دۆن جیرا سولە لە تـەمەنی شەست ساڵی دایە، بەلام پیرتر دیاری دەکات. ڕیشی هەموو سپی بوە و ڕ ومـەتی زەرد و ئێسـقـانی و بە پشتی چەمـاوە بە ڕێگادا دەڕوا . خۆی دەگێرێتەوە کە گەورەترینی دە منداڵ بوە و جگە لە خۆی و برە نیچە هەموویان مردوون. دەزگای پاپ لە بیانیـەوە تا ئێواریێ هەدای پێنادا . جگە لە پێش نوێژی مـەسح دەبێ ئیقرارانیش گوێ بداتێ و مـردوان بنێژێ و ئاینی عیبـادەتی نۆ ڕۆژە و سێ ڕۆژە و دوعا خوێندن و شتی دیکە بە ڕێوە بەرێ. جگە لە وانە دەبێ بە سـەر ئەنجـومـەنی خـەیریە و کـار و باری خێرات و میـرات وداب و ڕەسـمی « سن فرانسوا » ش ڕابگات.

کەشیش پێی دەڵێ :
- من دەبێ لە دەرفەتی کەم کەلک وەر بگرم تا بتوانم دوعایەکیش بۆ خۆم بکەم و خۆم بۆ مردن ئامادە بکەم کە هەست دەکەم لێم نیزیک بۆتەوە و لە گەڵ ئەوەش زۆر بە کاوە خۆ بۆ لام دێت. کاتێ شەو قەشەی پیر ئەوەندە هیلاک دەبێ خۆ لە سەر پێ ڕاناگرێت. بەمحاڵەش زۆر جار تەنانەت لە فەسلی هەرە خەراپی ساڵدا نیوە شەو وەخەبەری دێن و دەبێ بچێتە سەر نەخۆشێکی کە لە سەرە مەرگدایە. لە گەڵ ئەوەش سکاڵا ناکات و دەڵێ:
- پیاوی خودا هەمیشە دەبێ ماندوو بێت. فیکری خەراپ لە بێکاری دا پەیدا دەبێ و شەیتان هەمیشە لە پشت سەری وان لە کەمین دایە.
لە مەیدانی کلیسا دا دەستەیەک منداڵی بەرەڵا یاری دەکەن و بەملاو لادا ڕادەکەن. ئەوان ئێستا ڕادەوەستن تا ئەم دوو کەشیشە تێدەپەڕن. کەشیشی پیر پێیان دەڵێ:« چارەگە سەعاتێکی تر دەرسی شەرعیات دەست پێدەکات.
لە سەر پەیژەکانی کلیسا، دۆن جیراسولە تاوێک ڕادەوەستێ تا پشوێک بدا. بە دۆن پاولۆ دەڵێ:
- ئێوە خۆتان لە بارەی ئەم شەڕەی تازە چۆن بیر دەکەونەوە.؟
ژنێک لە بەر دەرگای کلیسا چاوە ڕوانی کەشیشە تا تاریخی تەعمیدێک دیاری بکات.
دۆن جیراسولە لە وەلامی دۆن پاولۆ دا دەڵێ:
- قەشەی گوند ئەوەندەی کار هەیە، کاتی بیر کردنەوەی نیە. جگە لەوە« تەورات و ئینجیل» و شوانی کلیسا هەن کە ئێمە ڕێنوێنی بکەن.
دۆن پاولۆ داوای لێبوردن دەکا و دەڵێ:« ببورە من مەبەستی خۆم بە شێوەیەکی خەراپ دەر بڕی
لە دەرگای چوونە ژووری کلیسا، پەردەی نەقاشی چەند ڕەنگی بە دیوارەکانی ئەملا و لا دا دەبینرێن کە ئیماندارانی موجیزە دیتوو نەزری کلیسایان کردوە و لە سەر هەر پەردەیەک شکڵی جیسمێک کێشراوە، وەک دەست، لاق، لوت، گوێ، مەمک و بەشی دیکەی بەدەن کە ئەوانەی نەزریان داوە بە کەرامەت وەگیریان کەوتۆتەوە. کاتێکی دەچنە ژوورێ نێو کلیسا تاریک دێتە بەر چاو. بەڵام زۆری پێناچێ چاو بە تاریکی ڕادێت. قەڵشتی سەنگ فەرشی هەردی کلیسا پڕ نە کراونەوە و لە هێندێ جێ هەڵکەنراون. بەشێک لە وان لە ژێر کراسی ڕەشی ئەو ژنانە دا کە خەریکی

دوعـان شـاراونەوە. ئەو ژنـانە بۆ ڕاگـەیاندنی ملکەچی وپاڕانەوە بە شـێـوەی ڕۆژ هەڵاتییان لە ماڵی خودا لە سەر ئەژنۆ دانیشتوون.
پیـرێژنێک ڕوومـەت لە هـەردی دەخـا و لە سـەر ئەژنۆیان بـۆ لای نوێژ دانـی« سن سکرەمان» دەچێ و هەموو جار زمان لە هەردی کلیسا دەخشێنێ و لە پشت سەری خوی خەتێکی سپی لە ئاوی زاری وەک جێ پێی شەیتانۆکە بە جێ دێڵێ.
کـوڕەکـەی لیـبـاسـی سـەر بازی لە بەر دایە و بە هەنگاوی ورد لە پەنای دەڕوا و شەرمەندە و داماوە. دۆن جیراسـولە تاوێک لە پێش قەفەسەی شتو مەکی موبارەک ئەژنۆ دادەدا. دۆن پاولۆش لاسای دەکاتەوە. لە سـەر مـیحرابی کلیسا پەیکەرێکی بچوک دەبینرێ کە جەنازەی مەسیح لە سەر کۆشی دایکی نیشـان دەدا. مـەسیح وەک جۆتیـارێکی فـەقیـر دەچێ کە لە شەڕێکدا کوژراوە و تەرمەکەی بۆنی گرتوە. برینەکانی دەست و قاچی و قەڵشتی ئاواڵەی پەراسووی وەک کانگاریای تەشەنەی کـردوو دێنـە بەر چاو. دایک وەک بێـوە ژنی تاجـرێکی دەوڵەمـەند دەچێ کـە لە بەد بەختیان داماوە. دوو دڵۆپی ئەسرێن وەک پارافینی ڕوون لە سـەر ڕوومـەتی جوان و بێرەنگی دەدرەوشێن، چاوە ڕەشـەکانی بەرە و عاسمان هەڵێناوە، دەڵێی نایەوێ ئەم کوڕە عـاسمـانییـەی کە ئـەو هەموو هیـوایەی پێبوو و لە ڕاستیـشدا ئەنجامی لەوە دەردە دار تری تووش نە دەبوو، ببینێت. چارشـێـوێکی زۆر جوان گوڵدروو کراوە، قژەکانی دادەپۆشێ و تا نێو چاوانی هاتۆتە خوار. دەسرەیەکی تۆڕە زۆر جوانی لە قـامکی چکۆڵەی دەسـتی ڕاستی بەسـتوە. لە خوارەوەی وی، لـە سـەر پایەی پەیکەر ئەم وشـــە ســـووتێنەرانـەی کـــە بۆ خـــودی ئەو دەکـــەرێنەوە بـە خـــەتی زێڕین هـەڵکـەنـراون:(Videte si dolor vestrum est sicut dolor meume
بزانن ئایا دەردی ئێوە لە گەڵ دەردی من یەکسان نیە )
دایکی سەر باز کە ئێستا ڕیازەتی خۆی تەواو کردوە بە گریان و هاوار ڕوو دەکاتە جیراسولە و دەڵێ :
– تۆ ئەو خـودایە ئاغای کەشـیش کـارێکی وابکە کە ئەو یارمـەتیـەی ژیان زوو بدەن ئەگینا چۆن دەتوانم بژیم.
– کام یارمەتی ژیان ؟
دایکی سەر باز لە ڕوونکردنەوەیدا دەڵێ:
– ئەو چوار لیرەی ڕۆژانە کە بۆ دایکانی سەر بـازانی ئامادە دیاریکراوە. ئیمـڕۆ لە ڕۆژنامە دا نووسیبویان.

ژنێکی دیکە دێتە پێش و لە کەشیش دەپرسێ:
- لە کــوێ دەبێ داوای ئەو یارمــەتیــەی ژیان بکەین. لە ئیــدارەی پۆست یا لە بەخشداری ؟ ئێوە ئاغای کەشیش ناتوانن نامەیەک بۆ من بنووسن.؟
ئەم دوانە هێـشـتـا نـە چوونە ژووری خـەزێنەی جـەواهێراتـی کلیسـا، ژنێکی دیکە دەگـاتێ. کـوڕی ئـەو ژنە سـورێژەی لێـهـاتوە. دەیەوێ ڕێگای بدرێ تا گـۆشــەی پارچەیەک بە ڕۆنی چرایەک کە لە پەنا قەفەسەی شتە متفەڕکەکان دایسێ، تەڕ بکا و لە سـەر دڵی منداڵە نەخۆشـەکەی دابنێ. دۆن جیـراسـولە ڕێگای دەدا، پاشـان بە دۆن پاولۆ دەڵێ :
- بەڵام لە بارەی شـەڕ. لە بەر ئەوەی جـەمـاعـەتـی کەشـیـش مـەجـبـورن لە ڕاست و چەپ لە تەقـەلا دا بن، زۆر ناتوانن بیـر بکەنـەوە. ئێـسـتـا کـارمکـانـی یارمـەتـی ژیان دەست پێدەکرێن. پاشـان دوعا بۆ ئەوانەی خـەریکی کشت و کاڵن. دیارە ئیدارەی دەوڵەتیش هەن بـەڵام فـەقیـر بڕوا بە وان ناکـەن. جگە لەوە لەو شـوێنانـە کـە لە گەڵ فەقیران خەراپ ڕەفتار دەکەن، ناچار دێنە کلیسا و دەگرین.
دۆن پاولۆ دەڵێ :
- پێش چەند ساڵ لە ڕۆم لە ئاهەنگی جێژنی پیرۆزی پەنجا ساڵە دا لە گەڵ پیاوێک بوومە ئاشنا بە ناوی « دۆن بنە دیتـو» کە خەڵکی ئەم ویلایەتە بوو. ئەگەر بە هەڵە نە چوبم ئەو دەم مامۆستای مەدرەسەیەکی ئایینی زمانی یونانی و لاتین بوو. داخوا ئەو هێشتا زیندوە؟ داخوا ئێوە جار و بار دەیبینن.؟
دۆن جـیـراسـولە دەیەوێ جـەواهێـراتی کلیـسـا بە دۆن پاولۆ پێـشـان بدا. لە قەفەسەیەک نیزیک دەبنەوە کە تەواو پانایی دیواری گرتوە. بە زەحمەت دەرگای وی دەکاتەوە. قەشەی پیر لە بان قەفەسەوە مینا کارییەکان و ئاڵتون و ئامرازی نیشان دەدا. مـجرییەکی تایبەتی لە نێوە ڕاستییە کە پەیکەری نێو قـەدی سنت ئانتوان- یان تێدا داناوە. لە خـوارەوەی قـەفـەسـە ژمـارەیەکی زۆر عـەبای ئاڵتـون دروی کـەشیـشـی و کـراسی ئاوریشم ولیـبـاسـی تەشـریفـاتـی تیکە لە بە جـوانی کـوڵدرو کراوە. لە پەنا یەک هەڵواسراون. خزمەتکاری کلیسا دێتە ژوور و دوو پیاڵە شەڕاب تێدەکا. ئاخرەکەی قەشەی پیر دەڵێ:
- دۆن بنە دیتـو پیـاوێکی پیـرۆز و فرە نازایە. حـەفـتـا سـاڵ ژیانی وی دەبێ سـەر مەشق بێ و بۆ هـەموانمان مامۆسـتای زانست و ئیمانە. بەڵام ئێستا کە گەیوەتە بارەگـای ئەبەدیەت، بێـزاری ئەو لە شـێوە بیـر کـردنەوەی خـەڵکی ئێـسـتـا و پشت

بەستنی لە ڕادە بەدەری بۆ خودا، توشی هێندێ ئاخافتنی کردوە کە لە پلەی کوفر و زەندقە دایە. خۆزیا تۆ لە ساڵەکانی بەر پرسایەتی پلەی ڕوحانیەت دا، ئەوت ناسیبایە. کاتێکی ئەو ئیجازەی وەر گرت من هێشتا خوێند کار بووم. سەبارەت بە گەورەیی و گران و سەنگینی و ژیانی ساکاری شەخسی و هۆگری بە کلاسیکەکان، ڕێزێکی زۆری بۆ قایل بووم. ئەو ویستبووی کە هەوەڵین نوێژی مەسح لە نوێژدانی زیندوان و دوو هەمیان لە خەستەخانە ئەنجام بدات. دیارە لە بەر ئەوەی کە دایک و باب و کەس و کاری بنە ماڵەی نوێژی مەسحیان بە جێژنێکی گەورە دەزانی و دەبوایە لە نێو جەماعەت بە ڕێوە بچێ، دەتوانی تێبگەی کە لەم کارەی وی چ هەرایەک لە بنە ماڵەکەیدا ساز بوو. دژایەتی لە گەڵ بیر و ڕای گشتی بەم شێوە سوکایەتیە هەر لەو کاتەوە زەینی باڵا دەستەکانی بە خۆوە خەریک کردوە. هەر بۆیەش چونکە نەیاندەویست حەوزەیەکی کەشیش نشینی بدەنێ. کاری دەرس پێگوتنەوەیان پێ ئەسپارد. لە ڕاستیدا وا دەزانرا کە موتاڵای شوێنەواری کلاسیک و ئاخافتن لە گەڵ شاگردانی گەنج ئەخلاقی وی هێدێتر دەکات، بەڵام پێوەندی لە گەڵ باڵا دەستان بەرە و باشی نەچوو. زۆر کەس ئەم خەسڵەتەی ئەویان کە بە دوای شوێن ویلە نە دەکەوت، بە شەرم و ڕیسواییان دەزانی. ئەم ئەخلاقەی ئەویان کە هاونشینی لە گەڵ شاگردەکانی پێ لە هاو نشینی لە گەڵ هاوکاران و باڵا دەستان پێ باشتر بوو، بە شێوە سووکایەتیەکیان وەر دەگرت. لە ئاخریدا لە دەرس گوتنەوەشیان وەلا نا. لە تاق کەوتنەوە و گۆشە نشینی ئێستاشی من هەمیشە هەولم داوە دۆستایەتی خۆمی لە گەڵ بپارێزم. بەڵام ئێستا ئیتر بە ڕاستی ئیجازەم نیە دۆستایەتی وی بکەم.

دۆن پاولۆ دەپرسێ: «لە وانەیە ئەخلاقی وی زۆر گۆڕا بێ.»

– کابرایەکی فوسایی کە یەکێ لە ئیمانداراتی قەڵەمڕەوی کەشیش نشینی منە و چەند ڕۆژێک لە باخچەی دۆن بنە دیتو کاری کردوە بە گوێی خۆی لێی بیستوە کە گوتوویەتی پاپی ئێستا لە ڕاستیدا دەبێ ناوی «پونس یازدەهەم[1]» بێت. لە «ڕوکادی مارسی» کە دۆن بنەدیتو ئێستا لە وێ نشتە جێیە، ئەم ناز ناوە زار بە زار دەگەڕێ و لە هەموو شوێنێ بڵاو بۆتەوە و خەڵکیش چونکە لە نەزانی و ساکاریدا دەژین، سەبارەت بە ڕێزێکی بۆ دۆن بنە دیتو یان هەیە، ئەوەیان باوەڕ کردوە. بەڵام ئەو ئیماندارە نیشتە جێی کەشیش نشینی من چونکە کەمێک گومانی لەوە دا هەبوو هاتە ئێرە و هەر لەم خەزێنەیەی کلیسا دا لە منی پرسی: ئایا ڕاستە کە

کلیسا ئێستا کەوتۆتە دەستی یەکێ لە پاشماوەکانی« پونس پیلات »؟ یانی ئەو کەسەی « کاتێ گیر و گرفتێک رووی تێدە کرد وازی لێ دەهێنا و دەیگوت پێوەندی بە منەوە نیە »

دۆن پاولۆ دەپرسێ: « ئێوە چ وەڵامێکتان داوە ؟ »

قەشە بە سەر سوڕ مانەوە سەیری میوانی خۆی دەکات.

دۆن پاولۆ دەڵێ : ببورە، من مەتڵەبەکەم بە شێوەیەکی خەراپ دەر بڕی.

خزمەتکاری کلیسا دێت و ڕادەگەیەنێ کە ژن لە کلیسا چاوە ڕوانی دەستپێکی زیکری دەستێن و منداڵیش بۆ دەرسی شەرعیات هاتوون. دۆن جیراسولە دەڵێ :

– ئێستا لە لایەن ئەنجومەنی ئەیالەتی دوور خستنەوان خەریکە حوکمێک دژی دۆن بنە دیتو دەر بکرێ. بەڵێ، کاری وی گەیوەتە ئێرە.! لە گەڵ یەکێک لە شاگردانی قەدیمی وی کە لە حیزبی ئەیالەتیدا دەستی دەڕوا و ناوی « کنچتینۆ ڕاگۆ» یە و چووین ناو بژی بکەین بەڵکوو بە هەر قیمەتێک بێ نەجاتی بدەین. ئەوە بوو پێکەوە چووینە لای. تەنیا بەو مەبەستە کە بۆ وی فایدەی هەبێ. ئێمە دەمانویست پێشنیاری پێبکەین کە هەر چۆنێک بێ شتێکی نا ڕوون سەبارەت بە گوێڕایەڵی لە حکوومەتی ئێستا و پیرەوی لە ڕێبازی ئێستای کلیسا بنووسێ و هەر ئەوەندەش بەس بوو. ئەو بە ڕووی خۆشەوە پێشوازی لە ئێمە کرد. من کە دەستم پێکرد کە کلیسا زۆر جار ناچارە بۆ خۆ پارێزی لە دەردە سەری گەورەتر لە بەرانبەر کارێکی خیلاف چاو بپۆشێ، ئەو قسەی منی بڕی و بە شێوەیەکی وشک گوتی :« گریمانەی لانی کەمی خەراپە لە وانەیە بۆ کۆمەڵێکی سیاسی ڕاست بێ بەڵام بۆ کۆمەڵێکی مەزهەبی قەت وانیە !» من هەولم دا نەچمە نێو مەعقولات، چونکە کاتی باسکردنی مەعقولات ڕەنگە خەراپتری کوفر لە گەڵ بزیەک بە سەر زماندا بێت. تەنیا وەڵامم داوە:« ئێوە هیچ بە خەیاڵتاندا نایە کە ئەگەر کلیسا بە ئاشکرا شەڕی ئێستای مەحکووم دەکرد چ ڕوویدەدا و چ بەڵایەکیان بە سەر دێنا؟ چەندە زیانی مادی و مەعنەوی زۆر لەم کارە دەکەوتەوە ؟...» و ئێوە ناتوانن فیکری بکەنەوە کە دۆن بنە دیتو بە چ غیرەتێک ئەم وەڵامەی داوە بە من :« و ئێوە جیراسولەی خۆشە ویست. دەتوانی لە زەینی خۆت دا دایبنێی کە یەحیای تەعمید دەر بۆ ئەوەی سەری نە بڕن پیرەوی لە هرود کردبێ ؟ دەتوانی بە خەیاڵت دابێ کە مەسیح بۆ ڕزگاری لە چوار میخە دەستی دابێتە « پونس پیلات» ؟

دۆن پاولۆ دەڵێ : «ئەگەر بچینە نێو مەعقولات و قسەکانی دۆن بنە دیتو باش لێک

بدەینەوە دە بینین کە ئەو قسەیەکی دژی ئایینی مەسیح نەگوتوە.»
دۆن جیراسولە لە وەڵامدا دەڵێ :
- بەڵام کلیسا کۆمەڵگایەکی خەیاڵی نیە بەڵکوو واقعیەتی عەینییە و هەر ئەوەیە کە هەیە. ئێستا نیزیکەی دوو هەزار ساڵ لە تەمەنی ڕادەبرێ. ئێستا ئیتر کیژێکی گەنج نیە کە ڕێگای سەر سەریەتی منداڵانە بە خۆ بدات و ناز و عیشوە بکات، بەڵکووخانمێکی پیرە، بەڵێ، زۆر پیر کە دنیایەک ئەدەب و فیز و ئەرکی لە بەر چاو گرتنی داب و نەریت و مافی لە پێشە. ئاشکرایە کە مەسیح ئەوەی دامەزراندوە، بەڵام پاش وی حەواریون هاتوون و پاش ئەوانیش پشتاو پشت پیرۆزەکان و پایەکان پەیدا بوون. کلیسا ئیترگرۆ و دەستەیەکی نهێنی نیە بەڵکوو میلیۆن میلیۆن خەڵک لە پشتی وێستاوە کە پێویستیان بە پشتیوانی وی هەیە.
دۆن پاولۆ لە زاری دەر دەپەڕێ:
- چەند چاکیان پشتیوانی لێدەکات کە بۆ شەڕیان دەنێرێ. جگە لەوە کنیسەی کۆنە ساڵی جولەکەش لە سەر دەمی پەیدا بوونی مەسیح دا، ژنێکی پیر بوو، زۆریش پیر و پێشینەی مێژوویی گەورەی پێغەمبەر و پاشا و قانوندانەر و خاخامانی هەبوو. بە دوای ویشدا دەستەی زۆر هەبوون کە کنیسە دەبوایە پشتیوانیان لێبکات. بەمحاڵە مەسیح زۆر چاو دێری حاڵی وی نەکرد.
دۆن جیراسولە لە بەرانبەر جامی شەڕابی خۆیدا کە هێشتا دەستی لێ نەدراوە، دانیشتوە. وەک هیلاکیەکی کوتو پڕی بە سەر داهاتبێ، چاوەکانی دە نوقێنێ و چەند چرکەیەک هەر وا بە چاوی بەستراو دەمێنێتەوە. لە کاسەی دەقولەوە چووی چاوەکانی ڕەنگێکی شین و لەرزێکی سوک کە تورەیی پێوە دیارە بە نارە نار دەڵێ:« خودایە ! خودایە ! بۆ چی دەتەوێ عەبدی خۆت بترسێنی!»
خزمەتکاری کلیسا دیسان دێتەوە تا بە کەشیش بڵێ کە ژن بۆ زیکری دەسحێب چاوە ڕوانن. منداڵەکان هەرایەکیان دەست پێکردوە کە پەنا بە خودا. دۆن جیراسولە بە زەحمەت لە جێ ڕادەبێ و بۆ لای کلیسا دەچێ کە لە وێ ئیمانداران چاوە ڕوانن. لەو لاشەوە دۆن پاولۆ بۆ میوانخانە دەگەڕێتەوە. لە پێش بەخشداری کۆمەڵێکی پڕ لە هەرا و هوریا دەبینێ. دوو وەرزێری ئورتایی کە بۆ شکایەتێک هاتونە شارەوانی لە لایەن سەت کەسێکی خەڵکی فوسا دەناسرێن کە خەڵکی ئورتان و پەلامار دەدرێن. لە سەر و سەکوتی پەلامار دەران دیارە کە نیوەیان کاسبکارن و نیوەی دیکەیان بێکارە و فەقیرن و لە هەموو لاوە بە چەکەوە هاتوونەتە

وێ. دوو وەرزێری بەد بەخت کە لە هۆی ئەم دوژمنایەتیەی کوتو پڕ بێ خەبەرن جگە لە دەخالەتی ئەو چەکدارانەی کە گرتوویانن و لە بەخشداری حەپسیان کردوون نەیان دەتوانی لە پەلاماری حەشیمەت نەجاتیان بێ. بەڵام لە مەیدانی شار، هەر وا هەڕەشەیان لێدەکرێ. زابالیونە لە سەر ویستی کار بە دەستان دەیەوێ حەشیمەت تۆزێ هێدی بکاتەوە، بەڵام فایدەی نیە. خەڵک تەنیا بە بیستنی ئەم خەبەرە هێور دەبنەوە کە کە دوو وەرزێری «ئورتایی» بە تاوانی هاو کاری لە گەڵ نووسەری نوسینەکانی دژی نیشتمانی - کە دیوارەکانی شاری پیس کردوە - بە ڕەسمی گیراون ە دەیانبەنە زیندان. لە بەر دەرگای میوانخانە دۆن سنۆ فونتە بە دەنگی بەرز خەریکی ڕوونکردنەوە ولێکدانەوەی دژ کردەوەی پاکی نەتەوەمیە لە بەرانبەر کردەوەی دزێوی نە ناسراوی گوندی دراوسێ. هەستی جیاواز کە بە نووسراوەکانی دیواری و بە بڕیارەکانی کار بەدەستانی ڕەسمی ورووژاون، لە ئاست دوو کابرای غەریب دەبنە قینێکی گشتی. دۆن پاوڵۆ ئاگا دار دەبێ کە نامەیەک سەبارەت بە وەفا داری لە ئاست دیکتاتۆری بە ئیمزای تەواوی بێکاران و ژنانی بێکاران کە نێوەڕۆیان شۆرباوی دەوڵەتیان دەدرێتێ گەیشتوە. ئەم خەبەرە دەیخاتە فیکرەوە. بێگومان ئەو هیچ پێی وانەبوو کە چەند نووسراوەی ڕەمەکی بە خەڵوز ئەنجامێکی ئاوا گەورە ولە باری هەبێ بەڵام چاوە ڕوانی ئەوەشی نە بوو کە ئەنجامێکی ئاوا دڵسارد کەرەوەشی هەبێ. ئێستا هەموو نەخشەکانی ئاگر کردنەوەی شەوانەی وەک نەخشی سەر ئاو دێتە بەر چاو. لە بەر ئەوە دیسان لە نێو تەقەلای فیکری جۆر بە جۆر دا ، دادەمێنێ. چونکە لە لایەک ئیرادە حوکمی لێدەکات کە کارێک ئەنجام بدات و لە لایەکی ترەوە بە دایم خۆی بە دوای واقعیەتێکی نا ڕوون دەبینێ کە گاڵتەی پێدەکا و فریوی دەدا و بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ تا دوو بارە لە خۆی دوور خاتەوە، دەکەوێتە فیکری گفتگۆیەکانی لە گەڵ دۆن جیراسولە و گورج بیانکینا دەکاتە مەعمور تا نامەیەکی کورتی تەنیا بە ئیمزاو پیتی هەوەڵی ناوی خۆی بۆ دۆن بنە دیتو بەرێتە« ڕوکادی مارسی». بیانکینا بە یاد داشتێکەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم چەند دێڕەیان بە خەتێکی وردی زۆر جوان و ڕێکو پێک و هێندێ لەرزۆک نووسیوە:

tibi .... non ante verso lene merum cado jamdudum apud )
( me est. eripe te moroe

( بۆ تۆ... ڕۆژگارێکی درێژە کە لە ماڵی من گۆزەیەکی پڕ لە شەڕابی شیرین هەیە

کە تا ئێستا سەری نەوی نە کردوە. واز لە هەموو پێوەندییەک بێنە و بە تاڵوکە وەرە لای من )

لە سـەر دەمی تەواو کـردنی خوێندنیەوە تا ئێسـتـا ئەوە هەوەڵین جـارە دۆن پاولۆ نووسراوەیەک بە خەتی مـامۆستـای خۆی دەبینێ و بە یادی ڕاسـتکردنەوەکانی کە دۆن بنە دیتـو لە سـەر تـەکلیفی دەبیرسـتـانی ئەنجـامی دەدان و هێشـتـا لە بـیری ماوون، خـەتەکە دەناسێتەوە. ئەم جـارەش دەقی نووسینەکە وەک دانان دەچێ بەلام دەقێکی ڕەوان و داوەتێکی خالیسانە.

دۆن پاولۆ دوای نیـوە ڕۆ بە گـاریـیـەکی کە بیـانـکینا بۆی بە کرێ گـرتـوە، بە رەو « ڕوکـا » دەکـەوێتـە ڕێ. گـاری چی بە خـەڵکی « پراتولا» ناسـراوە. کـەشـیـش لێی دەپرسێ: « تۆ خەڵکی « پراتولای »؟

کابرا بە ئاماژەی سەر وەلامی ئەرێ دەداتەوە..

– لە کەنگێوە لە گوندی خۆت بارت کردوە ؟

– ساڵێک دەبێ .

– تۆ لە سەر دەمی ڕاپەڕیندا لە وێ بووی ؟

کـابرا بە ئـامـاژەی سـەر دیسـان وەلامی ئـەرێ دەداتەوە. ئێـسـتـا گـاری بە پـەنا گـوندێکدا دەڕوا کـە پڕە لە باخـی ترێ و لە وێ تازە لـە کـاری ترێ چنین بـوونەوە. ناوچەیەکی نێوەڕاستیی و خۆشە خاکی سوک دێتە بەر چاو.

کەشیش دوو بارە دەپرسێ: « ئێستا بار و دۆخی ژیان لە پراتولا چۆنە ؟ »

– وەک پێشوو، تەنانەت وەک هەمیشە

دۆن پاولۆ غیرەت وەبەر خۆ دەنێ و دەڵێ :

– لە گەڵ ئەوە خەڵکی پراتولا دەتوانن لە مافی خۆیان بەرگری بکەن.

گـاریچی لە سـەر خـۆ ڕوو بۆلای کـەشیش وەر دەگـێـڕێ و تـەمـاشـای دەکـا و دەڵێ :« ئەوانەی کە هەمیشە زاریان کرا بۆوە، ئێستا بەستراوە. بەلام لە قـەبرستـان یا لە زیندان. ئەوانەی لە هەوەڵەوەش بێدەنگ بوون، ئێستـاش هەر بێدەنگن. مـنیش تەنیا کاری خۆم دەکەم.

لە چوونە ژووری ئـاوایی ڕوکـــا، لە مـــەیدانێکی چۆلی نێـــوان دوو خـــانوانـدا، لە چەرخـشـتـێکی گـەورە دا ترێ دەشـێلن. سێ ژن کـە خـۆیان تـا پشت ئەژنۆیان هەڵکردوە، بە لاقی ڕووت ترێ دەشێلن و حەرەکاتیـان وە سەمـایەکی نەرم دەچێ کە لە سەر هێشوە ترییانی بکەن.

پراتولایی دەپرسێ : « تۆ دەچیە کن دۆن بنە دیتو ؟»
- چما تۆ ئەو دەناسی ؟
گاریچی بە ئاماژەی سەر وەلامی نا دەداتەوە. بەلام پاشان لێی زیاد دەکا:
- لە بارەی وی زۆر قسان دەکەن،
- دەلێن چی ؟
- دەلێن : « خۆزیا هەموو وەکی ئەو دەبوون !»
دۆن پاولۆ لە مەیدانی گوندی گاری ڕادەگرێ. تکا لە گاریچی دەکات لە مەیخانەی نیزیک وێ چاوە ڕوانی بێت. خۆی چەمەدان هەڵدەگرێ، لە گردێک سەر دەکەوێ کە لە وێوە مـاڵی بچـوک و باخـچـەی دۆن بنە دیتـو دیارە. لە بەر ئەوەی زات ناکا بە لیباسی کەشیشە بچێتە خزمەتی لە پێشدا فیکری کردۆتەوە یەخە و کراوات و شەو کڵاو هەموو شتێکی کە بۆ گۆڕینی لیباس بگونجێ ئامادەی کردوە. ڕێگا چۆل و خوارە پێچەیە. ئەو برمو بەری بە درک و دار داپۆشـراوە. دۆن پاولۆ لە ڕێگا لا دەدا و پاش چەند چرکەیەک لیباسی گۆڕیوە و دێتەوە سەر ڕێگا .
دۆن بنە دیتو ی لە بەر دەرگای ماڵەکەی دەبینێ. هەر دەلێی پیرە مێرد زانیویەتی کە لەو کاتە دا دەگاتێ. هەر تک پیاو لە کاتێکا لە بەر ووروژانی ناخیان داگیرساون، دەستی یەکتر دەگوشن. پیرە مێرد میوانی خۆی بۆ ژوورێکی گەورە ڕێنوێنی دەکات کە پڕە لە کتێب و ئامرازی باخەوانی. لە پەنا بوخاری لە سەر کورسییەکی ڕاحەتی دایدەنێ و خۆشی لە پەنا مرۆڤی لاو لە سەر کورسییەکی ئەویتر دادەنیشێ. پیری وەها پشتی چەماندوە کە زۆر کورتتر لە شاگردی قەدیمی خۆی دیاری دەکا. ئەوی دیکە لە کاتێکا دەیەو ێ بە سەر ووروژان و نیگەرانی خۆیدا زاڵ بێت، خۆی بە ئارام و شاد نیشان دەدا و بە پێکەنینەوە دەلێ : « ئێستا ئەو مەڕە ون بوە بە پێی خۆی بۆ لای شوانی خۆی دەگەڕێتەوە.»
پیرە مێرد بە سەر سوڕ مانەوە سەیری ڕوخساری پیاوی لاو دەکات کە زووتر لە کات پیر بوە و چونکە ئاسکی گاڵتەکە تێنە گەیشتوە سەر ڕادەوەشێنێ و بە تاڵی دەلێ:
- تۆ نازانی مەڕی ون بوو ئێمە کامیانین. نازانی کامە لە ئێمە پێویستمان بە لێبوردی ئەویتر هەیە و کامە لە ئێمە خۆمان سەر شوڕ تر و نیگەرانتر دەبینین. بەلێ ، ئەی دۆستی من ! خەفەتبارە کە ئینسان لە تەمەنی من دا هێندێ شت تێبگات.!

عـەبدەكـانـی هـەرە بە ئەمـەكی خـودا ئـەو كـەسـانە نین كـە نوێژی مـەسح دەكـەن و خۆشیان بە پیاوی باریتەعالا دەناسێنن.

پیـاوی لاو لـە وەی كــە دەبینـێ پیـرە مــێـرد ڕاست وەک دەورانـی ڕابردوو باسـی باریتـەعالا دەكـات، دەترسێ لە وەی كە نە كا لە زەینی میواندارێدا خـاڵێكی گومـان سـەبارەت بە وی هـەبێ. گومانێكی كە دەرفـەتی هاونشینی تێک بدات. داخـوا پیرە مێرد پێی وایە كە ئەو هێشتا بڕوای بە مـەزهەب هـەیە ؟ بۆیە بە ئاهـەنگێكی كە لە پڕ گۆڕاوە دەڵێ :

– من چەند سـاڵە كـە بڕوام بـە باریتـەعـالا نـە مـاوە. دیارە ئەوە ورووژانێكی بڕوای مـەزهەبی بوو كە منی بۆ بزووتنـەوەی شۆڕشگێڕی ڕێنوێنی كرد. بەڵام لە پێ واژۆی بزووتنەوە دا من كـەم كەم خـۆم لە پەتی دەمار گرژی مـەزهەب ئازاد كـرد. ئەگـەر بە پێچەوانەی ویستی خۆم شتێكی مەزهەبیش لە وجودم دا مابێت لە مەو دوا نـەک هـەر بۆ مـن نابێتــە یارمــەتی، بەڵكوو دەبێــتــە هۆی ئازاریشـم. ئەگــەر من ڕەنگە شۆڕشگێڕێكی خـەراپ، شـۆڕشگێڕێكی دڕدۆنگ و خـۆ پارێزم بێگومـان لە بەر فێر كردە و پەروەردەی مـەزهەبییە كە لە زارۆكیدا وەرم گرتوە. لە لایەكی دیكەش ئەگـەر ئەو فێر كردنە نە بایە، داخوا من هـەرگیز دەبوومە شۆڕشگێڕ؟ داخوا قەت ژیانم بە جیدی وەر دەگرت.؟

پیرە مێرد بزەی دێتێ و دەڵێ :

– هیچ گـرنـگ نیـە. لە كـاتی ڕێک كـەوتن لە سـەر كـارێک و لە خـەباتی نهـێنی دا باریتەعالاش مەجبورە خۆی بشارێتەوە و ناوی خواستە لە خۆی بنێ. جگە لە وەش تۆ دەزانی خـوداش هێندە مـەبەسـتی ناوی ڕاسـتـە قینەی خـۆی نیـە و تەنانەت لە سـەرووی هـەموو حوكـمە عاسـمانیـەكانی خـۆیدا پێی داگـرتوە كە هیچ كـاتێ بە خۆڕایی ناوی ئەو بـە سـەر زماندا نەهێنن. كێ دەزانـێ هـەر ئـەو ویستی داد پەروەری كــۆمــەڵایەتی كــە ئیــمــڕۆ كــۆمــەڵانی خــەڵكی وەخــۆ خــســتــوە یەک لـەو ناوە خـواسـتـەمـەنیـانەی باریتـەعـالا نەبێ كـە بۆ دەر باز بوون لە پشكنینی كلیسـا و بانكەكان لە خۆی نە نابێت.

فیكری ئەوە كە خـودا نـاچار بێ بە پاسـپۆرتێكی سـاختـە بە دنیادا بسـوڕێتەوە، پیاوی لاو وە كـەیف دەخـات. بە سـەر سوڕ مانەوە لە سیـمای مـامۆسـتـای خـۆی ڕادەمـینێ و لە پڕ ئەوی لە گـەڵ ئەو بیـرەوەریەی كـە سـاڵەكـانی دووری لە زەینی خۆیدا ڕایگرتبوو، جیاوازی دەبینێ. دۆن بنە دیتو بێگومان ئێستا زۆر لێی نیزیكتر

بۆتەوە، بەڵام بە لە بەر چاو گرتنی ئەو هەموو رەنج و ناڕەحەتی کە بە سەر ئەو پیرە مێردەی تەنیاو تاک داهاتوە، پیاوی لاو بە قوڵی خەفەتبار دەکا و زاری دەبەستێ.

پیرە مێرد دیسان دەڵێ :

– من لێرە لە گەڵ خوشکم و لە نێو کتێبەکانم دا دەژیم. ماوەیەکە نامەکانی من بە سانسۆڕ کراوە دەگەنە دەستم. ڕۆژنامە و کتێبەکانیش ئەگەر لە ڕێگا دا بزر نە بن وە دوا دەکەون. ناچمە سەر دانی هیچ کەس و چاو پێکەوتنی جار و باریش کە هەمە ئەوەندە خۆش نین. لە گەڵ ئەوەش لە گەڵ ڕەوەندی زۆر شتان ئاگا دارم. ئەو شتانەی کە هەمووی باسی فەساد و خەراپییە. کلیسا بۆ گێژ کردنی خەڵکی بێچارە لە واقعیەتی مەزهەبی تریاکی دروست کردوە. ئەوەی کە لایقی خودایە داویانە بە قەیسەر و ئەوەی شایستەی قەیسەرە داویانە بە خودا. ڕوحی مەلەکوتی خودا لە کلیسا باری کردوە و کلیسا بۆتە بونیادێکی مادی و بە تەواوی ڕەسمی و قەرار دادی و خەریکی کار و باری جیهانی و چینایەتیە. « ژان باتیست» بێگومان لە گەڵ ئەو کلیسایانەیەتی کە دەیگوت : « ئەی وچەی عەزیا، کێ فیری کردووی تا لە بەرانبەر قینێکی لێت نیزیک دەبێتەوە، ڕابکەی؟» منیان بۆ ڕۆم بانگ کرد تا لە وێ هێندێ هەڕەشە و سەر کۆنە ببیسم. هەر ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بردمە سەر هۆیەکی لێبڕاو بوو بۆ دیاریکردنی ڕێبازی ژیانی مەعنەوی من. هەست دەکرێ کە دەرباری پاپ بۆ کۆیلەتی ڕۆژ هەلاتی ملی ڕاکێشاوە. بەلام بە ڕواڵەت فەرمانڕەوایە و دەسەلاتی وی درۆیە. بە تایبەت کەشیشە لاوەکان کە سەبارەت بە پشتیوانی مام و خاڵە خاوەن مڵک و بانکدارەکانی خۆیان لە دەر باری پاپ شوێن ویلەی گرنگیان وە گیر کەوتوە، منیان بە گرژی و گاڵتە وەر گرت. ئاشنایانی پێشوو بۆ ئەوەی تێوەر نەدرێن لە قبولکردنی من خۆیان دەپاراست. پاشملەی من شتو مەکی منیان دەیشکنی و دەفتەر چەی یاد داشتەکانیان لێ دزیم. کاتێ پرسیم:« ئێوە لە بارەی شەڕی تازە کە لە نێوان دوو میللەتی مەسیحیدا ساز بوە، چۆن بیر دەکەنەوە؟» کەشیشە گەنجەکان وەک ئەوەی لە گەڵ پیاوێکی خەراپکار ڕوو بە ڕوو بن، لە بەرم هەڵدەهاتن. لە گەڵ ئەوەش کاتێکی یەک لەوان بە هەڵکەوت پاش دڵنیایی لە وە کە کەس قسەکانی نابیستێ، زاتی کرد کە وەلامم بداتەوە. مەبەستەکانی خۆی بە شێوەی نارۆون و دوو لایەنی دەردەبڕی. بۆ نمونە دەیگوت: لە لایەکەوە ڕاستە کە .... و هەر وەک دەبێ قبوڵی بکەین کە ..... و لە سەر بناخەی ئەم شتانە، ڕەوشی ئێمە تەواو ڕوونە.» من بە دیتنی ئەو هەموو پەستی و ئەو

هەموو هۆگرییە بە بەرژەوەندی مادی کەم کەم وەشک دەکەوتم کە ئەدی باریتەعالا لە کوێیە ؟ بۆ چی ئێمەی بەرەڵا کردوە.؟
پیاوی لاو لە وەڵامدا دەڵێ :
- بە ڕاستی جێگای خۆیەتی مرۆڤ لە خۆی بپرسێ ئەدی باریتەعالا کوا ؟ ئەگەر بە ڕاستی ئەو خولقێنەری زەینی مرۆڤ نیە و گیان لە بەرێکی واقعی و بابەتییە و ئەوەڵ وئاخری هەموو بوونەوەرێکە ئەدی کوا لە کوێیە ؟
ئاهەنگی قسەکانی ئاهەنگی کافرێکی لە دین وەر گەڕاو نیـە، بەڵکوو ئاهەنگی ئەویندارێکی ناکامە.
مارتای خوشکی پیرە مێرد دێتە ژوور تا سڵاو لە میوان بکات. دوو لیوان و گۆزەیەک شەڕابی سوور لە سەر مێز دادەنێ و پاشان دەچێتەوە ژووری خۆی.
پیرە مێرد درێژەی پێدەدا :
- هەموو جارێ کە باسی باریتەعالا دەکرێ. داستانێکی کۆن وەبیر دێنێتەوە بۆیە دەبێ قەت فەرامۆش نەکرێ. لە وانەیە تۆش لە بیرت مابێ کە ئەو داستانە لە شوێنێکی کتێبی پیرۆز دا هاتوە. ئەوەش ئەوەیە: کاتێ ئەلیاس کێردی گەیشتبوە ئێسکان، چۆن لە بەر خودا پاڕاوە کە بیمرێنێ. خودا ئەوی بردە سەر چیایەکی بەرز. ئەو دەم تۆفانێکی ئەوەندە بە سام هەڵیکرد کە چیاکانی قەڵاشت و بەردەکانی تێک شکاند. بەڵام ئەو تۆفانە قورسە خودا نە بوو. پاش تۆفان زەوی دەستی بە لەرزین کرد، ئەو زەوی لەرزینەش خودا نە بوو. دوای لەرزینی زەوی ئاگرێکی گەورە هەڵبوو، ئەو ئاگرەش خودا نەبوو. پاشان لە کپ و بێدەنگیدا، دەنگێکی نەرم وسوک وەک دەنگی شنە بای ئێواران لە نێو گەڵای داران بە گوێ گەیشت. لە کتێبی پیرۆز دا نووسراوە ئەو دەنگە و ئەو نارە نارە و لێک خشانی گەڵای داران، ئەوە باریتەعالا بوو.
لەو کاتە دا شنە بایەکی نەرم لە باخ هەڵیکردوە. دارەکان نارە نارییانە. لە نێوان باخ و ژووری ئەو دوو پیاوە دەنگیک دێ و دەکرێتەوە. پیاوی لاو لەرزێکی بە سەر دا دێت. پیرە مێرد دەست لە شانی دەدا و پێدەکەنێ و دەڵێ مەترسێ. لێرە نابێ لە هیچ شتێ بترسی. بە کاوە خۆ ڕادەبێ. ئەو دەرگایەی شەوانە با کردوویەتەوە، دایدەخات و پاشان دەڵێ:
- بەڵێ، من لە خۆ دەپرسم ئەدی خودا لە کوێیە؟ بۆ چی ئێمەی بەرەڵا کردوە؟ ئەو بڵیند گۆیەی لە تەواوی مەیدانە گشتییەکان خەبەری شەڕی تازەی ڕاگەیاند، بەڵێ،

هەمان بڵیند گۆ، خودا نە بوو. ئەو زەنگوڵانەی کە بە دەنگی خۆیان دەستە دەستە برسی و سواڵکەریان لە دەوری بڵیند گۆ کۆ کرد بۆوە، بێگومان ئەوانیش خودا نە بوون. ئەو تۆپ وبۆمبایانەی کە بە سەر ئاواییەکانی ئەفریقادا دەڕژێن و ڕۆژنامەکان کە هەموو ڕۆژێ لەو بارەوە دەنووسن، بێگومان خودا نین، بەڵام ئەگەر پیاوێکی فەقیر بە تاکی تەنیا لە گوندی خۆی شەو هەستێ لە دیواری گوندی خۆی – ئەو گوندەی لێی لە دایکبوە – بە کڵۆ خەڵوزێک و یا بە گێچ بنووسێ : « نابوت بێ شەڕ، بژی برایەتی هەموو میللەتانی جیهان، بژی ئازادی!» لە پشت سەری ئەو داماو و نەخۆشەدا بێگومان خودا هەیە.! لە هەستی بێدەسەڵاتی ئەو پیاوە سەبارەت بەو مەترسیانەی کە هەڕەشەی لێدەکا، لە ئەڤینی نهێنی کە ئەو سەبارەت بە ئەفریقاییانی بە ڕواڵەت دوژمن هەیەتی و لە ئیرادەتێکی کە بە ئازادی هەیەتی،

ڕەنگدانەوەیەکە لە خودا » لە بەر ئەوە کاتێکی لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێنمەوە کە ئوسقوفەکان بە تاوانی قاچاخی دراوی قورس لە دادگا دا دەکەونە بەر پرسیار و وەک بازرگانی دز کە لە کاتی دزیدا دەستیان گرتبن لە کن قازی ئامادە دەبن و کاتێکیش لە هەمان ڕۆژنامانە دا دەخوێنمەوە کە ئەو کرێکارانەی بە تاوانی ئەوەی کە ئازادی ویژدانیی خۆیان داوا کردوە، بە مەرگ مەحکووم کراون – هەر چەندە ئەو کرێکارانە خۆیان بێدین بزانن – من ئیتر پێویستم بە بیر کردنەوەی زۆر نیە تا بزانم کە خودای تەعالا لە گەڵ کام دەستەیە. بەڵام تۆ ناتوانی بیخەیە زەینی خۆت کە لە تەمەنی مندا، گەیشتن بە کەشفێکی وا چ مانایەکی هەیە. لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدا کە قاچی مرۆڤ لە سەر لێوی قەبرە و کاتێ ئەوە هاتوە کە بیر بکاتەوە تا ئاوڕێک لەو ڕێگایە بداتەوە کە بڕیویەتی و کار نامەی ژیانی خۆی ئامادە بکا. وای چەندە کار نامەیەکی خەفەتبارە ! و ئەگەر ڕوو لە خۆم وەر گێرم و تەماشای کۆمەڵی شاگردانی قەدیمی خۆم بکەم دیسان زیاتر هەق بە خۆم دەدەم کە دان بە تێشکانی خۆم دا بێنم. دار لە میوە و مامۆستا لە شاگردانی دەتوانن لە بارەی خۆیانەوە داوەری بکەن.

هەستی ڕێز و ئافەرین کە پیاوی لاو سەبارەت بە مامۆستای قەدیمی خۆی هەیەتی، ئێستا بۆتە خۆشەویستییەکی برایانەی ئەوەندە توند کە لە جێ ڕادەبێ و بە توندی ماچی دەکات.

پیرە مێرد لە وتەکانی خۆی زیاد دەکا:

– من کە بیرم لە تۆ دەکردەوە کەمێک ئارام دەبووم. بەڵام بە هەڵە دەچووم، چونکە تۆ ئێستا باست کرد کە لە ژیانی خۆت دا هێندێ چاکەت کردوە نەک لە بەر فێر بوون و تەربیەتێکی هەت بوە بەڵکوو ڕاست بە پێچەوانە ی ئەوە بوە.

پیاوی لاو تاوێک کاس دەبێ و پاشان وەڵام دەداتەوە :

– ئێمە پازدە ساڵە یەکترمان نەدیوە و لە وانەیە پاش ئەم چاو پێکەوتنەش ئیتر هەر گیز یەکتر نە بینین. تۆ زۆر پیر بووی و من نەخۆش و ڕۆژگاریش سەخت گیر. کە وا بوو تێبکۆشین تا ئەو چەند دەرفەتەی بۆمان ماوەتەوە بە خۆش و بێش ی یەکتر بە فیـڕۆ نەدەین. من بە ڕاستی لە سەر ئەو باوەڕەم لە دۆستانی پێشووی دەبیرستانی خۆم باشتر نیم و دڵنیاشم ئەو کۆمەڵگایەی کە ئێمەی تێدا دەژین گەیوەتە پلەیەکی ئەو تۆ لە چەپەڵی کە هەر کەسێکی نە توانێ پێوەندی خۆی لە بناخەوە لە گەڵ بپچڕێنێ، فاسید و چەپەڵ دەبێ. ئەگەر چارە نووسی من لە دۆستانی قەدیمی دەبیرستانم باشتر بوە لە بەر ئەوەیە کە لە کاتی خۆیدا و بە یارمەتی هێندێ ڕوو داو پێوەندی خۆم لە گەڵ ئەم کۆمەڵگایە پچڕاندوە. ئەگەر منیش مابامەوە ناچار وەک ئەوان دەبووم. بێگومان من ئیمڕۆ وەک دزێک واتە دەر کراوی قانونم ، بە ناوی خواستەکی دەژیم و ئەگەر ناچار بم ڕابکەم. پاسپۆرتێکی بێگانەم لە گیرفاندا هەیە. لە گەڵ مەترسی مادیش دەست بە یەخەم. ئەو مەترسییەش هەیە کە بکەومەوە زیندان و لە وانەیە ئەشکنجەش بکرێم و لە هەڵکەوتی دژوار تر دا تەنانەت ڕەنگە گوللە بارانیش بکرێم. بەڵام لە جیاتی ئەوە لە هەموو جۆرە هەلپەرستییەک لە ئەماندا ماومەوە. پێش چەند ڕۆژ دوکتۆر نۆنزیۆ ساکام دیت: ئەو بێگومان لە من خەراپتر نە بوە، بەڵام ئێستا وەرە و بزانە کە توشی چ وەزعێکی خەفەتبار بوە!... ئێمە ئێستا گەیشتووینە نوختەیەک کە دەتوانین بڵێین: تەنیا کەسێک دەتوانێ لەم مەعرەکە گیان دەر باز بکات کە گیان بخاتە مەترسییەوە.

پیرە مێرد پشتی دەگرێ کە :

– بەڵێ ، بۆڕزگاری ڕێگای دیکە نیە ! ئەم نۆنزیوە فەقیرە ئاواتی بنە ماڵەی بە جێگەیاندوە. چونکە هەر پێش چەند ڕۆژ بوو کە کرا بە سەرۆکی خەستەخانەی گەرەک. بەڵام بە ناچار دەبێ چەند جۆرە فڕ و فێڵی کرد بێ؟ چەندەیان بە سەر دادا بێ؟ بۆ ئیسباتی بڕوای سیاسی و کوێر کوێرانە بە دەزگا، چەندە شانۆی ساز کرد بێ تا توانیبێتی حەریفانی تر کە ویستیاری ئەو شوێنەن لە مەیدان وە دەر

نابێ.؟ هەر ئەو بەهاری ڕابردوو، پاش دیدار لە گەڵ تۆ،لە « ئاکوافرەدا » هاتە لای من و هەر بەو عیبارەتەی کە تۆ ئێستا لە وتەکانت دا بە کارت هێنا، باسی قەیرانی ڕوحی و دەرونی خۆی دەکرد و دەیگوت: « چۆن دەکرێ لە ڕێژیمێکی دیکتاتۆریدا کە مرۆڤ بە دەزگای دەوڵەتییەوە بەستراوەتەوە، هەم ئەرکی خۆت بە جێ بگەیێنی وهەم شەرافەتمەندیش بی ؟ خوشی بۆ بەختەوەری سپینا کە رزگار بوە !»

رزگار بوە ؟ چما کرداری « رزگار بوون» ناوی بەر کاریشی هەیە.؟ چما تێکۆشان بۆ رزگار بوون خەباتێکی شێلگیر نیە ؟

بێگومان سپینا خۆی دەزانێ کە سەری دانەنواندوە و تەواوی پێوەندییەکانی خۆی لە گەڵ کۆمەڵگایەکی کە لێی بێزارە ، پچڕاندوە. بەڵام ئازادی بەو مەرجە شتێکی جوانە کە بتوانی کەلکی لێ وەر گری، ئەگینا نابێتە ئازادی. لەو کاتەوە کە ئەو بۆ ئیتالیا گەڕاوەتەوە توانیویەتی بەو ئازادییە چبکات ؟ داخوا دەورانی تەمەنی وی شتێکی وەک کاڵتەی خەیاڵی بێ ئەنجام نەبوە.؟ داخوا لە نێوان خۆی و دۆستانی پێشووی دا چاڵێکی قوڵ پەیدا نە بوە.؟

بە کەشیشی پیر دەڵێ : « لە فوسا لە ڕۆژی ئامادەیی دا، کنچتینو م لە دوورەوە دێت، ئەویش لە گەڵ ئاقار بۆتە هاو ئاهەنگ و پلەیەکی وەگیر کەوتوە.»

پیرە مێرد لە وتەی ئەو زیا دەکا و دەڵێ :

– نەک هەر وای کردوە بەڵکوو بە قازانجی شەڕ وتاریشی داوە. عیباراتی لاتینیش دەکاتە چاشنی وتارەکانی. بەم چەشنە ئەو دەرسانەی کە لە لای من خوێندوویە تی، لانی کەم بە کاری هاتوە. ئێستا دەڵێی هەستی کردوە کە دەبێ وەک داو تەڵەب بچێتە ئەفریقا. هاتبوو لەو بارەوە بە منی دەگوت :« هەموو وا دەچنە وێندەرێ، منیش دەبێ بچم » ئەوەش جۆرە داو تەڵەبییەکە کە دەبێ بە داو تەڵەبی ئیجباری ناو بەرین.

پیاوی لاو دەپرسێ :

– ئایا ئاگات لە وانیتر هەیە؟ « ئانتۆنیۆسپرانتزا » چی لێهاتوە.؟

– ئەو دوکانێکی خواردەمەنی فرۆشی بچوکی هەبوو، ئابوت بوو، تەنانەت وا دێتە بەر چاو کە ئابوتییەکەی تەواو ڕاست نەبوە. ئێستا تازە داوای داوتەڵەبی کردوە، بەڵام هێشتا قبوڵ نەکراوە.

– « وردونە چی لێهاتوە ؟

- ئەو تا ئـەم دواییـانە کـارمـەندی ئیـدارەی مـاڵیـاتەکـان بـوو، هیـوادارە شـەڕ ئەم دەرەتانەی بۆ پێک بێنێ کە ببێتە سەرۆکی ئیدارە. بێگومان کاری وی داهاتوێکی باشی هەیە. ئەگەر ئیتالیا لەم شەڕی تازە دا سەر کەوێ، چ کاری لە وە باشتری دەبێ کە لە وێشدا ڕایەلکەیەکی هەراو لە ئیدارەی جۆر بە جۆر بۆ وەر گرتنی باج دروست بکات.؟

پیاوی لاو دەڵێ: « حەبەشییەکان فەقیرن و پارەیان لێ هەڵناوەرێ. باشە «» باتیستا لۆپاتۆ» چدەکات ؟

پیرە پیاو لە وەڵامدا دەڵێ :

- وەک کنچێـتینۆ ڕاگۆ باسی دەکرد دیارە « لوپاتۆ» لە یاری» سکوپون»ی زانستی دا حەریفێکی کەللە ڕەقە. هەر بۆیەشە کە ئێستا کراوەتە سەرۆکی سەندیکایەک.

- سەندیکای کرێکاران یا کار فەرمایان.؟

من نازانم. ئەوانە هـەر تکیـان یەکن. مـەبـەستم سـەندیکای دەوڵەتـی بوو. ئەم وەزعە دەرفـەتی بۆ پێک دێنێ کـە هەر وا یاری وەرەقـی خـۆی درێژە پێبدا و لە ئاخـری مانگیش دا بچێت موچەکەی وەر گرێ.

-« دێ پرە تورو» چی لێهاتوە؟ هـەر وا لە ڕێگای ئاسنە ؟

- لە مێژە بە تاوانی هەبوونی بیر و باوەڕی سۆسیالیست دەریان کردوە. پاشـان وای لێـهـاتوە لە گـوندی خـۆی بسـووڕێتـەوە. لە وێ ژنێکی بەرگ درووی هێناوە و ئیتـر کاری بە سۆسیـالیزم نە داوە بەڵام بە یادی بیـر و باوەڕی پێشـووی جار و بار حەپسی دەکەن. هەر بۆیەش ڕۆژی ئامادە بوونی گشتـی کیـراو وەک دەڵێن هێشتا ئازاد نەبوە.

- « پیچیریلی » چدەکات ؟

- ئەو لـەم دەور و بەرە دا کـەشـیـش بوو. بەڵام لە سـەرە تای سـاڵـی خـوێندندا ئوسقۆف ئەوی کردۆتە مامۆستا مەدرەسەی خوێندکارانی دینی و ئاواتی گەیوەتە جێ. بەڵام ئەو دەتوانێ دەرسی چی بڵێتەوە؟ من کە نازانم، ڕەنگە وەرزش. دیارە ئەویش ئێسـتـا بە قـازانجی شـەڕ وتار دەدا وبە ڕستـە و وشـەی لاتینـی دەیان ڕازێنێتەوە و لە سەر ئەو باوەڕیە کە پێ ئاژۆی ئێستا شەڕ نیە بەڵکوو» خەزایەکی سەلیبییە بۆ چاکە وئاسایشی ئەفریقا ، خەباتێکە بۆئاشتی بە ڕاستی، بۆ ئاشتی ڕۆمی !» پیچیریلی، کنچێتینۆ ، وردونە ، ئانتۆنیو سپرانتزا و باتیستا لوپاتۆ. ئەوانە میوەی ئەم دارەن کە من بم.

سپینا چاوی پڕ لە ئاو دەبن. کەمێک ڕوو وەر دەگێڕێ تا وروژانی ڕوحی خۆی لە دۆن بنە دیتو بشارێتەوە. کە وا بوو ئەو پیرە مێردە ئازیزە، فەقیرەش کە تەنیا یادی بۆنەوە بەسبوو لە کاتی ناهومێدترین چرکەی دووڕ خستنەوەو ئاوارەیی دا ئاسایش و قەوەتی دڵی لە دەست چووی بۆ بگێڕێتەوە خۆی تا ئەو ڕادەیە توشی ناهومێدی ونیگەرانی بوە ؟ دەبێ وەڵامی چی بدرێتــەوە تا هۆشــی ڕوون و تیــژ بینی وی بە بەزەیی وەر نەگرێ؟
پیاوی لاو دەڵێ :
- دارێکی لە وانەیە میوەی خەراپ بەر بێنێ بەڵام هەمیشـەش دەرەتانی ئەوە هەیە کــە دزێک بێ و پێش ئەوەی مـیـوەکـان پێبگەن، ئەوان بدزن. جگە لەوە دوور نیــە خــۆشی لە دار بکەوێ، یا تەرزە لێی بدا و یا کرم بیخـوا بێ ئەوەی دارەکـە خـۆی بتوانێ بۆ پاراستنی میوەکان کارێک بکات. کاتێ ئێمە لە مەدرەسـە هاتینە دەر کــەس نەیدەتوانی پێش بێنی بکات کــە قــەزا و قــەدەر وا بوە ئێــمــە توشی چارە نووسێکی وا تاڵ بین. هەر چەندە دەم لە قەزا و قەدەر دان، بێگومان بێ جێیە.
پیرە مێرد پیـاڵەی خۆی پڕ دەکات و لە پێش ڕوناکایی ڕایدەگرێ تا لە ڕوونی وی دڵنیا بێت. چونکە ئەم شەڕابەیان لە کـوپەی تازە هەڵێنجـاوە. پاشـان بە کـاوە خۆ پیاڵە بۆ لێوی دەبا و قومێکی لێدەدا و دەڵێ :
- ئێـمــە هەر یەکـەمـان دزی خـۆمـان و تەرزەی خـۆمـان و کـرمی خـۆمـان لە زاتی خـۆمـاندا هەیە. بار و دۆخیش جگە لەوە یارمـەتی ئەم هۆکارانە بدەن، کـارێکی تر ئەنجــام نادەن و دەبێ دانی پێــدا بنێین کــە لە ســالەکـانی دوای شـــەڕ دا بۆ هاسـانکردنی کـاری دزی و تەرزە و کـرمی نێـو زاتی ئێـمـە، بار و دۆخـی لە بار و یاریدەر پێکهـاتبـوو. بەڵام ئەم کـارە بە هیچ جـۆر لە بەر پرسـایەتی ئێـمـە کـەم ناکاتەوە.
پیاوی لاو دەگێڕێتەوە کە :
- من لە خۆ پێشـاندانی گشتی کە بە بۆنەی دەستپێکی شەر ساز کرا بوو لە فوسا بووم. دیتنی حـەشـیـمـەتێکی ئاوا کە بوونەتە دەستخـۆشی غـەریزەی وەحشـیگـەری، منی ترسـاند. بڕوای وەرزێرانی فـەقـیر بە پێشـەوا هـەر وەک بڕوای جـادوو گـەرێکی بەر جـو نوێنە و قـەشـەکـانیش لەو باوەڕە دان کـە بوونی ئـەو پیاوە نیـشـانەیەک لە نیعمەتی خودایە. قەشەکان ! وای لە دەستی ئەو قەشانە !
پیرە مێرد دەڵێ :

– ئەگەر قەشەکان خۆیان فریو دەدەن خەتای خۆیان نیە. نیزیکەی دوو هەزار ساڵە کە خەبەریان پێدراوە و ئەو ڕستەیە لە گەڵ ئەوانیەتی کە « زۆرن ئەو کەسانەی بە ناوی خودا دێن و میللەتان فریو دەدەن » قسە لە شەڕ و هەڕەشەی شەڕ دەکرێ. دەبێ هەمووی ئەم ڕوو داوانە پێنە پێش. بەڵام ئەوە کۆتایی کار نیە. میللەتێک دەژی، میللەتێکی دیکە ڕادەپەڕێ و وڵاتێک دژی وڵاتێکی تر.

لە ناوچە جیاوازەکانی دنیا خەڵک توشی قات و قڕی و تاعون و بوومە لەرزە دەبن، بەڵام ئەوانەش هەموو کۆتایی کار نین، بەڵکوو سەرە تایە. بەڵێ ، ماوەیکە خەبەر بە مەسیحیەکان دراوە. هێندێ نارەحەت دەبن و هێندێ خەیانەت دەکەن. ئەو دەم ئەگەر کەسێ( هەر چەند خودی پاپیش بێ )بڵێ کە : « ئەوە شاندەیەکی خودایە، ئەویتر لە لایەن خوداوە بۆتە مەعمور» ئێمە نابێ باوەڕ بکەین. چونکە بە ئێمە خەبەر دراوە: نەجات دەری بە درۆ و پێغەمبەری بە درۆ پەیدا دەبن کە نیشانە و پەر جۆی گەورە لە خۆیان نیشان دەدەن و خەڵکێکی زۆریش فریو دەدەن.» ئێمە ناتوانین دەقی لەوە روونتر بخوێنینەوە. ئێستا ئەگەر کەسانێک ئەومیان لە بیر بردۆتەوە هیچ لە ناوەرۆکی مەسەلە ناگۆڕێ. چارە نووسی پیاوی «خودایی» ئەوان لە پێشەوە نووسراوە:Intralit ut yulpis , regnalit utico, morietur ut canis( یانی وەک ڕێوی دێت، وەک شێر حکوومەت دەکا و وەک سەگ دەمرێ.)

پیاوی لاو دەڵێ: « بە ڕاستی چەندە زمانێکی جوانە ئەو زمانە لاتینییە! و چەندە فەرقێکی زۆرە لە نێوان لاتینی کۆنی کلیسا و لاتینی بەخشنامەی پاپ !»

پیرە مێرد دەڵێ:

– من زۆر جار لە خۆم دەپرسم کە دەبێ چبکەم. لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدا دەکرێ بیر و ڕای خۆت بگۆڕی بەڵام ناتوانی داب و نەریتی خۆت بگۆڕی. گۆشە گیری تەنیا جۆرە گوزەرانێکە لە گەڵ ئەخلاقی من دێتەوە. من تەنانەت لە گەنجیەتیش دا لە خەڵک دوور دەژیام. من سەبارەت بە بیزارییەک کە هەمیشە لە شتی بێجێم هەبوە لە سیاسەت دوور کەوتوومەوە. حەز و سەلیقەی من فێر کردە و پەر وەردەیەکی کە لە جوانناسیدا وەرم گرتوە، منی لە تێکۆشان دوور ڕاگرتوە. جگە لەوە بێزاری من لە وەزعی ئێستا لە ڤینی سیاسی پەیدا نە بوە، وەک ڤینی دەنگدەرێکی هەڵبژاردن نیە، بەڵکوو بیزارییەکی ئینسانیە کە ئەم کۆمەڵگایە قبوڵ ناکات، بەڵێ، ئەو دەمەیە کە لە خۆم دەپرسم دەبێ چبکەم؟ سەیری دەور و بەری خۆم دەکەم و دەبینم ئەو کارەی بە من دەکرێ کارێکی هیچە. بە هیچ جۆر ناتوانم

لە نێو قەشەکاندا کار بکەم. ئەو قەشانەی من دەناسن ئێستا لە بەرم ڕادەکەن، لەوە ترسیان هەیە لە گەڵم بەرەو ڕوو بن. لە قەڵەمڕەوی کەشیش نشینی« مارسی» هەر کەشیشێک لەو پەنجا ساڵەی دواییدا کلیسای بە جێهێشتبێ لە ئەنجامی شکاندنی بەڵێن و پەیمانی ڕووت بوە. هەر ئەوەندە بەسە کە لە وەزعی فیکری چینی ڕوحانیەکانی ئێمە سەرە هەودایەکت بێتە دەست، ئێستا ئەگەر لە قەڵەمڕەوی ئەم کەشیش نشینە بڵاو بێتەوە کە قەشەیەکی دیکەش بە ناوی « دۆن بنە دیتو» خەڵکی ڕوکادی ماسی عەبای کەشیشی ماچ کردوە و لەو لای داناوە، بێگومان هەوەڵین لێکدانەوەی کە بە زەینی ئیمانداراندا دێت ئەوەیە کە بڵێن: «ئەوەش قەشەیەکی دیکە کەلە گەڵ قەرەواشی خۆی نێوانی هەبوە.» دەتوانم ئەوەشت پێ بڵێم کە ئەگەر من هێشتا پێش نوێژی نوێژی مەسح دەکەم تەنیا بۆ ڕێز گرتن لە حەشیمەتی ساکارە کە لە دەور و بەرم هەن و تا دڵیان نەیەشێنم. چدەکرێ ؟

ئێستا پیاوی لاو لە هەڵسەنگاندنی حالاتی ڕوحی خۆی لە گەڵ حالاتی ڕوحی پیرە مێرد هاو ئاهەنگیەکی قوڵی نێوان ئەم دوو زاتە دەبینێ کە لە سەرە تاوە بە خەیاڵیدا نە دەهات. ئەوەیە کە غیرەت وەبەر خۆی دەنێ و دەردی دڵی خۆی بۆ مامۆستای قەدیمی ڕۆژن دەکاتەوە. سەر نە کەوتن و تێکۆشانی بێ ئاکامی خۆی بۆ دۆزینەوەی شکڵی تێکۆشانێک کە بتوانێ ویژدانە خەوتوەکان وە خەبەر بێنێ، بۆی باسدەکات. بۆی دەگێڕێتەوە کە چۆن لە « پیتراسکا» بۆی دەر کەوتوە کە وەرزێڕەکان لە ئاست هەموو جۆرە تەبلیغاتێک لە هەر لایەکەوە بێت، لالوتن. وتو وێژی ئەم دواییەی خۆشی لە گەڵ «پراتولانو» ی گاریچی لە بارەی بێفایدە بوونی گەلێک هەنگاوی توند و تیژ باسدەکات. کە وابوو دەبێ چی بکرێت.؟

هەر تک پیاو بێدەنگ دەبن شاگرد و مامۆستا هەر تکیان توشی کۆسپێک بوون و هەودای ژیانی ئەم دوانە گەلێک جیاوازە، لەم نوختەیە دا دەگاتە یەک. پیرە مێرد دەڵێ:

- دەبێ ئاگا دار بی کە ئیرادەی خەبات ئێمە توشی خەیاڵ و ڕواڵەت و ڕووتبوونەوە نەکات. دەبێ لە ڕاکردن بە دوای سەر کەوتنی ڕواڵەتی خۆ بپارێزین. ئەم دەردەی کە من لە کەش و هەوای خۆ دا دەبینن شتێکە قوڵتر لە سیاسەت گانگاریایەکی واقعییە. مەلحەم کردنی برینێکی ڕزیو و بۆنگرتوو، هیچ نەتیجەیەکی نیە. خەباتی چینایەتی هەیە، شار هەیە، گوند هەیە، بەلام لە ژێری هەمووی ئەوانە ئینسان هەیە کە حەیوانێکی بەد بەخت و ڕەوەکە و گانگاریا تا مێشکی ئێسکانی

چۆتە خوارێ.

حاڵەتێکی خەفەتباری بێ وێنە بە سەر پیاوی لاو دا هاتوە، گوێ دەداتە پیرە مێرد و دەیەوێ تا لە نێو قسەکانی ویدا ڕێگا چارە و پێشنیار و پەندێک بدۆزێتەوە. پیرە مێرد هەست بەو مەسەلەیە دەکات و لە پڕ هەوای قسەکانی پتر تێکەڵاوی ئیحتیات دەبن. لاو دوو پات دەکاتەوە:

- کە وابوو دەبێ چی بکەین ؟

دۆن بنە دیتو درێژەی پێدەدا :

- منیش بە ڕادەیەکی تر و بە شێوەیەکی جیاواز قۆناخەی ئەزموونەکانی تۆم بڕیوە. منیش تێکۆشاوم کە لە گەڵ فلان شاگردی قەدیمی خۆم باسبکەم. منیش خۆم زەحمەت داوە تا ئیدیۆلۆژی دیکتاتۆرێکی کە شۆڕباوێکی پیس و دەستندەی هێندێ دوکتۆری سەر خۆش و بێ مەنتیق بە ناوی دەوڵەت دەر خواردی خەڵک دەدرێ، خاڵ بە خاڵ ڕەت بکەمەوە. » ماوەیەکی زۆری پێچوو تا منیش تێگەیشتم کە کاتی خۆم بە فیڕۆیی دەدەم چونکە ئەو کەسانەی کە من باسم لە گەڵ دەکردن خۆیان بێ مەنتیقی ئەم ئیدیۆلۆژییە تێنەدەگەیشتن. لە گەڵ ئەوە ئێستا ئەوان لە خزمەتکارانی ئەمەگداری دیکتاتۆرین. ئەوان بۆ ئەو شانازیەی کە دیکتاتۆری پێیان ببەخشێ پێکەوە مل بە ملە دەکەن. هەر یەکە هەول دەدا تا بۆ دەر بڕینی خزمەتگوزاری بۆ پێش کەوتن لە وانیتر لە هەموو دەرفەتێک کەلک وەر گرێ.»

لە مارسیکا سەر هەڵدانی تاکە کەسی کە نیشانەی ناهومێدییە کەم و زۆر ڕووی داوە، بەڵام ئەم هەنگاوانە نەک هەر فەقیرەکانی نە وروژاندوە،بەڵکوو بە پێچەوانە ئەوانی پتر ترساندوە.

پیرە مێرد بێدەنگ دەبێ و لاو چاوە ڕوانە کە ئەو دوو بارە درێژە بە قسەکانی بدات. ساڵەکانی دەبیرستانی وەبیر دێتەوە ئەو ڕۆژانەی کە مامۆستا مەسەلەیەکی زۆر دژواری دەدا بە شاگردان و بۆ چارەی مەسەلەکان یارمەتی نەدەکرد. ئەو ڕۆژانە مامۆستا بە سیمایەکی بە ڕواڵەت جیددی وەڵامی دەدانەوە: « ئەگەر ئێوە نەزانن، من بۆ دەبێ بیزانم.؟» بەڵام ئەمجارەش مامۆستا بە ڕاستی سەر گەردانە.

پیر و لاو هەر تکیان گەیشتوونە نوختەیەک کە دەبێ چی بکەن ؟

پیرە مێرد دوو بارە دەست بە قسان دەکاتەوە و دەڵێ :

- ئەوەی وڵاتی ئێمە نیەتی ڕوحی ڕەخنە و زۆر مەسەلە و ئیرادی توندی ساختەییش نیە، لە وڵاتی ئیمە تەنیا قاتی مرۆڤە. کەسانی واهەن کە هەنگاوی توند

هەڵدێنن و ئیواش هەن کە ئیراد دەگرن، بەڵام مرۆڤ نیە. منیش لە خۆم دەپرسم کە دەبێ چبکەین ؟من دڵنیام کە زەحمەتەکەی ناهێنێ مرۆڤ میللەتێکی کۆیلە و ترساو فێری شێوەی تازەی ئاخافتن و ژێست گرتن بکات. ڕەنگە ئەوە گرنگتر بێ کە بۆ ژیان ڕێگای تازەیان پێ نیشـان بدا. هیچ قسە و هیچ ژێست و حەڕەکەتێک ناتوانێ وەک ژیان و لە کاتی پێویست دا وەک مردنی مرۆیەکی ئازاد -کە تێدەکۆشێ ئازاد و بە شــەرەف و پاک و ڕاست و بێ چاوە ڕوانی بمێنێ و خــەڵک قـانیع بکات. مرۆڤێکی کە نیشان بدا ئینسان دەبێ چۆن بێ.

پاشـان پیـرە مێـرد یادی سـەفـەرێک دەکـاتەوە کە چۆتە «ئورتا» ئەو شـوێنەی کـە میوانەگەی لێی هاتۆتە دنیاوە و دەڵێ :

- هەر چەند خەڵک تێنەگەن کە تۆ دەڵێی چی و چی دەکەی، باست دەکەن و وەبیرت دێننەوە. چونکە تۆ نوێنەری ڕەگــەزێکی دیکەی لە ئادەمـیــزادان و نیـشــان دەری شێوەیەکی دیکەی بۆ ژیان، و لە بەر ئەوەش تۆ لە نێو واندا لە دایکبووی و بە وانت نیشانداوە کە لاوێکی « ئورتایی» دەبێ چۆن بێ.

سپینا دەپرسێ: « یانی هەر ئەوەندە بەسە. من پێم وانیە هەر ئەوەندە بەس بێ.

پیرە مێرد دەڵێ :

- ئێسـتـا چاری دیکە نیـە. دەبێ کاتی هـەموو شت لە بەر چاو بگیرێ، هـەر کارە کاتی خۆی هەیە. کـاتی هەڵپـەرتاندنی ڕەز جیـایە. کـاتی دەرمـان پێـوەر کردن و ئامادە کردنی کوپەکان و ترێ چنین و شێلانی ترێش هەموو لێک جیاوازن. لە بەهـار داکاتێکی تۆ خەریکی لقەکانی مێو لە دار ببەستی، ئەگەر کابرایەک بە کنت دابێ و بڵێ:« ئـەم کـارە پێـوویست نیـە، چونکە ئـەگـەر کـوپەکـان خـاوێن نـە بن شـەڕاب خـەراپ دەبێ و کە وابوو بەر لە هـەمـوو کـارێک ئەشێ لە فیکری کوپەکـان دابی.» تۆ دەتوانی بێژی:« هەر کـارەی وەرزی خـۆی هـەیە. ئێسـتـا کـاتی خـاوێن کـردنەوەی کوپەکـان نیە بەڵکوو وەرزی هەڵپـەرتاندنی ڕەزەکانە. کە وابوو لێگەڕێ با مێوەکان هەڵپەرتێوم و لقە زیادییەکان ببڕم»

مـارتا دێتـە ژوورێ و دەیەوێ بەر لە وەی بچێتە نێو جێ، شـەو باش بە مـیـوان بڵێ. سپیناش لە جێ ڕادەبێ و لە دۆن بنەدیتو ئیجازەی مەرەخەستی دەخوازێ، چونکە درنگ بـوە و گــاریـچی لەو خــوارە چاوە ڕوانە. پێش ڕۆیشـتن لە ســەر کـاغــەزێک ئادریسێک دەنووسێ و بە کاوە خۆ دەیداتە کەشیش و دەڵێ:

- دەمـەوێ تا حـەوتوێکی دیکە بۆ ڕۆم بگەڕێمـەوە. لەو مـاوەیەدا ئەگـەر پێویسـتت بە

من هەبوو ئەوە ئادرێسی منە.
« پراتولانۆ» لە خوارەوەی گرد چاوە ڕوانی دۆن پاولۆ یە. کەشیش ئارام و بێدەنگ سـواری گـاری دەبێ. لە ڕێگا وتەی دۆن بنە دیتـو دوو پات دەکـاتەو:« هـەر کـارێک فەسڵێکی هەیە، بە تاڵوکە نا توانی چنینی ترێ وەپێش بخەی.
گاریچی دەپرسێ : « دۆن بنە دیتو» حاڵی چۆنە ؟»
- باشە
- خۆزیا هەموو وەک یەک دەبوون
دەشـتی خـڕی فۆچینـۆ هـەر وەک شـانۆیەک لە حکایەتی پەریان بە شـەبەق نیشـانە کـراوە. لە لای « پچینـا» وە بای شـەماڵ دێت و دەشت وەک گـوڵێک داخـراوە. دۆن پاولۆ لە میوانخانە بیانکینا لە ژوورەکەی خۆی دەبینێ کە لە نێو کۆمەڵێک لیباسی بڵاوی سەر تەختی خەو، خەریکی گوڵدۆزیە. بیانکینا دەڵێ :
- ئەوە بوخـچـەی منە کە بۆ سـەفـەری دەرەوە ئامـادەی دەکەم. پورم چەند کـراسـی دەیەر کـراوی بە دیاری داومێ. بەر لە هەمـوو شـتێ خـەریکم ناوی خـۆمـیـان لێ بدرووم. بە ڕاستی سەیر دەبێ مرۆڤ بچێتە پاریس و لیباسەکانی نیشانیان نەبێ.
کەشیش دەپرسێ : « تۆ دەتەوێ بچیە پاریس ؟»
- چما تۆ بەڵێنت نە دا کە لە گەڵ خۆت دەمبەیە پاریس ؟
دۆن پاولۆ دەڵێی :
- ڕاست دەکەی. لە بیرم چوو بۆوە. بەڵام ئێستا دەبێ پێت بڵێم کە ئیتر وازم لە سەفەر نیە.
کیـژی گەنج هەموو ڕۆژێ لە بیری سـەفـەر دابوە و هەمـوو ڕۆژێ بۆ ئامـادە کـردن و بوخچە بەستنی خۆی زەحمەتی کێشاوە. ئێستا تووڕە بوە لە وەی بۆ چی دۆن پاولۆ بیـر و ڕای خـۆی گۆڕیوە و لە فـیکری ئەوەشـدا نە بوە کـە ئەو ئاگـا دار بکا و لە کـاتێکا ئەو خـەونی پـاریسی دیوە. چاوەکـانی لە تووڕەییـان دەدرەوشـێ و بە سـەر کۆنە بە دۆن پاولۆ دەڵێ : « بۆ چی تۆ من بە جیددی وەر ناگری ؟»
کەشیش لە وەڵامدا دەڵێ :
- من تۆ بە جیددی وەر ناگرم، چونکە ئەحمەقێک زیاتر نی.
ئەم پێوەدانی زمان کیژەکە وەگریان دەخات و هەڵدەستێ. لە سـەر هەرد دادەنیشت و ئەو کـراسـانەی کە پوری داویەتی، بە ئەسرین تەڕیان دەکـات. دۆن پاولۆ گـوێی ناداتێ و لێدەگەڕێ کە گریان درێژە پێبدا و پاشان بڕوا تا خۆی بنوێ.

کـاتێ گـریانـی بیـانکینـا تەواو دەبێ بە هـەنیـسکەوە دەڵێ:« دەیـەوێ قـسـان بکات. دەیەوێ بزانێ بە ڕاسـتـی بۆ ئەو سـوکـایەتیـە دەبوو؟ بۆ چی من ئەحـمـەقـم؟ پێم بڵێ بزانم. ئاخر بۆ ئەحمەقم؟ چونکە لە گەڵ پیاوان بە ڕێگادا دەڕۆم، یا چونکە هێشتا شووم نە کردوە؟

کەشیش دەڵێ: « تۆ تا ئێستا هیچ لە فیکری کار کردندا بووی؟»

- باشە. ئەمە چ پێوەندی بە مەسەلەکەوە هەیە؟

کەشیش ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێ:

- کار کردن بۆ گەیشتن بە هەموو ئاواتێک، هۆیەکی لێبڕاو نیە. بەڵام هۆیەکە بۆ ئەوەی مرۆڤ جیدی بێت.

بیانکینا مات دەبێ. کە وابوو لە بەر ئەوەی ئەو ئەحمەقە.

ڕۆژی دوایی بەیانی وتو وێژ دەست پێدەکرێتەوە. بیـانکینـا بە ئاشکرا قـانیـع دەبێ. بڕیار دەدا بچێتە ڕۆم. دۆن پـاوڵۆ دوو نامە و خـەرجی سەفەر و دوو نـامەی دەداتێ: یەکیـان بۆ ژنی« کلوچی» گیراوی سیاسی کە لەوێدا سـپینا تکای لە کرێکاری لاو کـردوە کـارێک بۆ ئەو کـیـژە پەیدا بکات. نامـەی دیکە کـە ژنی « کلوچی» دەبێ بیگەیێنێتە دەستی « ڕومیو»

بە ناوی لیمۆ نووسراوە. سـپینا لەو نامەیە دا گەڕانەوەی خۆی بۆ ڕۆم ڕادەگەیەنێ و دەیەوێ شوێنێکی ئەمینی بۆ بدۆزێتەوە.

## ١١

دۆن پاولۆ بەو مەبەستە بۆ «پیتراسکا» گەڕاوەتەوە کە تەنیا چەند ڕۆژێک لە وێ بێت تا ڕۆمیۆ لە ڕۆم جێگایەکی بۆ پەیدا دەکات لێی بژی و ئاوارە نە بێت. کەشیش ڕۆژێکیان ئێواریێ لە کن ماتالنا دەیگوزەرێنێ کە لە قاتی خواری موسافیرخانە خەریکی هەویر شێلانە کە نانی بکات. نانکردن لە پیتراسکا هەر پازدە ڕۆژ جارێک لە تەندوری گشتیدا دەکرێ و داب و ڕەسمێکی دژواری هەیە. ماتالنا کە پرچەکانی بە شکڵی دەسماڵی ژنانی ئیماندار بە خاولەیەک پێچاوەتەوە. ئاردەکەی بە هێڵەگ دادەبێژێ و ئاردی سپی لە کەپەک جیا دەبێتەوە. کەپەک بۆ مریشکان بە کار دێت. ئاردی ئاسایی دەکرێتە نان و لە ئاردی تایبەتیش شیرینی و هەرشتە و شتیتر دروست دەکەن. هێڵەگ کردوویەتە تۆز و سەر و چاوی ژنەکەی تەواو سپی کردوە. «ئامریکۆ» لە پێش ئاگر دان چۆکی داداوە و ئەوەندەی فوو لە داری تەڕ کردوە کە ئاگر بگرێ چاوی پڕ بوون لە ئاو.

پەتاتەیان لە دیزەیەکدا وەسەر ئاوە تا ڕەگەڵ ئاردی بخەن بۆ ئەوەی نان قورستر بێ و بتوانن ماوەیەکی زیاتر ڕایبگرن.

دۆن پاولۆ تەماشای دەکا و بێدەنگە. دابی نانکردنی ماڵی قەدیمی باوکی لە «ئورتا» دوو دڵێ و سەرنجی لە ڕادە بەدەری دایکی وەبیر دێنێتەوە. پێش هەموو شت نیشانەی خاچی دەکێشا. بانگ کردنی ژنە نانکەرەکان هێشتا لە گوێچکەیدا دەنگی دەدایەوە. بانگی یەکەم بۆ هەویر ترش کە هەویر هەڵبێ. بانگی دووەم بۆ ئەنگوتک کردن بوو، بانگی سێیەم بۆ هێنانی پنەی هەڵگری ئەنگوتکەکان بۆ تەندوری گشتی و نان برژاندن.

بەڵام لەو کاتە دا لاوێکی نە ناسراو کە سەر و پۆڕێکی نیوە دێهاتی و نیوە کرێکاری هەیە لە دەرگای موسافیر خانە دێتە ژوور و لە دۆن پاولۆ دەپرسێ و کوتە کاغەزێکی دەداتە دەستی کە دۆن بنە دیتو بە خەتی ورد و لەرزێنی خۆی ئەم چەند دێڕەی لێ نووسیوە: «دۆستی من هەڵگری نامە پیاوێکی فەقیرە و پێویستی بە تۆ هەیە و ڕەنگە تۆش پێویستت بەو هەبێ. قسەکانی تەواو گوێ بدەیە.»

لاو بە دیتنی دۆن پاولۆ واقی وڕ دەمێنێ و نارەحەت دەبێ و دەیەوێ بگەڕێتەوە. لەو

حـاڵە دا دەڵێ:« دۆن بنەدیتـو بە منی گـوت بۆ لای پیـاوێکت دەنێـرم کـە دەتوانێ لە هەموو بارێکەوە بڕوای پێبکەی . بە ڕاستی نەمدەزانی لە گەڵ قەشەیەک بەرە و ڕوو دەبم.

دۆن پاولۆ دەڵێ بە دوای مندا بێتە ژوورەکەی. لە پەنا خۆی دادەنێ و دەڵێ:

– ئەگەر کاری تۆ لە گەڵ من لەو کارانە بایە کە ئاسایی خەڵک لە گەڵ کەشیشان هەیانە ڕاست و ڕەوان پێتم دەگوت بچیتـە شوێنێکی دیکە. بەڵام ئەگەر دەتوانی عەبای کەشیشی من نە بینراو بگری، ئەگەر دەتوانی بە چاوی مرۆڤێکی ئاسایی چاو لە من بکەی، مرۆڤێکی وەک خۆتان، کێ چو زانێ ڕەنگە وەک فەقیری خۆتان، ئەو دەم ڕەنگە دۆن بنە دیتو هەقی بوو بێ کە تۆی بۆ لای من ناردوە. تۆ لە کەیەوە دۆن بنە دیتو دەناسی ؟

لاو لە وەڵامدا دەڵێ:

– ئێمە هاو وڵاتین. تەواوی بنە ماڵەکانی ڕوکا یەکتر دەناسن. کاتێ دەبینن یەک لە ماڵێ دەر دەکەوێ دەزانن دەچێتە کوێ و دەگەڕێتەوە دە زانن لە کوێوە هاتوە. بنە ماڵەی من لە بەر پاڵی گردی لە سەرووی گوندی ڕەزێکی هەیە بە باخی دۆن بنە دیتـو وە نووساوە. ئێـمـە بۆ پرژاندنی ڕەز لە چاڵاوی باخی دۆن بنە دیتـو ئاو هەڵدەکێشین. ئەویش بۆ ڕاگرتنی برکە تەماتان و نۆک و لۆبیا دار لە ئێمە بە ئەمانەت وەر دەگرێ. دایکم بۆ عاملاندنی من هەمیشە ڕاوێژی بەو کردوە. ڕەنگە پەندەکانی وی هەمیشە باشترین پەند نە بوو بن، بەڵام نیەت چاکی وی قەت جێگای باس نەبوە. ئەو لە سەر دەمی منداڵیمەوە جگە لە خێر و چاکەی من هیچی دیکەی نە ویستوە.

لاوەکە لە گەڵ درێژە پێدانی قسەکانی ورده ورده ڕواڵەتی کەسایەتی ڕوون دەبێتەوە. لە ڕووشانی دەستی وپریشکە قوڕی کە بە دەست و ڕوومەتیەوە دیارە، لە سەر و پۆڕی ئاڵۆزی و بە تایبەت لە جلی کۆن و پینە کراوی وا دێتە بەر چاو کە مرۆڤێکی نیوە وەرزێر و نیوە کرێکارە. بەڵام کاتێکی پتر لێی ورد دەبیەوە دەبینی هۆش و ژیری لە ڕادە بەدەر لە چاوانی دەتروسکێ و هەستان و دانیشتنی فرە لە سەر خۆ و موحتەرەمانەیە. جگە لەوە ئاخافتنی بۆرە پیاوانە نیە. بەڵکوو ئیتالیایەکی زۆر ڕەوان قسە دەکات. بڕوای هەر تک پیاو بە دۆن بنە دیتـو ئەوان زیاتر لێک نیزیک دەکاتەوە . نە ئاسراو دەست دەکا بە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆی:

– لە منداڵیدا زارۆکێکی نەخۆش و نازدار بووم، جگە لەوەش تاقانە بووم. لە بەر ئەوە دایکم وای دەزانی کـە من نابێ کـاری کـشت و کـاڵ بکەم و دەیگوت :«باو وباپیرمان هەموو لە سەر زەوی کاریان کردوە. ئێمە هێشتا هەر لەو شوێنە دەژین کە ئەوانی لێبوون. چەند پشتە ئێمە زەوی دەکێڵین و دەیچێنین و پەینی پێوەر دەکەین و هەمیشەش فەقیر بووین و هەر فەقیرین. ئەو کوڕەمان دەبێ بنێرینە مەدرەسە دەرس بخوێنێ، ئەو کز و لاوازە و پێویستی بە ژیانێکی ئاسودە هەیە.»
باوکم دژی ئەو بیر و ڕایە بوو. دەیگوت: « ڕاستە کە کاری کشت و کاڵی زەحمەت و دژوارە بەڵام بە بەرەکەتە. دەرس خوێندن تایبەتی بۆ منداڵانی پیاو ماقوڵانە و ئێمە کەسمان نیە یارمەتیمان بدا.» بەڵام یاریدەری ئێمە دۆن بنە دیتو بوو. ئەو دەیگوت: « ئێستا کە منداڵ لێهاتووی شایانی بۆ دەرس خوێندن هەیە، لێگەڕێن با بخوێنێ.» ئەو بە نسحەتەکانی خۆی لایەنی دایکمی گرت. تا ئەو کاتەی من لە سیکلی هەوەڵی ناوەندی دا دەمخوێند هێشتا بنە ماڵەی مە لە چاو وەزعیان باشە. باوکم جگە لە ڕەزە دوو پارچە زەوی دیکەشی بۆ سـەوزیکاری وچاندنی گـەنم هەبوو. چوار مـانگاشی لە تەویلە دا هەبوو. ڕاسـتـیت دەوێ ئەو پارەی دایکم بۆ خـەرجی پانسیۆنی من دەینارد، قەت بە تەواوی بە دەستم نە دەگەیشت. بەڵام لە ئاخریدا دەگەیشت. بەڵام لە مـاوەی سێ سـاڵەی سیکلی دووەمی ناوەندی سـەبارەت بە خـەرابی بەرهەم دوو سـاڵی لە سـەر یەک و نە خۆشی باوکم، جگە لە مـوخـاریجی قورسی خوێندنی من، وەزعی ماڵمان ڕۆژ بە ڕۆژ خەراپتر دەبوو. بەم پێیە پێویست بوو یەک لە زەویەکانمان بۆدانەوەی قەرز بفرۆشین، دوو مانگا بە نەخۆشی مردن و دووەکانی دیکەمان لە بازار فرۆشت. دایک و بابم تەویلەکەیان بە نیجارە دا. دایکم دەیگوت:« قەیناکا، کاتێ کوڕەکەم خوێندنی تەواو کرد، یارمەتیمان دەدا.» بەڵێ، من پێش سێ سـاڵ دیپلۆمی دەورەی پۆلی ناوەندیم وەر گـرت. چوومـە ڕۆم تا لە خوێندگای ئەدەبیات ناو بنووسم. دایکی فەقیرم نەیدەزانی موخاریجی ژیانی من تا دوکتۆرای ئەدەبیات وەر دەگرم، لە کوێ بێنێ.
دۆن پاولۆ دەپرسێ:« بۆ چوویە زانکۆی ئەدەبیات ؟ ئەدەبیات کە نانی لێ پەیدا نابێ
– دۆن بنە دیتو پێی وابوو لێهاتوویی من بۆ ئەدەبیات لە زانست زیاترە و هەر ئەو مەسەلە بە بڕوای وی بەس بوو کە مەسەلەکانی تر بخاتە ژێر تیشکی خۆیەوە. من لە ڕۆم ژیانێکی تێکەڵ لە گەڵ بێ بەشیم دەستپێکرد. لە ژوورێک دا دەژیام کارەبای نە بوو. نیوە ڕۆیان لە جیاتی خواردنی تەواو نانم بە شیر قاوەیەک دەخوارد و

شەوانە بە سوپێک قانیع دەبووم. هەمیشە برسی بووم، لیباسم وەک جلی دێهاتیان دەچوو. کەسم خۆش نە دەویست. ڕۆژەکانی هەوەڵی زانکۆ تێدەکۆشام لە گەڵ چەند کەس لە خوێندکاران زیاتر دۆستایەتی بکەم. بە لام سەبارەت بە سەر و وەزعم گاڵتەیان پێدەکردم. مەتەڵەک و لاتاویان پێدا دەدام. یەک دوو ئەزمونی دیکەی لەم چەشنە منیان لە شەرم وکەمڕوییدا نوقم دەکرد. زۆر جاران لە ژوورەکەی خۆم دا لە داخان دەگریام. لە ئاخریدا بە گۆشە گیری ڕاهاتم. منێکی لە « ڕوکا » فێر ببووم لە کەش و هەوایەکی گەرم و پڕ لە خۆشە ویستیدا بژیم، نەمدەتوانی لە گەڵ بارو دۆخێکی ئاوا پیس و بێشەرمانەی ئەم خوێندکارانە دا ڕابێم. زۆر بەی وان خەریکی وەرزش و سیاسەت دەبوون. چونکە وەرزش و سیاسەت دەرفەتی زۆر پێکدێنێ کە مرۆڤ هەرایەک لە کۆمەڵگادا بخاتە ڕێ. من لە مەسەلەکانی سیاسەت و فوتباڵ هیچم نە دەزانی. ڕۆژێک کە سواری تراموا ببووم شانۆیەکی زوڵم و زۆرە ملیم بە چاوی خۆم دیت کە بۆ وان ئاسایی بوو. دە دوازدە کەس لە خوێندکارانی زانستگای ئێمە لە نێوە ڕاستی شەقام بە مەبەستی کوشتن لە کرێکارێکیان دەدا. من هێشتا باشم لە بیرە کە چۆن ئەم کرێکارەیان خستبوە سەر شەقام. سەری خوێناوی کەوتبوە سەر یەکێ لە ڕێلەکانی تراموا و ئەو خوێندکارانەی کە دەورەیاندا بوو، هەر وا بە شەق لێیاندەدا و هاواریان دەکرد کە :« ئەو پیاوە سلاوی لە ئالا نە کردوە!»

چەند پاسەوانێک گەیشتنێ و پاش ئەوەی سەبارەت بەم هەستە نیشتمانپەروەرییە پیرۆز باییان لە پەلامار دەران کرد و بریندرایان گرت. خەڵکێکی زۆر کە لە شوێنی کارەسات کۆ ببوونەوە دەنگیان لە بەر نەدەهاتە دەر. من مات و کاس لە ترامـوادا مابوومەوە و لە بەر خۆمەوە دەمگوت:« ئەی ناجسنان ! دوازدە کەس دژی مرۆڤێکی بێکەس و تەنیا .» ئەو دەم یەکێک لە پشت سەرم بە سەبروکە لە قسەکانی منی زیاد کرد و گوتی :« بە لێ بە ڕاستی شەرمە.» ئەو مرۆڤە شۆفێری تراموا بوو. ئەو ڕۆژە لەوە زیاتر هیچمان بە یەکتر نەگوت، بەلام چونکە ئەو زۆر جار لە سەر ئەو خەتە کاری دەکرد ڕێگای وی بە کۆلانی مزلی مندا بوو جار و بار یەکترمان دەبینی و وەک دوو ئاشنا پێکەوە سلاومان لێک دەکرد. ڕۆژێک کە وچانی هەبوو لە کۆلانێ توشی یەکتر بووین. دەستی یەکترمان کوشی و پێکەوە چووینە مەیخانە تا پیاڵەیەک شەڕاب بخۆینەوە. هەر یەکەمان چیرۆکی ژیانی خۆمان بۆ یەکتر باسکرد و بووینە دۆست، ئەو منی بۆماڵی خۆی داوەت کرد. لە وێ لە گەڵ سیمای تازە

بوومـە ئاشنا کـە هەمـوویان گـەنج بوون. ئەوانە پێنج کـەس بوون دەسـتـەیەکـیـان پێکهێنا بوو ئەم چاو پێکەوتنە لە ڕاستیدا کۆبوونەوەی دەستە بوو. هـەموو شـتێکی وان بۆ من سـەیر و بێگانە بـوو. منیش دوای ئەوەی لە لایەن شـۆفـیـرەوە پێـشکێش کـرام، لەو دەسـتـەیە دا قـبـوڵ کرام و ڕاهاتم کـە حـەتوی جـارێک لە کـۆبوونەوە دا بەشـداو بم. بە سـەرنجدانی ئەو گـۆشـە گـیـرییـەی کە ئەو دەم تێـیـدا دەژیام ئەوە هەوەڵین پێـوەندی شـەخـسی بوو لە گـەڵ خـەڵکی شـار دەگـیـرا. لە بـەر ئەوەی من خـوێندکـار بـووم ئەندامـانی دەسـتـە هەمـوویـان کـرێکار و کـاسـبکار بـوون، بوونە هۆگرم. چێـژی ئینسـانی کـە لەم نیزیکی و چاو پێکەوتنانەم وەر دەگـرت، کـۆسـپی ئەوە بوو کە بیر لە ناخـۆشی دوا ڕۆژی ئەم کارە بکەمەوە. لە کۆبوونەوەکانی دەستە دا نووسـراوە و بڵاو کـراوەیان دەخـوێندەوە کە لە واندا بە تـرس و نەفـرەت لە سـەرە ڕۆیی یاد دەکرا و شـۆرشیـان بۆ برایەتی و داد پەروەری نێوان ئینسـانان بە کارێکی مـسـۆگـەر و لە پارێز نە هـاتوو دەزانی کـە بە زویی سـاز دەبێ. ئـەمـەش خـەونێکی خۆشی حەفتـانەی نهێنی و قەدەخە کراوی ئێمە بوو کە تێیدا نوقم ببووین و لە پەنا ئەو دا بەدبەختی ڕۆژانەمان لە بیر چوو بۆوە. جگە لەم کۆبوونەوانە هیچ پێوەندێکی دیکە لە نێوماندا نە بـوو. کاتێ بە هـەڵکەوت لە کـۆڵان تووشـی یەکتر دەهـاتین وامـان نیشان دەدا کە یەکتر ناناسـین. ڕۆژێکی بەیانی کە لەمـاڵ دەهـاتمە دەر، دوو پۆلیس گـرتیـانم و بردیانمە کـەلانـتـەری. لە ژورێک حـەپسـیـان کـردم کە پۆلیسـی دیکەشی لێبوون. ئـەوان سەعـاتێک بە زلله لێـیـان دام و تفیان دە ڕوی دەکردم. ڕەنگە ئەگـەر لێیان دابام زیاتر لەو تف و زلـلانە بۆم هاسانتر بایە. کاتێ دەرگایان لە مـەعموورێک کردەوە کە دەبوایە پرسیارم لێ بکات، تفم بە سینگ و سـەر و چاوە وە بوو. کابرای مـەعمور بە ڕاسـتی یا بە ڕواڵەت ژێر دەسـتەکانی خـۆی لەو کـارە سـەر کۆنە کرد و ئەمری کرد سـەر وچاویان شـوشـتـمەوە و پاکیان کـردەوە. منی بردە دەفتـەری کاری خـۆی و دڵنیایی دا کـە بە سـەرنج و نیەت چاکی بە کاری من ڕادەگـات. ئەو دەیزانی کـە من لە ژوورێـکی تەنگ و بچـوکدا دەژیم. ئـەو شـوێنانەی دەناسی کـە نیـوە ڕۆیان شیـر قـاوەی لێ دەخـۆمـەوە. ئەم ڕەسـتـورانەش کـە ئێـواران شـۆرباوی لـێ دەخـۆم. ئاگاداری تەواوی لە بنە مـاڵەی من و لە گیر و گرفتی ڕێگای تەواو کردنی خوێندنی منی هەبوو. بەڵام لە بارەی ئەنگیزەی کە منی بۆ لای دەستەی شۆرشگێر ڕاکێشاوە جگە لە شـک و گـومـان شـتێکی دیکەی نـەدەزانی. لەم بوارە دا گـوتـی : « ئەم جـۆرە ئەنگیـزانە لە خـۆوە بە تەمبێ و سـەر کۆنە نابن و تەنانەت لاوان سـروشـتێکی بەرزە

فڕی و خـەیاڵییان هەیە و ئەگەر وا نەبایە بەد بەختی بوو. لە وانەیە نـەخشی پۆلیس لەم بارە دا توند و تیژ بێ، بەڵام بە هەر حـاڵ لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتییەوە پێویسـتـە غەریزەی بەرزە فڕی و خەیاڵپەروەری لاوان لە نیزیکەوە بکەونە ژێر چاوە دێری.»

دۆن پاولۆ دەڵێ :« بە کـورتی ئەو مـەعمـورە پێشنیـارت پێدەکا بچیـە دە خـزمـەتی پۆلیسەوە. تۆ وەڵامت چی بوو ؟»

لاو لە وەڵامدا دەڵێ : « من قبوڵم کرد .»

ماتالنا دێتە بەر دەرگا و دەڵێ : « شێو ئامادەیە، داخوا دەبێ لە دوو قاپانی بکەم

کەشیش دەڵێ : « من ئیشتیام نیە »

لە ســەر کـورسی هـەڵدەستێ و لە بەر هێـلاکی لە ســەر تـەخت ڕادەکـشێ. لاو ئیقرارەکانی خوی درێژە پێدەدا.

لە سەرەتاوە دۆن پاولۆ بە زەحمەت دەنگی دەبیسێ. چونکە لە بەر لێدانی دڵی وزە وزێکی لە گوێچکەی دێت و وەک گـێژان وایە. لاو چیرۆکی خۆی بەمـجـۆرە درێژە پێدەدا :

- سـەت لیرەیان دا بە من تا کرێ خانوەکەم بدەم. من لە پاداشی ئەوە ڕاپۆرتێکم وەک ئینشای کلاس سەبارەت بەم مەسەلەیە نووسی: « دەستـەکە چۆن کار دەکات، لە وی چی دەخـوێننەوە و بیـر لە چی دەکـەنەوە؟» کـابرای مـەعـمـور ڕاپۆرتەکـەی خوێندەوە و ئافەرینی لە ئینشای من کرد و گوتی :« بە ڕاستی باش نووسراوە .»

منیش لەوەی کـە ڕازی بوو هەسـتم بە فـیـزێک کـرد. پەیمانم دا کـە لە بەرانبـەر مـانگانەیەکی سـەت و پەنجـا لیـرەییدا، پێـوەندیم لە گـەڵ وی هەبێت. ئەم وەزعـە دەرەتانی بۆ من پێکهێنا کە نێوەڕۆیان سوپ بخۆم و هەموو شەوی شەمۆیان بچمە سینەمـا. ڕۆژێکیان بەسـتە سیـغارێکی بە دیاری دامێ. ڕاسـتی من قەت سیـغارم نە کێشا بوو. بەڵام سەبارەت بە ئەدەب فێرە سیغاریش بووم.

دۆن پاولۆ دەپرسێ :« لە ڕاپۆرتەکانی دیکەت دا چیت بۆ مەعمور دەنووسێ.؟»

لاو لە وەڵام دا دەڵێ :

- ڕاپۆرتەکانی دواییم شتی گشتی بوون. بەڵام مەعمور ئیرادی گرت. من بەر دەوام دانەیەکم لەو بڵاو کراوانـە دەدایە کە دەستـە بڵاوی دەکردەوە. بەڵام ئەو ئەم کـارەی پێ کـەم بوو. بە گـریمانـی توند پێشـتـر ئەوانەی لە کـەسـێکی دیکە وەر دەگـرت. ئاخرەکەی پێی گوتم دەستەکەم بگۆڕم و بچمە دەستەیەکی سەرنج ڕاکێشتر. کاری لەوەی هاسـانتر نە دەبوو. تەنیا بە دۆسـتەکـانم گوت کـە ڕووناکبیرێکی دیکە لە وێ

هەبێت. لە دەستـەی تازە دا لە گەڵ کیژێک بوومـە ئاشنا کە کڵاو درووبوو. خێرا یەکترمان خۆش ویست. لە پەنا ئەو دا بۆ هەوەڵین جار هەسـتم بە پەشـیوانی کرد. لە پەنا ئەو دا وردە وردە مانای ژیانی پاکی و بە شـەرەفی و دوور لە چاوە ڕوانییەک تێگەیشتم کە پێشتر هەر گیز دەرەتانی وەم لە خـەیاڵدا نەبوو. بەم شێوەیە لە ژیانی دەستـە دا شعوری ئەخلاقی من قوڵتر دەبوو، هەر لەو کاتەشـدا خەندەکێکی قوڵ لە نێوان ژیانی ڕواڵەتی و ژیانی دەروونی مندا پێک دەهات. هێندێ ڕۆژ دەمـتوانی کە ڕازی خـۆم لە بیـر بـەرمـەوە. هـەر وەک بە حـەز و هۆگـری بۆ دەسـتـە کـارم دەکـرد بەشێکی تەواوم لە ڕۆمانە شـۆرشگێرەکانی لە دەرەوە گەیشـتووم دەکـردنە زمـانی ئیتالیـای و ماشـێنم دەکـردن و شەوانە بەیاننـامەم بە دیوارانەوە دەنووسـاند تا وای لێهات کە هەستم بە هەڵەی خۆم کرد. بەڵام کاتێکی دۆسـتـانی دەستـەی تازەی من پەسنی ئازایی و تێکۆشـانی منیـان دەکرد، بەو تاریف و پەسنە وەبیـریان دێنامـەوە کە من لە ڕاستیدا خـەیانەتیان پێدەکەم. ئەو دەم هەوڵم دەدا لە بەریان ڕابکەم و لە ئاخـافتن لە گەڵیـان خۆ بپارێزم. لە لایەکەوە فیکرم دەکردەوە کە ئاخر منیش مـافی ژیانم هەیە. ئیـتـر هیچ پارەم لە بنە مـاڵەم وەر نەدەگـرت. کاتێ برسـی دەبووم و یا ئیـجارەی ژوورەکـەم وە دوا دەکـەوت، تەواو بێ دەسـەڵات دەبووم و ئیـتر دەسـتم بە هیچ ڕانـەدەگـەیشـت. سـیـاسـەت وەک شـتـێکی پیس دەهاتە بەر چاوم و ئەوەم بە شـەڕێکی زەرگەری نێوان ئینسانەکانی پەست و بێ نرخ دەزانی. ئاخر ئەو هەموو چەنە بـازییـە دەیتـوانی قـازانجی چی بۆ من هەبێ؟ بێگومـان پێم باشـتـر بوو لە ژیانێکی ئارام کەلکم وەر گر تبایە و توانیبام ڕۆژێ دوو سێ جەمە نان بخۆم و ئیتر پەتی پێویستبوونی پەرە گرتنی قەڵەمڕەوی ئیمپراتوری و « دێموکراسیی ئابوری» بپچڕێنم. بەڵام بە داخـەوە دەرەتانم نەبوو. من نـە بۆنان خـواردن پارەم هەبوو نە بۆ ئیجارەی ژوورەکەم. بەڵام لە گەڵکوو لە گەڵ کیـژی ئەوتـێنیدارم ڕوو بە ڕو دەبووم ئەم جۆرە بەڵگە هێنانەوەی بێشەرمـانەم لە بیر دەچوونەوە. ئێمـە یەکترمـان بێ سنوور خــۆش دەویست. ئەو بۆ من نەک هـەر دیاردەی سـیـاسـەتێک بوو جـیـاواز لە سیاسـەتەکانی تر، بەڵکوو سـەر مـەشـقێک بوو بۆ بیر کردنەوە و داوەری کردن بە شێوەیەکی دیکە. هەر چەندە خۆی بە دەگمەن داوەری دەکرد و زۆر بێدەنگ بوو، بە حـــەزەوە وتەکـــانی خـــەڵکی دیکەی گـــوێ دەدایە. لە وەش بـەرز تر، ئـەو دیاردەی بوونێکی دیکە و ژیـانێکی دیکە و تەنانەت سـەر مـەشـقێکی بـێ وێنە و هـاو تا بوو بۆ ئینسانی بوون و بە پاکی ژیان. ئیـتر نەمدەتوانی بە خـەیاڵم دابێ کە دەتوانم بێ ئەو

ژنە بژیم. ئەو لە ڕاسـتـیـدا لە ژنێک زیاتر بوو، ئەو کـڕ بوو، نوور بوو، ئەو زیندوو ترین شـاهیدی ڕاسـتـی ئەم ئیدیعایە بوو کە دەکرێ لەم کورەی زەویدا بە شـەرافەت و پاکی و بێ غـەرز و داوا بژی و بە تەواوی بوونـی بە دوای دۆزینەوەی حـەقـیـقـەتی ئینسـانی و دادی مرۆڤـایەتیدا بگەڕێی. پێم وابوو لەو ڕۆژەوە کـە ئەوم ناسـیـوە بە تەواوی واتـای وشـە دەسـتـم بە ژیان کـردوە. بەڵام لە کن وی و لە بـەرانبـەر بڕوای کوێر کوێرانەی کە ئەو بە منی هەبوو چۆن دەمتوانی وە بیر نە هێنمەوە کە فریوی دەدەم و خـەیانەتی پێدەکـەم؟ ئەڤینی من لە بەر ئەو خـەیانـەتە هەر لە سـەر چاوە وە ژاراوی ببـوو. هەر چـەندە لە کانگای دڵـمـەوە خۆشـم دەویست، ئاخـافتن لە گەڵ وی عەزابێکی سەخت و ڕواڵەتێکی لە توانا بە دەر بوو.

دۆن پاولۆ گەلێک شـتـی لەم جاسـوسـە سـیـاسـیـانە وەبیـر دێنێتـەوە کە لە تەمـەنی حـیـزبایەتی خۆیدا بیـسـتـوویـەتی. ژیانی ڕێکخـراوەیەکی نهێنی کە لە ژێر دەسـەڵاتی دیکتاتۆری دایە، هەمیشە لە گەڵ تەقەلای پۆلیس بۆ خۆ تێخزاندنی ئەم ڕێکخراوەیە لە خـەباتـی کـوێر کوێرانە دایە. بەڵام ئەو هـەمـیـشـە سـیـمـایەکـی کـەم و زیاد دیار و یەکسـان بۆئەم جۆرە جاسـوسـانە لە زەینی خـۆی دا قـالب ڕێژ کرد بـوو. ئێـسـتـا بۆ هـەوەڵـین جـار دەبینێ بەد بـەخـتـێک لـە پێش چاوی دەسـت و پێ ڕادەوەشـێنێ کـە هـەرچی لایـەنی ئینسـانی بوە لە نوکـەوە سـەر کـوت کـراوە و پیس بوە. لە لاوەکـە دەپرسێ :

– بۆ چی پێوەندی خۆت لە گەڵ پۆلیس نە پچڕاند.؟

– لە وەڵامدا دەڵێ : « چەند جار هەوڵم دا وەها خۆ بزر کەم کەکەمترین شوێنەوارم نە دۆزنـەوە. جـارێک خـانوەکـەم گـۆڕی، بەڵام بە سـانایـی دیتـیـانمەوە. مـاوەیەک تێکۆشـام بە نووسـینی ڕاپۆرتی بێـجـێ و هـەڵە بۆ پۆلیس ویژدانی خـۆم ئارام بکەم. هـەر لەو کـاتە دا دایکم دەسـتی پێکرد بـوو مانگانەیەکی کـەمم بۆ بنێرێ. بۆ ئەوەش هـەوڵم دا کە پۆلیس بەوە فریو بدەم و بڵێم کە دەستە بڕوای بە من نەماوە و دەریان کردووم. بـەڵام پۆلیس ئاگاداری دیکەی هەبوو کە بە سانایی پێچەوانـەی قسەکانی منی بۆ دەر دەخـست. لە ئاخریدا ئـەو بیرە بە سـەرم دا زاڵ بوو کە تاوانم لە قـەرەبۆ نەهاتوە. خۆم بە مـەحکووم دەزانی. هیچ کارێک نەدەکـرا. چارە نووس ئەوەی بۆ من نووسـیـبـوو. من ئێـسـتـا نـامـەوێ خـەراپەی خـۆم کـەمتر لە وە نیشـان بدەم کە هەیە. بەڵکوو لەم دان پێدانانە دا چۆنی بووم ئـاوا خـۆم دەر بخـەم. ڕاسـتـی مـەسـەلە ئەوە بوو ترسی ئاشکرا بوونم لەو کاتە دا گـەلێک لە پەشیـمـانی خـەراپە کردن قـەویتر

بوو.« ئەگەر ئەڤیندارەکەم بزانێ کە من لە بڕوای وی کەلکی خەراپ وەر دەگرم، چی دەڵێ ؟ دۆستەکانم دەڵێن چی ؟» ئەو ترسە واقعیە بوو کە هەمیشە ئازاری دەدام لە بەر ئابڕو و ئیعتیباری خۆم دەلەرزیم. بەڵام نەک لە بەر ئەو خەراپەی کە دەمکرد. لە هەموو شوێنێ شکڵی ترسی خۆم دەبینی. هەموو دەزانن کە پۆلیس لە ئیدارەکانی جیاواز و لە هەموو کارخانە گەورەکان و لە تەواوی بانکەکان و ئیدارە گرنگەکاندا جاسوس هەنە. لە شار لە هەموو ساختومانێک دەرکەوانی ئەو ساختومانە بە حوکمی قانون جاسوسی پۆلیسە. لە تەواوی کارگە و کۆبوونەوەکان و لە تەواوی سەندیکاکاندا ڕایەڵەی لە پسان نەهاتووی ئەفراد لە گەڵ پۆلیس لە پێوەندی دان کە بۆ مانگانە و یا بە هومێدی وە دەست هێنانی هۆکارێک بۆ پێشکەوتنی خۆیان بۆ پۆلیس کار دەکەن. ئەم وەزعە دڵی تەواوی چینەکانی خەڵک پڕ لە گومان و دوو دڵێ دەکات. بناخەی دیکتاتۆری لە سەر گۆڕینی ئینسان بە حەیوانێکی لەرزۆک لە ترسان دامەزراوە. ترسێک کە مرۆڤ لە بەری دەلەرزێ، لە دراوسێی خۆی ئەفرەتی هەیە، ئاگاداری ویە، ئەو دەفرۆشێ، و پاشان دەترسێ کە خۆشی پێوە بکرێ. هەر کەسێکی لە بەد بەختی کەوتبێتە شەرم و ڕیسواییەکی ئاوا مەحکوومە بەوە کە ئارەزوو بکا دامو دەزگای دیکتاتۆری پایدار بمێنێ. لە قوڵایی دڵیەوە قینی لە دیکتاتۆرییە بەڵام لە نەمانیش دەترسێ چونکە دەست بە جێ دەڵێ :« ئەو دەم هەموو دەزانن و ڕیسوا دەبم.»

ئەوەیە کە هەر یەک لەو بەد بەختانە بە زیجیری ترسان لە ڕیسوایی خۆیان دەبەسترێنەوە. ئەم شێوەیە ڕەنگە بەشێک بێ لە سیاسەت و شێوەی کردەوەی هەموو ڕێکخراوێکی دەوڵەتی بەڵام هیچ ڕێژیمێک وەک ڕێژیمی فاشیستی ئێستا تەنیا بە فەسادی شارەیان کە لە ڕوی ئەخلاقەوە لاواز ترن، پشت ئەستور نەبوە. ڕێکخراوی ڕاستە قینە کە بناخەی ڕێژیمی فاشیستی ئێستایە، هەر ئەو هاو کاری نهێنی ترسە. تا ئەو کاتەی من لە ڕۆم بووم دیلی ئەو هاو کارییە بووم. دەمزانی کە پۆلیس لە بەر ئەوەی ئیتر بڕوای بە من نیە، هەمیشە لە کەمینی مندایە. لە ئەنجامدا لە دیداری دۆستان خۆم دەپاراست تا مەجبور نە بم ئەوان پێوە کەم. کاتێ لە گەڵ کەسانی گومانلێکراو پێوەندیم دەگرت بێ ئەوەی گورج پۆلیس خەبەر دار بکەم، پۆلیس هەڕەشەی گرتنی لە من دەکرد. من وەک شێتان لە گرتن دەترسام. هەولم دەدا تا بکرێ لە تەنیاییدا بژیم. هەر چاو پێکەوتنێک لە گەڵ ئەویندارەکەم بۆ من ئازارێکی قورس بوو، لە گەڵ ئەوەش ئەو هەمیشە لە گەڵ من لە

سەر خۆ و میهرەبان بوو. ڕۆژی جێژنی نۆئیل ساڵی ڕابردوو لە ڕەستورانێکی دەور و بەری شار جێژنمان گرت و....

ئێستا دۆن پاولۆ چیرۆکێکی دەردەدار دەبیسێ کە خۆی پێشتر دەیزانی وهەموو بەشەکانی وی دەهاتەوە بەر چاو. ئەو خـواردنی ڕەنگین، ئەو داوەتەی مـاڵ، ئەو کڕینەی گوڵ و میوە و شیرینی و شەڕابی « مارسالا»، گەیشتنی پۆلیس، ڕاکردن بی سەر بان، چاوە ڕوانی درێژ و ...

بەڵام لاو چیرۆکی خۆی تەواو ناکا. سەری دەخاتە نێو دەستەکانی و وەک منداڵ دەکەوێتە گریان. پاشان درێژەی پێدەدا:

– من بۆ مـاڵێ گەڕامەوە و بە دایک و بابم گوت کە دوکتۆران پێیان گوتم لە ئاو و هەوای شوێنی لە دایکبونی خۆم دا بژیم. زستـانم لە مـاڵێ بردە سـەر بێ ئەوەی کەس ببینم. جار و بار دەچوومە چاو پێکەوتنی دۆن بنە دیتـو، ئەو کـتێـبی بە ئەمـانەت دەدامێ کە بخـوێنمـەوە. لە وەرزی بەهار دا وردە وردە دەستم پێکرد لە مەزرا یارمەتی بە باوکم بکەم و لە گەڵ وی خەریکی بژاری گەنم و هەڵپەرتاودنی ڕەز و کێڵانی زەوی و دروێنە بووم. تا خۆم لە سەر پێ ڕاگرتبایە کارم دەکرد. ئەوەندە ماندو و هیلاک دەبووم هەر لە گەڵ شێو خواردن دەنوستم. ڕۆژی دوایی بەیانی باوکم وەخەبەر دێنا. باوکم بە چاوی ئافەرین سەیری دەکردم و دەیگوت:« دیارە کە کوڕە وەرزێڕی !ئەو کەسەی کە تۆوی زەویە، ئیتر ناتوانێ زەوی بە جێ بێلێ» بەڵام ئەو کەسەی تۆوی زەویە و لە شار دەژی نە بە وەرزێڕ حیساب دەکرێ و نە بە شارەیی. بیرەوەری شار، یادی ئەڤیندارم، یادی دەستە و پۆلیس لە مندا وەک برینێکی زار ئاواڵە ما بوونەوە وەک برینێکی کە هێشتا خوێنی لێ دێت وردە وردە دێ چڵک بکا و ترسی وەی هەبوو کـە مـاوەی تەمـەنم ژاراوی بکات... دایکم دەیگوت:« هەوای شارت پێ نەکەوتوە و خەم و خەفەت ڕژاوەتە نێو خوێنت! » لە وەڵامـدا دەمگوت:« لێگەڕێ با کـار بکەم، بەڵکوو کـار چاکم کـاتەوە.!» بەڵام لە مەزرایە زۆر جار لە پڕ سیمـای جوانی ئەڤیندارەکەم دەهاتە بەر چاوم. چۆن دەمتوانی تەواوی ئەو شتانەی لە هاو نشینی ئەو فێری ببووم لە بیری بەرمەوە.؟ پاش گەیشتن بە دەرەتانی ژیانێکی دیکەی پاک و شەریف و هاو تا لە گەڵ غیرەت و ساخبوونەوە لە خەونی خۆشی مرۆڤایەتیەکی باشتر، چۆن دەمتوانی لە گوندی لە گەڵ ژیان هەڵکەم.؟ لە لایەک چۆن دەمتوانی ئەم گوناحە لە قەرەبۆنەهاتوە لە خۆم بسرمەوە؟ کاتێکی لە دەست ئەو بیرو باوەڕانەی کە لە گۆشە گیری سەریان هەڵدا

بوو و هەراسانیان کرد بووم، وە ئامان دەهاتم لە ترسی سزا دان گەیشتمە ترسی سزا نەدیتن.
فیکری ئەوەی کە بۆیە یادی کردەوە خەراپەکانی خۆم دەکەم کە لەوانەیە ریسوا بم، وردە وردە منی ترساند. لە خۆم دەپرسی:« کە وابوو ئەگەر هۆی دڵنیاتر پەیدا بێت کە دەرفەتمان بداتێ خەیانەت بە دۆستانمان بکەین بێ ئەوەی مەترسی ریسوا بوون لە گۆڕێدا بێ دا خوا رەنجی خەیانەت سوکتر دەبێ ؟» من هەر گیز لە ناخەوە بڕوام بە خودا نە بوە. ڕاستە کە تەعمید کراوم ودابی تناول القوربان- یشم وەک هەموو خەڵک بە جێگەیاندوە بەڵام قەت بڕوام بە حەقیقەتی وجودی خودا نەبوە.
هەر بۆیەش لە ڕۆم بۆ قبوڵی گریمانەی بە ڕواڵەت زانستی کە لە نێو دەستەکاندا تەبلیغ دەکرا، هەر گیز بەر بەرەکانیم نیشان نەدا. لە گەڵ ئەوەش ئەو فیکرانەی لە « ڕوکا » دەمکردنەوە ئەو گریمانانە هاسانتر دەهاتنە بەر چاو و بە کردەوەش بە کارم دەهاتن. ئەوە کە هەموو شت مادە بێ و مەفهومی خێر لە مەفهومی فایدە جیا نەبێ- هەر چەند فایدەی کۆمەڵایەتی - و ئەوەش خۆی بناخەی لە سەر مەفهومی سزا بێت، فیکرێکی ئاوا بۆ من لە تاقەت بە دەر بوو. سزا بە هۆی چ کەسێکەوە؟ بە هۆی دەوڵەت یا دەستە و یا بیر و ڕای گشتی؟باشە. ئەگەر دەوڵەت یا دەستە، یا بیر و ڕای گشتی خۆی گومرا بێ چی ؟ جگە لە وە ئەگەر ئەم دەرەتانە پێک بێ مرۆڤ ئەگەر خەراپە بکا و دڵنیا بێ کە سزا نادرێ ئەدی ئەخلاق لە سەر کام بناخە خۆ دەگرێ و قایم دەبێ؟ کە وابوو هەر وەسیلەیەک کە بتوانێ ترسی سزادان لە بەین بەرێ، سەر پشکی خێر و شەڕیش لە بەین دەبات؟ گریمانەیەکی وا منی دەخستە ترسەوە، وردە وردە ترسی ئاژاوە هەڵیدەگرتم. مەبەستم ئەوە نیە کە بەم زۆر بڵێییە کە ڕەنگە لە بەر چاوی تۆ ناڕوون ولێڵ بێ، سەرت بێشێنم ، و ناشمەوێ تۆ پێت وابێ کە من هەوڵ دەدەم بە قسەو و ساز کردنی ڕستە خۆم باشتر لە وە نیشان بدەم کە هەم. تەنیا دەمەوێ بڵێم کە ئەم بیر و ڕایە ببوە جەوهەر و هەوێنی ژیانی من.
من بڕوام بە خودا نە بوو، بەڵام ئەو دەم بە دڵ ئاواتم دەخواست کە خۆزیا خودا هەبایە. من پێویستم پێبوو تا لە نیگەرانی و ئاژاوە نەجاتم بێت. تا شەوێکی کە توانا و سەبرم نەمابوو، هەستام بچم لە عیبادەتگا لە کبوشی بدەم. لە ڕێگا توشی پیاوێکی ڕوحانی بووم کە پێشتر دەمناسی و ناوی « برای دینی ئانتی فونا » بوو. پێم گوت :« زۆرم گەرەکە بڕوا بە خودا بێنم بەڵام ناتوانم. بۆچی بۆم ڕوون ناکەیەوە

کە دەبێ چبکەم ؟» لە وەڵامدا گوتی : « نابێ غەڕە بی، نابێ بۆ تێگەیشتنی هەموو شت پێدا بگری، نابێ گـوشــار بۆ خـۆت بێنی، دەبێ تـەسلیم بی و چاوەکـانت بنوقێنی و دوعا بکەی . دین بەخششێکە.» بە داخەوە من بێ بەش لەو بەخششە هاتبوومە سەر دنیا. من دەمویست هەموو شت تێبگەم.

نەمدەتوانی بۆ تێگەیشتن هەوڵ نەدەم. تەواوی جەستەم ببوە هەوڵێکی دردە داری توند. نـەمـدەتوانـی تەسلیم بم. بە هـەمـوو تواناوە خـودام دەویست. پێـویسـتم بەو هەبوو. ئەو وەڵامی نەدامەوە. ئەو دەم چوومـە کن دۆن بـنە دیـتو. لە بەر ئەوە نە چوو بوومـە کن ئـەو کەشـیـشـە، بەڵکوو لە بەر ئەوە بـوو ئەو لە ڕوانگەی مـنەوە دیاردەی مرۆڤێکي داد پەروەر بوو. وەک پێشتر باسم کرد ئەو لە منداڵیەوە مني دەناسي. لە گەڵ ئەوەش کـاتێ چوومە خزمـەتی پێم گوت کە بە ڕاسـتی هێشتا من باش ناناسی چونکە لە تەواوی ئەو شـتـانەی لە دڵی منـدا شـاراومیە، ئاگـادار نیـە. فـشـارێکی سەختم بۆ خۆم هێنا و لە ئیقرارێکی کە پێنج سەعاتی تەواو درێژەی کێشا. هـەر چی بوو و نەبوو باسم کرد. لە کۆتایی ئیقرارەکە دا نیوە گیان وەهـەردی کەوتم. ئەو مـارتای خـوشکی ناردە لای دایکم تا خـەبەری بداتێ کە من شـەو لە مـاڵی کـەشـیش دەمخـەوم. تا چەنـد ڕۆژی دیکە لەوێ دەمـێنمـەوە تا لە کـارەکـانی بـاخ دا یارمـەتی بدەم. ڕۆژەکانی دوایی کـاتێ لە باخ کارم دەکرد جار و بار ڕادەوەستا و لە گەڵ من قسەی دەکرد. فێری منی کرد تا ئینسان لەم جیهانە دا زیندوە هیچ شتێک بۆ ئەو وانیـە کە قـەرەبۆ نەکرێ و مـەحکوومـەیەتێکی لێبڕاو نیـە. هـەر وەهـا ڕوونی کردمـەوە کە بێگومان نابێ خەراپەت خۆش گەرەک بێ. بەڵام نابێ لەم نوکتەیەش خافڵ بی کە جاري وایە چاکە لە خەراپە لە دایک دەبێ. لە وانە بوو ئەگەر ئەو بەد بەختیانەم نە دیتـبایـە، تووشی ئەو هەڵانە نـە دەهاتم کە بـە سـەرم هـاتن و هـەر گـیـز نـە دەبوومـە مـرۆڤـیکی واقـیـعی. ئاخـریەکـەی کـاتێ ئیـزنی دام و ڕێگای دا بۆ ماڵی خـۆم بگەڕێمـەوە، ئیتر ترسم لە دڵدا نە بوو، پێم وابوو تازە سـەر لە نوێ هاتوومەوە سـەر دنیـا و هەوایەکی لە چیاوە دەهات بە سـەیرەوە هەستم پێدەکرد کە قـەت هەوای وا فێنک و خاوێنم هـەڵنەمژی بوو. کاتێ ترسم لە دڵدا نە ما ئەم هەستـەشم لا نە ما کـە من سـەر باری خـۆمم. دوو بارە خـەریک بووم فـیکر لە دنیـا بکەمـەوە. دوو بارە دارەکـان و منداڵەکانی کـۆڵان و خـەڵکی فـەقیری زەحـمـەتکێشی سـەحـرا و کـەرە بەسـتە زمـانەکانـی بار کێش و گایەکانی بەر نیریم تەمـاشـا دەکرد. جار و باریش هەر وا دەچوومـەوە دیداری دۆن بنە دیتو. ئەو دوێنێ لە دوای منی نارد و گـوتی : «

دهمـهوێ تۆ له ڕهنجی دوو پاته کردنهوهی ئیقراری دهرده دارت تهرخـان بکهم. بهڵام له نیـزیکی « ڕوکـا » پیـاوێک ههیه تکات لێـدهکـهم بچـیـه لای وی ئهم ئیـقـراره لای ئهویش دوو پات کـهیـهوه. ئهو پیـاوه کـه سـێکه له ههمـوو بارێکهوه دهبێ بڕوای پێبکهی. نیشانه پێویستی دا به من و هێندێ شتی ڕاسپارد و ئێستا وا هاتووم.
بۆته شـهو. دهنگی هیـلاکی پیـاوی لاو له تاریکی دا کپ دهبێ و ههر لهو تاریکییـه دا دهنگی پیاوێکی دیکه دێت که دهڵێ:
– من ئهگهر سهرۆکی حیزب و یا دهستهیهکی سیاسی بوومایه. دهبوایه به گوێرهی ئهسـاسـنامـهی حـیـزب دادگـاییت بکهم. ههر حـیـزبێک خـاوهنـی ئیـدیۆلوژێیکه و ئهخلاقی تایبهتی خۆی ههیه که به شکڵی زنجیره بڕیاراتێکی وشک دامهزراوه. ئهم بڕیارانه زۆر جـار له ئهسڵێک زۆرنیـزیکن که ڕوحی ئهخـلاق وه بهر ههمـوو کهس دهنێ و هێندێ جاریش تهواو له گهڵ ئهو ناجۆرن. بهڵام من ڕێبهرێکی سیاسی نیم – و یا ئیـتـر نیم – منی ئێسـتـا لێره مرۆڤێکی ئاسـاییم. ئهگهر قـهرار بێ پیـاوێکی دیکه دادگایی بکهم ناتوانم جگه له ویژدانی خۆم بهڵگه و قـایدهیهکی پشت ئهستورم نیـه و ههر لهو کـاتـهشـدا دهبێ سنوورێکی زۆر تهنگه بهر له بهر چاو بگرم کـه له چوار چێـوهی ویدا مـرۆڤـێک مـافی وهی ههیه له بارهی مـرۆڤێکی دیکهوه داوهری بکات.
لاو وهڵام دهداتهوه:
– من نه هاتووم که داوای پاکانه و لێخـۆشبوون بکـهم. برینی ئهو تۆ ههن که نابێ بیان بهسـتی و بیانشـارییهوه بهڵکوو دهبێ بیانکهیهوه تـاو لێیان بدات. ئهو ئیـقراری ئایینی کـه ئاسـایی له پشـتی مـیلهکـانهوه ئهنجـام دهدرێ، به ڕای مـن کـارێکی تهشریفـاتییه که لێرهدا جێگای باسکردنی نیه. بهڵام ئیقرار کردنی کـهسێک له کن کهسێکی دیکه دهکرێ وهک داغ کردنی برین حیساب بکرێ.
ئهو دهم وته وێژ به دهنگێکی سهبروکه دهڵێ :
– ئهی لویجی موریکا، من دهمهوێ شتێکت پێبڵێم که سابیتی دهکا ئێستا چهنده بڕوا به تۆ دهکهم. من کهشیش نیم و دۆن پاولۆ سپادا ناوی ڕاسته قینـهی من نیه. ناوی ڕاستهقینهی من پیترۆ سپینایه.
ماتالنا مێزی بۆ دوو کهس ئاماده کردوه و پێیان دهڵێ بۆ شێو خواردن بێنه خوار و لهم باورهوه دهڵێ :
– پیاو که له دهورهی حهسانهوهی پاش نهخۆشیدایه، نابێ قهت نانخواردن وه پاش

خات. ئەگەر میوانیشی هەبێ باشتر کە ئەو میوانەش بۆ خواردن داوەت بکا.
مودیری موسافیر خانە سفرەیەکی سپی و بوتڵێک شەرابی لە سەر مێز داناوە. ئەم دوو پیاوە بە بێدەنگی نان دەخۆن. شەرابی پێش ساڵێک و نانیش پێش پازدە رۆژە. نانی بەیات دە شـەرابدا خـاو دەکـەنەوە. مـۆریکا دەیەوێ هەر ئەو شـــەوە بۆ رۆکـا بەگەڕێتـەوە و دۆن پاولۆ پاش ئەوەی دەچێتـەوە ژوورەکەی خۆی چاو لە سـەر یەک دانێ ، پاش تاوێک دێتـەوە خـوار تا مـیوانـەکـەی مـەودایەک بە رێبکات. مـاتالنا ناتوانێ ئێرمیی خۆی سەبارەت بەم دۆستـایەتیە کوتو پڕەی کە لە نێوان کەشیش و نە ناسراو دا پێکهاتوە، بشارێتەوە، بۆیە بە موریکا دەڵێ :
– ئەو هەموو قسەیەت کرد دیسان قسەت ماوە بیکەی ؟
لاو لە وەڵامیدا دەڵێ : « خەریک بووم نیقرارم دەکرد »
ئاخریەکەی کاتێ لە سەر جادەی کە بۆ سـەرەو ژێری دۆڵ دەچێ لێک جیا دەبنەوە، موریکا دەڵێ :
– ئێستا بۆ هەموو کارێکی ئامادەم.
دۆن پاولۆ دەڵێ: « لەم بارەوە بەو زوانە دیسان قسان دەکەین.»
لە دوور دەنگێکی نا ڕوون دەبیـسـرێ کە لە دەنگی شـوانـان و سـەگ وەڕ و کـاڕەی مـەڕە تێکەڵە. لە زەوی شـەدار بۆنی نەرمـی پنگی سەحـرا و ئیکلیلی کـێـوی دێت. کـاتێکە کـە وەرزێڕەکـان بەر لەوەی بچن بخـەون، کـەرەکـانیـان بۆ تەویلە دەبەنەوە. دایکەکان لە پەنجەرەوە بانگی منداڵەکانیان دەکەن کە هێشتا نەهاتوونەوە ماڵ. سەعاتێکی لە بارە بۆ دوعا و پاڕانەوە. ئینسان بۆ حەیوان و حەیوان بۆ گیاو گوڵ و بۆ زەوی دەگەڕێنەوە. ئەو ڕوبارەی بە قولایی دۆڵدا دەڕوا لە بەر ئەستێران پەڵە پەڵە بوە. لە پیـتـراسکا ئێـسـتـا تاریکی داهاتوە جگە لە کـەللە سـەری گـا کـە بە دوو شاخەوە لە سەر بانی موسافیر خانەی مالتانا ریکوتایە، شتێکی تر نابینرێ.
پیتراسکا لە کاتێ ڕۆژ دا دێتەوە سەر حاڵەتی خۆی. لە گەڵکوو وروژان وشلوقی رەمـەکی ڕۆژەکـانی ئامـادەیی دەنیشـێـتـەوە وەرزێڕەکان ژیانـی یەک هەوا و ئارامـی خۆیان دەست پێـدەکـەنەوە. تەنیـاگوند لە لاوان خـاڵیـیـە. پیـرە مێـردەکـان لە بەر دەرگای مـاڵەکانیان مات و بێدەنگ، بێ ئەوەی تەماشای دەور و بەری خۆیان بکەن خـەریکی شـۆرباو خـواردنن و بە حـاڵێکی هیلاک و مـاندوو وەڵامـی پرسـیـارەکـان دەدەنەوە. دایکی فـلان سـەر باز یارمـەتـی کـەم وەر دەگرێ و لە دڵدا هیـوا دارە کە ئەم یارمـەتـیـە درێژەی هەبێ. سـەبارەت بە مـەسـەلەکـانی دیکە پێویسـتـی بە بیـر

گردنەوە نیە. ئەوەی دەبوای ببێ، هەر دەبێ. دەبوایە شەڕ بێت، وا ئێستا هاتوە. ئەگەر قەرار بێ تاعون بێت، ئەویش دێت. ئەوەی دەبێ بێت، بە ئیجبار دێت و هەرچی بێتیش ئاخرەکەی دەڕوات. ئێستا منداڵانی مەدرەسە بە دوو دەستەی ئەفریقایی و « ئیتالیایی» دابەشبوون و شەڕە بەردیانە. زۆر جاران وا دەبێ کە ئەفریقاییەکان لە ئیتالیەکان دەدەن و ئەو دەم خانم مامۆستا تورە دەبێ و دەیکاتە هەرا.

ژنی ماگاشیا لە زمانی ماتالنای بیستوە کە دۆن پاولۆ ئیجازەی ئیقرار بیستنی وەر گرتوە. ئێستا لە بەر کەشیش دەپاڕێتەوە کە ئیقراری مێردەکەی گوێ بداتێ کە وا بیست و پێنج ساڵە لە گەڵ خودا تێکچوە. لەم بارەوە بە کەشیش دەڵێ: « ئەو بڕوای بە کەشیشەکانی مەحەللی نیە و ئیتر دەرفەتی واش پێک نایە کە کەشیشێکی غەریب بێتە پیتراسکا. تۆ ئاغای کەشیش ئەگەر ئەو لوتفەی لە گەڵ نەکەی ئەو بە گوناحباری دەمرێ و دەچێتە جەهەندەمێ.

کەشیش دەیەوێ ڕوونی بکاتەوە کە بە ڕاستی ئیجازەی ئیقرار بیستنی وەر نە گرتوە. بەڵام ژن بە گوێی دا ناچێ و چوە لە گەڵ ماگاشیای پیرەمێردی شوی گەڕاوەتەوە. ماگاشیا کە پیاوێکی باڵا بەرز و بە خۆوە و ڕیش دارە، کڵاوەکەی بە دەستەوە گرتوە و چوار چێوەی دەرگای پڕ کردوە. قۆڵی چاکەتی کە بە سەر شانی بێدەستی داداوە، خستوویەتە گیرفانی. دۆن پاولۆ لە سەر کورسی پەنا تەختی خەوی چاوە ڕوانە و دەیەوێ قسەیەک بکا. بەڵام پیرە مێرد لە بەر پێیانی ئەژنۆ دادەدا، نیشانەی خاچ دەکێشێ، هەرد ماچ دەکا و لە کاتێکا ڕوومەتی لە سەر هەرد داناوە، دوعای ئیقرار دەخوێنێ و سێ جار لە سنگی خۆی دەدا و لە بەر لێوانیەوە دەڵێ :

Mea culpa , mea culpa, mea maxima cwlpa ( واتـــــە: مــــن گوناحبارم، من گوناحبارم، من لە ڕادە بەدەر گوناحبارم

بێ ئەوەی سەر بەرز کاتەوە، تا چەند چرکەیەک هەر وا قسەی نا ڕون درێژە پێدەدا کە کەشیش هیچی لێ تێناگات. کاتێ کابرا ئێنقرارەکانی کۆتایی پێدێنێ هەر وا سەری لە سەر هەردە و بە جەستەی زەلامی خۆی نیوەی ژوورەکەی گرتوە. قەد و باڵای زەلامی وەک غولی هێناویەتە سەر شکڵی بوونەوەرێکی وەک حەیوانی سەر دەمی پێش توفانی نوح. ڕیشی پڕ و قژی سەری گیاو گوڵی لێرەوارەکان وە بیر دێنێتەوە. تەنیا ترسی وی کە لە وەزع و ڕەفتاری دەر دەکەوێ نیشانی دەدا کە

ئەدەمیزادە. لەو حاڵی دوعا و پاڕانەوە دا تاوێ مات دەبێ، پاشان سەر هەڵدێنێ و بە دەنگی ئاسایی خۆی دەپرسێ :« باشە، تەواو ە؟ تۆ منت پاک کردەوە ؟. دەتوانم بڕۆم ؟»
ئیقرار بیسەر دەڵێ: « بەڵێ دەتوانی بڕۆی »
ماگاشیا هەڵدەستێ و دەستی کەشیش ماچ دەکا بەر لەوەی بڕواتە دەر دەڵێ:
- پێویستم بە ڕاوێژێکیش هەیە ناوێرم لە گەڵ خەڵکی تر باسی بکەم. داخوا پیاو کوشتن پاش بیست و پێنج ساڵ تێپەڕ بوونی زەمانی بە سەردا نایە.؟ داخوا ئەگەر مرۆڤ ئاشکرا بوو دەیبەن بۆ دادگای جنایی؟
- کامە پیاو کوژی ؟
ماگاشیا تێناگات کە بۆ چی کەشیش خۆی لە کوچەی عەلی چەپ داوە، بەڵام چونکە پرسیار نارەحەتی کردوە بە سرتە پێی دەڵێ :« کوشتنی « دۆن جیولیو» دەفتەر داری« لاما» ت عەرز دەکەم.»
کەشیش دەڵێ:
- ئەها ! ڕاستە... من لە بیرم چوو بوو. بەڵام من پارێزەری عەدلیە نیم و لەم بارەوە نازانم وەڵامی چیت بدەمەوە.
ئەم هەڤاڵە لە گوند دا بڵاو دەبێتەوە کە دۆن پاولۆ ئیجازەی ئیقرار بیستنی وەر گرتوە.
ماگاشیا گوتوویەتی: « ئەمە ئیقرار بیستێکە کە هەموو شت دەزانێ و هەموو گوناحێک دەبەخشێ.
ماتالنا دوو پاتی دەکاتەوە کە :
- ئەو لە سەرووی ئیقرار بیستێکی ئاساییە، ئەو پیاوێکی پیرۆزە کە ناخی دڵی گوناحکارانی فەقیر دەخوێنێتەوە.
خەڵک لە هەموو لاوە تاڵوکە دەکەن تا ئاگاداری وەر بگرن. ژووری دۆن پاولۆ لە مەو دوا بۆتە پێگەی هەموان. خەڵک دەچنە ژوور و دێنەوە دەر. هەر کەس دەیەوێ ڕۆژی ئیقراری خۆی دیاری بکات. منداڵ لە پەیژەکان دەچنە سەر و لە بەر دەرگا دەمێننەوە و ناوێرن بچنە ژوور و لەم پیاوە پیرۆزە وەنیزیک کەون کە نە دەتوانێ خۆ بشارێتەوە و نە دەتوانێ بەر گری لە خۆی بکا کە نیزیک بنەوە.
« جزیرا »ی پیر لە ڕێوە دەگاتێ. ئەو هەموان دەر دەکات و دەرگا لە سەر خۆی کاڵە دەدا، ئەژنۆ دادەدا و پاش خوێند نی دوعای « من گوناحبارم» چیرۆکی ژیانی خۆی

دەست پێدەکا. پیرێژن وەک ئاشی ئیسوت هارین دەسووڕێ. ئاشێکی بێ ددان کە تەنیـا لێـوی زەرد و باریکی هەبن. لە ژێر ئـەو چەند داوە قـژی پیـسـی کـە بۆی ماوەتەوە نیوەی گوێچکەی دیارە و پیرێژن دەڵێ نیوەکەی تری بە جحێڵی کەر گازی لێگرتوە و لێی کردۆتەوە. شوێنە واری چەند برینی لە ئازای لەشی یەک یەک نیشان دەدا و قسەیان لە سەر دەکا کە هەموویان یادگاری مێردی هەوەڵیـەتی بۆی بە جێ ماون. تا ئێستا هیچ کەس ئەو برینانەی نەدیوە چونکە لە سایەی خودا لەشی بە کەس نیشان نەداوە. بەڵام ئەوە برینی ڕاستین. ڕاستییەکی ئەو تۆن وەک جێگای نێزەی حەزرەتی مەسیح. ئێستا بیست ساڵە کە مێردی لە کارەساتی بوومە لەرزە دا مردوە. جزیرا ئاوا دەگێڕێتەوە:

– لە کاتی بوومە لەرزە دا خودا وای ویستبوو کە من لە سەر شەقام بم. مێردەکەم لە خەو دابوو لە ژێر دیواری کە بە سـەریدا ڕووخـا بوو دفن کـرا. من گـورج بیـرم کـردەوە: « ئێـسـتـا بوومـە بیـوە ژن دەتوانم پشـوێکی ئاسـودە بدەم. بەڵام مێـردی دووەمم پێـویسـتـە بە لێ ورد بوونەوە ی زیاتر هەڵبـژێرم.» بەڵێ من ئیقرار دەکەم کە هەوەڵین فـیکری من ئەوە بوو. ئەو کـەسـانـەی کـە لە بوومـە لەرزە دا گـیـانـیـان بە سـلامـەت دەر چوو بوو پەنایان بۆ ژێر چەند خێـوەت برد کە لە پشتی گۆڕستان لە نێـو بەفـر هەڵدرا بوون. شـەوانە ناچار بوین بۆ ڕاو نانی گـورگان ئاگر بکـەینەوە. دەچووینە خانوە وێرانەکان داری وشکمان کۆ دەکردنەوە. شـەوێکیـان لە نێـو مـاڵە وێرانـەکـەی خـۆم دا بە دوای هێندێ شـڕە و بڕە دا دەگـەڕام لە نە کـاو گـوێم لە دەنگێکی لاواز بوو لە نێو بەردەکان دەهاتە دەر. دەنگەکە دەیگوت:«« جزیرا ! جزیرا !» مێردەکەم بوو کە هێشتا زیندو بوو. من لە ترسان ڕامکرد بە خۆم گوت ئەگەر بێـتە دەر بە تاوانی ئەوەی لە هەوەڵەوە لە ژێر وێرانـە دەرم نەکێشـاوە، بە قەسـتی کوشتن لێم دەدا. پاشان ئەو فیکرەشم بە مێشکی داهات: «بێگومان قاچێک و یا باسکی شکاوە وتەواوی تەمـەنی شـەل و نەقوستان دەبێ و ئێمەش لـە هەموو کـاتێ فـەقیـر تر دەبین» ڕۆژی دواییش دوو بارە منی بانگ دەکـرد بەڵام دەنگی لاواز تر دەهات و دەیگوت.« جزیرا ! جزیرا !» من لای خۆم فیکرم دەکـردەوە: ئەگەر خـودا ویستبای ئەو نەجاتی بێ لە ژێر خاکدا دفنی نەدەکرد. پاش چەند ڕۆژ سـەر باز هاتن خاکەکەیان لابرد کە مردوەکان بنێژن. مێردەکەم یەک لە وانە بوو کە یەکەم جار دیتیانەوە و ناشتیـان. شوی دووەمم لەو باشتر نە بوو. مانگێک پێکەوە بووین و پاشـان مـێردەکـەم بە پاشـەکـەوتی من چوە ئارژانتین و ئیتر نە گـەڕایەوە. ئەوەش

چارە نووسی ئێمەی ژنانی فەقیرە.
جزیرا چاوە ڕوان بوو کەشیش شتێکی پێ بێژێ. بە گوێرەی ئاسایی سەر کۆنەی بکا و پرسیاری لێبکات و ئاخرەکەشی بە گوێرەی داب لێی خۆشبێت. بەڵام دۆن پاولۆ بە ڕەنگی پەڕیو لێی ورد دەبێتەوە و هیچ ناڵێ .
پیرێژن دەپرسێ:: « تەواو بوو ؟ دەتوانم بڕۆم؟ تەواو بوو.=»
کەشیش دەڵێ: « تەواو نە بوو، بەڵام دەتوانی بڕۆی .»
پاشان ماستر ئانجلۆ دێت. « لیدونیا » ی خێزانی و« ماریتا » ی ژن خوشکی باسکیان گرتوە چونکە لاقی پێچراوە ویە زەحمەت دەتوانێ بە ڕێگا دا بڕوا و لە بەر ئەوەی ناتوانێ چۆک دابدا ئەو دوو ژنە لە پەنا ئیقرار بیسەر لە سەر کورسی دادەنێن و خۆیان دەچنە دەرێ. ماستر ئانجلۆ بۆ دەستپێکردنی قسەکانی لێوەکانی لە گوێچکەی کەشیش نیزیک دەکاتەوە تا زیاتر دڵنیا بێ کە جگە لەو کەسیتر قسەکانی نابیسێ. هەناسەی بۆگەنی شەڕابێکی لێ دێ کە خودا دەزانێ شەڕابی چەند ساڵانە. بۆگەنێک کە دۆن پاولۆ ژانە سەر دەگرێ.
ماستر ئانجلۆ دەڵێ :
- ژنەکەم هەژدە منداڵی بوو. بەڵام خودا لەو هەژدە منداڵە شازدەی لێ وەر گرتەوە. هێندێ کە س هەن کە هەر لە کاتی لە دایکبوون سزا دەدرێن و هیچیش ناکرێ. ماریتای ژن خوشکی من بە شێوەیەکی تر سزای بینیوە. ئەو ژنی فەقیرێک بوو بەڵام ساخ و سەلیم بوو. بەر لە شوو کردنی بە « نیکلا چیکاوۆ» هەموو کەل و پەلی بوکێنی ئامادە بوو. ئاگاداری پێویستیشیان بڵاو کرد بۆوە لە پڕ نیکلا هاتە لای من و بە نهێنی پێی گوتم : « من ڕازێکم هەیە دەبێ لە گەڵ تۆی باسبکەم. ئەویش ئەوەیە کە شەڕ منی بە سزای کردەوەی خۆم گەیاندوە.» ئەو دەم بەد بەختی خۆی بە من نیشاندا . ئەو پیاوە بە تواناو هێزە ئیتر پیاو نەبوو. لە نەخۆشخانەی نیزامی بۆ ئەوەی گیانی ڕزگار بکەن، مەجبوور بون سیرمتی لە بنەوە ببڕن. کابرای بەد بەخت تاک و تەنیا بوو. نە دایک و خوشک و نە کەس و کارێک کە کراسی بۆ بشوات و چێ خەوی هەڵبگرێ و سوپی بۆ لێنێ. ناچار بوو ژنێک بێنێ. جگە لەوە باخێکی ڕەزیشی هەبوو. میداڵێکی لێهاتوویش. ئەگەر ماگاشیا مرد بایە فرۆشتنی توتن و خوێیان سەبارەت بە میداڵی لێهاتوویی دەدا بە نیکلا. ماگاشیا لەو کاتە دا پیر بوو چاوە ڕوان دەکرا بە زوویی بمرێ. ئەوە کە هێشتا زیندوە خەتای ئاواڵ زاوای من نیە. بەڵێ، نیکلا و مارتینا زەماوەندیان کرد و تەنیا پاش بوک گوازتنەوە

مـاریتـا زانی چ خـاکێکی وە سـەر کراوە. نیکلا پێی دەڵێ کە مێردی خوشکت لەو ڕازە ئاگا دار بوە. مـاریتـا کورج کەسێکی بە دوای مندا نارد و تا مـن گەیشتمێ دەستی کرد بە گریان و هـاوار و گوتی : « تۆ بوویـە هۆی بەد بەختی من. ئێستا لە شەرمی ئەو ڕیسواییە باشترە خۆم بکوژم.» نیکلا ئێمەی تەنیـا بە جێهێشت و بەر لە ڕۆیشتن بە ئێمەی گوتبوو: « ئێستـا کە خـودا مـەیلی لە سـەر ئـەوەیە من سزا بدات، من هەق بە خۆم نادەم ئیرەیی بەرم. بەو مەرجە کە شەرافەتی من بپارێزرێت. مەبەستم ئەوەیە کەس نە زانێت.» ماریتا شـەش مندالی بوون کە چواریان زیندوون. مندال دروستکردن وەک ئاو خواردنەوە وایە. مرۆڤ لە گەڵ خۆی پەیمان دەبەستێ کە : « ئەوە ئاخرین پیالە دەبێ.» بەلام دوایە دیسان تینوایەتی هێرشی بۆ دێنێ و پیاڵەیەکی دیکەش دەخواتەوە. دیسـان دەڵێ:« تەنیـا ئەو پیـالە و بەس » بەلام کێ دەتوانێ پێشی تینوایەتی بگرێ. کاتێ ژن تینوە و کاتێک پیـاو. جاری واشـە هەر تکیان. سـالەکانی هەوڵ پاراستنی پێوەندی باش لە نێوان دوو خوشکدا هـاسان نەبوو. بەلام لە گەڵ تێپەر بوونی زەمـان باشبوو. ئێمـە بە ڕەزای هەق ڕازی بووین. ئابرووی نیکلاش پارێزرا و هیچ ڕیسوایی نە قەومـان. هیچ کەسیش نەیزانی. بەلام ڕۆژێک نیکلا بۆ ئیقرار دەچێتـە کن « دۆن چیپریانۆ»ی کەشیش و نـاو براو بە جـارێک کابرا هەڵدەتەکێنێ. کەشیش پێی گوتبوو ئەو سزایەی کە خودا تا ئێستا پێی داوین لە تۆڵەی کردەوەی خۆمانە و موستەهەقین و لە بەرانبەر ئەوەی لە مەو دوا بە سەرمان دێت هیچە. ئەوەی ئێمـە لە ژیانی خۆماندا دیتمان، ئەوە دیتمـان و ئەوەی نەمـاندیت منداڵەکـانمان کە تۆی گوناحن دەیبینن و ئەوەی منداڵەکانمان نەیاندیت، نەوە ونەتیـژە دەی بینن تا حـەوت پشت. بەلام ئەگـەر خـودا ئاگـاداری مەسـەلەکەیە چۆن دەتوانێ دوو بـارە ئێمـە سـزا بدات؟ چما ئێمـە بە ڕادەی تەواو ڕەنجمان نەکێشاوە.؟

تۆبە کـار بێدەنگ دەبێ و بە چاوی پڕ لە خـوێنـی لە ئیقرار بیسـەر ڕادەمێنێ تا وەلامێکی لێ ببیسێ. لە پەیژەکانەوە دەنگی چەند سەر خۆشێک دەبیسرێ کە لە قاتی خوارێ یاری « مۆرا » دەکەن. یەکیان هـاوار دەکات: « پێنج، پێنج، پێنج، ئەوی دیکە دەقیـژێنێ و دەڵێ : « سێ !.. نۆ.!.. شـەش!» دۆن پاولۆ دوو مێشـان لە سـەر شوشەی پەنجـەرەکەی دەبینێ کە پێکەوە نووساون و مەرگ لە کاتی جوتبوندا خافڵ گیـری کردوون. لە دەرەوە باران دەبارێ. دۆن پـاولۆ دەلەرزێ و ئاخـرەکـەی دەڵێ :« ماستر ئانجلۆ، تکا دەکەم باوەر بە قسەی من بکە! من نازانم وەلامی تۆ چ بدەمەوە.

من قەت بیرم لە مەسەلەیەکی وەک مەسەلەی تۆ نە کردۆتەوە.
- لە کتێباندا چییان نووسیوە ؟
کەشیش لە وەلامدا دەڵێ :« با بزانم دەگەرێم ».
لیدوینا و ماریتا کە ماسترئانجلو بانگی کردوون، لە پەیژەکان سەر دەکەون و باسکی دەگرن بێتە دەرێ. لە گەڵ ئەوەش بە چاو لێی دەپرسن بەڵکوو نەتیجەی ئیقرارەکان هەست پێبکەن. لە رێگای پەیژەکان تۆبە کاری دیکەی ژن و پیاو لە سەر پەیژەکان دانیشتوون و چاوە رێی نۆرەن. بۆنێکی توند و خۆش لە هەوا شەپۆل دەدا. دەڵێی ئەو خەڵکە راهاتوون دەرێیی خۆیان پیس بکەن. قەت خۆیان ناشۆن. دۆن پاولۆ کلاوەکەی لە سەر دەنێ و عەبای بە شانی دادەدا و هەر چەندە باران دەبارێ روو دەکاتە کۆلان دەکەوێتە بیری چاو پێکەوتنێک کە سەر دەمێک لە کانالی گەنداوەکانی پاریس دا ئەنجامی دابوو. وای دێتە بەر چاو کە ئێستا لە زەلکاوێکی دیکە هاتۆتە دەر. ئەوە کە بە حوکمی غەریزە لە شیکردنەوەی بەد بەختی و رازی تایبەتی خەڵک خۆ دەبوێرێ، ئەدی هەر بۆیە نیە کە دەترسێ ئەو خەیالی ساکاری کە لە رەنج و ئازاری مرۆڤ و لە ئارامکردنی ئەوان لە زەینی خۆیدا بەر جەستەی کرد بوو، تێکیچێ ؟ لە وانەیە بترسێ لە گەڵ هێندێ دەردی ئینسانی بەرەو روو بێ کە چاریان نەیە ؟ و لە پڕ داوەری لیبراوی« ئولیوا » لە بارەی خۆیەوە وە بیر دێنێتەوە کە دەیگوت:« واقعیەت تۆ دەترسێنێ. تۆ بە زۆر خۆت کردۆتە خۆشبین و شۆرشگێر چونکە پێچەوانەی ئەوە تۆ دەترسێنێ.»
دۆن پاولۆ بۆ ئەوەی وەک مشکی تەڕی لێ نەیە و دەست بە جێش نەچێتەوە موسافیر خانە، پەنا بۆ ماڵی کولامارتینی یەکان دەبات. کریستینا رادەکا و دەرکای لێدەکاتەوە. دۆن پاولۆ لەو رۆژەوە کە بۆ پیتراسکا گەراوەتەوە جگە لە کاتی تێپەڕ بون بە کۆلاندا نەیدیوە. کیژی گەنج لاواز بوە. دیارە رەنج دەکێشێ و کراسێکی رەشیش کە لە تازیەی باوکی دەبەری کردوە ئەم هەستە بە هێز دەکات. بە کەشیش دەڵێ:
- ئێستا زیکری خێری تۆ بوو.
لە متبەقی گەورە کە کریستینا کەشیش دەباتە وێندەرێ تەواوی کەسانی بنە ماڵەی ئەو کیژە گەنجە، واتە دایە گەورە و پووری و دایکی و برای لە وێن. ئالبێرتۆ لیباسی ئەفسەری ئەرتەشی لە بەر دایە و لە روونکردنەوە دا دەڵێ :
- منیش داو تەڵەب بووم. لە جیاتی ئەوەی لێرە لە بێکاریدا بسورێمەوە، چەند سەت

لیرمیەک مانگانە وەر دەگرم. ئەگەر داو تەڵەب نە بوومایە بە ئیجبار دەیانبردمە سەر بازی. باشترە مرۆڤ کاری چاک بە مەیلی خۆی ئەنجام بدا.
بۆنێکی سوکی هەوای پیس لە متبەق دێ کە بە عەتری قوتوی کۆنسێر و شەڕابی بۆندار لە بەین چوە. ژنەکان بێدەنگن. دۆن پاوڵۆ لە پشت شوشەی پەنجەرەوە تەماشای باخ دەکات کە باران ئاوی داوە و ئێستا کراسی پایزی دەبەر کردوە.
گوڵەکان تۆویان کردوە. تۆیەکە ڕژاوەتە سەر زەوی و لە زەویدادەڕزن و لەو ڕزینە گوڵی تازە شین دەبن. پوور ڕادەبێ و بە ئاماژە دایکی کریستیناش بە دوای خۆیدا بانگ دەکات. بەڵام دایکی کریستینا مەبەستی وی تێناگات و وەک منداڵی بچوک و ئینسانی ئاقڵ شیرین پێکەنینێکی ئەحمەقانە دێتێ. کریستینا و ئالبێرتۆ ش دەڕۆن تا ماینەکە لە تەویلە ڕنەک بکەن. دۆن پاوڵۆ لە گەڵ دایە گەورە بە تەنیا دەمێنێتەوە.
پیرێژن دەڵێ :
- تۆ ئاخرین کەس بووی پاسکاڵی کوڕم پێش گەڕانەوە لە فوسا قسەی لە گەڵ کردووی. ئەو چی بە تۆ گوت؟
کەشیش لە وەڵامدا دەڵێ:
- ئەو بە منی گوت: کۆتایی کارە! نەیدەویست هیچ کەسی لە گەڵ بێ. بە ڕاستیش کۆتایی کار بوو، زیاتر لە وە هیچی نە گوت.
پیرێژنی ڕەشپوش لە سەر مۆبلێک دانیشتوە کە پارچەکەی لە کۆنە مەخمەرێکی سوورە ولە پێش پەنجەرە دانراوە کە دەڕوانێتە باخ. ئەو پیرێژنێکە ورد و پیر و پڕ چرچ و لوچ. بە چاوی وەک شوشە و بێ حاڵ تەماشای کەشیش دەکات و کاتی قسە کردن پوکەکانی نیشان دەدا کە ددانێکی تێدا تەماوە و دەڵێ :
- ئەوان ئێمەیان بۆیە بە تەنیا بە جێهێشت کە دەیانویست من لە لای تۆ ئیقرار بکەم. بەڵام من نامەوێ ئیقرار بکەم. بۆ ئیقرار کردن شتێکم کەمە ئەویش هەستی پەشیوان بوونەوەیە. ئاخر لە چی پەشیوان بمەوە.؟
دەستەکانی وەک خاچ لە سەر سنگی داناوە. ئەو دەستانەی وەک ئامرازی کۆن دەچن کە لە بەر کاری زۆر و دژوار و بەر دەوام سیس بووبن. باسکە وشکەکانی وەک دوو لقە دار دەچن کە چاوە ڕوانی بڕین بن وبیانخەنە سەر ئاگر.
پیرێژن دوو پاتی دەکاتەوە:
- لە چی پەشیوان بمەوە ؟ لەو هەشتا ساڵ تەمەنە دا جگە لە یەک شت هیچی ترم نە ویستوە. یەک شتی ڕاست، تەنیا یەک شتی ڕەوا، ئەویش شەرافەتی بنە ماڵەم

بوە. جگە لە وە بیرم لە هیچ شتێکی دیکە نە کردۆتەوە، هەر کیز هیچی دیکەم نە ویستوە. هیچ کارێکم نەکردوە. بەڵێ لە ماوەی هەشتا سالی تەمەندا... ئێستا لە چی دەبێ پەشیوان بم.؟

ئێستا لە قولایی چاوەکانیدا کە لە پڕ گوشاد بوون، نیگەرانیەکی بێ هومێدی و ترسێکی کە ماوەیەکە شاراوەتەوە، ترسێکی ئەوەندە لە چار نە هاتوە و نا هومێدێکی وەها دەر دەکەوێ کە دۆن پاولۆ بە دیتنی وی واقی وڕ دەمێنێ.

پیرێژن دەپرسێ: « ئایا کۆتایی کارە.؟.. بە ڕاستی کۆتایی کارە ؟ کۆتایی هەموو شتێکە یا تەنیا کۆتایی کاری کولامارتینییەکانە ؟ کاتێ پیرێژن دەزانێ کە دۆن پاولۆ لە چاوەکانی وی ڕاماوە، چاو دەنوقێنێ. سەری وەک ئێسک و کەچەڵی، شکڵی سەر ی پاساری وەبیر دێنێتەوە. چ شتێکی قابیلی شکانە و هەر لەو کاتەشدا چەندە ڕەق و سەخت و خۆ ڕاگر و کار تێنەکەرە.

هەشتا ساڵ خۆ ڕاگری! کاتێ کریستینا بە دایە گەورەی گوتبوو: « ئەگەر پەشیوان نەبیەوە و ئیقرار نەکەی دەچیە جەهەندەمێ.» دایە گەورە وەڵامی دابۆوە: « قەیناکا. با بچمە جەهەندەمێ.» بەڵام ئێستا کە دەرفەتی بۆ هەڵکەوتوە تا لە گەڵ کەشیش ڕاوێژ بکا. زیاتر لە هەموو شت دەیەوێ لە وردە کاری مەسەلەیەکی دین ئاگادار بێ. بۆیە دەپرسێ :

– ئەوانەی کە هەست بە پەشیوانی ناکەن و هەر لە بەر ئەوەش دەچنە جەهەندەم، چەندە لە پێش داوەری ئاسمانیدا دەمێننەوە؟ ئایا لانی کەم کاتی ئەوەیان دەبێ کە بەرەو ڕوو ڕاستی بە خودا بڵێن.؟

دۆن پاولۆ مەجبورە ئیعتراف بکا کە ئەگەر ئەزمونی شەخسی ڕێگای نادا لەم بارەوە فتوا بدات، بەڵام ئاقڵی ساخ حوکمی لێدەکا کە وەڵامی ئەرێی بداتەوە. هەر ئەوەش بۆ پیرێژن بەسە. کریستینا بە وەخت دێتەوە تا دۆن پاولۆ تا بەر دەرگا بەڕێبکات. بەڵام بەر لەوە کەشیش بڕوا، کیژ پێدا دەگرێ کە ژوورێکی بچوکی پەنا متبەقی پێ نیشان بدا کە لە وێ دەزگایەکی بچوکی جۆڵایی دانراوە. لەم ژوورە دا کریستینا لە ڕۆژ و هێندێ جاریش بە شەو تا نیوە شەو سەعاتەکانی بەتاڵی خۆی بە کار دەباتە سەر. کیژی گەنج بە کەشیش دەڵێ:

– خوری گرانە و ئیتر هیچ کەس پارچەی دەست چن ناکڕێ چونکە بۆتە شتێکی خۆ ڕانان. تەنیاهێندێ د لە دۆستەکانم سەبارەت بە لە بەر چاو گرتنی وەزعی من کاریان پێ سپاردووم.

دۆن پاولۆ دەڵێ: « ئیتر ناتەوێ بچیەوە دێر ؟»
کریستینا لە وەڵامدا دەڵێ :
– ئێستا ئیتر چۆن دەتوانم؟ تازە دەبێ بڵێم کە تەنگ و چەڵەمەی مادی تاقە گیر و گرفتی ئێمە نیە. ئەگەر لەم بارەوە لە گەڵ تۆ قسەم کرد تەنیا لە بەر ئەوە بوو کە لە دیتنی پیرێژنەکانی وەک دایکم و دایە گەورەم و پورم کە هەموویان لە ئاخری تەمەندان و بەمحاڵەش ژیانیان دابین نیە، دڵم پڕ دەبێ. بەلام بێبەشی مادی لە بەرانبەر فەقری ئەخلاقیدا هیچە. مردنی باوکم پارسەنگی بنە ماڵەی ئێمەی تێکدا. ئەو شتانەی کە پێشتر لە بارەی وانەوە هیچمان نە دەبیست، ئێستا بۆتە مەسەلەیەکی جێگای باس و موناقەشە.
کاتێ کەشیش داوای ئیجازەی ڕۆیشتن دەکا، کریستینادەری دەبڕێ کە هەر لەم ڕۆژانە دا لە کات و شوێنی دیاریکراو دا کە جێگای موافەقەتی کەشیش بێت، بێ و ئیقرار بکا. دۆن پاولۆ لە پڕ سوور هەڵدەگەڕێ و دەڵێ :
– ئاخ ... نا ، نا ،
ئەو خەیاڵە کە بە بیانوی ناو و نیشانی درۆی خۆی لە ڕازی دەروونی کیژێکی گەنج ئاگادار بێ لە پڕ وەک گوناحێکی چاو لێ نە پۆشراو دێتە بەر چاوی. لە گەڵ ئەوەش هەست دەکا کە هەر چۆنێک بێ، دەبێ نە ویستنی خۆی بە کیژەکە بڵێ. بەلام هیچ بیانوو و عوزرێک نا دۆزێتەوە و لە کاتێکا نا ڕەحەتە دەڵێ :
– من پێت دەڵێم کە بچیە لای ئیقرار بیسی دایمی خۆت. جگە لەوە من بە خۆشیەوە ئەم وتو وێژە وەبیر دێنمەوە کە بەهاری پارەکە پێکەوەمان هەبوو بەر لە وەی بگەڕێمەوە بۆ قەڵەمڕەوی خۆم. خۆشحاڵ دەبم کە دوو بارە پێکەوە کەمێک بدوێین.
هەر تکیان بە هیوای ئەوەی کە زووتریەکتربیبیننەوە لێک جیا دەبنەوە.
لە سالۆنی موسافیر خانە شاتاپ کە لە دەشت گەڕاوەتەوە چاوە ڕوانی کەشیشە تا نامەیەکی بداتێ کە لە کن «مارتا» وە هێناویەتی. لەو نامەیە دا نووسراوە کە گیانی دۆن بنە دیتو لە مەترسی دایە. مارتا ڕوونی کردۆتەوە کە ؛ « یەکێک خەبەری بە ئێمە داوە و بەڵگەی نیشان داوە کە جێگای گومان لە ڕاستی خەبەری خۆیدا ناهێڵێتەوە. من نازانم بچمە لای کێ؟ کنچتینۆ ڕاکۆ لە ئەفریقایە و دوکتۆر ساکاش دەترسێ پلە و شوێنی خۆی لە دەست بدا.»
دۆن پاولۆ ناتوانێ خۆی بچێتە ڕوکا و بزانێ مەسەلە چیە و چ هەنگاوی پێویست بنێ. چونکە ئەگەر دۆن بنە دیتو ئێستا لە ژێر چاوە دێریدا بێ، ترسی وە هەیە کە

شـاگردی قەدیمـی وی بناسـرێ و بگیرێ و بـکەوێتـە ژێر پرسـیـار و لێکۆڵینەوە. بۆیە دۆن پاولۆ دەکـەوێتـە فیکر کە نووسـراوەی مـارتا بۆ موریکا بنێرێ. مـوریکا خـۆی خـەڵکی ڕوکـایە و دەتوانێ بێت و بچێ بێ ئەوەی سـەرنجی کـەس بۆ لای خـۆ ڕاکێشێ. دۆن پاولۆ چەند ڕاسپاردەیەک بەم جۆرەی خوارەوە لە نووسـراوەی مارتا زیاد دەکا:« تا وەزعی بە ترس و هەڕەشـەی ئێستا هەیە، دۆن بنە دیتو نابێ تەنیا لە ماڵ بچێتە دەر. ئەگەر بۆ دەر کەوتن ناچار بێ، پێویستە هـەنگاو بە هـەنگاو لە گەڵی بی. خۆت دەبێ بچیە ماڵیان و شەو لەوێ بمێنیەوە.»

دۆن پاولۆ لە شاتاپ دەپرسێ : « ڕۆژانە کە کار دەکەی چەندت وەگیر دەکەوێ ؟»

– لە چوار تا شەش لیرە.

– من هەقی دوو ڕۆژانت پێشەکی دەدەمێ بەو مەرجە ئەم نامەیە بۆ ڕوکا بەری.

شـاتاپ « گـاریبـاڵدی» لە تەویلە دەر دەکـێـشێ و سـوار دەبێ وبە غـار بەرەو دۆڵ دەیکوتێ. بەیانی ئەو ڕۆژە شـەمۆیە. کریستـیناش نامەیەکی لە مارتاوە پێدەگـات کە لە وێدا باسـی مەترسی دۆن بنە دیتو کراوە. لەو نامەیە دا نووسراوە: « ئـەنجومەنی ئەیالەتی دوور خستنەوە لە ترسـی ئـەوەی نەکا هـەرای لێ ساز بێ نەیوێراوە ئەو بە دوور خستنەوەی ئیجباری لە دوڕگەیەک مـەحکوم بکات. هـەر بۆیەش نەیانگرتوە و نەیانداوە بە دادگـای تایبـەتی. باشـترین ڕێگا چارەی دیتویانەتەوە ئەوەیە کە بە بێ دەنگی» سـەری دە گۆمێ ڕابکەن »

کریستینا نامە بە دەست دەچێتە کن دۆن پاولۆ. ڕوونکردنەوەی کەشیش کریستینا پتر نیگەران دەکات. کریستینا دەیەوێ ئیراد بگرێ و دەڵێ :

– ئاخر دۆن بنە دیتو هەر گیز دەست لە سیاسەت وەر نەداوە. چۆن دەکرێ بە ناوی دوژمنی حکوومەت ڕاوی بنێن ؟

دۆن پاولۆ لە وەڵامدا دەڵێ :

– ئێمە لە کۆمەڵگایەکدا دەژین کە جێگای مرۆڤی ئازادی تێدا نا بێتەوە. تەنیا ئەو قەشـانە لە ئەمـاندان کە مـەزهەب بخـەنە خـزمـەتی حکوومـەت و بانکەکـانەوە. ئەو هونەر مـەندانەی کە هونەری خۆیان بفرۆشن و ئەو حـەکیمانەی سەودا بە زانسـتی خۆیان بکەن. ئەوانیتر هـەر چەند کەمیش بن دەخرێنە زیندان و دوور دەخرێنەوە و دەکـەونە ژێر چاوە دێری، بـەو مـەرجـە کـە مـەعـمـوری دەسـەڵاتدار بە گـوێرەی پێویست بە بێدەنگی سەریان دە بنگۆم ڕادەکەن

کریستینا لەم قسانە تێناگات. ئەم مەتڵەبە بۆ ئەو سەرنج ڕاکێش نیە. ئەو نایەوێ

لە گەڵ ئەم گیر و گرفتانە سەر و کاری هەبێ. بەڵام ئەو دۆن بنە دیتو و خوشکی خۆش دەوێ و ئێستا کە ئەوان لە مەترسی دان نایەوێ بە جێیان بێڵێ.
پاش ئیجازە وەر گرتن لە دایە گەورە دەچێتە ڕوکا بەو مەبەستە تا شەوی یەکشەمۆ لەوێ بمێنێتەوە. لە ڕوکا هەموو شت ئاساییە. دۆن بنە دیتو لەو خەبەرانە ئاگا دارە کە پێیان ڕاگەیاندوە. بەڵام نازانێ داخوا خوشکی کەسی دیکەی ئاگادار کردوە یان نا ؟ بە هەمان خولقی خۆشی هەمیشەیی کاری ڕۆژانەی خۆی درێژە پێدەدا. کاتێ شەوی پێشوو موریکا داوای کردوە کە لە وێ بمێنێتەوە، پێی وابوە کە کوڕی لاو لە گەڵ دایک و بابی دمە قاڵی بوە. بۆیە ئەو داوایەی پێ سەیر نە بوە. بەڵام کاتێ کریستینا لە ڕێوە دەگاتێ و داوا دەکا ڕۆژێک میوانی بێت، پێی سەیر دەبێ. کریستینا و شەو لە ماڵی خۆیان نەمێنێتەوە! بێگومان ڕوداوێکی گرنگ لە پێشە. بەڵام خەریکبوونە ئەو مەسەلانە بە خوشکی دەسپێرێ.
ئێوارەی شەمۆ خزمەتکاری کلیسای« سن مارتینۆ» دێت و داوەتنامەیەکی بۆ دۆن بنە دیتو هێناوە کە سبەی پێشنوێژی مەسح لە کلیسا وەستۆ بگرێ.
مارتا دەپرسێ : « بۆ چی دۆن چیپریانۆ» ناچێ ؟»
خزمەتکاری کلیسا دەڵێ: « چیپریانۆ لە شوێنێکی دیکە کاتی گرتوە.»
کاتێ خزمەتکاری کلیسا دەڕوا، مارتا تکا لە برای دەکات کە داوەتنامە ڕەت کاتەوە و نەچێ.
دۆن بنە دیتو لە وەڵامدا دەڵێ :« هیچ دەلیلێک نیە کە داوەتنامە ڕەت کەمەوە و خەریکی کاری دیکە دەبێ.
کریستینا شەو لە لای مارتا دەباتە سەر. موریکا لە متبەق دەنوێ. دۆن بنە دیتو تا شەو درەنگ لە پشتی مێزی کاری خۆی خەریکی ڕێکو پێک کردنی نووسراوە و نامەکانی خۆی دەبێ. بەیانی مارتا لە بەر دەرگای ماڵ چاوە ڕوانی برای دەکا و لە بەری دەپاڕێتەوە کە نە چێتە « لاما » پێدا دەگرێ کە ئەو هیچ پێویستی بەوە نیە کە بچێ لە کلیسایەکی دیکە نوێژی مەسح بکا. پاشان لە وتەی خۆی زیاد دەکا و دەڵێ : « دوێنێ شەو خەونێکی ناخۆشی دیوە.»
دۆن بنە دیتو پاش وەڵامدانەوەی بە موحیبەت و پاش چەند وتەیەکی گەمە و شیرین لە بارەی خەون لێکدانەوە، خوا حافیزی لە خوشکی دەکا و بەڵام ڕێدەدا کریستینا و موریکا لە گەڵی بچن.
ڕۆیشتن بۆ « لاما » بە پێیان نیزیکە، سەعاتە ڕێیەکە. لە بەر ئەوەی باریوە، ڕێگا

قـوڕ و لیـتـەیە. هەر چەندە تاو هەڵاتوە بەڵام هێشـتـا هـەوا گـەرم نەبوە و پڕە لە سـەرمـای شەداری شـەوانە. کریسـتـینا لە لای ڕاست و مـوریکا لە لای چەپەی پیرە مێرد دەڕۆن. دۆن بنە دیتو بە کیژی لاو دەڵێ:

– کریسـتینا ! ئێستا پیاوێک لە پیتراسکا لە موسـافیر خانەی مـالتانا دەژی. ئەگەر ڕۆژێک پێویستی بە یارمەتی تۆ هەبوو داوات لێدەکەم یارمەتی بدەی .

کـیـژی لاو دەپرسـێ : « مـەبەسـتـت دۆن پاوڵۆ یە؟ پێت وایە ئەو پێویسـتی چی بە من دەبێ ؟»

پیرە مـێرد دوو بارە دەڵێ : « کریسـتـینا ! زۆر جـار لە وانەیە هـێندێ مـەسـەلە بێنە پێش کە تۆ نـەتوانی بە مـێشکی خـۆت لێیان تێبگەی. ئەو دەم هەوڵ بدە کە بە دڵ لێیان تێبگەی »

لە دەشتی فۆچینو مژ وەک شـەپۆلی بێدەنگ و دەریایەکی ئارام بۆ لای بەرزاییـەکان هەڵدەکشـێ. لە نێو ئەم دەریایە دا چەند دورگـەی بچوک کە منارەی کلیسـاکـان و سەری بەرزترین دارەکانی تەوریێزین، سەریان وەدەر ناوە.

دۆن بنە دیتو بۆ ئەم دو لاوە دەگێڕێتەوە کە سـەر دەمـی لاوی کاتێ لە تەمـەنی واندا بوە حـەزی لە کـەونارا ناسـی بوە. کـاتێ بیسـتوویە لە تەکمـیـشـی فـلان ڕەز بەردی سـەیر دیتـراونەوە و یا لە وێرانـکردنی فـلان بنـاخـەی ژێر زەوی ئێـسـقـانی کـەللە ئینسـان دۆزراونەوە، زۆر جـار چۆتە گـوندەکـانی دەور و بەر. لە گـێـڕانـەوەی ئەم قسانە دا نوکتە و قسەی خۆشی گونجاندوون و لاوەکانی وە پێکەنین خستوە.

کـاتێ دیمەنی « لامـا » دەر دەکـەوێ دەنگی زەنگوڵەی کلیسـای« سـان مـارتینو» دەبیسرێ کە ئیمانداران بۆ نوێژی مەسح بانگ دەکات. دۆن بنە دیتو لە کاتێکا گرژ و خـەمناکە، بێدەنگ دەبێ. سان مـارتینو کلیسـایەکی کۆن و دوور کەوتوە کە لە ساڵدا یەک دوو جار زیاتر نوێژی مەسح لە وێ ناکرێ. لە پێش کلیسا دا پیرە مێرد لە کریستینا دەپرسێ :

– تۆ دەزانی وەڵامەکانی نوێژی مەسح لە بەر بخوێنی ؟

کیژی جوان دەڵێ: « بەڵێ، من لە دێر زۆر جار ئەم کارەم لە ستۆ بوو.»

پیرە مێرد دەڵێ: « خۆش وەختم لە ئیمڕۆ لە نوێژی مەسح دا، تۆ وەڵامدەری منی .»

پێش دەرگای کلیسا لە مەڕ مەڕە کە لە گەڵ تێپەڕ بوونی زەمان ڕەش هەڵگەڕاوە و نیشاندەری دەرگایەکی گەورەیە کە بەرد تاشی وی درێو و کاشەیە.

دۆن بنە دیتو و کریسـتینا بە دەرگای تەنیشت دا ڕاست دەچنە خەزێنەی کلیسا و

موریکا بە دەرگای بەردی گەورە دا دەچێتە ژوور. هەردی کلیسای سن مارتینو لە تەختە بەردی قەبر فەرش کراوە. یادگاری سەر دەمێکە کە هێشتا قەبرستان نەبوە و مردوەکانیان لە ژێر زەمینی کلیسا دەناشت. دوو ڕیز هەر یەکەی تێکەڵ لە سێ کـۆڵەکـە بە تاقی زەوبی ژووری کلیـسـایان بە سێ بەش دابەشکردوە. تاقـەکـان پشتیان بە سێ کۆڵەکەی کۆنەوە هەیە کە پایەیان نیە و ڕاست لە هەرد هاتوونە دەر و لە سەری کۆڵەکەکان کۆتاییان دێت کە لە ئامرازی جوان و ڕازێنەر کە لە ناوچە جیاوازەکان کۆ کراونەوە دروست کراون. میحراب لە بنی کلیسایە کە بە شکڵی تەختە بەردێک سروشتی بەرزیان کردۆتەوە. لە بان وی خاچێکی داری ڕەنگ کراو بە ڕەنگی ڕەش چوار چلچرایان پێوە هەڵاوەسیوە. لە لای چەپەی میحراب شکڵێکی ڕەنگ عابی لە سەر دیوار کێشراوە کە جەهەندەم نیشان دەدا. جەهەندەم پڕە لە شەیتانی ڕەش کە بە شکڵی ترسناک و نەفرەت ئەنگیز خۆ دەنوێن و بە هەزاران شێوە خەریکی ئازار دانی ڕوحی «وەرزێڕانی» مەلعونن. ئەو مەلعونانەی کە یا لە دیزەی ئاوی کوڵیو دەکوڵێن و یا بە دارانەوە هەڵواسراون. لە لای ڕاستی میحراب شکڵێکی دیکەی هەیە نیشانەی ئەفسانەی سێ مردوو و سێ زیندوە کە تەنزێکە لە کۆمەڵگای سەدەکانی نێوە ڕاست و بە شکڵی سەمای مردوان بەر جەستە کراوە. ئیسکلیتەکان یا کڵاوی بەرزی ئوسقۆفی و یا تاجی پاپ و یا تاجی ئاساییان لە سەرە و لە کاتی سەما دا ئێسکەکانیان وێک دەکەون. خزمەتکاری کلیسا هەر چوار شەمی میحراب هەڵدەکا و زەنگوڵەیەکی بچوک بە نیشانەی دەستپێکی نوێژی مەسح وە دەنگ دێنێ. ئیماندارانی ئامادە لە کلیسا ڕەنگە دە دوازدە کەس بن کە هەموویان ژن و کیژی جحێڵن. دۆن بنە دیتو کە ئێستا کراسی متفەرکی نوێژی مەسحی دەبەر کردوە لە پێش هەوەڵین پەیژەی میحراب وێستاوە و کریستینا کە لە لای چەپی چۆکی داداوە بۆ خوێندنی وەڵامی نوێژ ئامادە دەبێ.
کریستینا لە سەر خۆ و بە قەڕانەت وەڵام دەداتەوە. هەر دەڵێی وشە گەلی لاتین بەند بە بەند شی دەکاتەوە. موریکا لە نیزیک دەرگا لە پەنا قابی ئاوی متفەرک ماوەتەوە. چەند پیاو کە بە گوێرەی عادەت درنگ دەگەنێ بۆ بەشداری لە نوێژی مەسح دێنە ژوور. سەری قامکیان بە ئاوی پیرۆز تەڕ دەکەن و نیشانەی خاچ دەکێشن. یەک لەو پیاوانە پێستی ماری بۆ چاو وزار لە کڵاوی دروە و یەکی دیکە چەند داوە موی لە زنجیری سەعاتەکەی بەستوە. دۆن بنە دیتو لە پەیژەی میحراب دەچێتە سەر و ئەو شتانەی کە پێویستە بۆ دابی تناول القربان-ی نوێژی مەسح

کەڵکی لێ وەر بگیرێ لە سەر میحرابی دادەنێ. دۆن بنە دیتو داری تایبەتی کە کتێبی دوعای لە سەر دادەنێن و ئێستا نامیلکەی دوعاکانی نوێژی مەسحی لە سەرە لە لاچەپەی خۆی دادەنێ و نووسراوەکان دەخوێنێ. پاشان سێ پایەی کتێبی دوعا لە لای ڕاستەی دادەنێ و ئینجیل دەخوێنێ. ئیماندارانی ئامادە لە ڕێو ڕەسمی « تناول القربانی نوێژی مەسح» بەشداری دەکەن وردە وردە کە دۆن بنە دیتو ئەژنۆیان دەچەمێنێ و بۆ لای خەڵک سەر وەر دەگێڕێ و دوعا دەخوێنێ، ئەوانیش بە گوێرەی قۆناخی جیاوازی ئەم ڕەسمە پیرۆزە ئەژنۆ دا دەدەن و یا هەڵدەستنەوە. تەنیا موریکایە کە هەر وا بە پێوە ڕاوەستاوە. تەنیا ئەوە کە تەماشای شانۆ دەکا و لە دڵی خۆیدا شاهیدی ڕازێکی دیکە و قوربانیەکی دیکەیە.

لە ڕوانگەی ئەو ڕێو ڕەسمی نوێژی مەسح بە کاوە خۆ و نا ئاسایی دەڕواتە پێش. گفتگۆی مەزهەبی نێوان بە ڕێوە بەری داب و ڕەسمی نوێژ و وەڵامدەرەوەی» دۆن بنە دیتو و کریستینا » لە حاڵەتی یەک هەوایی و ساردیی کلیسا دێتە دەر و لە پڕ وتو وێژەکە وروژانێکی پڕمانابە خۆوە دەگرێ. دەنگی پیرە مێرد ئارام و خەفەتاوی لە گەڵ هەرەکەتی سەبر و ڕێک هاو هەنگاوە.

دەنگی کریستینا منداڵانە و بە ترسی وەک پاڕانەوە وشە گەلی لاتین بەند بە بەند دەڵێتەوە. پیرە مێرد سەربۆ لای ئیمانداران وەر دەگێڕێ وبە گریانەوە داویان لێدەکات کە : Orate fratres (برایان دوعابکەن)

ئەو دەم موریکاش ئەژنۆ دادەدا.

کیژی لاو وەڵام دەداتەوە:- Suscipiat Dominus Sacrifcium de man-ibus tuis ( یانی: خودا ڕۆژی فیدا کاری لە نێوان دەستەکانی تۆ دا دەر بخات !)

ئاڵتونی جامەکە لە نێوە ڕاستی میحراب دا لە بەر ڕوناکی شەمەکان شەبەقی داوە و جەغزێکی نورانی بە دەورەی سەر سپی کەشیش دا کێشاوە.

هەموو جارێ کە کریستینا بە پێش میحراب دا تێدەپەڕێ تا لە لایەکەوە بچێتە لایەکی تر لە نێوە ڕاستی ڕێگا ئەژنۆ دەچەمێنێ. ئێستا ئەو لە لای ڕاستەیە، دەستێکی گۆزەی شەراب و دەستی دیکەی گۆزەی ئاوی پێیە. دۆن بنە دیتو بە جامی ئاڵتونەوە بۆ لای دەچێ و کریستینا هێندێ شەراب و هێندێ ئاوی بۆ دە جامەکەی دەکا . لە سەرەتای ڕەسمی تەبەروکی شەرابی مەسح ئیماندارەکان ئەژنۆ دادەدەن و ڕوو لە هەرد هەڵدەسون. دۆن بنە دیتو بۆ هەر یەکە لە شتەکانی « تناول القربان» دوعای تایبەتی دەخوێنێ و فویان پێدا دەکات. سێ جاران ئیقرار بە لێ

ئەهاتوییی خۆی دەکا. سێ جاران دوو پاتی دەکاتەوە : Dominus non Sun digns ( خودایا من شایستەی تۆ نیم ) پاشان لە سەر میحراب دادێتەوە. لە نانی متفەرک دەخوا. پاشان جامی ئاڵتون هەڵدەگرێ و دەیخواتەوە. پاش ئەنجامی ئەم ڕەسمە ئیماندارەکان دوو بارە هەڵدەستنەوە، بەڵام دۆن بنە دیتو بێ جوڵە لە نێوە ڕاستی پەیژەکان دەمێنێتەوە و ئانیشک وە مێزی پیرۆز دەدا. دەڵێی دەترسێ کە لە پڕ نکەوێ. بە دوای ئەوە دا ئەژنۆکانی دوو لا دەبنەوە وپیری ڕوحانی دەکەوێتە ژێر میحراب. کریستینا لە سەر خۆ بانگی دەکا و سەبروکە لێی دەپرسێ چما حاڵت خەراپە. لە نێو ئیمانداراندا چەند ژن دەست بە گریان و هاوار دەکەن. موریکا بە تاڵوکە بە نێو کلیسا دا بۆ لای میحراب دێت و باسکی دۆن بنە دیتو دەگرێ و بە یارمەتی کریستینا بۆ خەزێنەی کلیسای دەبەن. ئیماندار لە کلیسا دەچنە دەر و لە مەیدانی گوندی لێک کۆ دەبنەوە و لە بارەی ئەو بەد بەختییەی بۆ کەشیش هاتۆتە پێش بیر و ڕای جیاواز دەر دەبڕن. یەکێک دەڵێ لە خۆ چوە.
ئەوانیتر دەڵێن: فەقیرە پیرە مێرد شەڕابی مەسح نازاری داوە.
دوو نیزامی بە تاڵوکەیەکی سەیر دەگەنە شوێنی ڕوو داو. ئەوان بێجگە لە شاهیدی دانی مردنی دۆن بنە دیتو کارێکی دیکەیان نیە. کراسەکانی نوێژی مەسحی لە بەر دەر دێنن و جەستەکەی بۆ چاوە ڕوانی گەیشتنی کار بە دەستانی دەوڵەتی دەخەنە ژێر چاوە دێری. کریستینا وموریکا نایانەوێ لە مەیدان بچنە دەر. بەڵام بە زۆری وەدەریان دەنێن. کریستینا لە ترس و نیگەرانی دەلەرزێ، زمانی ناگەڕێ. بە چاوی زەق لە ترسان و بە سەر سوڕ مان تەماشای دەور و بەری خۆی دەکات. بە زەحمەتی زۆر دوو بارە بۆ کلیسا دەگەڕێتەوە و لەوێ بێهۆش وە هەردی دەکەوێ. موریکا کریستینای ون کردوە و نازانێ وەڵامی ئەو کەسانە چۆن بداتەوە کە لێی دەپرسن چ ڕوویداوە و ئەم ڕوو داوە چۆن هاتۆتە پێش. لەو کاتە دا کالسکەیەک دەبینێ کە بە غار بۆ لای« ڕوکا » دەڕوا. کالسکە ڕادەگرێ و سواری دەبێ.

دۆن پاولۆ بە موریکا دەڵێ :
- پاش ئەو موسیبەتەی کە دیتمان ئیتر ئێمە ناتوانین وەک خەڵکی دیکە لە بارەی سیاسەتەوە قسە بکەین. کاتێ باشی بیر لێبکەینەوە دەبینین سیاسەت بۆ ئێمە بۆتە شتێکی دیکە. موریکا وەپێش کەشیش کەوتوە تا دڕکەکانی سەر ڕێگا لابدا. هەر تکیان بە کوێرە ڕێیەکی خلیسک دا دەڕۆن کە بەر لەوەی بگاتە ڕوباری پیتراسکا و بە پەنا ئەو دا درێژە بدا، بۆ قولایی دۆڵ سەرەو ژێر دەبێتەوە. موریکا ئەم کارەساتە بۆ دۆن پاولۆ دەگێڕێتەوە کە پاش مردنی دۆن بنە دیتو ڕوویداوە.
- دەست تێوەر دانی کار بە دەستانی کلیسایی بوو بە کۆسپی ئەوە کە هۆی ڕاستە قینەی مردنی دیاری بکرێ. ئوسقۆف بە مارتای گوتوە: خانم بەڵێنت پێدەدەم کە ڕەوەندی مردنی برای تۆ بە باشی ڕوون دەکرێتەوە. بەڵام پشکنینی تەرمەکەی بە شێوەیەکی باش نەبوو، بۆیەش بە کارێکی بێسوودیان زانی. دوکتۆر ساکا کە خوشکی دۆن بنە دیتو داوای لێکرد بوو لە « ئاکوافەردا » بێتە « ڕوکا » بە تاڵوکە چوە قەبرستان بەڵام ڕێگایان نەدا کە تەماشای تەرمەکەی بکات.
دۆن پاولۆ دانی پێدا دەنێ:
- لە ژێر کار کردی ئەم زەبرەی کە بە بیستنی ئەم کارەساتە وێمکەوتوە، ئێستا وە خۆ دێمەوە. من پێم وانەبوو کە دۆن بنە دیتو تا ئەو ڕادەیە بۆ من گرنگ بێ. پازدە ساڵ بوو ئەوم نە دیبوو و بە دەگمەن خەبەرێکم لەو وەر دەگرت. فێر کردەکانی وی منیانکردبوە مەسیحی، بەڵام نەک مەسیحییەکی « بە شێوەی پێویست» پاش تەواو کردنی مەدرەسە و پێوەندی لە گەڵ ژیانی ڕاستە قینە، فیکری من بە لایەنێکی تەواو پێچەوانەی ڕێگای مەزهەب بەرەی سەند و ئوسوڵێکی دیکەم کردە جێنشینی ئوسوڵی مەسیحیەت. لە گەڵ ئەوەش تەنانەت لەو کاتانەش دا کە زیاتر لە هەموو کاتێک لە کاری سیاسی خۆمدا نوقم ببووم، لە قولای دڵمەوە هەستم بە خۆشی دەکرد لە وەی کە ئەو پیرە مێردە لە شوێنێکی ئەم جیهانە دا دەژی. دیارە من تێدەکۆشام خۆم لەو بەندە ڕەزگاربکەم کە لە فێر کردەکانی وی لە مێشکم دا ما

بۆوە.
داب و شوێنی ساکارانەی ئایینی مەسیحیم بە گاڵتە وەر دەگرت. لە ڕۆژنامەکاندا دژی کلیسا وتارم دەنووسی. بەڵام لە دڵدا لە خۆم دەپرسی: «ئەگەر کەسێک دۆن بنە دیتو لە کارەکانی من ئاگا دار بکا، پیرە مێرد دەڵێ چی؟» من ئەو دەم هیچ پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کە هەل و مەرج نەکەر من بۆ لای ئەو دەگێڕێتەوە بەڵکوو ئەویش لە من نیزیک دەکاتەوە.
هەر تک پیاو بە درێژایی ڕوبار بە دوای یەکدا دەڕۆن. زۆری پێناچێ دەبێ هەر تکیان ڕاوەستن. چونکە قوڵکەیەکی گەورە ڕێگای بەستبوو. هەورێک لە عاسمان دەر دەکەوێ کە هەر دەمە بۆ لایەک دەڕوا و دەڵێی نازانێ ڕوو دەکوێ بکات. ئاخرەکەی بۆ لای فوچینۆ دەڕەوێ.
کەللە سەری کەرێکی تۆپیو کەوتۆتە قوڵکە و سپی هەڵگەڕاوە بەڵام هێشتا ددانەکانی لە مەڵاشوویدا دەبینرێ.
دۆن پاولۆ دەڵێ: «ئێستا وا دێتە بەر چاوم کە لە ماوەی ئەم پازدە ساڵە دانیوەی تەمەنم بە فیڕۆیی چوە. لە ڕاستیدا لە تەواوی ئەو ماوەیە دا لە بەرنەوە کە لە سەر دەمی لاوێتیدا بە کردەوە بڕوام بە بیر و باوەڕی ئایینی هەبوە، دەمێک لە کوتان و ڕماندنی هێزی دەرونی خۆم خافڵ نە بووم. بە ئیرادەیەکی سەرە ڕۆیانە کە بێزاری لە کلیسا برد بوویە فیکری من هەولم دەدا لێهاتووی ئاقڵانی کە بە دەرکی زەینی لە دنیای ئابوری و سیاسەت وەرم گرتبوو، بیکەمە جێنشینی هێزی دەرونی خۆم. چونکو بە لێکدانەوەی خۆم ئیتر پێویستم بە وان نەمابوو. بەڵام کاتێ بۆ مارسیکا گەڕامەوە زەینمکرد کە تێکۆشانی من بۆ سەر گوت کردنی هێزی دەرونی سەر کەوتوو نەبوە و ئەو دەرکی زەینی نە کردۆتە جێ نشینی وی بەڵکوو لە گەڵ وانی تێکەڵ کردوە. لە گەڵ ئەوەش ئەوەی دوو بارە لە پیتراسکا لە مەزهەبەوە هاتە بەر چاوم، منی لە وەدا شێلگیر تر کرد کە نەفرەتی من لەو لە جێی خۆی بوە. کاتێکی چاوم بە دۆن بنە دیتو کەوت ئەوەندە قاڵ ببووم کە تێبگەم تەقەلای کوێر کوێرانەی من بۆ ساز کردنی تێکۆشانێک لە نێو وەرزێران و پێک نەهاتنی پێداویستیەکانم و وەر نەگرتنی نەتیجەیەکی خێرا و بەر چاو، لە نە بوونی پار سەنگی دەرونیم سەر چاوەی گرتوە. چەند ڕۆژ لە سەر یەک بیرم لە وە کردۆتەوە کە دۆن بنە دیتو پێی گوتبووم. هاتنی تۆ بۆ پیتراسکا و ئیقراری تۆ ئاخرین بەر بەرەکانی دەرونی منی تێک شکاند و ئەو دەم قسەکانی دۆن بنە دیتو تا قوڵایی گیانم کاریان کرد. لە

ماوەی چەند ڕۆژ دا تەواوی ئەو ڕێو و شوێنەی مەسیحیەت کە زیندو و خۆڕاگر لە گۆشەی مێشکم دا شارا بونەوە، جارێکی دیکە گیانیان هاتەوە بەر، بەڵام مەسیحیەتێکی دوور لە ئەفسانەی خەرافاتی. دوور لە بیر و باوەڕی پشت سەری سروشت و ئازاد لە چاو دێری و پشکنینی کلیسا، مەسیحیەتێک کە تەسلیمی بارەگای خودای سەروەت و سامان نابێ و دەستی پێڕەوی بۆ لای « پونس پیلات» درێژ ناکات. مەسیحیەتێک کە وەسیلەی کار دێتەوە نیە، بەڵکوو وەک سزای لە خاچ دان لە بەین براوە. ئیماندارەکانی خۆی لانی کەم بۆ زیندان دەنێرێ. ئەم زیندوو بوونەوەی بەشێک لە وجودی من کە ئەوم بە عەیبی خۆم دەزانی و تێدەکۆشام تا لە بەینی بەرم و بیشارمەوە، ئێمڕۆ هەستێکی ئارامی بەدەنی بە من دەبەخشێ کە چەند ساڵ بوو لێی بێخەبەر بووم و هێز و ئازایەتێکیم وەبەر دەنێ کە هەر گیز لە خۆمدا شک نەدەبرد.

موریکا دەڵێ: « من زۆر جار دەمبیست لە دەستە دا باسی تۆیان دەکرد. بەڵام تۆم پێ وانەبوو. ئەو دەم کەمێک لە تۆ دەترسام.»

دۆن پاولۆ دەڵێ : « مرۆڤێکی شۆڕشگێڕیش وەک ئەوانیتر لە ئێسک و گۆشت و پێست پێکهاتوە. هێندێ وەک پۆڵا دێنە بەر چاو و مرۆڤ دەیەوێ سوێند بخوا کە بەدەنیان یەک پارچەیە. بەڵام ئەوانیش وەک خەڵکی دیکە لە ئێسک و گۆشت و پێست دروست کراون.»

پاش ئەوەی ئەم دوو پیاوە کوێرە ڕێی درێژایی ڕوبار بۆ خوارەوە دەبڕن، لە دۆڵێدا دەگەنە نوختەیەک کە بەرین دەنێتەوە و جادەیەکی کالیسکە ڕۆ لە گەڵ کوێرە ڕێی وان تێکەڵ دەبێتەوە. موریکا پێشنیار دەکا: «باشترە هەر لێرە بوەستین چونکە ئەگەر بچینە پێشتر لە وانەیە لە سەر جادە بمان بینن و بمان ناسن.»

پۆلیس لەو ڕۆژانە دا موریکای خستۆتە ژێر چاوە دێری توندەوە. ئەو دەیەوێ لە گەڵ دۆن پاولۆ نەبیندرێ. بە کەشیش دەڵێ: « من لە ڕوکا ئەنجومەنێکم لە نووسەرانی گەنج دامەزراندوە.»

– نووسەران ؟

– بەڵێ، لە نووسەران

دۆن پاولۆ دەپرسێ : « ڕەنگە مەبەستت ئەنجومەنێک بێ لە هەڤاڵدەرانی ڕۆژنامە بچوکەکانی ناوچەیی ؟»

– ئەوانەی من دەڵێم هیچ کاتێ ئامادە نابن لە گەڵ ڕۆژنامەکانی ئێستا هاو کاری

بکەن،
– چەند کەسن و لە کوێ شت دەنووسن ؟
موریکا لە ڕوونکردنەوە دا دەڵێ :
– جارێ سێ کەسن. چەند کەسی دیکەش هەن ڕەنگە لە ئەنجومەندا قبوڵ بکرێن بەڵام باشترە ئیحتیات بکرێ. جگە لەوە سێ کە سە، کوڕی زۆر باشن و من چاکیان دەناسم. هەموویان فەقیر و نەدارن و تەنیا مەدرەسەی سەرە تاییان دیوە، پاش کارەساتی مردنی دۆن بنە دیتو هاتنە لای من و پرسیان دەبێ چبکەین؟ پێکەوە باسمان کرد و ڕێک کەوتین کە دەبێ ڕاستیەکان بڵاو بکەینەوە. حەقیقەت هەر ئەو ئەسڵەیە کە دۆن بنە دیتو لە هەموو شتێک زیاتری خۆش دەویست. کە وابوو تاقە ڕێگای شاد کردنی ڕوحی ئەو خوا لێخۆشبوە ئەوەیە کە حەقیقەت بناسین. ئەوان بۆ هەموو کارێک ئامادەن کە ڕوحی دۆن بنە دیتو شاد بکا. هەر بۆیەش ئەنجومەنێکیان بە ناوی نووسەرانی حەقیقەت پێکهێناوە. شەوانە سواری دوو چەرخە دەبن، بە کێچ و خەڵوزەوە دەچنە گوندەکانی دراوسێ و ئەم حەقیقەتە لە دیواران دەنووسن:

« دۆن بنە دیتو ژار خواردوو کراوە.» باسکرا کە ئایا دەبێ شتێک لەم ڕستەیە زیاد بکرێ یان نا. وا بە باش زانرا کە هیچ شتێ نابێ لە حەقیقەت زیاد بکرێ. ئەگینا حەقیقەت نابێ. لە سەر ئەوەش ڕێک کەوتین کە پێویست نیە بۆ بە هێز کردنی حەقیقەت شتێکی دیکە بنووسرێ، چونکە شتێکی بە هێز تر لە حەقیقەتی ساف و خالیس نیە. لە ئەنجامدا بریار درا کە لە هەموو شوێنێ و بێ پسانەوە- واتە تا هەموو خەڵک تێدەگەن - هەر بنووسن: « دۆن بنە دیتو ژار خوارد و کراوە.» جگە لەم چەند وشەیە هیچیتر نە نووسرێ. تەنانەت نوختەی سەر سورمانیشی لێ زیاد نەکرێ. ئەو دەمە ئەوانەی نایانەوێ تێبگەن، مەجبور دەبن کە تێبگەن. کاتێکی بزانن کەسانی وا هەن کە ئامادەن ئەو لە بیر بەرنەوە، ئەم لاوانە دوو بارە لە سەر دیواران دەست بە نووسین دەکەنەوە کە دۆن بنە دیتو ژار خوارد و کراوە. ئەو دەم ئەوانەی دەیانویست لە بیری بەرنەوە مەجبور دەبن وە بیری بێننەوە. ئەوەیە ئەرکی ئەم نووسەرانە.

موریکا باسی لایەنگرانی دیکەش دەکا کە لە گوندەکانی جیاواز دا بڵاون. لە وانە دار تاشێکە دوازدە ساڵ لە ئەمریکا بوە و لەوێ لە گەڵ دەستەکانی ئاژاوەچی پێوەندی هەبوە.

وەرزێرێک کـە پێش شـەڕ سـەرۆکی سـەندیکای وەرزێران بوە. کـابرایەکی خـەڵکی« پراتولا» کە ئێستا لە فوسا کاریەی هەیە. چەند کەسی دیکەش، بەڵام موریکا لە وە دەترسێ کە نەزانێ چۆن بیاندوێنێ. لە وتەکانی خۆی زیاد دەکا:

– تۆ ئێستـا گوتت پاش بە سـەر هاتنی ئەو هەمـوو بەڵایە ئیتر ناتوانی وەک پێشـوو باسی سیاسەت بکەی.

دۆن پاولۆ دەڵێ:

– هەر چەندی بکرێ دەبێ لەم بارەوە کـەمتر قسـە بکرێ، لە گەڵ ئەو کەسـانەی ناوت هێنـان و لە گەڵ خـەڵکی دیکە ڕەنگە ببـیە ئاشنا، هەوڵ بدە لە گەڵیـان ببیـە دۆست. کاتێ ئەوان بڕوایان بە تۆ کرد، دەتوانی ئەوان تێبگەیەنی کە مەبەست ئەوە نیە کە هێندێ فۆرمۆڵی تازە و یا جۆرە سلاوێکی تازە و یا دەبەر کردنی لیباس و کـراسی ڕەنگین بکرێتـە باو، بەڵکوو مـەبەست ژیانە بە شـێـوەیەکی تازە. ڕەنگە ئەوەندەش بەس بێ کە بڵێی مەبەست ئەوەیە بە واتای ڕاستە قینە ببی بە ئینسان. ئێمە ئەوەندە لە ئینسانەتی دوور کەوتووینەوە کە هەر یەک لە ئێمە کاتێ وەزعی بە کـەمگرتویی ئێسـتـای خۆمـان لە گـەڵ ئەوە پێک دەگـرین کـە بە هەق دەتوانێ هەمانبێت، لانی کەم هەست بە ناڕەحەتی دەکەین. هەر یەک هەست پێدەکا کە کەم و کوڕی هەیە، دزێو بوە، شکڵی گۆڕاوە و سـەر کوت کراوە. هەمـوو شـۆڕشێک لە ناخی خۆیدا هەمیشە وەڵامدەری ئەم پرسیارە سەرە تاییانەیە کە ئینسان چیە؟ و ژیانی ئینسانی چیە ؟

هێندێ کـەس توشی بـەخۆشی دەمـار گـرژی بوون کـە شۆڕش لە ڕوانگەی وانەوە جۆرە سەر خۆشی و یا هەڵچوون و ورووژانی گۆرانیە و لە سەر ئەو باوەڕەن کە : « ڕۆژێک ژیانی وەک شێر باشـتـرە لە سـەت ڕۆژ ژیانی وەک مـەڕ » بەڵام شـۆڕش بۆ فـەقیران شتێکی دیکەیە. ئازاد بوونە، نیـاز بە سادەیی و ڕاستییە، قبوڵ نەکردنی چارە نـووسی مـــەڕانە و ڕەتکردنـەوەی چارە نووسی شـێـر-یشـــە. ئـاخـریـەکی پێکهێنانی بار و دۆخێکە کە شایانی پلە و ژیانی ئینسانی بێت.

موریکا دەڵێ :

– شۆڕش نیازی ئینسانە بۆ ئەوەی ئیتر تەنیا نەبێ و کەسیش ئەو بە گژ کەسێکی دیکە دا نەکات. تێکۆشانێکە بۆ پێکەوە بوون ونەبوونی ترس و نیازی برایەتی.

دۆن پاولۆ دەڵێ :

تۆ ناتوانێ بێنیـە بەر خەیاڵت کە لە وڵاتێکی وەک ئیتالیا بوونی سەت لاو کە ئامادە

بن بۆ چاو پۆشی لە هەموو جۆرەئاسایش و خۆشی ژیان و بریار بدەن قەت فاسید نەبن و ئازاد بن لە بەندی خاوەن ملکی شەخسی و گوێ نەدەنە شەهوەتی جنسی و پلە و پایە و یەک گرتوو بن لە برایەتی و دۆستایەتی، چ واتایەکی دەبێ ! سەت لاوێک کە لە گەڵ کرێکار و وەرزێران بژین و نەیانەوێ لێیان جیا بنەوە ، سەت لاوێکی خاوەن بڕوا کە لە هەموو بوار و لە هەموو پرسیارێکدا ڕاستی بڵێن و لە ڕاستی بە دەر هیچ نەڵێن و خۆشیان لە سەر بناخەی ڕاستی بژین. لاوانێک کە نەک بە دروونی نیشانە لە جیاتی دوگمە لە لیباسی و نەک بە لیباسی یەک شکڵ، بەڵکوو بە شێوە ژیانی تایبەتی خۆیان لە خەڵکی دیکە جیاواز و شاز بن.

کوێرە ڕێ لە نێو چیمەنێک لە گەڵ جادە تێکەڵ دەبێتەوە و مێگەلە مەڕێک لە وێ دەلەوەڕێ. کاتێکە کە حەوانەکان لە چیا دێنە خوار و بۆ دەشتێ دەچن تا زستان لەوێ بەرنە سەر. شوانێکی پیر خەریکە ئاگر دەکاتەوە. شوانێکی گەنج فوو لە ئاگر دەکا و شوانێکی دیکە چیلکە و داری وشک کۆدەکاتەوە. شوانی پیر ناوی« بونیفاتسیو پاتاکا» یە و بانگی دۆن پاولۆ دەکا تا بۆی بگێڕێتەوە کە دۆن بنە دیتوی لە خەو دیوە.

شوانی پیر دەڵێ:« ئەو بزەی لە سەر لێوی بوو دەیویست لیرەیەکم بداتێ.

– لیرەکەی دایەی ؟

– نە خێر، ماوەیەکی زۆر لە گیرفانیدا لە لیرە دەگەڕا ، بەڵام پارەی نە بوو،

دۆن پاولۆ قاقا پێدەکەنێ و لیرەیەک دەدا بە شوان.

« بونیفاتسیو» دوو بارە دەپرسێ :« ئاغای کەشیش تۆ چیرۆکی دەریاچەی فوچینۆت بیستوە.؟»

دۆن پاولۆ چیرۆکی وا نازانێ و بونیفاتسیو چیرۆک دەس پێدەکا:

– مەسیح وەک دار تاش بە دوای کار دا دەگەڕێ. گەیشتە مارسیکا و ماڵ ماڵ لە ماڵەکان دەپرسێ: « ئێوە بۆ دارتاشێکی فەقیر کارتان هەیە.؟» خاوەن ماڵ لێی دەپرسێ :« لە کوێوە دێی؟ ناوت چیە؟ پاسپۆرتت هەیە؟ نامەی لێت ڕازی بوونت هەیە ؟ شەو دادێ بێ ئەوەی مەسیح کارێکی پەیدا کرد بێ. ئەو دەم دەگەیشتە هەر بێکارێک دەیگوت: « بە دوای مندا وەرە!» هەموو وەدوای دەکەوتن. مەسیح پێی دەکوتن سەر وەر نەگێڕن و هیچ کەس ئاوڕی نەدەداوە. کاتێ گەیشتنە سەر چیا مەسیح گوتی : « ئێستا دەتوانن ئاوڕ دەنەوە» لە جێگای گوندی ئاوەتزانو گۆلێک پێکهاتبوو. ئێستا ئەگەر وەزع هەر وا بڕوا زۆری پێناچێ کە ئەوێ دیسان دەبێتەوە

گۆل.
دۆن پاولۆ دەڵێ :
– بیستوومە لەم چیایە کانگا هەیە.
بونیفاتسیو وەڵام دەداتەوە: « خودا نەکا کانگا هەبێ. »
دۆن پاولۆ تێناگا بۆچی.؟ شوان بۆی ڕوون دەکاتەوە:
– مادام چیا فەقیرە ئی مەیە، بەڵام کە دەر کەوت دەوڵەمەندە دەوڵەت بە خاوەنی دەکات. دەوڵەت دەستێکی درێژی هەیە و دەستێکی کورت. دەستی درێژی دەگاتە هەموو جێیەک و بۆ وەر گرتنە، دەستی کورتی بۆ دانە بەڵام ناگاتە کەس کە زۆریش نیزیکن.
برای دینی «ئانتی فونا» بە جادەی کالسکە ڕۆدا دەڕوا. بونیفاتسیو بانگی دەکات تا دەنگو باسی ئەفریقای لێ بپرسێ. بەڵام برای دینی لە کن کەشیش لە عەزاب دایە، لە شوان دەپرسێ :
– چما کوڕەکەت دەبێ بچێتە سەر بازی ؟
– بەڵێ، ئاخری مانگ.
برای دینی سکەی « سن فرانسوا » کە تایبەتی پاراستنی گیانی شەڕ کەرانە بە شوان نیشان دەدا.
شوان دەپرسێ: ئەوانە یەکی بە چەندین؟
– پەنجا سانتیم
بونیفاتسیو لیرەی دۆن پاولۆی دەداتێ و باقی لێ وەر دەگرێتەوە. سکەی گەورەتری نیشان دەدا کە دیارە کاریگەر ترن وقیمەتیان یەک لیرەیە.
بونیفاتسیو دڕدۆنگ دەبێ. برای دینی دەڵێ :
– کاتێ مەسەلەی گیانی کوڕت دێتە گۆڕێ نابێ لەچەر بی،
بونیفاتسیو واز لە لیرەکەی دێنێ. دۆن پاولۆ ئیراد دەگرێ :
– ئەو لیرەی بە دیاری دام بە تۆ، ئەوت دایە ؟
شوانی پیر سەر دەباتە بن گوێی کەشیش و دەڵێ : « ئەو نە بوو. سکەیەکی قەڵب بوو.»
کەشیش و برای دینی پێکەوە بەرەو جادەی پیتراسکا دەکەونە ڕێ. کەشیش دەپرسێ :
– فرۆشتنی سکە برەوی هەیە ؟

ئەوی دی لە وەلامدا دەڵێ:« خەراب نیە ئەگەر لە ڕۆژی ئامادە بوونـەوە دەستپێکرا بایە برەوی زیاتر دەبوو. بەلام کلیسا هەمیشە درنگ دەجولێتەوە. باوکی ڕوحانی شارستانی ئێمە پیر بوە و مەوعیزە نازانێ. باوکی ڕوحانی نیگابانی ئێمە کە بە ڕاستی هەستی بۆنکردنی تیژی پیرۆزانی هەیە چەند مانگ پێش بۆی نوسیبوو: « شەر دێ نیزیک دەبێتەوە و ئێمە خەریکی چین؟ داخوا ناکرێ سکەیەکی تایبەتی بۆپارێزگاری گیانی سەر بازان لێبدرێ؟» باوکی پیری شارستانی وەلامی دابۆوە: « شەڕ ؟ شەڕی چی -» و بەم چەشنە کاتیان بە خۆڕایی دا و ئێمە خافڵگیر بووین. لە گەڵ ئەوەش بۆ سکالا نابێ و هەر چەند وە دوا کەوتوە داوا کاری سکە زۆرە.

هەرتکیان لە ڕێگادا ژنێک لە سەر جادە دەبینن کە لە سەر ئەژنۆیان دەڕوا. وەک کیسەیەک دەچێ کە لە کۆنە پەڕۆ ە قوڕ دروستکرا بێ. کیسەیەک بە ڕێگا دا بڕوا و بە لادا بێت. دۆن پاولۆ لە پێشدا دەترسێ نەکا ژن شێت بوو بێت. بەلام ئەو لە ڕاستیدا دایکە. دایکێک کە کوڕەکەی چۆتە شەڕ و ئەو نەزری کردوە کە لە پیتراسکاوە تا لاما لە سەر ئەژنۆیان بڕوا بەو هیوایە کوڕەکەی بە سلامەتی لە شەڕ بگەڕێتەوە. ژنی چارە ڕەش لە بەیانیەوە کەوتۆتە ڕێ. دەنگی گیراوە و ڕوخساری گۆڕاوە و چاوی پڕ بوون لە خوێن و مات و بێحاڵە. وا دێتە بەر چاو کە هەموو دەم لە وانەیە بکەوێ.

دۆن پاولۆ دەیەوێ مەجبوری بکات هەستێ و بە پێ بە ڕێگادا بڕوا. بەلام ژن بە چنگ و دان بەرگری لە خۆ دەکات. ئاخر ئەو نەزری کردوە و ئەگەر هەستێتە سەر پێ کوڕەکەی لە ئەفریقا نایەتەوە. ئانتی فونای برای دینی سەری لە وە سوڕ ماوە کە کەشیش ئەو مەسەلە ساکارە تێناگات.

هێندێ دوور تر باب و کوڕێک کە هەرتکیان سواری کەرێکی چکۆلە بوون، پەیدا دەبن. برای دینی سکەیان نیشان دەدا: یەکی پەنجا سانتیم. کابرا پارەی نیە. بەلام پێشنیار دەکا دەسرەیەکی سێو بداتێ، برای دینی قبوڵی دەکات. دەسرەیەک سێو بۆ پاراستنی گیانی کوڕێک زۆر نیە.

کەشیش و هەواڵەکەی لای ڕۆژ ئاوا دەگەنە پیتراسکا. بەر لەوە بگەنە پرد، لە نیزیکی ساختومانی بچوکی مەدرەسەی ئاوایی لێک جیا دەبنەوە. چونکە برای دینی دەبێ لە گوندی بگەڕێ و دەیەوێ لە مامۆستای مەدرەسەوە دەست پێبکات. لوتکەی چیاکانی پشتی پیتراسکا بەفر سپی کردوە. لە پەنجەرەیەکی ئاواڵەوە دەنگی پیاوێک و کیژێکی بچوک دەبیسرێ. ئا... ئا.. ئای.... ئۆ...

ئەوە سەرە تايە، سـەرەتاى سالّى تازەى خوێندن، سەرەتاى کتێبى هەوەڵى سەرە تايى. بۆ کیژەکە سەرەتاى ژيانە. بە دواى ويدا دەنگى منداڵێکى کوڕ دێت: « با... ب.. بێ....ب... بو....

کەشيش ڕادەوەستێ تا گوێ بداتێ. دوو بارە دەنگى کچەکە بەرز دەبێتەوە

– فا.... ف... فا.... في... فو

نيسێ بە سەر پيتراسکا دا هاتوە. تەنيا ماڵى کولامارتينى لە بەشى بڵيندى گوندى هێشتا تاو ڕووناکى کردوە.

کريستينا لە پشت پەنجەرەيەکى قاتى ئاخرى ڕاوەستاوە و ڕوومەتى وە شوشە يەک دەچێ کە ڕۆژى لە ئاوابووندا لە وێ ڕەنگى دابێتەوە. دۆن پاولۆ لە تەواوى گوند لەو ڕوخسارە زياتر هيچى ديکە نابينێ.

هێشتا ڕۆژ ئاوا نە بوە کە هەوا ساردە و دەيبەستێ. ماتالنا لە بەر دەرگاى موسافير خانە هەر وا خەريکى تەشى ڕستنى خۆيەتى و دەزوو بە نێو قامکانيدا دەچێتە سەر و چاوە ڕوانى گەڕانەوەى کەشيشە. تەماشاى عاسمان دەکا و دەڵێ :« بەو زوانە بەفر دەبارێ. »

بەلاّم پاش دوو ڕۆژ بەفر دەبارێ. بەيانى ڕۆژى دووەم کاتێ دۆن پاولۆ لە خەو هەڵدەستێ دەبينێ ديمەن گۆڕاوە و وەک ديمەنى چيرۆکى پەريانى لێهاتوە. بەفر وەک شتێکى چاوە ڕوان نەکراو قورس و مات دەبارێ.

کريستينا دێتە ديدەنى دۆن پاولۆ. چاوەکانى کيژى لاو لە بەر ڕەنجى ڕەوانى گەورە بوون، دەڵێ :

– خەبەرت هەيە کە دۆن بنە ديتو خوشکى خۆى و کەسێکى بە ناوى « پێترۆ سپينا » وەک ميراتگرى خۆى ديارى کردوە.

و نامەيەک بە دۆن پاولۆ نيشان دەدا کە لە وێدا « دۆن چيپريانو» پاش ڕاگەياندنى ئەو خەبەرە وکەلک وەر گرتن لە دەرفەت گوتوويەتى کە دۆن بنە ديتو دەبێ ئاقڵى لە دەست دابێ.( واتە مێشکى لەق بوو بێ )

– داخوا ڕاستە کە پێترۆ سپينا دوژمنى دينە ؟

– بەڵێ ڕاستە .

– کە وابوو دۆن چيپريانۆ هەقيەتى ؟

– نا .

کريستينا ڕوخسارى بێڕەنگ و دەردە دارى ڕەنج ديتوى خۆى بۆ لاى دۆن پاولۆ

بڵیند دەکا و حاڵی وی وەک حاڵی ئەو بونەوەرانەیە کە کەم کەم لە بەر خەم و بەلا هیلاک بوون و تەمەننای کەمێک ئارامی و حەسانەوەیان هەیە،
دۆن پاولۆ دەڵێ : « هێندێ مردوو هەن کە دەبێ لە حاستی وان وەفا دار بی.»
کیژی لاو بە چاوی بە ئەسرینەوە تەماشای دەکا و چەند جار بە ئامازەی سەر قسەکانی وی پشت ئەستور دەکا. پاشان دەڵێ : « لە فریام کەوە !»
هێندێ دێهاتی بۆ ئەوەی هەوڵین ڕۆژی بەفر بارین جێژن بگرن کاتی ڕۆژ ئاوا دێنە موسافیر خانەی ماتالنا. کریستینا کەمێک درنگتر دەگاتێ. دۆن پاولۆ لە نیزیک بوخاری دانیشتوە و وەرزێران و ژن و منداڵ دەورەیان داوە. لە لایکی نیزیک ئاگر سەگێک وەر کەوتوە و لە لای دیکە منداڵی شیرە خۆری« ترزا سکارافا » واتە هەمان منداڵی کە قەرار بوو بە کوێری لە دایک بێ و بەڵام نەجاتی بوو. منداڵەکەیان لە قەرتاڵەیەکدا وەک گوڵی کەلەم لە سەر هەردی داناوە و ڕوومەتی لە بەر ئاگری وەک سێو سوور بۆتەوە. خەڵک داوا لە دۆن پاولۆ دەکەن کە چیرۆکێکیان بۆ باس بکا و کریستینا پێدادەگرێ کە داستانی پیرۆزان بێت. ئاخرەکەی دۆن پاولۆ ناتوانێ داخوازی وان ڕەت کاتەوە، کتێبی دوعای خۆی هەڵدەگرێ و بە دوای پێرستی نووسراوەکاندا دەگەڕێ و بە شێوەی تایبەتی خۆی دەست دەکا بە نەقڵی داستانی شەهیدان کە لە کتێبەکەدا هاتوە.
چیرۆکی شەهیدان هەمیشە جۆر بە جۆرە و هەمیشەش وێک دەچن. سەر دەمی وان سەر دەمی قەیرانی توندە. حکوومەتێکی سەرە ڕۆیە بە ڕێبەرایەتیەک کە لیباسی خودایەتیان کردۆتە بەر. کلیسایەکی کرمخواردو و کۆن کە بە سەدەقە زیندوە. لەشکرێکی بە کرێگیراو کە قوت دانی پارووی ڕەنگینی ئارام و بێ ژانە سەر بۆ دەوڵەمەندەکان ئامادە دەکات. میللەتێکی کۆیلە و ئامادەی دایمی شەڕی تازە ی ڕێک لە گەڵ تالان و ڕاو و ڕوت بۆ پاراستنی ئابڕوی حکوومەتی سەرەڕۆ. لەم بەینە دا موسافیری گومانلێکراو لە دەرەوەڕا دەگەنێ. ئەوان بە سەبروکە باسی بەرجویان دەکەن کە لە ڕۆژ هەڵات ڕوویان داوە. ئەوان مزگێنی ئەوەیان هێناوە کە ئازادی نیزیکە. ! داماو و برسی و ناهومێدەکان بۆ بیستنی قسەکانیان لە ژێر زەمینەکان کۆ دەبنەوە، ئەم خەبەرە لە هەموو جێ بڵاو دەبێتەوە. نوێ دینەکان کەنیسەی خۆیان بە جێ دێڵن و دینی تازە وەر دەگرن. نەجیبەکان کۆشکەکانیان بە جێ دێڵن. یوز باشەکان ڕادەکەن دارۆغە کۆ بوونەوە نهێنییەکان خافڵگیر دەکەن. زیندانیەکان ئەشکنجە دەدەن و لە دیوانی تایبەتی دادگایی دەکرێن. ئەوان بزە لە

سەر لێوان خۆ لە بەر ئەشکنجە ڕادەگرن. لاوەکان وەک کەلاک داوێنە پێش دڕندان و پیرەکان زیندانی دەکەن. ئەوانەی زیندوو ماونەوە لە حاست مردوەکان وەفا دارن و بڕوای نهێنیان بە وان هەیە. زەمان دەگۆڕێ. شێوەی لیباس پۆشین ونانخواردن و کار کردن و زمانەکان هەموو دەگۆڕێن، بەلام لە دەروون دا هەر ئەو داستانەیە کە درێژەی هەیە، داستانی ئینسان.

لە نیزیک ئاگردان لە پێشدا سەگ دەخەوێ، پاشان منداڵی نێو قەرتاڵە و بە دوای واندا ئامادە بوانی مەجلیس. ئەوانەی نە خەوتوون تەماشای ئاگر دەکەن. ئەو دەم کریستینا دەڵێ :

- لە هەموو دەورانێک و لە ژێر ئالای حکوومەتانی جۆر بە جۆر دا، بەرز ترین کاری ڕوح ئەوەیە کە خۆی فیدابکات تا خۆی بدۆزێتەوە. خۆی فەنا بکا تاخۆی دووبارە پەیدا کاتەوە. مرۆڤ جگە لەوەی دەیدا نیەتی.

ئاگر کوژاوەتەوە، میوانەکان شەو باش دەڵێن و دەڕۆن. دۆن پاولۆ دەچێتەوە ژوورەکەی خۆی. دەفتەرچەی وتوو وێژی لە گەڵ کریستینا کە لە ڕۆژەکانی هەوەڵی نیشتە جێبوونی لە پیتراسکا دەستی پێکرد بوو، دوو بارە بە دەستیەوە دەگرێ. هەوەڵین لاپەرەکانی کە پڕە لە موحیبەت و ئیرادەت سەبارەت بە کیژی لاو دەخوێنێتەوە. دیسان دەیخوێنێتەوە و لاپەڕەکانی کە بە ئیلهام لە تێشکان و قین نووسراوە، دەیاندڕێنێ. هەشت مانگ لەو کاتە تێپەڕیوە، ماوەیەک کە بۆ ئەو و بۆ کریستینا بێ فایدە نەبوە. پێش ئەوەی بخەوێ چەند دێڕێک بە شێوەی خوارەوە لە گفتگۆیەکە زیاد دەکا:

- بەڵێ کریستینا، ڕاستە، مرۆڤ جگە لەوەی دەیدا چیدیکەی نیە. بەلام بە کێی دەدا و چۆن؟ ئەڤینی مە و نیەت چاکی و ئیرادەی مە لە فیداکاری و لە خۆ بوردوییدا، ئەگەر لە ڕێگای ئارمانێکی نادیار و غەیرە ئینسانیداتەرخان بکرێ، ئەستێور دەمێنێتەوە و تەنیا بە مەرجێک بەرهەمی دەبێ کە لە ڕێگای پێوەندی ئێمە دابێ لە گەڵ هاوجۆرمان. ئەخلاق جگە لە ژیانی بە کردەوە پەرە ناستێنێ و ناپشکوێ.

« ئەگەر شعوری ئەخلاقی خۆمان هەر چەند بە کەمیش ڕووی لە ئاژاوەیەک بکەین کە بە سەر ئاقار دا زاڵە، ناتوانین دەست لە سەر دەست دابنێین و تەنیا دڵ بەوە خۆش کەین کە چاوەڕوانی دنیایەکی سەرووی ئەم دنیایەی زەمینی بین. ئەو دێوەی کە پێویستە دژی ئەو خەبات بکەین، تەنیا ئەم بوونەوەرەی خەیالی بە ناو شەیتان

نیە، دێو تەواوی ئەو هۆکارانەن کە مرۆڤ دژی مرۆڤ دەهاروژێنن.»
دۆن پاولۆ کـە دەگـاتە ئێـرە تووشـی دوو دڵی دەبێ. دەزانـێ کـە دەیەوێ چ بڵـێ بەڵام نازانێ چۆنی بڵێ. چونکە ڕووی ئاخافتنی دە کریستینایە. لە بیری نە چۆتەوە کە مـەسـەلەی کۆمـەڵایەتـي مـەسـەلەی ئەخـلاقي نیە و تەنیا لە ڕێگای ئەخلاقەوە چارە سـەر ناکرێ. دەزانێ هەر چۆنێک بێ پێوەندی نێوان ئینسانەکان لە ئیحتیاجەوە سـەر چاوە دەگـرێ نـە ک لە چاکـە و خـەراپەی نیـەتـی ئێـمـە. بۆ گـۆڕینی ئەم پێـوەندییـانە مـەوعـیزەی ئەخـلاقی بەس نیـە. بەڵام دەمـێک دێتە پێش کە کۆنی و زەرەرمـەنـدی هێندێ لە پێـوەندییـەکـانی کـۆمـەڵایەتی وەک ڕۆژ دەر دەکـەون. ئەو دەمەیە کە ئەخـلاق ئەو شتە مەحکوم دەکات کە مێژوو مـەحکوومي کردوە. هەسـتی داد پەروەری دەبێتە هۆ کە کۆیلەکان یاخی بن. پێشەنگەکان چەک هەڵگرن، ڕوحی شەهیدان گڕ بگرێ و خاوەن بیر و هونەرمەند ئیلهام وەر گرن.
« ئەی کریستینای خۆشەویست، ئەوەندە بەسە تەماشای دەور و بەرمان بکەین تا بزانین کـۆمـەڵگای ئێـسـتـا گـەیوەتە ڕادەیەکی چەندە چەپەڵی. دیارە کـاری هەمـوو کـەس نیـە بچـێتـە سـەر مـیـحـراب و وتار بدا، کـاري هەمـوان نیـە کـە بچنە نێـو دەستەیەکی سیاسی و بۆ گۆڕینی ڕێکخراوی کۆمەڵ خەبات بکەن. لە گەڵ ئەوەش کیژێکی لاوی وەک تۆ ئەرکی سـەر شـانیـەتی بۆ دیتنی ڕوو داوەکانی دەور و بەری چاو بکاتەوە و چاوی ئەو کەسانەش بکاتەوە کە دەیانەوێ هەر بە چاوی بەستراو بمێننەوە.
« ئەگـەر بوونەوەرانی وەک تۆ کـە لەسـایەی بەخـشـینی زاتـی خـاوەني سـەروەتي فـراوانی ڕوحین، ڕۆژێک لە بەخشینی ئەم سەروەتە لە ڕێگای پەرستنی خـەیاڵاتی مـەزهەبێ دەست هەڵگرن و بۆ وەبەر هێنانی ژیانی کۆمەڵایەتی تەرخانی بکەن، چ گـۆڕانکارییـەکی مـەزن لە جیـهـاندا پێک دێت.! بەم جـۆرەیە کـە لە ئەنجامـدا پیرۆزەکانی نوێ و شەهیدانی نوێ و ئینسانەکانی نوێ پەیدا دەبن.
« من لە سەر ئەو بڕوایە نیم کە ئیمڕۆ بتوانی ڕوحی خۆت بە جۆرێکی دیکە ڕزگار بکەی. ڕزگار ئەم کەسەیە کە بتوانێ بە سەر غەرەبی تاکی و دەمار گرژی بنە مالەیی و چینایەتی خۆیدا زاڵ بێت و لە دێر نە بێتە گۆشە نشین و بورجێک لە ئێسکی فیل بۆ خۆی دروست نەکا و شێوەی رەفتار و هەستی لێک جیا نەبن. ڕزگار ئەو کەسەیە کە ڕوحانیەتی خاسی خۆی لە بەندی تەسلیم بە ئاژاوەی مەوجود ئازاد بکا. ژیانی مەعنەوی هەمیشە بەرهەمی فیداکاری و لە خۆ بردوویە.

لە کـۆمـەڵگایەکی وە کـۆمـەڵگای ئێـمـە ژیانی مـەعنەوی ناتوانێ جگە لە ژیانی شۆڕشگێڕی شتێکی دیکە بێت.!

« ئەی کریسـتـینا، نابێ بترسی، نابێ لە بەر بوونی ئەمنیەت هەر چەند ئەمنیەتی زێدمیی و پاکی خۆشت بێ، تەسلیم بی. ژیانی مەعنەوی و ژیانی جوت لە گەڵ ناز و نیعمەت لە گەڵ یەک بە ڕێگا دا ناڕۆن. بۆ رزگاری خۆت دەبێ خـەبات بکەی و گیان بخەیە مەترسیەوە.

دۆن پاوڵۆ ئەوەی نووسـیویەتی دوو بارە دەیخوێنێتەوە و ئەم ڕێگایە هەڵدەسەنگێنێ کە کاتی گەڕانەوە بۆ ئیتالیا بڕیویەتی. لە گەڕانەوەی و لە هاتنەوە سـەر خۆ، شادە. تەواوی شـەو بەفر دەبارێ. بەیانی کاتێ ماتالنا کەشیش بانگ دەکا، ئەو هێشـتـا نوسـتـوە. هێندێ لە وەرزێران و منداڵەکانی گاریباڵدی، لە پێش موسـاقیر خـانە کەری شـاتاپیان دەورە داوە. کەلاکی گورگێکیـان هاویشـتـۆتە سەر پشتی کەر کە هەر بـەیانی ئەو ڕۆژە لە چیاکـانی پشـتـی پیـتـراسـکا کـوژراوە. توکی گـورگ بە ڕەنگێکی خـۆڵە مێشـی خۆێن و قـوڕی پێوەیە. ددانەکانی گورگ سپی و قـایمن. دوو پەڵە خوێن نیشانەی دوو گولله بە شـان و پەراسووی گورگەوە دیارن. ڕاوچیەکان بە گوێرەی داب بە ماڵاندا دەگەڕێن و گورگی کوژراو نیشـان دەدەن تا دەسـتـخۆشـانە وەر بگرن. « لویجی باندوچیا» کە هێشتـا تفەنگی لە شانی دایە ڕوونی دەکاتەوە کە ئەوە چوارەمین گورگە کوشتوویەتی. مۆری ئەوین لە پشت ملی گورگ نیشـان دەدا کە ئەوە جێگای گـازی گۆڵە گورگی لـە دێڵە گورگی گرتوە. ئەڤین لە نێو گورگاندا کـارێکی جیـددییـە. باندوچیـا لە دوورەوە دەتوانـێ لورەی جیـاوازی گـورگ لێک بکاتەوە. لورەی تـرس، ئەوە کاتێکە کـە گورگ دەبینێ بە چەکـەوە پەلاماری دەدەن. لورەی خوێن، ئەوە بەو مـانایەیە کە حەیوان ڕاوی کردوە وئێستا رەفیقانی خۆی بۆ مـیوانی بانگ دەکا، چونکە گورگ نایانەوێ تەنیا خوراک بخـۆن. لورەی ئەڤین یانی حەیوان پێویستی بە مێیینە هەیە و شـەرم ناکات کە ئەم نیازە دەر بخا.

دایە گەورەی کریستینا نایەوێ هیچ بدا بە گورگی کوژراو، بەڵام کریستینا کە لە منداڵییـەوە ڕێزێکی تایبـەت بۆ گـورگان قـایلە لە دایە گەورە تکا دەکات. پیـرێژن دەڵێ:« گورگی کوژراو ئیتر ناگەزێ.»

دۆن پاوڵۆ نامـەیەک بە چەند ڕسـتـەی ئاسایی و بە ئیمزایەکی نەناسـراو لە ڕۆمـەوە وەر دەگـرێ. کـاغـەزەکـە لە پێش گـەرمـایی چرا ڕادەگـرێ لە نێـو دێڕەکـاندا چەند وشـەی ڕەنگ زەرد کە بە ئاوی لیـمۆ نووسـرابوو دەر دەکەوێ: « ڕۆمـیـنۆ گـیراوە،

ئەگەر دێی ئاگات لە خۆ بێت. وەرە ماڵی کلوچی .»
دۆن پاولۆ دەست بەجێ دەکەوێتە ڕێ و بە ماتالنا دەڵێ:
– من بۆ کارێکی بنە ماڵەیی دەبێ بچمە ڕۆم. جارێ با شتەکانم لێرە بن تا دوایە دەگەڕێمەوە دەیانبەم. کەمێک بەر لەوەی قەتار بگاتە ئیزگەی ڕۆم، دۆن پاولۆ دەچێتە دەست شۆیی و دەرگا دادەخات. کاتێ دێتە دەر دیسان بۆتەوە پێترۆ سپینا. لە ئیزگەی ڕێی ئاسنەوە یەکسەر بە شەقامی « دلالۆ نگاراتا » دا دەچێتە ماڵی ئانیناپچی کلاو درووی دۆستی موریکا و بە کیژی لاو دەڵێ:
– موریکا سلاوت دەگەیێنێ. ئەو دەرد و زەحمەتێکی زۆری کێشاوە بەلام ئێستا چاکبۆتەوە، کاتێکی بیبینی نایناسیەوە. تەواو پیاوێکی دیکەیە. قەت تۆی لە بیر نەچۆتەوە.
ئانینا بۆ شاردنەوەی وروژانی دەروونی خۆی هەول نادا و چاوی پڕ لە ئەسرین دەبن. کە وابوو ئەم ڕوو داوەی کە بە تەواوی بوونییەوە هیوای پێیەتی، بە ئەنجام دەگات. دەپرسێ :
– ئیتر نایەتەوە ڕۆم ؟
– نا
– پێت وایە من دەتوانم جارێک بۆ دیتنی وی بچمە گوندی.؟
– ئەو چاوەڕوانی تۆیە و لە بارەی تۆوە لە گەڵ دایک و باوکی قسەی کردوە.
کیژی لاو بڕیار دەدا کە ڕۆژی دوایی بکەوێتە ڕێ.
سپینا ئانینا دەنێرێتە شەقامی« دی موروسونی» تا هاتنی وی بە ژنی کلوچی ڕابگەیێنێ و خۆشی لە کۆلانێکی دراوسێ چاوە ڕوان دەبێ. ماوەیەک درێژە دەکێشێ تا ئەو دوو ژنە دێن، سپینا لە پیادە ڕۆ هاتو چۆ دەکات.
لە عاسمانی شاری واتیکان باڵۆنێکی گەورە بەستراوە بە سیم لە فڕیندایە. بە پیتی گەورە تەبلیغات بۆ دەرمانی زکچوون لە بەدەنی باڵۆنەکە نووسراوە. سپینا بە خۆی دەڵێ کە لە ئیتالیا زۆر لە و دەرمانانە بە ناوی پیرۆزان نێو دار کراون و هەر وا وەبیریش دێنێتەوە کە ئاگاداریەکانی زۆر بە نرخی تەبلیغاتی کە لە ڕۆژنامەکانی کاتۆلیکی ئیتالیایی دا بلاو دەبنەوە، هەمیشە لە بارەی تەبلیغات بۆ دەرمانەکانی زکچونە. داخوا لە وانەیە ئەم کارە هەڵکەوت بێت؟ نە خێر، نابێ هەڵکەوت بێت و سپینا نەتیجە دەگرێ کە :« «کلیسا دەبێ قەبز بێت» ئەم فیکرە وە پێکەنینی دەخست و دۆن بنە دیتو ش پێ شاد دەبوو.

ئاخـرەكـەی ئەو دوو ژنە دەگـەنـێ، هـەر تک لە سـەر هـەست تەمـاشـای ئەمـلا ولای خۆیان دەكەن، دەڵێی لە وە دەترسێن كە وەدوایان كەوتبن. خانم كلوچی دەڵێ :
- .ڕۆمێنۆ گیراوە بەڵام هیچیان لە كن نەدیوەتەوە. لە وانەیە زۆری ڕانەگرن.
سپینا لە وەڵامدا دەڵێ :
- دەوڵەت چی بوێ لە گەڵ گیراوەكانی دەكات. قانون لە ئیتالیا تەنیا بۆ خوێند كارانی حقوق و بێگانان هەیە... مێردەكەت چۆنە، هێشتا هەر لەوێیە ؟
- بەڵێ، هەر وا چاوە ڕوانی دادگا ماوەتەوە. كوێریش بوە. لە وانەیە چەند مانگە چاوی نابینێ بەڵام من ئاخرین جار كە چوو بوومە ملاقاتی زانیم. من بۆ دڵخۆشی وی شاڵێكم لە بەر كرد بوو كە لە كاتی زەماوەندمان بە دیاری دابوویمێ. لە گەڵ ئەوەش لە شوێنێ چاو پێكەوتن هەر نردەیەكمان بەینە و ئەوێش ڕووناكە، ئەو دەبوایە ئەو شاڵە بناسێتەوە. من پێم گوت «نازانی چم دەبەر كردوە ؟ نایناسیەوە؟» لە وەڵامدا گوتی : « خەزە » كێ داویە بە تۆ ؟» دایكی لە پەنا من وێستا بوو ئەو هەموو جارێ كە دێتە مولاقاتی كوڕەكەی ئەوەندە نارەحەت دەبێ كە بە زەحمەت قسەی بۆ دەكرێ، ئەو لە منی پرسی: « دایكم لە كوێیە؟ ئیمڕۆ بۆ نەهاتوە؟ بۆ چما نەخۆشە.؟» ئەو دەم زانیمان كە چاوی نابینێ. خۆزیا زووتر دادگایی كرا بایە. ئانینا دەڵێ :« دادگایەكانی دیكەش هەر وا وەدوا دەخەن. دەوڵەتی ئیتالیا نایەوێ خەڵك بزانێ كە كەسانی واش هەن كە دژی شەڕ خەبات دەكەن.
خاتو كلوچی بە سپینا دەڵێ:
- ڕومینۆ بە منی گوتبوو كە مزڵێكی ئەمین بۆ تۆ پەیدا بكەم. بەڵام من نازانم تۆ لێرە دەتەوێ بە چ ناوێك بمێنیەوە.؟
- پاشان پێت دەڵێم. سپینا خەبەری بیانكینا دەپرسێ. خاتو كلوچی لە وەڵامدا دەڵێ :
- ئێمە هەوڵماندا یارمەتی بدەین بەڵام ئەو كارە گران بوو. ئەو كیژێكی خەراپ نیە، بەڵام شلوق وناسك نارنجی و هەوەسبازە. تا لە گەڵ ئێمە بوو لە بێ حەوسەلەیی كیانی دەر چوو بوو. بە كارێكی كەم ئەوەندە هیلاك دەبوو نەخۆش دەكەوت. ڕۆژێكیان بێ ئەوەی بە كەس بڵێ بزر بوو. پێش دوو ڕۆژ دوو بارە پەیدا بۆوە، سەر تا پێ گۆڕا بوو. خەبەری تۆی لە ئێمە دەپرسی. ژمارە تەلەفونێكی داینێ كە ئەگەر هاتی پێت بڵێین.

سپینا ژمارە تەلەفونەکـە وەر دەگریّ. چەند دەسـتـورێک بۆ سـەفـەری نـهێنی بۆ « ڕوکادی مـارسی» دەدا بە ئانینا و لـە گـەڵ خـاتو کلوچیش قـەرارێکی چاو پێکەوتن دادەنێ. پاشان لە تەنیشت پانتئون دەچێتە میوانخانەیەک و ژوورێک دەگرێ. ناو و نیشانی خۆی بە گوێرەی پاسپۆرتی چێکی کە هەیەتی لە دەفتەری میوانخانە تۆمار دەکات. کاتی ڕۆژ ئاوا تەلەفون بۆ بیانکینا دەکا و لە ناوەندی شـار لە قاوەخانەیەک قـەراری چاو پێکەوتن دادەنێ. هـەر تکیـان لە سـەعـاتـی دیارێکراو دا دەگـەنە جێ ژوان. سپینا دەڵێ :

– پێت سـەیر نەبێ من لیبـاسی خـۆم گـۆڕیوە. لە کـاتی پێویست دا گـۆڕینی لیبـاس ڕەوایە.

– بە کـۆت وشـاڵوارەوە هێندە سـەیر بووی. بـەڵام قەی ناکا. ژن سـوور و سـپیاوێکی توندی کردوە. قدەکانی بە شێوەیەکی سـەیر ڕازاندۆتەوە و لیباسێکی شیکی دەبەر کردوە. قاوەخانەکە لە ڕوانگەی سپیناوە زۆر شلوقـە و جێگای گومـانیشـە. هێندێ بە هـەوای ئۆرکێسـتری نـارێک سـەما دەکـەن. چرایەکی بچـوکی بە سـەر پۆشیـان لە سـەر مێزێک دانـاوە ، ئەو چرایانە وە بیر سپینا دێنێتەوە کـە لە بن سـەری نەخۆشی دادەنێن. ئامادە بوانی وێ سیغاری لۆکس دەکێشن و قژی سـەریان بە « بریانتینی ئاسـایی» پێکەوە نووسـاندوە و لە کاڵتـەی سوک و ئەحـمـەقانە سـرت و خـورتیـانە. لە نێوان مـێـزەکـاندا هـەوایەکی تێکەڵ بـە ئەحـمـەقـی، هەوایەکی پڕ لە شــەهوەترانی و بۆگـەن و بۆنـی ئارەقـەی بنەنـگڵ و قـاچی نە شـۆراو. بیـانکینا بەرەو ڕوی سـپـینا دانیـشـتـوە و دیارە مـاندو و هـیـلاکـە. ڕەنگە چاوە ڕوان بێ سـپـینا دەسـت بە قـسـان بکا.

سپینا لێی دەپرسێ : « ئێستا ئیتر جیدی بووی ؟»

ئەم قـسـە درێژەی هـەمـان گـفـتـگۆیە کـە لە فـوسـا لە گـەڵ وی هـەبوو. هـەر بۆیەش بیانکینا بریاری دابوو بێتە ڕۆم.

لە وەڵامدا دەڵێ : « جیدی ؟ ... ئاخ... چ جۆرێک !

: ئێستا لە کوێ کار دەکەی ؟

– ئێستا چەند ڕۆژێکە دەحەسێمەوە.

– داهاتت باشە ؟

– ئەی.. هـەر وا !

– کارەکەت پێخۆشە ؟

- هیچ کـەس لە هیچ کـاتێکدا کـاری واقـیـعی پێـخـۆش نە بوە. تـەنیـا قـارەمـانانی کتێبەکانی کیژ پەسند کاری واقیعیان پێخۆشە.
- لە کوێ کار دەکەی ؟
ژن بە ئارامی سیـغارێکی پێدەکا. دیسان لێی دەپرسێ : « ببورە گوتم لە کوێ کار دەکەی ؟ »
ژن بە سادەیی تەواو وەڵام دەداتەوە ؛
- لە جندە خانەیەک.
سپینا رۆژنامـەیەکی تایبـەتی ئێواران لە منداڵێک دەکرێ کە خـەبەری گـەیشـتنی هێزی ئیتالیای بە « ماکالە» تێدا نووسراوە.
ژن دەپرسێ :
- ئێمە گەیشتووینە «ماکالە » (ماکالە شارێکی سـەر سنووری حەبەشـەیە )
سپینا وەڵام دەداتەوە ؛
- بەڵێ ، ئێوە گەیشتوونە ماکالە.!
پاشـان هەر تک بێدەنـگ دەبن. لە شـەقـام دا کە دەیانەوێ لێک جیا بنەوە بیـانکینا دەپرسێ :
- نارەحەتم کردی ؟
پیاو لە وەڵامدا دەڵێ :
- راستیت دەوێ من ئاگام لە تۆ نەبوو. بیرم لە شتێکی دی دەکردەوە،
بەڵام ئەو وەڵامـی دەوێ و دوو بارە دەپرسێ :
- نارەحەتی ؟
پیاو دەیەوێ دوور کەوێتەوە و بروا بە دوای کاری خۆیدا ، بۆیە دەڵێ :
- مەجبور نیم وەڵامت بدەمەوە،
بیانکینا پێداْدەگرێ :
- دەبێ وەڵامم بدیەوە.
پیاو بۆ رۆیشتن دەبزوێ و شەو باشی پێدەڵێ .
ژن باسکی دەگرێ و دیسان دەپرسێ :
- نارەحەتی ؟
هەر تک لە سەر نێو تەختێکی بەرد دادەنیشن. سپینا دەڵێ :
- ئەو کاتەی کە من هێشتـا لە دەبیرسـتـان بووم منداڵان رۆمانێکیـان بە نهێنی

دەست بە دەست دەگێڕا، باسی ژنەکانی نشتە جێی چندە خانانی تێدا نووسرا بوو- ئەوانەی کە تۆ ئێستا سەر بەوانێ - منیش ئەو کتێبە خەفەتبارەم خوێندەوە، ئەو دەم تەمەنم پازدە ساڵ بوو. دەبێ پێت بڵێم ئەوەدەم ئەو کتێبەم پێ خەراب بوو کە لە وەوە دوا قەت نەمتوانی کتێبێک بخوێنمەوە کە بە هەڵکەوتیش ئەم جۆرە مەسەلانەی تێدا نووسرا بێ.

ژن دەڵێ:« لە دەبیرستانی ئێمەشدا ئەم جۆرە کتێبانەیان بڵاو دەکردەوە. من پێم وایە ئەم جۆرە کتێبانە بە ئانقەست چاپ دەکەن تا لە مەدرەسەکان کەشیش و خوشکانی تەرکە دنیا بیانخوێننەوە. من خۆم دە دانەی ئەوانەم خوێندۆتەوە کە هەمـــوویان وەک یەک وا بوون. بەشی هەوەڵ پاکی، بەشی دووەم دوو دڵی، بەشی سێیەم کەوتن، بەشی چوارەم گوناح، بەشی پێنجەم بە سەر لێژی ڕیسواییدا، بەشی شەشەم هەوەڵین هەستی پەشیوانی، بەشی حەوتەم قیامەت. ئەوە پێرستی نە گۆڕاوی تەواوی ئەو کتێبە کاڵتە جارانە بوو کە بە ئانقەست بۆ گریاندنی پیاوی گەنج و کیژی سادە دڵ دەیاننووسین. بەڵام چیرۆکی من ئەحمەقانە و سوک و ماندوو هێنەرە. تەنانەت چیرۆکیش نیە، بەڵکوو ژیانی منە.

پیاو دەڵێ : « ڕەنگە خەتای من بێ نەدەبوایە تۆ بجولێنم کە فوسا بە جێ بێلی .»

- من لە فوسا زۆر هیلاک دەبووم ڕەنگە جگە لە هێندێ کاتی دەگمەن کە تۆ لە وێ دەبووی ئەگینا لە بەیانیەوە تا ڕۆژ ئاوا باوێشکم دەهاتێ. دۆستانی شوودار مرۆ دادەهێزێنن چونکە جگە لە باسی مێردەکانیان هیچیتر ناڵێن. تەنیا دەزانن بێژن:« فرانسوای من »، « ئانتوانی من »، « لویی من » ئەوانە جگە لە نیستی مێردەکانیان شتێکی دیکە نین. هەمیشەش دەترسێن نە کا ئەم سێبەرەیان لە سەر کەم بێتەوە. دۆستی گەنجتر کە هێشتا شوویان نەکردوە، زیاتر لە دەستەی هەوەڵێ مرۆ هیلاک دەکەن. کیژی فەقیر بیست ساڵی تەواو بۆ چارەگە سەعاتێک خۆشی نەفسانی چاوە ڕوانی دەکات. چارەگە سەعاتێکی کە پاشان دەر دەکەوێ برە لە پەستی و حەماقەت و حەیوانی. لە تەواوی ماوەی ئەو چاوەڕوانیەشدا لە قوڵایی دڵەوە جگە لە وە بیر لە هیچیتر ناکەنەوە. بەڵام پیاوان، باشترە هەر باسیان نەکەین. ئەوان پیاو نین، بەڵکوو کارمەند، بازرگان، خاوەن ملک و وەرزێڕن.

- تۆ لە ڕۆم دەتوانی لە ماڵی خاتو کلوچی بمێنیەوە. ئەو ژنێکی بە هۆش و بێ غەرەزە. بێگومان بۆ ڕێک و پێک کردنی ژیانێکی باشتر دەیتوانی یارمەتیت بدا.

- چونکە ئەو ئاشنای تۆیە نامەوێ خەراپەی بڵێم. بێگومان ئەو ژنێکی باشە، بە لام

لە پوورم خەراپتر لە بەیانیەوە تا ئێوارێ کاتی خۆی بە ئاخ و داخەوە دەباتە سەر. هەمیشە چاوی پڕ لە ئەسرینە. هیچ قسان ناکا و هەر دەناڵێنێ.

– ئاخر مێردەکەی گیراوە و کوڕیش بوە.

– دەزانم هەر بۆیەش هەولم دەدا دەردی دڵی تێبگەم، دڵسۆزی بۆ بکەم، دەڵخۆشی بدەمەوە و سەری گەرم بکەم بەلام هیچ نەدەکرا. لە لایەکی دیکەوە لە مالی وی خەلکی دیکەشم دەبینی کە مێردیان نە گیرا بوو لە گەل ئەوەش لە ڕوو گرژیدا لەو نە دەمانەوە. من نالێم ئەو فیکرە خەراپە، تۆ دەتەوێ سۆسیالیست بی، باشە بیە، بەلام مێشکی منیش مەبە. بەلام ئەوان هەمیشە قسەیەک دەکەن و لە بەیانیەوە تا ئێوارێ لە خانووی شەدار و پیسی خۆیاندا ئاخ هەڵدەکێشن. لە کاتێکا لە دەرەوە ڕۆژ بەم جوانیە دەدرەوشێ. بە ڕاستی بەد بەختییە کە مرۆڤ بوونەوەری وا جوان ببینێ کە سەبارەت بە فیکرێکی قەتیس ماو هەمیشە تازیە دابگرێ و نەخۆش بکەوێ و مووی سەری سپی بکا. بڕوای ئەو ژنانە بە سۆسیالیزم، لە بڕوای ژنی ئیماندار بە « ساکرە کور» کەمتر نیە. باش گوێ بدە قسەکانی من. ئەو کەسانەی تۆ منت بەوان سپارد بوو بە ڕاستی ئینسانی زۆر باش و شەریفن بەلام زۆر وشک و داهێزێنەرن.

– ناچار ئەو جندە خانەی تۆ پەنات بۆ بردوە لە چاو ئەوێ شوێنێکی کەیف بەخشە

– تۆ قەت لەو جۆرە مالانە نەبووی ؟

– نا

– منیش پێشتر قەت لێی نە بووم. لە مالی دۆستێکی خەلکی ڕۆم بە ناوی « جوسپینا سترافا » کە لە دەبیرستان لە گەل من و کریستینا هاو دەرس بوو، ئێستا دەزگیرانی کابرایەکە کە خاوەنی کارخانەیەکی سابوون سازیە. لە گەل « کۆماندوتۆر» ێکی نیشتمانپەرستی ئەندامی حیزبی دەوڵەتی بوومە ئاشنا. چەند ڕۆژێک لە ئاشنایەتی مە تێنەپەڕیبوو داوای لێکردم ئەگەر دەمەوێ بۆ جەبهەی شەڕم بنێرێ. ستادی ئەرتەش دوو هەزار ژنی ویستبوو. هێندێک بۆ سەر بازان و هێندێکی باشتر و جوانتر بۆ ئەفسەران. لام وایە لە بەر جوانی و تەربیەت و خوێندەواریم منیان بۆ ئەفسەران دانا بوو. دیارە قەرار بوو ئەگەر ئەو ژیانەم پێخۆش نەبێ بە هاسانی بتوانم لە کۆلۆنیەکی دیکە یا لە ئیدارە و یا شوێنێکی وەک ئەو کارێک بۆ خۆم پەیدا بکەم. تەنیا فیکرێک منی دوو دڵ ڕاگرتبوو، ئەوەش فیکری تۆ بوو. نەمدەویست بچمە جێیەک لە تۆ دوور بم. ئاخر من هیوام بە تۆ بوو.

ئاخرەکەی تەسلیمی پێداگرتنی « کۆماندوتور» بووم و کەوتمە ڕێ. ئەوەی زیتر منی ڕادەکێشا سەفەری دەریا و چوونی وڵاتێکی نە ناسراو و بۆ نێو خەڵکێک کە بە زمانێکی دیکە قسە دەکەن. لەوانەیە لە وێش خەڵک ناڵە و گریانیان بێت، بەڵام من لە زمانی وان تێناگەم.

– تۆ ئەو دەم بە قەسدی ئەفریقای ڕۆژ هەڵات سواری پاپۆڕ بووی؟

– تا ناپول چووم. لە وێ بۆ چاوەڕوانی سوار بوونی پاپۆڕ منیان بردە سالۆنی بە ڕواڵەت « ڕووتەکانی هونەری ». ئێمە شازدە کەس « ڕووتی هونەری» بووین کە لە ژێر دەسەڵاتی موشتەریاندا بووین. ئەو موشتەریانەش زۆربەیان نیزامی بوون کە دەیانویست بۆ شەڕ بچن. لە نێو ڕووتەکاندا ژنی سەیر و سەمەرە هەبوون کە لە شەڕی جیهانیدا بەشدارییان کرد بوو. کاتی شەو سەر باز و دەرەجە دار بە کاسکێت و لیباسی خزمەتەوە لە نۆردوگاوە دەهاتن. ئەوانە بەر لەوەی بۆ ئەفریقا بڕۆن، یەک دوو ڕۆژ لە ناپول ڕایاندەبوارد. دیارە هەموویان و بە تایبەت ئەوانەی فەقیر بوون بە دوای کەیف دا دەگەڕان. تەواوی تەقەلای خۆیان بە کار دەهێنا تا خۆش ڕابوێرن بە لام هیچ سەر نەدەکەوتن. ئەوانەی دەهاتنە بەشی ئێمە تا ئەو کاتەی کە هەموو پێکەوە بوون بە کەیف و سەر حاڵ و ئازاد خۆیان نیشان دەدا. بەڵام کاتێ بە تەنیا لە گەڵ ئێمە لە ژوورێکدا دەمانەوە، خەمبار و گرژ دەبوون. زۆربەیان وەرزێڕ بوون. کاتی لەزەت بردن کە بە سەرم دا خوار دەبۆونەوە و تەماشام دەکردن لە سیمای گرژیان دەترسام. ئەگەر بە هەڵکەوت یەک لە نێویاندا زار بە پێکەنین بایە ڕەنگە باوکی خێزانێک بوو بێت و بۆ خۆشکردنی دڵی من پێدکەنێ. پیاوانی گرژ بە سمێڵی زەلام و ماهیچەی ئەستوور لە کاتی لەزەت بردن جیک جیک یان دەکرد. بە نازی منداڵانە منیان ناز دەکرد« جیک..جیک.. بیو... بیو.. بیو..» بەڵام هەوای دەنگیشیان لە ناخدا خەمناک بوو. کەسانی وایان تێدا بوو کە عەکسی دایک و ژن و منداڵیان بە چاوی بە ئەسرینەوە بە من نیشاندەدا. بیری لێبکەوە لە شوێنی وا دا مرۆڤ چی بەسەر دێت. بە داخەوە ئەوان پتر لە چارەکە سەعاتێک مافیان نەبوو لە ژوورەکە دا بمێننەوە. زەبت و ڕەبت ئاوا حوکم دەکات. ئەوانەی دەیانتوانی دوو ئەوەندە پارە بدەن. نیو سەعات دەمانەوە بەڵام پێت وانەبێ کە زیاتر لە وانیدی کەیفیان دەکرد. نیزیکەی هەموویان کاتێ ماندوو دەبوون داوایان لە من دەکرد سەر بردەی خۆمیان بۆ باسبکەم. لە هەوەڵەوە نەمدەزانی کە بۆ چی و لە کام ڕوانگەوە سەر بردەی من بۆ وان سەرنج ڕاکێش بوو. پاشان دەر

کەوت کـە بەوەش کـەیف دەکـەن. ئەو دەم مـن دەمگێڕاوە و شـتی وام دەهـۆندەوە کـە زیاتر ئەوان کەیف خـۆش بکا. بۆ نموونە ئاخم هەڵدەکێشا و دەمگوت« کـچێکم هـەیە لە مـەدرەســەی خـوشکانی پیـرۆز دەرس دەخـوێنیّ و من بۆ ئەوەی بتـوانم بیکەمـە مـەسـیـحـیـەکي تەواو و کـەمـاڵ ئەو ژیانـەم دەست پێکردوە. بەڵیّ بۆ خـۆشـبـەخـتی کیژەکەم هـەموو کـارێک دەکەم. » هێندێکیـان کە قسـەکانی منیـان دەبیست، چاویان پڕ لە ئاو دەبوو. ئـەوان ئینسـانی چاک بوون، هـەموویان دیهاتی خـەمـبـار و هیـلاک بوون. تەنـانەت یەک لە وان جـوتە کـەوشـێکی بۆ من نارد تا بـۆ کـیـژەکـەمی بنێـرم. کەوشەکان هێشتا لە چەمەدانم دان. بەم چەشنە ئێستـا هـەست دەکەم هـەر چۆنێک بێ کـچـێک پەیدا بکەم. زۆر جـار لە بارەی ئەو کـچـەم قـســەم کـردوە. زۆر جـاران ڕوخسـار و قژ و چاو و دەسـتە چکۆڵەکانی و ئەو چاڵە چوکەی کە کـاتی پێکەنین دەکەوێتە سـەر کولمـەکانی باسـم کردوە. زۆر لەو ئینسـانە باشـانە هۆگری بوون و دڵسـۆزیان بۆ دەکـرد و بـۆی دەگـریان. ئێـسـتـا بزانـە بۆ لاقـە چکۆڵەکـانی جـوتە کـەوشێکم هـەیە.! بە کـورتی پاش چەند ڕۆژ ژیـان لەو جندە خـانەیە وردە وردە زۆر هیـلاک بووم، زۆریش مـاندوو دەبووم و هـەر وەک بۆ زیارەت ڕێگایەکي دوورم بڕی بێت. لاقم دایم مـاندوو پشت و ماسولکەکانم ژانیان دەکرد. بە تایبـەت کە ژیانێکی خـەفـەتبـار و سـوک ویەک هەوام هـەبوو. لە وێ جـۆرە ڕەسـتـورانێک هـەبوو بە خـواردەمـەنی ئیـجـبـاری و نە گـوڕاو. ئەوانەی دەهاتن هـەموویان یـەک شـتـیـان دەویست. جگە لە وەش هـاو کـارانی منیش ئەوەندە ئەحـمـەق بوون کـە ڕووی گـایان سپی دەکردەوە.

سپینا دەڵێ:

– لە تەمەنی تۆ دا هـەموو شت، ژیانی ئاسایی یا نا ئاسایی هیلاکت دەکا. کە وابوو چی بۆ تۆ ماوەتەوە.؟

– یەک هومێد

– چ هوێتدتک ؟

دەستی سپینا دەگرێ و بە سەبروکە دەڵی : « تۆ »

سپینا دەڵێ : « من؟ بە داخوەوم. بەلام....

ژن دەپرسێ :

– بە ڕاسـتی تـۆ کێی ؟... تۆ بێگومـان نـە کـەشـیش نە ڕێگری و نە شـەیتـانی. نە سـەوداگـەری چەرچی، کـە وا بوو تۆ کـێی؟ ڕەنکە هـەمـووی ئەوانەش بی بەلام ئەو

مەسەلە بۆ من سەرنج ڕاكێش نیە و نامەوێ بشزانم تۆ كێی . ئەوەی من لە تۆی دەزانم بۆ من بەسە. تۆ هەر ئەوەی كە هەی. یەكەمجار كە تۆم بینی- لە بیرتە یەكەم جار كە یەكترمان دیت - لەو كاتەوە چاوم بە چاومكانت كەوت، بەڵێ لەو كاتە بە دواوە من تۆم خۆش دەوێ. جگە لەوە هیچ شتێكی تر بۆ من سەرنج ڕاكێش نیە، من بە هەموو زاتم لە سەر تا پێ تۆم خۆش دەوێ و ئەویتر هەر چی بێ بۆ من هیلاكی و ماندوو هێنەرە. تۆ تاقە شتێكی كە هیلاكم ناكەی .

- بیانكینا من دەبێ پێت بڵێم كە ....

- پێویست ناكا كورج وەلامم بدەیەوە. تۆ هەر چەندی درنگتر وەلامم بدەیەوە بۆ من باشترە. مەبەستم ئەوەیە كە بەم هۆیەوە هیوای من زیاتر دەبێ. لێگەڕێ من هیوادار بمێنمەوە. ئێستا ئەوە تەنیا شتێكە كە من بە ژیانەوە دەبەستێتەوە. بۆ تۆش بێ مایەیە.

پیاو لە وەلامدا دەڵێ : « پاشان لەم بارەوە دیسان دەدوێین .»

بەم وادمیە هەر تك لێك جیا دەبنەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە سپینا لە گۆشەیەكی شەقامی « موروسینی » خاتو كلوچی دەبینێ كە پێشتر ژوانی چاو پێكەوتنیان دانا بوو، ژنەكە دەڵێ :

- بۆ بەڕێكردنی ئانینا چوو بوومە نیزگەی ڕێگای ئاسن. خۆزیا دەتبینی چاوی كیژەكە بە ئەڤینی چاو پێكەوتنی سەر لە نوێی موریكا چۆن دەدرەوشان.!

- لە ڕێكخراو دا كێ لە جێگای ڕومیئو یە؟

- یەك لە دۆستانی میلانی بە ناوی بولا. من هاتنی تۆم بەو ڕاگەیاندوە.

لە پێش دەرگای ڕەستوران پیرێژنێك لە پشتی مەنقەڵ دانیشتوە بەڕوو دەفرۆشێ.

خاتو كلوچی بە سرتە بە سپینا دەڵێ : « ئەم ژنە یارمەتیمان دەدا »

خاتو كلوچی لولە كاغەزێك بەڕوی برژاو دەكرێ. پارچە كاغەزێك دە بنی لولەكە دایە شوێنی چاو پێكەوتنی « بولا »ی دیاری كراوە.

ئەم دوو پیاوە لە سەر پەیژەكانی كلیسای « « ترینیتای مونتی» یەكتر دەبینن بۆ ئەوەی بتوانن یەكتر بناسن هەرتك ڕۆژنامەیەكی عەكس داری وەرزشیان لە دەستی چەپدایە. بۆلا دەڵێ :

- دەمێكە پێمان وابوو تۆ گیراوی چونكە هیچ خەبەری تۆمان نەبوو. تەنانەت پێمان وابوو خەبەری گرتنی تۆیان لە ڕۆژنامەكانی ئازادی ئێمە دا بە دەرەوە ڕاگەیەنراوە.

« بولا» كرێكارە بەلام بۆ شوێنە ونكە شوغڵی نوێنەرایەتی هەڵبژاردوە و دەڵێ

قـازانجـیشی لـێ دەکات. هەمـوو ڕۆژێ بە چەمـەدانێکی پڕ لە عـەتر و شـتـو مـەکی ڕازانەوەی هەرزان قیمـەتی ژنان دەچێتە بیست دوکانی سـەر تاشی ئەو شتانەی کە پێشـتـر بازاڕیـان برەوی هەبوو، بە بیانووی ئەوەی کە ئێستا دژی سیاسـەتی میللەتخوازی دەوڵەتن قەدەخە کراون.

سپینا دەپەرسێ :« دەستەکانی ڕۆم لە چ حاڵێکدان.؟

- ئێمە دیسـان لە هەوەڵی کار داین. گیرانی ڕومییۆ زیانێکی گەورە بوو. بە تەواوی و یا نیزیکەی هەمـوو پێوەندییـەکان پچڕاون و یا جێی باوەڕ نین. هەمـوو کارەکان دەبێ لە سەر ڕا دەست پێبکرێنەوە.

- کەسـی تازە هەن کە بۆلای مە بێن ؟

- هەن بەڵام کە جارێک پێوە بوون وهەڕەشـەیان لێکرا بە گشـتی بەر بەرەکانیان کەمـە و هەر چی دەیزانن دەیڵـێن. هەر بۆیەش هـەمـوو شت دەبێ لە نوکـەوە دەست پێبکرێتەوە. زۆر جاران بۆ دامـەزراندنەوەی سـەر لە نوێی پێوەندێکی سـاکار دەبێ چەند حـەوتوو زەحـمـەت بکێشین. دەبێ بە دوای ئەو کـەسـانە دا بگەڕێیین کـە لە بەر چاو بزر بوون. کوێر کوێرانە لە نیشانێکەوە بۆ نیشـانێکی تر بچین و قەراری چاو پێکەوتن دابنێین. کە هیچ کەسیش نایە. تازە کاتێ کە پێوەندی دامەزرا، زۆر جاران چەند ڕۆژ زیاتر ناخـایەنێ و ئەو دەم پێویسـتـە بـێ مـاندوبوون لە سـەرە تاوە کـار دەست پێبکرێتەوە. تێکۆشانی نهێنی سەبر و خۆ ڕاگری گەرەکە.

- لایەنگرانی تازە کە دەیانەوێ بیانهێننە نێو دەستە چکارێکیان پێ دەسپێرن ؟

- بۆ تاقیکردنەوە لە سەرە تاوە چەند بەیاننامەیەکیان دەدرێتێ بڵاوی کەنەوە.

سپینا نارازی بوونی خۆی لەم شێوە نهێنیکارییە ناشارێتەوە و دەپرسێ :

- پێت وانیە کـە پێش هەموو کارێک پێویستە لـە گەڵیان ببیە دۆست؟ ئەدی بۆنابێ ئەوەی تازە دێتە نێو، ئێواران لە سـەعاتی بێکاری بیبینی و ڕۆژانی یەکشـەمۆ لە گەڵی بچیە گەڕانێ و نەک لە سیاسـەت بەڵکوو لە بارەی شـتـیـتر قسـەی لە گەڵ بکەی؟ بـە واتایەکی تر بۆ ڕاکـێـشـانی تەواوی لە هۆگـرییـەکی نـادیار کە لـە ئاست ئێمە هەستی پێدەکا، کەلک وەر گری و پیاوێکی لێ دروست بکەی.

« بولا» ڕێزێکی زۆر بۆ سپینا قایلە کە پێش ئاشنایەتی پەسنی وی بیستبوو. بەڵام ئەوەش دەزانێ کە ئەویش وەک زۆربەی ڕوناکبیران عـەجایبە و هـەر بۆیـەش دەیەوێ لە بـاس کــردن لە گــەڵ وی خــۆ بپــارێزێ. دەڵێ:« من ڕۆژنامــەیەکی بچــوکم بۆ خوێندکاران ئامادە کردوە بڕیارە لە ڕێگای پۆستـەوە بە ئادرێسی سـەت کەس بنێر

دریّ.»

– چیت تێدا نووسیوه.؟

– سەر وتار خۆم نووسیومه. پاشان نامەیەکی جوانه له خوێندکارێکی کاتۆلیک.

– ئه وکیّ نوسیویەتیّ ؟

– ئەویش خۆم نووسیومه .

سپینا دەپرسیّ : « ئەو هەموو زرنگییه بۆ چی ؟

« بولا» له وەڵامدا دەڵیّ :« دەبیّ ئەم فیکره تەڵقین بکریّ که خوێندکارانیش وا له بیّ هەستی و گێلی دێنه دەر.

سپینا خوێن ساردی خۆی له دەست دەدا و هاواریش دەکا :

– کۆمەڵی ئێمه کۆمەڵی کلاو کیس سازان نیه. ئێمه بۆ ڕواڵەت کار ناکەین. بۆ ئێمه گرنگ نیه که به ڕواڵەت قەوی بنوێنین. بەڵکوو دەبیّ به ڕاستی هەبین. شۆڕش که چاو بەستەکی نیه، واقعیەته و جگه له واقعیت نابی شتێیتر بیّ.

– بەڵام ئەگەر واقعیەت فیتنه هەڵایسێن بیّ چی ؟

– له گەڵ ئەوەش فیتنه هەڵایسێنی وی هەمیشه له درویّ هەره مەسڵەحەت کەمتره.

بولا له سەری ناڕوا. دەزانیّ سپینا هاوڕێیەکی باشه، بەڵام له دڕدۆنگی سەیر دایه.

سپینا شەو ناچار له گەڵ بیانکینا دەباته سەر، له ڕەستورانێک نان دەخۆن و پاشان دەچنه قاوەخانەیەکی وەک چۆل. هەوەڵجار سپینا تێدەکۆشیّ له گەڵ بیانکینا به جیددی قسه بکا. بۆیه دەڵیّ :

– ژیان له زاتی خۆیدا نه جیددی و نه سەر سەری، نه ماندوو کەره و نه سەرنج ڕاکێش. بەڵکوو ئەوه مەسەلەیەکه پێوەندی به وەزعی خۆمانەوه هەیه.

بیانکینا دەڵیّ: له گەڵ ئەو بیر وڕایه موافیقم.

سپینا درێژەی پێدەدا :

– ژیانی غەیره جیددی له ڕواڵەتەوه سەر چاوه دەگریّ. ئامانجی ئەم جۆره ژیانه تەنیا فەخر فرۆشتنه. ئەم جۆره ژیانه هەمیش دەیەویّ سەرنجڕاکێش، به هۆش، جوان و تێگەیشتوو خۆ نیشان بدا، تەنانەت هێندیّ جار دەیەویّ له ڕواڵەت دا باش و نەوعدۆست و ڕەشید بنوێنیّ. بۆ کەسانی سەر سەری غەیره جیدی بون گرنگ نیه، گرنگ خۆ نیشاندانه.

بیانکینا دیسان هاو دەنگی خۆی له گەڵ ئەم بیر و ڕایەش ڕادەگەیەنیّ.

سپینا لە پڕ لێی دەپرسێ: « تۆ بۆ چی هەمیشە لە گەڵ من موافیقی ؟»
ژن وەڵام دەداتەوە: « خۆشە ویستی دڵم، تۆ هەرچی دەتەوێ بیڵێ، من هەمیشە لە گەڵ تۆ موافیقم.
سپینا دڵسارد و بێدەنگ دەبێ. دەبینێ کات و تێکۆشانی خۆی بێهودە بە فیڕۆ دەدا. لە ئاخریدا دەڵێ :
– ئێستا تێگەیشتم تۆ لە منداڵێک زیاتر نی
– تۆ چی ؟ دەتەوێ پێت بێژم کە تۆ چی ؟
– ئەوە بۆ من سەرنج ڕاکێش نیە
– تۆ وڵاغێکی گەورەی
– بۆ چێ ؟
بیانکینا لە ڕوونکردنەوە دا دەڵێ :« ژنێک، ژنێکی بە ڕاستی هەمیشە هاو بیری پیاوێکە خۆشی دەوێ. ئەگەر ئەو پیاوە کاتۆلیکە، ئەویش کاتۆلیکە، ئەگەر ئەو پیاوە مسلمانە، ئەویش مسلمانە. ئەگە ر ئەو پیاوە هۆگری کۆکردنەوەی تەمرە، ئەویش تەمری بەتاڵ وعەنتیکە کۆ دەکاتەوە.
– بە واتایەکی دیکە ، بە قەولی تۆ ژن هەمیشە خەریکی خۆ سازدان دایە.
– ببوورە. ئێستا ئیتر تۆ وڵاغ نی. بەڵکوو قەنارییەکی گەورەی. ژنێکی بەڕاستی ئەڤینداری پیاوێک بێ تەنیا سمێڵەکانی وی خۆش ناوێ، بەڵکو بە دڵ بیرو باوەری ویشی خۆش دەوێ. باوەڕ ناکەی ؟
– باشە. ئەگەر ژن دڵی بە هیچ پیاوێکەوە نەبێ، بڕوای بە چی هەیە.؟
– لە قوڵایی دڵ خودای نە ناسراوی خۆی دەپەرستێ. واتە خودایەک کە چاوە ڕوانە خۆی پێ نیشان بدا.
– بەڵام ئەگەر ژن لە گەڵ مێردەکەی هاو بیر نەبوو چی ؟
– ئەو دەم مێردەکەی فریو دەدا و لە گەڵ فاسقەکەی هاو بیرە
– ئەگەر بە هەڵکەوت مێردەکەی فریو نەدا ، چۆن ؟
– ئەو دەم سارد سروشتە.
سپینا پێی وایە کە درێژەی گفتگۆیەکی ئاوا ئەحمەقانە و بێفاید دەبێ. بیانکینا لەوە کە دەبینێ ئەو بەم زوانە تووڕە دەبێ، دڵی دەگیرێ و بۆ سوکنایی دڵی وی دەیەوێ سەر پشکیەکی بداتێ:
– کە وابوو تۆ پێت خەراپە کە من بمەوێ لە سەر فیکر و باوەڕی تۆ بم؟ دەتەوێ بە

پێچەوانەی تۆ بیر بکەمەوە؟... دەبا زووتر پێم بێژی. ئیتر چیت گەرەکە ؟ بەڵام من یەک شــتم زیاتر ناوێ، ئەویش ئەوەیە بە دڵی تۆ بم و ئامــادەم تەنیــا بیــر لە وە بکەمەوە کە تۆ گەرکتە و بیری لێدەکەیەوە.
سپینا هەول دەدا تورە نەبێ و دەڵێ :
– من دەمەوێ تۆ هەمیشە بە دڵی ویژدانی خۆت رەفتار بکەی و بە ئاقڵی ساخ و شعوری خۆت بیر بکەیەوە و دەمەوێ تەواوی ئەوانە لە ژیانی تایبەتی تۆ جیا و سەر بە خۆ بن.
بیـانکینا دەڵێ :« ئەگــەر تۆ تەنیــا هەر ئەوەت دەوێ من ئـامـادەم وابکەم. بەڵام لە تۆڵەی ئەوە دا تۆ منت خۆش دەوێ ؟
سپینا لە جێ هـەڵدەستێ، کڵاوەکەی هەڵدەگرێ و بۆ لای دەرگا دەڕوا. بیـانکینا بە سـەر سوڕ مـانەوە چاوی لێدەکا و لە هەوەڵەوە پێی وایە گاڵتەیە بەڵام کاتێ دەبینێ سـپـینا بە ڕاسـتی دەچێـتـە دەر، بێ ئەوەی ئاوڕ داتەوە تەنیـا ئەو دەرفــەتەی بۆ دەمێنێ کە هاوار بکا:
– تۆ پیاو نی، تۆ حوشتر مورغی !
پاش دوو ڕۆژ خـاتو کلوچی تەلەفون بۆ سپینا دەکا کە نامەیەکی گرنگی لە ئانینا وەر گرتوە و دەیەوێ نـامـەکەی بەو نیشان بدا. سـپینا لە دوکـانێکی شیـر فروشی لە تەنیشت« پانتون » چاوی بە کلوچی دەکەوێ و لە ناوەرۆکی نامـەکە ئاگا دار دەبێ. لە نێوان خەتەکانی کە بە جەوهەری ئاسایی نووسراون، خەبەری ژێرەوەش بە ئاوی لیمۆ نووسراوە: « موریکا دوێنێ گیرا . لێرە وروژانێکی گەورە ساز بوە. ئەو لاوانەی کە سـەر بە ئەنجومەنی نووسـەرانن لە من دەپرسن دەبێ چ بنووسن و حـەقیـقـەتی مەسەلە چیە ؟ پیاوێکی دیکەش کە خەڵکی « پراتولا » یە هاتۆتە دیداری من »
سپینا بڕیار دەدا کە بچێتە مارسیکا، خاتو کلوچی پێی دەڵێ:
– وڵاتێکی کە زێدی ئینسانە وەک دەستی خودی ئینسانە. مرۆڤ لە وێ ناسراو ترە بەڵام باشـتر دەتوانێ خۆ بشارێتەوە. دەچێتە کن بیانکینا و دەبینێ لە بەر گریان چاوی سوور بوە و لە ژووری خۆیدا بوە. دەڵێ:
– من ئیحتیاجێکی زۆرم بە تۆ هەیە. موریکا گیراوە. تۆ هـەر ئێستا دەبێ بچیەوە فوسا . لە وێوە خۆت بگەیێنیە « ئاوەتزانو» لە گەڵ تەواوی نـاسیارەکـانی خۆت قسە بکەی بەڵام نابێ وابکەی گومـانت لێبکەن. دەبـێ تێبکۆشی هەرچی ڕوو دەدا و هەر ئامادەییەکی دەیبینی لێی ئاگادار بی.

- تۆ خۆت لێرە دەمێنیەوە ؟
- منیش سبـەینی دەکـەومـە ڕێ. کـەمـێک دوای نیـوە ڕۆ کـابرای« پڕاتولایی» بە گاریەوە بنێرە سەر جادەی نێوان فوسا وڕوکادی مارسی. پەناگایەکی شەویش بۆ من پەیدا کە.
- بۆ ناچیە موسافیرخانە پوورم ؟
- نە. چونکە لیباسی کەشیشم لە بەر دا نابێ
- دەتوانین شەوێ پێکەوە بین ؟
- بەڵێ .

بیانکینا لە خۆشیان هەڵدەپەڕێ. چەمەدانی دەبەستێ و دەکەوێتە ڕێ.
ڕۆژی دوایی سپینا ڕۆم بە جێدێڵێ و تا « تیوولی» بە تراموا دەڕوا. لەوێ بە قەتاری ناوچەییکە لە هەمـوو ئیزگەیەک ڕادەوەسـتێ خـۆ دەگـەیێنێتـە بناری چیاکـانی « ئابروتزە». ئەو دەزانێ کە پۆلیس بە سەر ڕێگای ئاسندا چاوە دێری توندی هەیە. لە گەڵ ئەوەش ڕۆیشتنی بە کاوەخـۆی قەتار بێتاقـەتی دەکا. باش نازانێ لە مـارسیکا چباسـە. ئانینا بە شـێوەی سـەر بەسـتە نووسـیویە لە وێدا وروژانێکی گـەورە سـاز بوە. بەڵام ئەم قسـەیە لە وانەیە چەند مـانای هەبێ. داخوا ئەنجومـەنی نووسـەرانی موریکا لە وانەیە توانیبێتی لە ماوەیەکی کەمدا وەزع بگۆڕێ
هەر چۆنێک بێ پێویسـتـە خـۆی جێگای مـوریکا بگرێ و نە هـێڵێ ئەم کلـولە دەزوە بکرێتـەوە. ئێسـتـا ڕاسپـاردەکـەی دۆن بنە دێتـوی وەبیـر دێتـەوە کە « هـەر کارێک فەسلێکی هەیە. فەسڵی برینەوەی ڕەز جیایە. فەسـڵی پڕژاندنی ، خاوێن کردنەوەی ئامادە کردنی کوپەکان و ئاخرەکەشی فەسڵی ترێ چنین و شێلانی هەمووی جیایە.
بەڵام ئێستا ئێمە لە مارسیکا لە چ فەسڵێکداین.؟ ئەو تێدەکۆشێ تا لە قسە کردن دەگەڵ کابرای پڕاتولایی، لە گەڵ ئانینا ، لە گەڵ بیانکینا، لە گەڵ لاوانی نووسـەر و دۆستـەکانی دیکەی مـوریکا ئەم نوکتـەیە تێبگات، و دیارە بە گوێرەی بوونی فـەسڵ هەنگاو دەنێ و بۆ ئەوانیتر دەبێتە سەر مەشق.
لە ئاوەتزانـو قـەتاری مـەحـەللی « تیـولی» زیاتر نا چێتـە پێش و سـپـینـا بە ناچاری سواری قـەتارێکی ناوچەیی دیکە دەبێ کە لە سەر خـەتێکی دیکە وێسـتاوە و هەر لە ئێـسـتـاوە پڕە لە وەرزێران و سـەودا گـەرانێک کـە دوای بازار بۆ گـوندەکـانیـان دەگەڕێنەوە.
ژنێکی دێهاتی بە سپینا دەڵێ:

- بازاری پێش نوئیل هەمیشە شلوغە. سوپاس بۆ خوا ئێستا زۆریان یارمەتیەکی دەوڵەت بۆ کورەکانی چوونە سەر بازی وەر دەگرن و هەر بۆیەش خەڵک زیتر پارەی دێتە دەست. سپینا گوێ بۆ قسەی موسافیران ڕادەگرێ تا بزانێ داخوا گۆڕانێکی تازە بە سەر ناوچەی مارسیکا دا هاتوە یا نا. بەڵام هەستی کونچکاوی وی قانیع نابێ.

چیاکانی کە دەشتی فوچینویان دەورە داوە، بە جارێک لە بەفر سپی دەچێ. لە هێندێ جێ بەفر لە سەر گردەکانی دەشتیش ماوەتەوە. سپینا باڵتۆیەکی ڕەشی لەبەر دایەکە تا قولاپانی دێت و شاڵگەردنێکی ڕەشی لە ملی هاڵاندوە. بەم سەر وسیمایە ئەگەر توشی کەسێکیش بێ کە دە لیباسی کەشیشیدا دیتوویە، نایناسێتەوە کە ئێستا لیباسی کەشیشی دەبەر دانیە. هەر لەو کاتە دا ئەگەر پێویست بێ ئەوەندە بەسە کە دوگمەی باڵتۆی بکاتەوە و شاڵ گەردنەکەی لە ملی لا بەرێ ببێتە ئاغایەکی ئاسایی. شکڵی کڵاوەکەی سەرنج ڕاکێشترە. جسن و شکڵی کڵاوەکەی جۆرێک هەڵبژاردوە کاتێ لە سەری دەنێ هەم وە کڵاوی کەشیشان دەچێ و هەم وە کڵاوی ئاسایی. ئەم داهێنانە بۆتە هۆی ئەوە کە سپینا ماوەیەکی درێژ کاتی خۆی لە کڵاو درویتکی شاری ڕۆم بە فیرۆ داوە بەڵام ئاخرەکەی نەخشەکەی گرتوویەتی و وەک مناڵان پێکەنینی بە خۆی دێت.

لە نیزگەی فوسا کە پڕە لە خەڵک بێ ئەوەی سەیری دەور و بەری خۆی بکا، دادەبەزێ و گورج بە ڕێگایەک دا کە بۆ ڕوکا دەچێ دەکەوێتە ڕێ. ئەو ڕێیە کە سەرەو ژێرێکە بۆ لای تەپکەکان سنووری نێوان گردێکی داپۆشراو بەرمز و مەزرایەکی بەر بڵاوی گەنم. لە سەر پێچێک کابرای پراتولایی بە گاریەوە دەیگاتێ. سپینا بێ ئەوەی هیچ بڵێ سوار دەبێ و گاری دەکەوێتە ڕێ.

کابرای پراتولایی ڕیشێکی چەند ڕۆژەی هەیە، گراس و باڵتۆکەی لە ئاسایی پیستر و شڕ ترە، هیلاک دێتە بەر چاو، وەک نەخۆش بێ. سپینا دەپرسێ :

- خەبەری موریکا چیە ؟

- ئەو دوێنێ مرد.

لە لای چەپ، ئاخرین گەڵا سیسەکانی میوەکان دەوەرن و لە لای ڕاستە ش رەپستەی شین مەزرای داپۆشیوە. هەوا پڕە لە ئارامیەکی تایبەتی، ئارامیەکی سروشتی ئارام ئەو شتانەی کە هەموو لە سەر جێگای خۆیان بن. موریکاش ئاخرەکەی لە جێگای خۆی ئارامی گرتوە. سپینا دەڵێ :

– ئەو بە منی گوتبوو کە ئێوە یەکترتان دەناسی و پێکەوە دۆست بوون.
کاریچی وەڵام دەداتەوە:
– بەڵێ، ئێمە زۆر جار پێکەوە بووین، مرۆڤ پێی خۆش بوو لە گەڵ ئەو بێ. پیاوێکی باشبوو، تینی وەبەر مرۆڤ دەنا کە باش بێ. لە گەڵ ئێمە باسی ئالو گۆڕێشی دەکرد و دەیگوت: پێکەوە بوون و نەترسان سەرەتای کارە.
سپینا دەڵێ: « بەڵێ، دەبێ پێکەوە بین و نابێ بێڵین ناکۆکی بکەوێتە نێوانمان.
کاریچی دەڵێ: « ئەو لە سەر کوتە کاغەزێک نووسیبووی: « لە جیاتی درۆ و نەفرەت ڕاستی و برایەتی لە بەینی ئینسانەکاندا حاکم دەبێ و کاری زیندوو جێگای کاری پارە دەگرێتەوە.» کاتێکی گیرا ئەم کوتەکاغەزەیان لە کن دیتبۆوە ئەو حاشای نەکرد. ئەو دەم لە حەساری سەر بازخانەی فوسا لە جیاتی تاج لەگەنی شەویان لە سەر نا و گوتیان: « ئەوەش ڕاستی !» پاشان لە جیاتی دەزگای کەشیش گەسکێکیان وە دەستی دا و گوتیان« ئەوەش برایەتی !» پاشان لە سەر هەرد لە فەرشێکی سووریان وەر پێچا و سەر بازەکان وەک تۆپی فوتباڵ دەیاندا بە یەکتر و پێیان گوت:« ئەوەش کاری زیندوو!» کاتێکی کەوتە هەرد بە پۆتینی بزمار دار لە پەراسوویان دەدا و بە هەموو تواناوە پێشێلیان دەکرد. تازە پاش ئەو لێپرسینە سەرەتاییەش تا دوو ڕۆژ هەر زیندو مابوو.
سپینا دەڵێ: « ئەگەر ئێمەش وەک ئەو بژین، مانای ئەوەیە ئەو نە مردوە. ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە پێکەوە بێن و نە ترسێن.»
کابرای پڕاتولایی بە سەر پشت ئەستوری دەکا.
سپینا دەپرسێ:« کەسێکی بە دوای داد پەروەری دابێ لە چی بترسێ؟ لە مەرگ ؟»
« پڕاتولایی» لە وەڵامدا دەڵێ : « تەنیا پیاو کوژەکان لە مەرگ دەترسێن »
لە چوونە نێو گوندی« ڕوکا » کاریچی ماڵێک نیشان دەدا کە لە نێو مەزرا دروست کراوە و حەسارێکی گەورەی هەیە. ئێرە ماڵی دایک و بابی موریکایە. سپینا پاش ئەوەی تکا لە کابرای پڕاتولایی دەکا کە دوایە بە دوایدا بێ و ئەگەر بکرێ بیانکیناش لە گەڵ خۆی بێنێ. لە ڕێگایەکی باریک و داپۆشراو لە گیا بۆ لای ماڵەکە دەچێ. ماڵی موریکا یەک قاتە و بەڵام ساختومانێکی پان و بەرینە نیوێکی جێگای دانیشتن و نیوەی دیکەی تەویلەیە. تەواوی پەنجەرەکان داخراون. بەڵام هەر وەک لە تازیە و پرسە دا دابە، دەرگای حەسار کراوەتەوە. لە ژووری حەسارێ لە پێش دەرگا عارەبانەیەکی دوو تەگەری گەورە و چوار گۆشە دانراوە کە بە ڕەنگی

سوور و عابی ڕەنگیان کردوە و دوو قوڵی بەرە و حەوا ڕاگیراون. لە پەنا عارەبانە ئامورێکە گاسنەکەی چوو بوە دەهەردی. خەڵک بە گوێرەی داب و نەریت ئاسایی دێن و دەچن. سپیناش بە دوو دڵی دەچەێتە ژوور بەڵام کەس سەرنجی ناداتێ، هێشتا لە دەرگای ماڵ نە هاتۆتە ژوور خۆی لە ژوورێکی گەورە دا دەبینێ کە هەردەکەی بە بەردی نارێک فەرش کراوە وئاسایی دەبێ ئاشپەزخانە و عەمباری کەل و پەلی کشت و کاڵ بێ.

بەڵام ئێستا پڕ لە میوانە. ژن بە لیباسی ڕەش و زەرد لە پەنا ئاگر دان لە سەر هەرد دانیشتوون. پیاوەکان کە لە دەوری مێز ڕاوەستاون باسی زەوی وبەرو بو دەکەن. سپینا لە ئاخری ژوورەکە دا چاوی بە ئانینا دەکەوێ کە بە تەنیا لە سەر چوار پایەکی بە ڕەنگی پەڕیو و مات و لەرزیو لە نێو ئەو هەموو نەناسراوانە دا دانیشتوە. ئەویش ناگری، بۆ گریان دەبێ تەنیا بی و یا لە گەڵ ناسیارێک. بەڵام کاتێ سپینای دەناسێتەوە ئیتر خۆی پێ ڕاناگیرێ و دەست بە گریان دەکا. دایک و بابی مردوو کە لیباسی ڕەشیان لە بەر دایە لە ژووری جیرانەوە دێن، دایک دەچێتە کن ئانینا، ئەسرینەکانی دەسرێ و دە پارچەیەکی ڕەشی وەر دەگرێ و لە پەنا خۆی لە سەر هەمان چوار پایەی پەنا ئاگردانی دادەنێ.

ژنەکانی دیکە لە یەکتر دەپرسن: ئەو ژنە کێیە ؟

یەکێک وەڵام دەداتەوە: « ئەوە ژنی ڕەحمەتیەکەیە، ژنێکی شارییە.

باوک لە ئاخری مێز لە گەڵ پیاوانی دیکە دادەنیشێ.

خزم وکە س لە گوندی دراوسێوە دەگەنێ. منداڵ دەگەنێ. وەک باوە دایک تاریفی کوڕەکەی دەکا و دەڵێ :

– من ویستبووم منداڵەکەم ڕزگار بکەم لە خۆم دوور خستبۆوە تا بخوێنێ و لە بەر ئەوە جەستەیەکی لاواز و ناسک و بە هەستی هەیە نەجاتی بێ. بەڵام نەمتوانیبوو ڕزگاری بکەم. هەوای شاری پێ نەکەوت و زەوی بۆ لای خۆی بانگی کرد بۆوە. لێرەش دیسان خەریکی کشت و کاڵ دەمبوو بیارمەتی باوکی دەکرد. وێدەچوو ئەم کارە زۆر هیلاک و بێزاری بکات. چونکە هەموو ڕۆژێ کار کردن لە زەوی سزایەکی ڕاستە قینەی خودایە. بەڵام ئەو بە پێچەوانە وردە وردە هۆگری ئەم کارە دەبێ، هەموو ڕۆژێ بەیانی باوکی وەخەبەر دێنا، ئەسپەکەی زین و لغاو دەکرد، تۆیەکانی هەڵدەبژارد، چەلەنگەکانی پڕ دەکرد و دەگەیشتە باخچە.

دایک لە گەڵ پەسنی کوڕەکەی جار جار پشوێکی دەدا و ئاگری ئاگردانەکەی خۆش

دەکرد و لقە دارێکی دەخستە سەر ئاگرەکە. مارتای خوشکی دۆن بنە دیتو دەگاتێ ئەویش لە بەر مردنی برای ڕەشپۆشە. وەرزێڕەکانی گوندی لە دەور و بەرەوە دەگەنێ. هێندێک جێگا چۆل دەکەن و دەڕەوّن. موریکای پیر لە نیزیک مێز ڕاوەستاوە خواردن و خواردنەوە دەدا بە پیاوەکانی دانیشتوو. شەراب تێدەکا و دەڵێ: بخۆنەوە! نان دەکاتە پاروو دەڵێ بخۆن! پاشان دەڵێ :

– ئەو لە چاندن و بلار کردن و دروێنە و کوتان و لە ئاش کردنی ئەو گەنمەی کە ئەو نانەی لێ دروست کراوە، یارمەتی داوم. وریگرن ، بیخۆن، ئەوە نانی ویە.

پیاوەکان دەخۆن و دەخۆنەوە. هێندێکیش نان لە شەرابدا دەکەنە تلیت.

دیسان دەستەیەکی دیکە دەگەنێ. باوک شەراب تێدەکا و دەڵێ: بخۆنەوە. ئەو لە هەڵپەرتاوتن وپرژاندن و بژار کردن و چنینی ئەو ترێیەی کە ئەو شەرابەی لێ دروستکراوە یارمەتی منی داوە، وەر گرن بخۆنەوە، ئەوە شەرابی ویە.

ئەو جار سواڵکەر دەگەنێ. دایک دەڵێ لێگەڕێن با بێنە ژوور. کەسێک دەڵێ: لەوانەیە ئەوانەیان بۆ جاسوسی نارد بێ.

– لێگەڕێن با بێنە ژوور. چونکە دەر خوارد دانی خواردن و خواردنەوە بە سواڵکەران، زۆر کەس بێ ئەوەی خۆیان بزانن خواردنیان داوە بە مەسیح.

باوک دەڵێ : –« بخۆن و بخۆنەوە، ئەوە نان و شەرابی ئەوە. ئەو دەم باوک چاوی بە سپینا دەکەوێ، سەیری دەکا و لێی دەپرسێ:

– خەڵکی کوێی؟

– خەڵکی « ئورتا »

– ناوت چیە ؟

ئانینا هەڵدەستێ بە سەبروکە ناوێک بە گوێچکەی پیرە مێرد دەڵێ . پیرە مێرد بە سپینا دەڵێ :

– من بە گەنجی لە گەڵ باوکی تۆ ئاشنا بووم. ئەو لە بازار ماینێکی لە من کری. ئەو کوڕەی لە منیان ئەستاند لە بارەی تۆوە زۆر شتی بە من گوتوە. وەرە لێرە لە نێوان دایکی و خێزانی دانیشە،بخۆ و بخۆوە چونکە ئەوە نانی ویە و شەرابی ویە.

سپینا دەڵێ نان کە لە هەزار دەنکە گەنم دروست دەکرێ بە مانای یەکێتییە. شەراب لە هەزاران دەنکە ترێ ساز دەکرێ ئەویش مانای یەکێتییە. یەکێتی لە شتی وەک یەک و یەرانبەری و بە قازانج. کە وابوو یەکێتی ڕاستیشە و برایەتیشە و

ئەوانە پێکەوە سازگارن. لە لای ڕاستەی سپینا ژنە وەرزێرێک دانیشتوە کە دایکی مردۆکەیە و لە لای چەپەشی کیژە کرێکارێکە خێزانی مردۆکەیە. لە لای چەپەی گوندە و شاریش لە لای ڕاستەیەتی. سپینا خۆشی نیوە شارەیی و نیوە گوندییە.
باوک دەڵێ بۆ نان دروست کردن نۆ مانگ پێویستە.
دایک بە سەر سوڕ مانەوە دەڵێ : « نۆ مانگ !»
– لە نوامبر تۆوی گەنم دەچێنن و لە یول دەدروونەوە و گێرەی دەکەن. پیرە مێرد مانگەکان دەژمێرێ. نوامبر، دیسامبر، یانواری، فێوراری، مارس، ئەپریل، مای، یونی، یولی، ئەوە ڕاست نۆ مانگ. بۆ پێگەیشتنی دیکەش نۆ مانگ پێویستە. لە مارسەوە تا نوامبر ئەوەش دەبێتە نۆ مانگ. دایک دیسان دەپرسێ:« نۆ مانگ » ئەو قەت بیری لەوە نە کرد بۆوە بۆ منداڵ دروست کردنیش نۆ مانگ پێویستە. ئەو لە مانگی ئەپریل هاتبوە دنیاوە. دایک مانگەکان دەژمێرێ.
ئاشنای دیکە دەگەنێ هێندێک دەڕۆن تا جێگا بدەوە بەوان مارتا بە دایک دەڵێ:
– لە بیرمە کاتێ کوڕەکەت منداڵبوو، تۆش هێشتا گەنج بووی ئەوت دە ئامێز دەگرت و دەچوویە سەر تەپۆڵک و دەتگێڕا. دۆن بنەدیتو ئەو دەمدەیگوت: تۆ وەک تولە مێوێک دەچی و ئەویش وەک هێشوە ترێیە. تۆ وەک چڵە گەنم دەچی و ئەویش گوڵە گەنمی تۆیە...
باوک دەڵێ : « بخۆن و بخۆنەوە. ئەوە نانی وییە و ئەوە شەرابی وییە.
بیانکینا لە دەرگاوە دێتە ژوور. سپینا یەکسەر دەچێتە پێشوازی. ژنی گەنج پێی دەڵێ:
– هەر ئێستا دەبێ ڕابکەی. تۆیان ناسیوە،
: تۆ لە کوێ دەزانی ؟
– من لە ئاوەتزانو دوو جار ئالبێرتۆ کولامارتینی– م چاو پێکەوت. ئەو هێشتا ئەڤینداری منە. لەو کاتەوە کە پۆمپینو چۆتە ئەفریقا، ئیتر ئێرەیی نابات. من لە سەر ڕاسپاردەی تۆ بە ڕواڵەت ئەڤینی ویم قبوڵ کرد. ئەوئێستا ئەفسەری ئەرتەشە، بۆ منی باسکرد کە ئێستا چەند ڕۆژە عەکسی گەورەی کەسێکیان بە ناوی پێترۆ سپینا لە دەفتەری کۆڕی وی بۆ تەماشا داناوە. ئەگەر باش سەیری بکەی، گومانت نامێنێ کە پێترۆ سپینا و دۆن پاولۆ یەک کەسن. من زۆر هەولم دا تێیبگەیێنم بە هەڵە چوە، بەڵام گوێی نەدایە. هەر ئیمرۆ بەیانی ڕاپۆرتی داوە بە باڵا دەستی. بە ڕاستی هەڵکەوتێکی سەیرە کە ئیمرۆ کاتێ گەیشتوویە ئێزگەی قەتاری ڕێگای

ناسنی فوسا تۆیان نەناسیوە. ئێستا ئیتر نابێ یەک چرکەش کات بە فیرۆ بدەی. بێگومان ئێستا تەواوی پۆستەکانی ژاندارمە و نیزامی ناوچەی ئاگادار کردوە.
سپینا ئانینا بانگ دەکاتە پەنایەک، پاشان داوا لە موریکای پیر دەکا کە بۆ ڕۆژێک ئەسپەکەی بە ئەمانەت بداتێ. پیرە مێرد کاتێ بۆ حەساری ماڵ دەگەڕێتەوە، جوانو ئەسپێکی جوان کە تازە گیراوە بە دوای خۆیدا دەکێشێ و دەڵێ: « کەمێک هەوا هەڵمژێ بۆی خەراپ نابێ.
بیانکینا دەپرسێ: « من چکارێکم لە دەست دێ ؟ »
– هەر چی پراتولایی پێی گوتی وابکە و جیدی بە. من ئێستا دەچمە پیتراسکا، چونکە لەوێ هێندێ کاغەزم داناون باشترە بیانسووتێنم. پاشان دێمە خوارێ و بە ڕێگای « پسکا سرولی»دا دەچمە «ئالفدنا» و یا «سکانۆ»، دیارە هەر کە توانیم لە وەزعی خۆم ئاگا دارت دەکەم.
سپینا سواری ئەسپ دەبێ، ئەسپێک بە گوێرەی دابی گوندی زین و لغاوی نیە. تەنیا هەوسارێکی ساکاری بە سەرەوەیە. بۆیەش ئەسپ کاتێ بێگانەیەک لە سەر پشتی خۆ دەبینێ، دەحیلێنێ و چوار نال هەوسار پساو ڕوو لە سەحرا دەکا و سپیناش کە ساڵەهای ساڵ سواری ئەسپ نەبوە، ئەسپ هەڵیدەگرێ. هەر چەند هەوساری ئەسپ دەکێشێ بۆی ڕاناگیرێ. بۆ ئەوەی نەکەوێ ناچار هەرتک دەستی لە یاڵی ئەسپ قایم دەکات. ئەسپەکەش پاش تاوێک ئارام دەبێتەوە. سپینا بە کوێرە ڕێیەک دا بە نێو مەزرای تەنیشت جادەی کالیسکە ڕۆ دا ئەسپ بۆ لای دۆڵی پیتراسکا دەبات. لە دەرەوەی گوندی «لاما» کەمێک پێش ئەوەی بگاتە ئەو پردەی کە دەچێتە دۆڵی پیتراسکا دژبانێک پێشی دەگرێ و هاوار دەکا: « ڕاوەستە! »
ئەسپ لەو دەنگدانە دەرەوێتەوە و سپیناش بێ ئەوەی لە غاری ئەسپەکە کەم کاتەوە چوار ناڵ دەیکوتێ. هەر چەند هەورازیشە ئەسپ بێ پشوو دان بەشی هەوەڵی دۆڵ دەبڕێ و تەنیا بە دیتنی بەفر لە سەر جادە غار کەم دەکاتەوە. سپینا جار جار ئاوڕ دەداتەوە بەڵام شوێنی ڕاونانی لە دوا نیە.. گریمانەی ئەوە نیە کە ئەو نیزامیە دوای کەوتبێ. بەڵام دووریش نیە کە سەربازخانەی جیران ئاگادار بکا و نیشانەی سواری بداتێ. لەمحاڵە دا گەشتێکی ژاندارمی ئەسپ سوار یا دژبانی مۆتۆر سکلیت سوار ڕێگای دۆڵی پیتراسکا دەگرێ. هەر یەک لەو گریمانانە دەبنە کۆسپێک لە سەر ڕێگای ڕاکردنی کە ئاقڵی پێناشکێ. سەر ڕەوی خۆی بۆ لای پیتراسکا درێژە پێدەدا بەڵام ڕێگا بۆ چوونە دەر لە دۆڵ دەبەسترێ و دەکاتە کوسپ

و چۆن دەتوانـێ ڕابکات ؟ لە پڕ سـەری ئەسپ وەرگێـڕان و هاتنە خـوار بۆ دەشت کارێکی بە ترسە ڕۆیشتنە بەرەو پێشـوازی لـە ژاندارم و نیزامیـان. بەڵام چوونی پیتراسکا و مانەوەش لە وێ ئەوەندە ئاقڵانە نیە و لە وێ وەک مشک دەتەڵە دەکەوێ.
سپینا بە لێبڕاوی هیچ ڕۆژنەیەکی هیـوا بۆ نەجاتی خـۆی نابینێ. ئەسپ پشوو دەدا و هەڵمی لـێ هەڵدەستـێ و کەفی بە لغاواندا دێتە خـوار. بەڵام هەروا داژوێ.
هەر چـەندی زیاتر دەڕواتـە پێش، دیمـەنـی دۆڵەکــە دەگــۆڕێ. بەفـــر زۆر بـاریوە و عاسمـانی دیسـان بەفری پێوە دیارە. بنارەکانی چیا کە وا سپی هەڵگەڕاون، هەر گیز ئەوەندە بەرز و ڕژد نە هاتبوونە بەر چـاو. هەولدان بۆ تێپەڕ بـوون لەو بنارانە نەک هە ربە هیلاک چوونە، بەڵکوو فایدەشی نیە.
گوندەکانی ئەو لای بناریش بەشێکن لە مارسیکا دوور نیە نیشانی ئەویان دابێ بەوێش. سـپینا دەگـاتە بەرانبـەری پیتـراسکا. کـڵاوەکەی دادەکێشێ و دوگمـەی باڵتۆکەی دادەخات و بەم چەشنـە کەم و زۆر خۆ دێنێتـە سەر ڕەنگی کەشیش. لەو دیوی پیتـراسکا چیا دۆڵەکە دەبەستێ و تەواو لـە بەفر داپۆشراوە. دوو لوتکەی نا بەرانبـەر کـە دوگـەی حـوشـتـر وەبیـر دێننـەوە. لوتکەی بەرز تر دوورە دیمەنی دۆڵ دەبەستێ، و لوتکەی بچوکتر کە لێوارێکی دەشتەکی هەیە ئەولاترە و دەکاتە بناری لای ڕاستـە. خڕێکی قوڵ ئەم دوو لوتکەی لێک جیـا کردۆتەوە کـە بە « زین بزان» ناسراوە.
سێلاوێکی لە دۆڵی پیتراسکا دێتە خوار لە وێوە سـەر چاوە دەگرێ. سـپینا دەزانـێ لە « زین بزان» بۆ بناری ئەو دیوی چیـا، تاقە کوێرە ڕێگایەکی هێستر ڕۆ هەیە کە بێگومـان بەفـر گرتوویە و بۆ لـێ تێپـەڕ بوون نابێ. سـپینا وەبیر دێنێتـەوە کـە لە شـاتاپی بیستبـوو کە تێپەڕ بوون لە « زین بزان» و گـەیشتن بە ماڵەکانی هەوەڵی ئاوایی بناری ئـەو دیوی چیـا، لە هاویندا ڕێگای چوار پێنج سـەعـاتە. ئـەدی لە زستـاندا چۆن ؟ ئەگـەر ئەو توانایەکی زیاتری هـەبایە تاقـە ڕێگای ڕزگاری لەم تەڵە مشـکەی تێیکەوتوە، بێگومـان هەر ئەو ڕێگایەیە. بەڵام لە وەرزێکی ئاوا دا، داخـوا ئەوە شێتی نیە کە چەند سەعات لەم بەرزاییە و لە چیایەکی ئـاوادا، خۆی سەر گەر دان بکات؟ بێگومـان لـە بوارێکی ئاوا دا زۆر باشـــترە کــە بە فـێـڵـێکی ژیرانە هەنگاوێکی پێچەوانـە باوێ و لە پیتراسکا بمێنێتـەوە و وا نیشـان بدا کە بە فڵان لادا ڕادەکا. ئەو دەم لە خـانووی یەکێ لە وەرزێران، یا لە تەندوری گشـتی ئاوایی کە هەر پازدە ڕۆژ جارێک هەڵدەکرێ و یا لە ژێر زەمینـێ لە چەلەنگێکی گەورە دا

خۆ بشارێتەوە. بەڵام بۆ ئەم کارە هاو دەستێک پێویستە و ئەو هیچ کەسی نیە.
بە تاو توێی ئـەم فیکرانە لە مێشکی خۆیدا ئاخرەکەی سپینا دەگاتە پێتراسکا.
هەوساری ئەسپەکە لە دەرگای موسافیرخانە دەبەستێتەوە و دەیەوێ بچێتە ژوور.
لە نەکاو دەنگی نیزیکبوونەوەی کەسێک لە پشتەوە دەبیسرێ. ئاوڕ دەداتەوە دەبینێ کریستینایە. ڕوخساری کیژەکە ئەوەندە خەفەتاوی کە سپینا دەترسێنێ. کیژەکە بە زەحمەت دەڵێ:
- برام نامەیەکی بۆ من نووسیوە.
سپینا لە پێشدا نیگەران دەبێ کە نەکا بەڵایەکی بە سەر ئالبێرتۆ دا هاتبێ. بەڵام قسە لە شتێکی دیکەیە.
کیژی لاو دەپرسێ:
- ڕاستی بە من بڵێ. داخوا ڕاستە کە تۆ پێترۆ سپینای .؟
- بەڵێ .
ماتالنا لە موسافیرخانە دێتە دەر. سپینا و کریستینا کە هەر یەکەیان بە هۆیەکەوە ئاڵۆزن، بێدەنگ دەبن.
سپینا دەچێتەوە ژووری خۆی. شتو مەکی خۆی کۆ دەکاتەوە و کاغەزی زۆر دەسووتێنێ. جار و بار ڕادەوەستێ تا چاو لەو جادەیە بکات کە لە لای دۆڵەوە هەوراز دێت. لە گەڵ ڕێک و پێک کردنی کاغەزەکانی توشی دەفتەر چەی یاد داشتەکانی ڕۆژانی خۆی دەبێ کە ناو ونیشانی « وتو وێژ لە گەڵ کریستینا » ی لێ نووسراوە. تاوێک لە دڕدۆنگیدا دەمێنێتەوە. پاشان ئەم چەند وشەیە بە ناوی پێشکێش و ماڵاوایی لە پشتی بەرگەکەی دەنووسێ:
- ئازیزم ،کریستینای خۆشەویست ! تۆ لێرە حەقیقەت دە دۆزیەوە و جگە لە حەقیقەت هیچی دیکە نابینییەوە. مەبەستم حەقیقەتی واقیعی و ڕەسەنە. حەقیقەتێک کە لەم سەر دەمە خەفەتاویە دا بزرە. حەقیقەتێک کە لە دڵدایە. پێترۆ سپینا»
دەفتەر چە دەخاتە پاکەتێکەوە. بۆ ئاشپەز خانە دێتە خوار و پاکەتەکە دەدا بە ئامریکۆ و داوای لێدەکا بە خێرایی بیگەیێنێتە کریستینا . ماتالنا ش بە دوای شاتاپ دا دەنێرێ. هەقدەستی ڕۆژێک پێشەکی دەدا بە شاتاپ کە خێرا ئەسپەکە بۆ ڕوکا بەرێتەوە و بیداتەوە بە خاوەنەکەی. پاشان دوو بارە دەچێتەوە ژوورەکەی خۆی. پاش نیو سەعات کاتێ ماتالنا دێت بپرسێ کە چی دەخوات، ژوورەکە بە

خــاڵی و ڕێک و پێک دەبینێ لە گـەڵ هێندێ پارە و چەند وشــە بۆ ســوپاس لە میوانداری ماتالنا لە سەر مێزە. ڕۆیشتنێکی چەند سـەیر! هێشتا نیو سەعات لە هاتنەوەی ڕانە بردوە، بێ مالاوایی ڕۆیشـتوە.! دێتە خـوارێ بۆ باخـچـە و لە سـەر بەفر شوێنی ئینسانێک دەبینێ. بە سەر سورِ مانەوە شوێن پێ هەڵدەگرێ و دەگاتە سێـلاو گـر، لە درێژایی سـێـلاو گـر شـوێن پێ درێژەی هەیە، بەلام نەک بۆلای دۆڵ، بەڵکو بۆ لای سـەر چاوە هەوراز چوە. بێگومـان ئەو کـابرایە شـێت بوە. مـاتـالنا لە ڕێگا دا تـوشێ جـوتیـارێکی کـەڕ ولاڵ دەبێ بە دەست وئامـاژە تێیـدەگـەیێنێ کـە کەشیشی دیوە یا نا. کەڕ و لاڵ حاڵی دەکا کە دیتوویە بۆ لای چیا ڕۆیشتوە.

ماگاشیا دەگاتێ وئەم خەبەرە پشت ڕاست دەکا. کەشیش وەک مرۆڤێکی لە هەموو شوێن ناهومێد ڕووی کردۆتە چیا و ئێستا دەبێ تەواو دوور کەوتبێتەوە.

ماتالنا دەڵێ:

– بێگومـان ئەو شـێت بوە. لە هـاوێندا هەمـیشـە لە ژوورێ دەمـایەوە. ئێـسـتـا کـە میترێک بەفر باریوە، ڕوو دەکاتە چیا.!

مـاتاڵنا چونکە لە هیچ سـەر دەر ناکات، دەچێتـە کن کریسـتینا بەڵکوو ئـەو شـتێ بزانێت.

کیژی لاو لە ژووری خۆی تەنیا دەرگای لە سـەر خۆی کاڵە داوە و گیرۆدەی خەمێکی گەورەیە. تازە لە خوێندنەوەی یاد داشتەکانی ڕۆژانەی پێترۆ سپینا بۆتەوە.

ماتالنا پێی دەڵێ:

– کەشیش شێت بوە. بە نهێنی لە دەرگای باخ چۆتە وەر و ڕووی کردۆتە چیا.

کریسـتینا دەچێتە پێش پەنجەرە و تەماشای ئەو لایە دەکات کە مودیری موسافیر خانە پێی نیشان داوە. لە بناری سەر تاپێ سپی چیا کە یەکسەر بۆلای« زین بزان» دەڕوا، شـوێنی ئینسـان دیار نیـە. کـە وا بوو ڕێگـای ئاسـانتـر و بەلام درێژ تری گـرتۆتە بەر واتـە هەمـان کـوێرە ڕێیی هێـسـتـر ڕۆ کـە پاش جـیـا بوونەوە لە لێرەوارەکانی سێلاو گر بە هێڵی درێژی مار پێچ بۆ لای پشت چیا هەوراز دەڕوا.

خۆزیا نانی خوارد بایە ! خۆزیا لیباسی گەرمتری دەبەر کرد بایە.!

بەسـتێنی سێـلاو گر وەها بە تەختـە بەرد و داری بچۆک شـاراوەتەوە کریسـتـینا ناتوانێ بزانێ کە ڕاکردوو دەبێ گەیشتبێتە کوێ. جگە لەوە مژیشە.

مـاتالنا دەڵێ: « بەم زوانە شـەو دادێ. ئەو ئەگـەر بگـاتە « زین بزان» یش لە کڕێوەی بەفردا دەمێنێتەوە..»

مودیری موسافیر خانە دەنگی گریانی ئامریکۆی کوڕی دەبیسێ و بە دوای کاری خۆیدا دەڕوا. کریستینا لە بەر پەنجەرە دەمێنێتەوە و چاوی بڕیوەتە ئەو لایە کە ئەو پیاوە پێیدا ڕادەکا. ئەم ڕوو داوە بۆ مرۆیەکی وەک سپینا کە جەستەیەکی لاوازی هەیە و لە بار و دۆخی ناوچە شارەزا نیە و کەل و پەلی تایبەتی و ئازوقەشی نیە. لە وانەیە بە قیمەتی گیانی تەواو بێت. فیکری ئەوەی کە ئەو مرۆیە بە رە و ڕووی مەترسی مەرگە لە پڕ نیگەرانی بە سەر گیانی کریستینا دادێنێ و هەموو جۆرە تێڕوانین و ئیحتیات لە بیر دەباتەوە. دەفتەرچەی یاد داشتەکانی سپینا لە ژێر باڵنجی خۆی دەشارێتەوە، لە قەفەسەی خۆی بە دوای لیباسە خورییەکانیدا دەگەڕێ کە بە کار بێن، باڵتۆیەک و دوو بلوزی دەستچن و جوتێکی دەستەوانە و دوو شاڵ گەردن دێنێتە دەر و هەموویان لە بوخچەیەک دەنێ. ئەو دەم دەچێتە ئاشپەز خانە، نردوێک نان و شوشەیەک شەراب هەڵدەگرێ و ئەوانیش دە نێو لیباسەکان دەنێ و بۆ ئەوەی دایە گەورەی نەیبینێ و دەنگی نە بیسێ، بوخچە دە بن هەنگڵی دەنێ وەک بچێ سەری تەویلە بدات. لە ئاخری باخ دەمچێتە دەر، بەڵام لە دەرەوەی ماڵ دەورێکی سوک لێدەدا، لە پشتی کلیسا و قەبرستان تێدەپەڕێ، پاشان لە بەفر دەنیشێ وەک ئە وکاتەی منداڵ بوو لە سەرەو ژێرێکی بە بەرزایی دە دوازدە میتری لێ دەنیشێ تا دەگاتە کوێرە ڕێی خوارەوەی سەرەو ژێر کە بە درێژایی سێڵاو گر تا مەودایەکی درێژ بەرەو سەر چاوە هەوراز دەڕوا. کاتێ دڵنیا دەبێ کە لە دانیشتوانی گوندی هیچ کەس نەیدیوە، دەست بە ڕاکردن دەکات. چونکە ئەگەر بە ڕاستی ڕاکردوو نیو سەعات پێش وی کەوتبێتە ڕێ ئەو نابێ کات بە فیڕۆ بدات. لە سەر کوێرە ڕێ شوین پێی جیاواز دەبینرێ و کریستینا لە گەڵ ڕاکردن تێدەکۆشێ شوین پێی ڕاکردووی خۆی بزر نەکات. هەر چەندی دەچێتە پێش جێ پێیەکان کەمتر دەبێ بەڵام هەر چۆنێک بێ لە لێواری سێڵاو گر جیا نیە و ئەوەش نیشانەیەکی ئاشکرایە کە ڕاکردوو بۆ گەیشتن بە «زین بزان» ڕێگای دوور تری گرتۆتە پێش وانە هەر بە هەمان کوێرە ڕێگای هێستر ڕۆدا ڕۆیشتوە. کریستینا بۆ ئەوەی بتوانێ دواکەوتنی خۆی قەرە بۆ بکاتەوە ناچار دەبێ ڕێگای کورت تر بگرێتە بەر کە سەرەو ژێرێکی توندی هەیە و لە بنارێکی بە بەرزایی نیزیک بە سەت میتر دەچێتە سەر تا دەگاتە ئاخری بناری دۆڵ. ئەو دەزانێ کە سەر کەوتن لەم بنارە پڕ لێژو هەورازە تەنانەت لە وەرزێکدا کە هەواش خۆشە ئازایەتیەکی مە ترسیدارە کە تەنیا بەوانە دەکرێ کە لەگیانیان بوردوون و لە

زستاندا لە ڕادە بە دەر بە ترسترە. بەڵام ئەو تاقە ڕێگایەکە لە پێشیەتی تا بتوانێ خۆ بگەیێنێتە ڕاکردوو. بە بازدێک لە سێڵاو گر تێدەپەڕێ و دەست دەداتە هەواراز، بە یارمەتی لاق و دەستان دەچێتە سەر. دەست بە لقە دار و گوێنی و لوتکە بەردان دەگرێ کە سەریان لە بەفر وەدەر ناوە. هێندێ جار لە وەی دەستی پێدەگرێ بە هەڵە دەچێ و بەرەو ڕوو دەکەوێتە سەر بەفر ولە سرڕا دەکەوێتەوە خوار. لە بەختی خۆی لەو شوێنە سەرەو ژێری بنار زیاترە، بەفر لە بەر با تەنکترە. بەڵام لە نێو دەختە بەردان کە کریستینا هیوادار بوو بە دڵنیایی زیترەوە بچێتە پێش، زیاتر لە بەفر دەچێتە خوار و دەبێ هەمیشە هێزی باسکی بە کار بێنێ تا لە بەفر خۆی دەر باز دەکات. داوێنی و بوخچەکە کۆسپی گەورەن بەڵام ئەو بە دوو هۆی جیاواز ناتوانی واز لە هیچیان بێنێ. لە شوێنێکدا کە لە بەر هاتنە پێشێ لە ڕادە بەدەری تەختە بەردێک ئەشکەوتێکی وشک ساز بوە. کریستینا هیلاک و پشو لێبڕاو دەکەوێتە هەرد. لە ئاخری دۆڵ مژ دێتە سەر. پەڵە گەورەی مژ کە وەک خۆڵە مێش دەچن. کەندالەکان پڕ دەکەن. ماڵەکان دادەپۆشن و مەزرا و بەرژین و دیوارەکان دادەگرن. ئێستا زەوی بێ شکڵ و خاڵی دێتە بەر چاو. دەڵێی کەسی تێدا نیە و گەڕاوەتەوە سەرەتای دروست بوونی. بەڵام بە پێچەوانەی سەرەتای دروست بوونی کە گیان لە بەری تێدا نە بوو، ئێستا ژن و پیاوێکی تێدایە. پیاوێکی تەنیا کە لە وانەیە ئێستا زۆر لە ژنەکە دوور نەبێ. ژنێکیش کە دەیەوێ دوو بارە ڕاست بێتەوە تا خۆی بگەیێنێتێ و لە تەنیایی یارمەتی بدا. ئێستا بەفر توند تر بوە. کریستینا دەتوانێت باشتر بە ڕێگدا بڕوا، بەڵام ئاسانتر دەخلیسکێ. ئارەقە لە هەموو لەشی دێتە خوار. خوێنی لە دستان دێت چونکە دوو سێ جار ناچار بوە بۆ ئەوەی هەڵنەدێردرێ، دەست بە پنجە دڕوان بگرێ و دڕوو دەستیان بریندار کردوە. کریستینا نازانێ لە چ ماوەیەکدا ئەم مەودایە هاتۆتە سەر. نیتر ناتوانێ بڕوا. ئێستا لە سەر تەپکێکی بەرینە بە شکڵێکی چوار گۆشەی درێژ کە « مێرگی جادوو» ی پێدەڵێن. لەو دیوێ تەپک چیا بە لێژێکی هێدیتر دا درێژەی دەبێ. دەوراندەور بەفر مۆرە، دیارە کەسی پێدا نە ڕۆیشتوە. دیسان ڕۆیشتن بۆ لای لوتکە، نەک هەر لە پێی دەخات، بەڵکوو بێفایدەشە. کریستینا بڕیار دەدا باشترە بە قەد پاڵی چیادا بە شکڵێ لا بەلا سەر بڕ بڕوا تا بەم جۆرە ڕێگا لە سپینا بگرێ. لەو ڕێبازە تازە دا ڕێگا درێژە پێدەدا. دیمەن تەواو گۆڕاوە. دۆڵی پیتراسکا لە بەر چاوان بزرە. جگە لە لوتکە و بستووی چیاکان هیچ شتێ نابینرێ. لە مەودای دیتنیش بە خێرایی کەم

دەبێتەوە. بایەکی ساردی دێ کە دەمو چاو وەک شوشە دەبڕێ. ڕۆژ لە ناوا بوون دایە. کرێوەی بەفریش نیزیک دەبێتەوە. کریستینا دەگاتە نوختەیەک کە بستوو لە وێوە دەست پێدەکا، بستوێک کە دوو کوڕایی چیا لێک جیا دەکاتەوە و « زین بزان» پێکدێنێ. لە سەر بەفرێ هیچ شوێنێکی ئادەمیزاد نابینێ. زەوی زۆر ناڕێکە و لە تەختە بەرد داپۆشراوە و لە هێندێ جێ با و سێلاو دڕ دڕی کردوە. جگە لەوە تا نێو قەد لە بەفر دەچێتە خوار. مەودایەکی دوور تر لە خۆی نا توانێ ببینێ. ئەو ڕۆژەی بەهار وەبیر دێنێتەوە کە هەوەڵێتجار هاتبوە وێندەرێ. ئەو ڕۆژە هێشتا منداڵ بوو لە گەڵ باوکی هاتبوو. ئیمڕۆ بە پێچەوانەی ئەو ڕۆژە دیمەن خەفەتبارە. کریستینا چوونە سەر بەرەو « زین بزان» دەست پێدەکاتەوە. پێی وایە کاتێ بگاتە ئەم سەرەوە دەتوانێ تەماشای هەر تک بناری چیا بکات و ئاسانتر سپینا ببینێ و یا لانی کەم خۆی بەم هۆیەوە ببنیدرێ. بەڵام دەمێک دادێ کە توانای ڕۆیشتنێ نیەو و بە سەر بەفراندا دەکەوێ. بۆ ئەوەی ئەوەکوو سپینا بەم دەور و بەرەدا تێپەڕێ و لە بوونی ئەو لەم جێگایە ئاگا دار نەبێت، جار جار بە هەموو توان و بە هر هێزێکی تێیدا ماوە بە ناو بانگی دەکات. بە ناوی تازەی، بە ناوی ڕاستە قینەی بانگی دەکات:

– سپینا ! هۆی سپینا !

بێگومان ئەگە ر بەوانە دا تێپەڕێ دەنگی وی دەبیسێ. سەر و بۆڕی خۆی ڕێک و پێک دەکا و ئەو بەفرەی سەر و چاو و مژۆڵ و ملی گرتوە پاکی دەکاتەوە. ئەگەر سپینا بێتە ئێرە چەندی پێ سەیر دەبێ ! ئەو بە سپینا دەڵێ « لە پێشدا ئەو لیباسە خوریانە بگرە و لە بەریان کە!» سپینا لە وەڵامدا دەڵێ: « تۆ چۆن توانیوتە لە پێش مندا بگەیە ئێرە؟» ئەو بە سپینا دەڵێ :« ئێستا هێندێ لەو شەرابە بخۆوە و هێندێکیش لەم نانە بخۆ. ئەوانە خواردنی ساکارن بەڵام سلامەتن!» سپینادەڵێ:« مادمازل کریستینا، دەتەوێ ئەم سەفەرە لە گەڵ من درێژە پێبدەی ؟» ئەو لە وەڵامدا دەڵێ : « خۆشەویستم هەموو شت بەم ساکارییە نیە، چما لە بیرت چوە کە من بنە ماڵەم هەیە و دەبێ بچمەوە ماڵ » بەڵێ، ئەو هەر ئەم قسەیە بە سپینا دەڵێ،هە ربۆیەش بە هەموو توانا بانگی دەکات ؛

– سپینا، ! هۆی سپینا !

ئێستا دەزانێ ئەگەر سپینا نەگاتێ وەزعی خەراپ دەبێ: « ئێمەی ژن هەر واین، دەمانەوێ یارمەتی بدەین، پاشان خۆمان پێویستیمان بە یارمەتی دەبێ.» هە رلە

بەر ئەوەیە کە بە هەمو توانایەکی کە ماویەتی، دیسان بانگی دەکات.
تاوێک پێدەچێ کە دەنگێک لە دوور وەلامی دەداتەوە. بەلام ئەوە دەنگی ئادەمیزاد نیە. دەڵێی دەنگی لوورەی سەگە، بەلام تیژ تر و درێژ تر. کریستینا دەنگەکە دەناسێ، لوورەی گورگە. لوورەی خوێنە. ئاوازێکە بۆ گورگەکانی تر کە لە چیا بلاون. بانگی داوەتی میوانداری گشتییە. ئەمجارە خواردنێکی چاوە ڕوانیانە خواردنێکی ڕەمەکی نیە بەڵکوو گۆشتێکی تورت ونەرم وبژاردەیە، گۆشتی مەسیحییەکە.
لە پشت مژی قەتیس ماو،لە پشتی تاریکایی شەو کە ئێستا دەست پێکراوە کریستینا هەوەڵین جانەوەری دڕندە دەبینێ کە بۆ لای دێت و بە گوێرەی نا ڕێکی بەفر جارێک دیارەو جارێک ونە. لە دوورەوە سەر و کەللەی گورگەکانی دیکەش دەر دەکەوێ. ئەو دەم کریستینا ئەژنۆ دادەدا و چاو دەنووقێنێ و نیشانەی خاچ دەکێشێ.

تەواو. ٢٠٠٠/٢/١٨